كریس كۆچێرا

# كورد

## لە سەدەی نۆزدە و بیستەم دا

و: حەمەكەریم عارف

# کریس کۆچێرا

# کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا

وەرگێڕانی لە فارسییەوە
حەمە کەریم عارف

چاپی چوارەم

هەولێر ٢٠٠٧

ناوی کتێب : کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا

بابەت : مێژووی کورد

نووسەر : کریس کۆچێرا

وەرگێڕ : حەمە کەریم عارف

نۆبەتی چاپ : چ١- کتێبفرۆشی سۆران- هەولێر (٢٠٠٣)

چ٢- کتێبفرۆشی سۆران- هەولێر (٢٠٠٤)

چ٣- کتێبفرۆشی سۆران بەهاوبەشی لەگەڵ کتێبخانەی ئاوێر (٢٠٠٦)

چ٤- کتێبفرۆشی سۆران- هەولێر (٢٠٠٧)

ساڵی چاپ : ٢٠٠٧

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٦٢٢) ی ساڵی ٢٠٠٦ ی دراوەتێ

بەرهەمی رەنجی ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە :
دایکم ( رەحمە دەروێش کەریم )
باوکم ( عەبدولکەریم عارف )

(ع.ح)

## دەربارەی نووسەر
# Chris kuts chera

کریس کوچرا، نووسەرێکی فەرەنسییە، لە ساڵی ١٩٣٨ لە دایک بووە وڕۆژنامەنووسە. تا ئێستا چەندین ڕیپۆرتاژی سیاسی بە شەرێکی دەگەڵ ژنەکەیدا، کە وێنەگرە، لە بلاوکراوەکانی ناو فەرەنساو دەرێی فەرەنسادا بلاو کردۆتەوە. لەوانە: بیافرا ١٩٦٩، کەنداوی فارس ١٩٧٠-١٩٧٨، سودان ١٩٧١، کوردەکان ١٩٧١-١٩٧٥، شیلی ١٩٧٦ و فەلەستینییەکان ١٩٧٦-١٩٧٨.

ئەم کتێبەش (بزاڤی نەتەوەیی کورد) یەکێکە لە بەرهەمە دیارەکانی. کوچرا، وەکو گوتمان رۆژنامەنووسە نەک مێژوونووس، بۆیە خوێنەر نابێ ئەم کتێبە وەکو مێژوویەکی تەواو تەواو بخوێنێتەوە و چاوەڕوانی شیکردنەوە و لێکدانەوەی مێژوویی تەواوی لێ بکات. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کتێبە دڵپاکی و بە ویژدانی نووسەرەکەیەتی کە خۆی لە هەموو لایەنگرییەکی زۆرداران و سیاسەتی تایبەتی دوورەپەرێز گرتووە و بگرە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا، زیاتر هاودڵی و هاوسۆزی دەگەڵ زۆر لێکراواندا کردووە.

Dear Chris,
These Days I Have Translated Your Book - Le Mouvement National Kurd- From Persian To Kurdish. It Was Translated By Muhammed Rabbani Before But Not So Good. I Entend To Print It. So I Have To Ask You And If You Accept, Give Me O.k..
With My Best Wishes

Yours,
Hama Kareem Arif
27/5/2000
Fax: 00441628477322
[illegible]
Kurdistan-Arbil

OK
please keep something for me
Best wishes
Chris Kutschera

## وتەیەک...

١

ڕەنگە ئەگەر بڵێین چ شتێک لە دەرێی مێژوودا نیە، هیچ نەبێتە زێدەڕۆیی، بەڵکو خۆی لە خۆیدا ئاماژە بێت بۆ ڕۆڵی هەرە مەزنی مێژوو لەپێکهاتەی نەتەوەدا..

کە دەڵێین مێژوو، تەنیا ڕابردوومان مەبەست نییە، بەڵکو مەبەستمان ئێستاو داهاتووشە، ئەو زەمەنانە بە جۆرێ ئاوێتە بوون و لە حاڵی کارلێدکان، ئەگەر جیا کردنەوە و هەڵاوێرکردنیان مەحاڵ نەبێ، ئەوا یەکجار ئەستەمە، چونکە مێژوو پرۆسەیەکی بەردەوامە و لە گەشە کردن و گۆڕانی بەردەوامدایە و زیندوویەتی خۆی لە ڕووداو ودیاردە زیندووەکانی شوێن و زەمەنەکانەوە وەردەگرێ و تاریخیەتیان پێ دەبەخشێت.

٢

ئێمەی کورد هەر لە کۆنەوە نەهێڵراوە چاو بکەینەوە، سەرکوت و چاوترسێن کراوین، غەدری زۆر گەورەو خیانەتی نامرۆڤانەمان لێکراوە، ئەوەی ئەمە چ لە لایەن گەلانی داگیرکەرمانەوە بووبێ وچ لەلایەن ئیمپریالیستی ڕۆژهەڵاتی ورۆژاواییەوە بووبێ، ئەوەی چەندیشی خەتای خۆمان وبی توانایی خۆمان بووبێ لەبواری خوێندنەوەی واقیعبینانەی ئاراستەی هاوکێشە ڕامیاری و ئابووری و بەرژەوەندییە فرە لایەنە کۆک و ناکۆک و ناوچەیی و هەرێمایەتی و جیهانییەکان. بە قازانجی خۆمان و بە مەبەستی سیاسەتاندنی دۆزەکەمان.. ئێمە لە هەموو ئارامی و ئاسوودەییەک کە خۆی لە خۆیدا فاکتەرێکی هەرە گرنگی بەرهەمهێنانی شارستانیەتە وسەرەتای تەفاعولە دەگەڵ مێژوودا، مەحروم کراوین، بۆیە نەتەوەیەکی چەوساوەی هەرەشە لێکراوی وەکو کورد لەسەرێتی لە ڕابردووی خۆی بکەڕێ و بە ئێستاوەی گرێ بدات و بەپێی پێداویستییەکانی ئێستای بیخوێنێتەوە. ڕاستە مێژوو گەلان دروست دەکات و گەلان لەناو جەرگەی بونیادە مێژووییەکانەوە چێدەبن، لێ گەلانیش وەکو بوونی کۆمەڵایەتی زیندوو دەتوانن لە نوێژەن مێژوو دروست بکەنەوە وبە شێوەیەکی مرۆڤانە ئاراستەی بکەن.. پێویستە مێژوو بەهەردووباری ئاسۆیی و ئەستونیدا بخوێنینەوە وبیکەن بە فاکتەری هەرە کارای یەکخستنی نەتەوەکەمان. لەسەرمانە هەوڵی یەکخستنی مێژووی نەتەوەییمان بدەین و بیکەین بە زامنی یەکبوونی نەتەوەییمان و و ڕێگە لە پارچە پارچە کردنی سیاسی وئابووری و

کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری نەتەوەکەمان بگرێ کە ناحەزان ونەیارانی کورد، دیانەوێ ئەو پارچە پارچە کردنانە بە بەرنامە قوڵ بکەنەوە و لە کوردی بکەن بە ئەمری واقیع ولە گۆڕان نەهاتوو، بۆیە دەبێت هزر و زەین و ویژدانێکی مێژوویی لەلای رۆڵەکانی نەتەوەی کورد دروست بکرێ، رەنگە خوێندنی مێژووی کورد لە قۆناغەکانی خوێندنی قوتابخانەکاندا دەورێکی زۆر مەزن لەم رووەوە بدینێ. ئەوەی مایەی دڵخۆشییە ئەوەیە کە جەماوەری خەڵکی کوردستان، جەماوەرێکی یەکبوونخوازن، نەک تەقسیمخواز، واتە زۆربەی خەڵکی کوردەواری خەون بە دەوڵەتی یەکگرتووی کوردییەوە دەبینێ نەک بە ناوچەگەرێتییەوە، بۆیە منەوەران و رۆشنبیرانی کورد بەر لە هەر کەسێکی دی لەسەریانە هەوڵەکانی چەسپاندن وبە واقیعی کردنی ناوچەگەرێتی- جا بەهەر هەنجەت و بیانوویەک بێ- پوچەڵ بکەنەوە و بیسەلمێنن کە وابستەیی نەتەوەیی لە هەر وابستەییەکی دی بالاترە و تەنیا لە سایەی ئەو وا بەستەییەدایە کە هەر کارو کردەوەیەکی هەر گەل و میللەتێک تاریخەیت وەردەگرێ و دەرژێتە نێو روباری مێژووی مرۆڤایەتیەوە وبەمەش راستەوخۆ بەشداری لە تاودانی رەوڕەوەی مێژوو، و پرۆسەی بەرهەمهێنانی شارستانیەت دەکات.

٣

هەر لەو پێوداننگەی سەرێرا و وەکو خەمخۆرێک بۆ کتێبخانەی هەژاری کوردەواری چوومە ژێرباری قورسی وەرگێڕانی ئەم کتێبە (بزاڤی نەتەوەیی کورد) بە نرخەی کرێس کۆچیرای رۆژنامەنووسی دۆستی گەلی کورد، تا خوێنەرانمان بە زمانی زکماکی خۆیان مەسەلە ورووداو قەوماو و واریقاتەکانی پاژێکی سەدەی نۆزدە و تەواوێکی سەدەی بیستەم بخوێننەوە و بەخۆیان حەقیقەتەکان هەڵێنجن.

٤

گەلی برادەرینە، ئاشکرایە ئێمەی کورد کەمتر پەرژاوینەتە سەر ئەوەی سەربوردە و رووداو و هەوراز و نشێوەکانی خەباتی رەوای خۆمان بخەینە سەر کاغەز و ببێ بە تۆمارێک بۆ خۆمان و نەوەکانی ئایندەمان ومێژوومان ببێ بە چرای روونکردنەوەی رێگەی ئایندەمان. بۆیە لە زۆر قۆناغی مێژووی کوردا، کەهەر قۆناغێکی بۆخۆی کارەساتنامەیەکی دڵتەزێنە، بێگانان هاتوون ئەم کارەساتنامەیەیان تۆمار کردووە، جا ئەمانە تیایانا هەیە دڵسۆز و واقیع بێ و راستگۆ و دۆست و دۆستانە و تیایانیشدا هەیە

ڕێکبە پێچەوانەوە و لە تۆمار کردنی کارەساتنامەکەشدا غەدرێکی تریان لێکردووین، و بۆ مەبەستی خۆیان حەقیقەتەکانیان شێواندووە، بە هەر حاڵ بێگانە بێگانەیە و مەبەست و غەرەزی خۆی فەرامۆش ناکات. با خۆمان بە ئەقڵییەتێکی تەحلیلی و مەنتیقیانە خۆمان بخوێنینەوە و نەیەڵین گوڵمان لێ بکرێ و کڵاوانمان بکرێتە سەر، وەختی ئەوە هاتووە قۆڵی لێ هەڵماڵین و چاکی لێ بکەین بەلادا و بکەوینە تاقیب و سۆراغ و ساغکردنەوەی کارەساتنامەی خۆمان و هەرچی لەم بارەیەوە لەلایەن بێگانانەوە تۆمار کراوە بیکەین بە زمانی کوردی و چاکی و خراوی، دروست و نادروستی لێکدی هەڵاوێرین و تەتەڵەی بکەین و پوختە و حەقیقەت و جەوهەری کاری کارەساتنامەکەمان، کە لە جەوهەردا پرۆسەیەکی پێشکەوتنخوازی شۆڕشگێڕییە، بخەینە بەر دەست، تا لەوێندەرەوە بە دیدێکی رەخنەگرانەوە، مێژووی خۆمان بخوێنینەوە و دەرسی لێوەربگرین و بکەوینە سەر راستە رێگەی بیر کردنەوە و حاڵی بوون وتێگەیشتن، چونکە کە کەوتینە سەر ئەو رێگەیە ئیدی بەو ئاسانییە فریو نادرێین و لە خشتە نابرێین و رێگەمان لێنابەسترێتەوە و نابین بەقارەمانی ناو غەدرنامەکانی جیهان.

ئەم کتێبە ئەگەرچی لەلایەن بێگانەوە نووسراوە، بەڵام بە نەفەسێکی دۆستانە و بە شێوازێکی رۆژنامەوانی مێژوو نامێز نووسراوە و نووسەر پابەندی بیروراو بۆچوونەکانی خۆیەتی و ئەگەر لە هەندێ شوێندا پێچەوانەی بیروبۆچوونی ئێمەش بێ، ئەمە لە بایەخی مێژوویی و گەورەیی کارەکە و دەوڵەمەندی نێوەڕۆکی کتێبەکە کەم ناکاتەوە. جا با خوێنەری کوردیش خوێندنەوەی خۆی هەبێ و بە زمانی زکماکی خۆی مەسەلەکان بخوێنێتەوە وحەقیقەتەکان هەڵێنجێ. بەهەر حاڵ بەندە وەکو ئەمانەتی کاری وەرگێران، پابەندی نێوەرۆک و دەقی کتێبەکەبووم و ئەگەر لە هەندێ شوێن و بۆ هەندێ رووداو و لە مەڕ برێک بیروبۆچوونان پێویست بە پەراوێز و روونکردنەوە وراستکردنەوە و هەڵوەستە هەبووبێ.- کە هەیە- ئەوا خۆم لێی بواردووە و ئەم کارەم رووبەرووی خوێنەری شارەزا کردۆتەوە، با ئەوانیش بەباری سەرنج و تێبینی خۆیان بەشدارییەک لەم ئەرکە قورسەدا بکەن، کە بەندە تەنیا لە رووی خەمخۆرییەوە بۆ کتێبخانەی کوردەواری شانم داوەتە بەری.

له بندیری ئەم کتێبە و زۆر کتێبی دیبەوە ئەومان بۆ بە دیار دەکەوێ کە کورد نەتەوەیەکی رەسەن ر دێرینی ئەم دەڤەرەیە و هەموو بنەمایەکی مێژوویی و نەتەوەیی خۆی هەیە و هەر لەبەر ئەمەشە کە بەرگەی چەپۆکی رۆژگاری گرتووە و تا ئەمرۆکەش ناسنامەی نەتەوەیی خۆی بە هەر نرخێ بووە پاراستووە و دابەشکردنی بە ناهەقی کوردستان نەیتوانیوە بیسڕێتەوە. دابەشکردنی بەناهەقی کوردستان جۆرە سەنگەلاییەکی سیاسی لە ناوچەی رۆژهەلاتی ناڤیندا دروست کردووە، بۆیە تا مەسەلەی کورد وەکو دۆزێکی سیاسی چارەسەری رەوا نەکرێ- کە بریتییە لە دامەزراندنی دەولەتی کوردی- نە رۆژهەلاتی ناڤین هاوسەنگی سیاسی بەخۆوە دەبینێ و نە گەلانی ناوچەکە ئارامی و ئاسوودەیی بەخۆوە دەبینن، لەم سەرزەمینەدا سەدان دەولەت و دەلەتۆکە هەیە، چەندین دەولەتی ئەم دەڤەرە بەو شێوە و قالبەی ئێستایان لەسەر حیسابی دەولەتی کوردی دروست بوون، ئەگەر کوردان وەکو مافی رەوای خۆی ببێتەوە بە دەولەت نە دنیا ژێر و ژوور دەبێ، نە پردی سیراتێ دەپچڕێ، نەکابە کەج دەبێت و نە قیامەتیش رادەبێ، بەلکو بە پێچەوانەوە گیروگرفت و دلەراوکێی چەندین نەتەوەی رۆژهەلات چارەسەر دەبێ و هاوسەنگی سیاسی بۆ ناوچەی رۆژهەلاتی ناڤین دەگەرێتەوە.

بە هەر حال نامەوێ لەوەی پتر لەزەتی خوێندنەوە لە ئاشقانی حەقیقەت زەوت بکەم، فەرموون ئێوە و کتێبی (بزاڤی نەتەوەیی کورد) بە هیوام بەم کارە سووکە خزمەتێکم بە کتێبخانەی هەژاری کوردەواری کردبێ و گلەیی خوێنەری ئازیزم نەیەتە سەر.

تێبینی:

هەرچەندە ئەم کتێبە لە سالی ١٩٩٠ لەلایەن رێزدار مامۆستا محەمەد رەیانییەوە، بە ناوی «مێژووی سەدی نۆزدە و بیستی کورد» کراوە بە کوردی و چاپ و بلاو کراوەتەوە. بەلام بەندە چ سوودێکم لە وەرگێرانەکەی ئەو وەرنەگرتووە و ئاسایشە یەک بەرهەم لەلایەن چەند کەسێکەوە وەربگێردرێ، بەتایبەتی ئەگەر بەرهەمەکە بایەخدار بێ و بە ئاسانی دەستنەکەوێ.

حەمە کەریم عارف

هەولێر ٢٠٠٠/١/١

## ١
## میر بەدرخان شای کوردستان

«من شای وڵاتم، نەک سوڵتانی عوسمانلی- ئەگەر ئەو لەمن بە دەسەڵاتدارە؛
ئەوا من لەو شەریفترم»[1].

ئەم قسە دلێرانەیەی کە ئەجیب زادەیەکی کورد لە سەدەی هەڵدەدا، لە بەردەم ئێردەی پاشای فەرمانڕەوادا کردبووی لە ڕاستیدا کاکڵە و پوختەی دنیای زەین و هزرو بیرکردنەوە و کەلەکەڵەی سەربەخۆیی ئەشرافی کوردی زادەی فیوداڵزمی ئاسیای کۆنە. ئەشراف زادەیەک کە سەرۆکی قەڵایەک یان ئاغای دۆڵێکە و پاسای تایبەتی هەبووە لە ئێو داورودەستە و ماڵباتی خۆیدا و خۆی لە سوڵتانی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی ئاسیا بە شەریفتر زانیوە و سوڵتانی بە داگیرکەر زانیوە... و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی هەل و دەرفەت بووە تا هاوسەنگی هێز تێک بدات.

بەدرخان بەگ کە ئەوەو ئەتیرەی یەکێک لە کۆنترین ماڵباتی کوردستانەو لە ساڵی ١٨٢١ میری بۆتان بووە ئەم ڕێباز و ڕێچکەیەی گرتەبەر لە کێشەی فیوداڵیانەی نێوان میرانی کورد و سوڵتان دلو یەکەمین کەسە کە مەودای ڕەهەندی نەتەوەیی بەم کێشانە بەخشی و وەکو باوکی ناسیونالیزمی کورد لە مێژوودا جێی خۆی گرت.

ئەم میرە فیوداڵە گەورەیە، بەخۆی شان و شەوکەت و شایستەیی ئەم هەنگاوەی هەبوو: عەبایەکی سورمەچنی بە شانداددەدا مێزەرێکی گەورەی حەریری لەسەر دەناو دەستەسرێکی ئاوریشمی گەورەی یەک مەتری بەکار دێنا و شەل و شەپکی ئاوریشمی مۆقەلەمی سپی و ڕەشی لەبەر دەکرد و کەوشێکی نوک هەڵگەڕاوەی سوور پاژنە سووری لەپێ دەکرد. قەڵافەت و سیمایەکی شاهانەی هەبوو، گوندییانی کورد بە چاوی ڕێز و حورمەتەوە[2] وەکو پەیامبەری د دووەمە سەیریان دەکرد.

هەوڵی دەدا، دیاری گرانبەها بۆ مەلایان بنێرێ و یارمەتی هەموو ئەو موسڵمانانە بدات کە توانای کڕینی چەکیان نەبوو. پارەی تەواوی دەداتێ کە تفەنگ و قەڵغان و شمشێری پێ بکڕن.

هەژاران و بێنەوا، بێوەژن و نابینا و پەککەوتە بێ توانایان ناو بە ناو دەستە دەستە لە حەساری قەڵای دەرگوڵەی نزیکی جەزیرە گرد دەبوونەوە و ئەویش لەو کیسە زێڕەی

ئەنگستی بە دەست و دڵاوایی و هەرکەسە و بە ئەندازەی پێویستی خۆی یارمەتی وێدەدا و لە زەوقی رۆژێک دا بەهای ١٢٥ دۆلاری دەدانێ و کە بۆ ئەو رۆژگارە پارەیەکی مەزن بوو.[3]

بەدرخان، پیاوێکی دیندار و بە باوەڕ بوو. زۆر بە وردی پابەندی یاسا و ڕێسا و بنەماکانی ئاین بوو، بەپێی گوتەی ئەو مژدە بەرە مسیونێرە مەزهەب ئەمەریکاییانەی کە سەردانیان کردوە و دیتویانە نوێژی لە وەختی خۆیدا کردوە وەکو خۆی بە یەکێک لەو مژدەبەرانی گوتبوو پیاوێکی « سەر ڕاست و خاوەن پەیمانە بوو.

ئەو کەسانەی کە دیتویانە، ئەوە دووپات دەکەنەوە کە بیری ئیسلامی ڕۆڵێکی گەورەی لە بەهێز کردن و پتەو کردنی دەسەڵاتی ئەودا هەبووە، خۆ ئەو سەرۆک هۆزانەی کە کوێرایەڵی ئەو بوون، هەرگیز نەیانتوانیوە لە فەرمان و ڕێبازی ئەو لابدەن و دەیانگوت: «خوا ئەو دەسەڵاتەی داوەتێ، بۆیە پێمسووە گەر ئێمە هەوڵ بدەین ئەو دەسەڵاتەی لێ بسێنینەوە.»[4]

لێ میر بەدرخان دەیزانی چۆن لە بازنەی تەسکی تیرەگەری و تایفەگەری بێتەدەرێ و بۆ یەکەمین جار لە سەردەمی تازەدا، حکومەتی نەتەوەیی کورد دروست بکات هەر ئەمەشە کە ئەو لە میرێکی ئاسایی کورد جیا دەکاتەوە.

لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، ئەو هەنگاوە سەرەتاییانەی کە لەم بوارەدا ناونی، دیارو ئاشکرا نین و ئەنجامگیرییەکی بنبڕ لەمەڕ ئەو هەنگاوانە کارێکی ئاسان و سادە نیە.

میر بە خۆی لە ساڵی ١٨٤٦ دا بە میوانە ئەمەریکاییەکانی گوتبوو کە هەشت ساڵ لەوە پێش، واتە لە ساڵی ١٨٣٨ دا هێشتا میرێکی وێن دەسەڵاتە[5] و دەستەپاڵ و ئەنئاسراو بووە.

مەحمود پاشای میری کوردی سلێمانی، کە لە ساڵی ١٨٢٠ دا ماڵباتە گەورەکانی کوردی بۆ دیپلۆماتێکی ئینگلیزی سەرژمێری دەکرد، لە باسی ئەم بنەماڵەیەدا تەنیا ئاماژە بۆ وێران بوونی جەزیرەی پایتەختی میرنشینی بۆتان وله تێچوونی ئەم ماڵباتەی کە ڕۆژگارێک شکۆدار و پایەدار بووە، دەکات و چیتر نالێ.

بە پێی هەندێ سەرچاوە، بەدرخان تا ماوەیەک لە سایەی میر سەیفەدینی میراتگری میرنشینی بۆتاندا حوکمڕانی دەکرد، ئەو میر سەیفەدینە کە یەزدانشێری کوڕی خۆی، بەرلەوەی بکاتە پایەی جێنشینی ئەو، حەپس کرد بوو.[6]

بەڵام میربەدرخان کە لە ساڵی ۸۲۱ وە دەسەڵاتی گرتبووە دەست، لە ساڵانی ۱۸۲۸-۱۸۲۹دا هێندە هێزو توانا پەیدا دەکات کە چیتر سوارە و تفەنگچی بە حکومەتی عوسمانی نەدات و هەوڵبدات سەران و گەورە پیاوانی کورد، بەتایبەتی هاوسێکانی خۆی، واتە مەحمودخانی میری وان و نوروڵلابەگی هەکاری قەناعەت پێ بکات کە سەربەخۆیی کوردستان کارێکی پێویستە.

میربەدرخان، پاش ئەوەی لە ساڵانی ۱۸۳٦-۱۸۳۸ دا بە زەحمەت بەربەرچی هێرشێکی عوسمانیان دەداتەوە، لە ساڵی ۱۸۳۹ دا پەیمانێک دەگەڵ سوڵتاندادەبەستێت. چەند هەفتەیەک دوای ئەوە لەشکری ئیبراهیم پاشای میسر، لەشکری سوڵتان راودەنێ. شکستی نیزیب « Nisib شارۆچکەیەکی پارێزگای گازی ئانتێپ-» واتە شکستی شەڕی ۲۳- ۱۸۳۹/٦/۲٤ بۆ کوردەکان، کە جگە لە بیری تۆڵەسەندن لە عوسمانیان چ شتێکی دیکەیان لە کەڵلەدا نەبوو، خۆی لە خۆیدا نیشانەی شۆڕشێکی سەرتاسەرییە. دوای ٥ ساڵی دی، واتە لە ۱۸٤٤-۱۸٤٦ بەدرخان دەگاتە لوتکەی پایەو دەسەڵاتی خۆی، سکەی خۆی لێ دەدا، لە نوێژی هەینی دا بە ناوی ئەوەوە خوتبە دەدرێ، لەم سەروبەندەدا دەسەڵاتی لە رۆژهەڵاتەوە، دەگاتە ئەو دیوی سەرزی ئێران و لە رۆژئاواوە دەگاتە ناو دۆڵی دووڕووبار و لە دەروازەکانی دیاربەکرەوە تا دەروازەکانی موسڵ دەگرێتەوە و سەروەت و سامانی لە حیساب دەردەچێت.

مەخابن، شتێکی ئەوتۆ لەمەڕ شێوەی بەڕێوەبردنی کوردستان لەم سەردەمە کورت خایەنەی حکومەتەکەی ئەو نازانین، لێ گومان لەوە دا نیە کە چەتەیی و ڕێگری بە تەواوەتی بنبڕ بوو، ئەمن و ئاسایش باڵی بەسەر هەموو کوردستاندا کێشا بوو- ڕێبواران و گەشتیارانی ئەورووپایی ئەو سەروبەندە، شایەتی ئەو حاڵەن.

دوو ئەمەریکایی سەر بە شاندی مژدەبەری، بەناوی ئێم ئێم رایت، بریث کە بەدرخان بۆ «دەرگۆڵە»ی دەعوەت کردوون، لە ساڵی ۱۸٤٦ دا بۆ ماوەی ۲۳ رۆژ بە پێیان هەموو کوردستان لە ورمێوە بیگرە تا جەزیرەی ئیبن عومەر دەگەڕێن بێ ئەوەی کەمترین کۆسپ و دژوارییان بێتەرێ و بە جولەمێرگ و سەرچاوەکانی ڕوباری خابور و زۆر ناوچەی سەخت و سامناکی کوردستاندا تێدەپەڕن.

یەکێک لە فەرمانبەرانی کۆنسوڵیەتی فەرەنسا کە لە ساڵی ۱۸٤٥ دا بە بۆتاندا رەت بووە و باسی ئەو جیاوازیە سەیرەی کردووە کە لە نێوان ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی

حکومەتی تورکان و قەڵەمڕەوی میرەبەدرخاندا بەدی کردووە: «پاش بڕینی نزیکەی پەنجا فەرسەخ لە دیاربەکرەوە بۆ دیجلە شۆڕ دەبیەوە یەکسەر سەرت لە گۆڕانی دیمەنی ناوچەکە سوڕ دەمێنێ، کێڵگە و مەزراکان، ڕێک و پێکترن، خانوو دیهات باشترن، وا بە دیار دەکەوێ کە ژیانیان باشترە. ئەمە قەڵەمڕەوی بەدرخانە. ... ٢٥٠٠٠ پیاستر (Piastre) ( ناوی جۆرە دراوێکە) باج بە دەرباری عوسمانی دەدات. بە چاکی قەڵەمڕەوەکەی بەڕێوە دەبات. میرێکی بە زەبرە بەڵام دادپەروەرە، ئاسایشی تەواو باڵی بەسەر قەڵەم ڕەوەکەیدا کێشاوە. خۆشگوزەرانی و بەختەوەریەکی، ئەوتۆ لە قەڵەمڕەوەکەیدا بەدی دەکرێ، کە مەحاڵە لە قەڵەمڕەوی سایەی حکومەتی تورکاندا شتی وەهات بەرچاو بکەوێ.»[٧]

بەدرخان، پیاوێکی سەربەرز و بەهۆش و دلێرە، لە هەموو میرە کوردەکانی سەردەمی خۆی دیارترو لەبەرچاوتر و لە پێشترە، بەداخەوە ئەو مژدەبەرە دیانانەی کە بۆ ماوەیەکی کەم هەڵسوکەوتیان دەگەڵیدا هەبووە، لەوانە دکتۆر رایت و بریث کە پتر لە چوار هەفتە دەگەڵی بوون، لەبەر ئەوەی پەروٚشی چارەنووسی دیانانی کوردستان بوون، چ شتێکیان لەمەڕ پەیوەندییەکانی میر دەگەڵ سوڵتانی عوسمانلی و ئەو بەرنامە و نەخشانەی بۆ کوردستان هەیبوون، نەپرسیوە.

لە ساڵی ١٨٤٦ دا میر بەدرخان کە پێشتر واتە لە ساڵی ١٨٤٣ ناوچە و دەڤەرە دیان نشینەکانی داگیر کردبوو، هێرشی دووەمی کردە سەر نەستورییەکان و ناکامێکی زۆر خراپی بۆ بەدرخان لێکەوتەوە: سوڵتانی عوسمانی، لە ئەنجامی نارەزایی توندی پاریس و لەندەن دا، لەشکرێکی ناردە سەری. میر کە خۆی لە قەڵاکەی خۆیدا لە ئیبروح Evroh، قایم کردبوو، لە تابی ١٨٤٧ دا خۆی تەسلیم بە عوسمان پاشا کرد و نەفی کرا بۆ شاری کاندیای Candia دوورگەی کریت، پاشان نەفی دیمەشقیان کرد و لە ساڵی ١٨٦٨ یان ١٨٧٠ دا لە دیمەشق وەفاتی کرد.[٨]

هەڵبەتە مێژوونووسان رای جیاوازیان لەمەڕ بەدرخان هەبووە: ئەو کوشتارەی دەرهەق بە دیانانی کرد، رۆڵی ئەوی لەبەر چاوی مێژوونووسانی وەکو نیکیتین کەم کردووەتەوە، نیکیتین پێی وایە « ئەوانەی پاش بەدرخان» نەخش و رۆڵی ئەوەیان بەرجەستەتر کردوە لەوەی کە هەبووە.

لەلایەکی ترەوە مێژوونووسانی واقیعبین تری (وەکو نیگلتن) پێیان وایە کە بەدرخان

کوردێکی ناسیونالیست بووە، لە هەمان کاتیش دا پێیان وایە کە ئامانج و مەبەستەکانی هەرگیز روون و ئاشکرا نابێ و نەبووە.

بەلام لە روانگەی گەلێک لەو کوردانەی کە ئەورۆ لە حیزبانی پێشکەوتوخواز دا کار دەکەن، بەدرخان تەنێ دەرەبەگێکی گەورە بووە و هیچی دی. وێرای ئەمانەش میربەدرخان بێ چەندوچون یەکێکە لە فارەمانانی سەربەخۆیی کوردی سەدەی نۆزدە: بەدرخان جیاوازیەکی گەورەی لە هەموو ئەوانەی پاش خۆی هەیە: لە رۆژانی ئەفسانەییدا ئەو تاقە کوردێکە کە بە هەموو کورتی تەمەنی حکومەتەکەیەوە، توانی دەسەلاتی خۆی بەسەر هەموو کوردستاندا واتە لە کوردستانی ئیرانەوە تا دیجلە بسەپێنێ.

دەسەلات و هەستی دادپەروەری و پلەو پایەی کۆمەلایەتی ئەو پیاوە بەرادەییەک بوو کە هەشت سال لەوە دواتر، کوران و نەوە و نەتیرەکانی کە بە خۆیان سەنگ و بایەخێکی ئەوتۆیان نەبوو، سوودیان لە ناووناوبانگی ئەو وەردەگرت بۆ خڕ کردنەوەی دێهاتییان و پیاو ماقولانی کورد لە دەوری خۆیان بە ناوی سەربەخۆیی کوردستان.

میر بەدرخان یەکەمین کورد بوو، کە رووبەرووی مامەلە ورەفتار و ئەتواری ئەوروپاییەکان سەبارەت بە کورد بووەوە: یەکەمین پشت گوێ خستن ئەگەر نەلێین دژمنایەتی، لە رێگەی نەستوری و ئەرمەنیەکانەوە بوو، پاشان بە هۆی ئەوتەوە بوو!

بەدرخان بەو هەموو توانا و شەوکەتەیەوە» دەبوایە سەرنەکەوێ، چونکە تا سەرنەرۆیی و خۆی تەسلیم بە دەسەلاتێک کرد کە ئومێدی هیچی لێنەدەکرا.

ویلیام ئیگلتن ی نووسەری مێژووی کۆماری مەهاباد، رای وایە کە سەد سال دواتر قازی محەممەدی سەرۆکی کۆماری تەمەن کورت و بچکۆلەی مەهاباد، هەمان کاری ئەوی دووبارە کردەوەو مەخابن لە سالی ١٩٧٥ شدا مەلا مستەفا بارزانی هەمان شتی بەسەر هات.

## ٢
## شێخ عوبەیدوڵلای شەمدینان

پاش تەسلیم بوونی سەرانی کورد، واتە ئەوانەی کە دەگەڵ م . بەدرخاندا نەفی کران، کۆمەڵی کوردەواری لە راستیدا بە «بێ سەر» مابوە و ئەدانانی حاکمی تورک لە جێی سەرانی میراتگری کورد و نە هەوڵدانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەپاندنی دەزگایەکی نیداری ' ستەوخۆ، نەیان توانی ئەو بۆشاییە گەورەیە پڕ بکەنەوە کە لە ئەنجامی هەرەسهێنانی فیودالزمی کوردەوە هاتبووە ئاراوە.

سەردەمێکی پڕ لە هەراو هەنگامە و پاشاگەردانی شوێنی ئەو سەردەمە رێک و پێکەی گرتەوە کە کوردستانی سەردەمی حکومەتی بەدرخان بە خۆیەوە دیتبوو.

پاشان، لە نێو کۆمەڵی پاشکەوتووی دێهاتییان دا تاقمێکی تازە لە «رێبەران» پەیدا دەبن، ئەمانە «شێخان» واتە سەرانی مەزهەبی و ئایینی بوون، کە بە حوکمی دەسەلاتیان لە نێو جەماوەری خەڵکی کوردا، بوون بە جێنشینی مەرو رێبەرە دنیاییەکان، خەڵکانی سەر بەم تاقمە لە نیو سەدەی دواتردا رۆڵێکی سیاسی گرنگ دەبینن.

شێخانی شەمزینان « یان شەمدینان» کە پێیان وایە سەرەجەڵیان دەچێتەوە سەر شێخ عەبدولقادری گەیلانیی (١٠٧٨-١١٦٦) دامەزرێنەری تەریقەتی قادری.

شێخ عبیداللە کە ماوەیەک بەر لە ١٨٣٠ لە دایک بوو بوو، سەروەت و سامانی زۆر و ناو و ناوبانگی گەورەی لە پێشینانییەوە بە میرات بۆ مابۆوە و هەر زوو دەری خست کە « لەوان زیاتر پابەندی ئەم دنیای دونیەیە، و حەز دەکات لە پاڵ دەسەلات و پایە روحانی و ئایینی یەکەیەوە، سەرۆکی دنیایەیش بێ.»[٩]

لەشەڕی سالانی ١٨٧٧-١٨٧٨ی نێوان روس و عوسمانیاندا، شێخ عبیداللە بە سەرۆکایەتی گروپێکی بچکۆڵەی کورد، بە شداری ئەو شەڕەی کرد و زۆر بە خرابی لەبەردەم روسەکاندا شکاو[١٠] بە دەستی بە تاڵ بۆ ماڵ گەرایەوە، بەلام لەگەڵ ئەم شکستەشداو هەر بەزوویی وەکو «سەرۆکی میللەتی کورد» ناسراو نێوبانگی دەرکرد.[١١]

شێخ عبیداللە، پیاوێکی سادەو قانع و دادپەروەر و خواناس و زۆر بە دین بوو، یەکجار پەرۆشی خۆشگوزەرانی خەڵکی کورد بوو، هەموو ئەم ئاکارانەی کردبوویانە کارێک کە هاوولاتیانی خۆی بەرێزەوە تەماشای بکەن و بەو کەسەی بزانن کە خوا بۆی ناردوون.

هەڵبەتە هەموو دەزانین کە لە ئەنجامی دوا شەڕی نێوان رووس و عوسمانی دا قات و قڕی

و گرانی و ویرانیەکی بێ وێنە ڕووی کردە وڵات و باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشی گرتەوە ووەزع و حاڵی خەڵکەکە زۆر خراپ بوو، شێخ هەرچی لە توانایدا بوو دریغی نەکرد و بەراستی وەکو نێردەی خوا فریای لیقەوماوانی میللەتی خۆی کەوت.

ئەو بە خۆی لەو باوەڕە دابوو. هیچ هەڵەرکێیکی قەبوڵ نەدەکرد، تەنانەت لە ناوچە دوورەکانی وەکو بارزانیش دا.

**شێخ عبیداللە کە پیاوێکی یەکجار نەتەوە پەروەر بوو، باوەڕی وابوو کە تاقە دەرمانی ڕزگارکردنی خەڵکی کورد، دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆیە کە کوردستانی ئێران و تورکیا لە خۆیدا کۆ بکاتەوە و یەکیخات.**

**لە یەکەمین بەیاننامەی نوسراوی ناسیونالزمی کورد دا، شێخ عبیداللە بە یەکێک لە نوێنەرانی هێزە ڕۆژئاواییەکان، کە دۆستایەتی لە گەڵیدا هەبووە، دەڵێ: «میران و سەرانی کوردستان، چ لە تورکیا و چ لە ئێران و چ لە کوردستان، هەر هەموو ڕایان وایە کە ناکرێ بەمجۆرە لەگەڵ ئەم دوو حکومەتەدا هەڵبکرێ، دەبێ کارێک بکرێ کە دەوڵەتانی ئەورووپایی لە دۆزەکە ئاگادار بن و لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەن. خەڵکی کورد نەتەوەیەکی جیایە، ئێمە دەمانەوێ کاروباری خۆمان لە دەستی خۆماندا بێ»**[١٢]

**شێخ عبیداللە بەم بەیاننامەیە دەبێت بە یەکێک لە دامەزرێنەرانی ناسیونالزمی کوردی،** بەلام ئەو دوو شۆڕشەی کە لە سالانی ١٨٧٩-١٨٨٠ دا لە بادینان **Badinan** و ئێران بەرپای کردن، تەنێ دوو شۆڕشی کورتخایەن بوون و هیچی دی، بەتایبەتی لەشکرکێشییەکەی بۆ سەر ئێران هیچ مایەی سەربەرزی نەبوو، ئەوە بوو میاندواوی تالان کرد و بەم کارە جارێکی دی بۆ دژمنانی کوردی سەلماند کە کوردان «نازانن شەڕی نیزامی و ڕێک و پێک بکەن، لە کۆمەڵە تالانچییەک بەولاوە چیترنین» و هێرش بۆ سەر ئێران بووە مایەی ئەوەی هێزە ئەورووپاییەکان، بەتایبەتی بەریتانیای مەزن و فەرەنسە خۆ لە کاروباری عوسمانی هەڵقورتێنن.

ئەم هێرش و لەشکرکێشیە بووە هۆی ئەوەی کە ئەمەریکا بە ڕەسمی دان بە ئێراندا بنێ و لە سالی ١٨٨٢ نوێنەری سیاسی بۆ دەوڵەتی نێوبراو بنێرێ تا دڵنیای بکات کە پارێزگاری لە هاوولاتییانی خۆی دەکات.[١٣] ئەمە یەکەمین نیشانەی حەزی ئەمەریکا بوو بۆ پەیوەندی دەگەڵ ئێراندا و کە لە ئایندەدا سات بە سات زیادی کرد! چل سال پاش مردنی شێخ عبیداللە کە لە ئۆکتۆبەری سالی ١٨٨٣ دا لە مەکە و بە نەفی کراوی مرد، شێخ عەبدولقادری کوڕی و سەید تەهای نەوەی لە سایەی بەرەکەتی شۆڕەت و پایە و دەسەلاتی ئەوەوە ڕۆڵێکی گرنگیان لە کاروباری کوردستاندا بینی.

٣

## دامەزراندنی کۆمەڵە و یانە کوردییەکان

لەم سەردەمەدا، واتە لە رۆژانی هەوەڵی سەدەی بیستەمدا و پاش نیو سەدە لە شۆڕشی پەراگەندە، ئەوجا «چینێکی ناوەراست» لە کوردستاندا سەر هەڵدەدات و پەیدا دەبێت، ئەمانە لە راستیدا بریتی بوون لە بورژوایانی گەورە و پاشماوەی میرانی مێژوویی لێکەوتوو.

رێبەرانی تازە « بورژوایان» کە بێهودەیی ئەم شۆڕشانە دەبینن، پەی بەزەروورەتی رێکخستنی کورد دەبەن و لە ساڵی ١٩٠٨ دا یەکەمین رێکخراوی سیاسی کوردی دادەمەزرێنن.

مەدحەت بەگ بەدرخان لە ساڵی ١٨٨٧ دا یەکەمین گۆڤاری کوردی بە نێوی کوردستان لە قاهیرە، دامەزراندبوو (تێبینی: مقداد مەدحەت بەدرخان لەساڵی ١٨٩٨دا یەکەمین رۆژنامەی کوردی لە قاهیرە دامەزراند. نەک یەکەمین گۆڤاری کوردی. - وەرگێڕی کوردی-) ئەم بڵاوکراوەیە زۆر بە توندی رەخنەی لە سیاسەتی عوسمانی لە کوردستاندا دەگرت. پاش ماوەیەکی کەم عەبدولرەحمان بەدرخانی برای جێی ئەوی گرتەوە و گۆڤارەکەی لە جنیڤ و پاشان لە فولکستۆن ی خوارووی رۆژهەڵاتی ئینگلستان لە ساڵی ١٩٠٢ بڵاو کردەوە. لە گەرمەی یەکەم جەنگی جیهانیدا، سورەیا بەدرخانی کوڕی میر ئەمین عالی بەدرخان، جارێکی دی گۆڤارەکە لە قاهیرە دەردەکاتەوە.

هەر لە هەمان سەروبەندا، واتە لە ساڵی ١٨٩٨ دا لە تورکیادا حیزبێکی سیاسی تازە بە نێوی « کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی» لەلایەن چوار کەسی چالاکەوە دادەمەزرێ کە دوانیان کورد دەبن بە نێوی ئیسحاق سکوتی و عبدالله جەودەت.[١٤]

شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ عبیدالله یەکێک دەبێت لەو خەڵکانەی کە نارمانجی تازە و ریفورمیستانەی « کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی» سەرنجیان رادەکێشێت و پەیوەندی پێوە دەکەن و شێخ عەبدولقادر لە ساڵی ١٨٩٦ دا بەشداری دەسیسەیەک دەکات دژی سوڵتان عبدالحمید.

دوو کەسایەتی نێوداری دیکە، واتە عەبدولرەحمان بەدرخان و حیکمەت بابان لە ساڵی ١٩٠٢ دا لە یەکەمین کۆنگرەی « کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی» دا لە پاریس بەشداری دەکەن. سەیر ئەوەیە کە ناسیونالیستانی کورد وتورک نزیکەی دەساڵێک پێکەوە لە یەک

ڕێکخراوی سیاسیدا کار دەکەن، ئەم هاوکاری و پێکەوە کارکردنە تا سەرهەڵدان و پەیدا بوونی بزاڤی «تورکانی جەوان» لە ساڵی ١٩٠٨ دا بەردەوام دەبێت.

یەکێک لە هەنگاوەکانی شۆڕشگێڕان بریتی بوو لە گەڕاندنەوەی مەشروتیەتی لیبراڵی ساڵی ١٨٧٦: ئەم سەروبەندە سەردەمی هەرە خۆش و بە ڕەونەقی «کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی» و هەموو بزاڤە ناسیونالیزمیەکانی تورکیایە. ئیدی ناودارانی کورد ڕێگەی گەڕانەوەیان بۆ قەستەنتەنیە پێ دەدرێ و هەر لەوێندەر یەکەمین ڕێکخراوی سیاسی کورد دادەمەزرێنن.

ئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری شەمدینان و شەریف پاشا و ئەحمەد زولفیق پاشا، لە ساڵی ١٩٠٨ دا « کۆمەڵەی تەعالی و تەرەقی کوردستان» و کۆمەڵەیەکی تری هەندێ جەماوەری تر بە ناوی «کۆمەڵەی بڵاڤکردنی مەعاریفی کوردی» دادەمەزرێنن و قوتابخانەیەکی کوردی لە گەڕەکی چەنبرلی تاشی ئەستەموڵ دەکەنەوە.

لە پاییزی ساڵی ١٩٠٨ دا یانەی ئەمین عالی بەدرخان گۆڤاری « تەعاون و تەرەقی کورد» بڵاو دەکاتەوە و گوتار و نووسینی ئیسماعیل حەقی بابان زادە و سەعید کوردی و عەبدولقادر شەمدینانی تێدا بڵاو دەکاتەوە. ئەم گۆڤارە بە تایبەتی هەندێ بابەت دەربارەی زەرورەتی زمانی ستانداردی کوردی بڵاو دەکاتەوە کە بە کلیلی فێربوون و بەشارستانی بوونی دەزانێ و هەروەها تەکید لەسەر گرنگی و دەوڵەمەندی فولکلۆر وەکو ئەدەبیاتی ڕاستەقینە و نەنووسراو دەکات.

ڕێبەر و سەرانی کورد لە هەندێ گوتاری سیاسەت ئامێزدا، بە پارێزەوە ئەوە ڕادەگەیەنن کە فێربوون و خوێندنی تورکی بۆ منداڵانی کورد وەخت بە فیڕۆ دانە و پێشنیازی دامەزراندنی هێزێکی کورد لە لەشکرانی عەشایەری دەکات. بەڵام بەپارێزەوە و لە ژێر پەردەوە ئەوە دەدرکێنن.

کۆمەڵێک یانەی دیکەی کوردی لە بەغداو موسڵ و دیاربەکریش دەکرێنەوە.

بەڵام سەیر ئەوەیە کە قەستەنتەنیە هەر وەکو جاران بە بنکەی قەومیەتی کورد دەمێنێتەوە. ژمارەی کوردی قەستەنتەنیە لە چاو خەڵکی دیکەدا، یەکجار کەمە: نزیکەی ٣٠٠٠٠ کەسن و زۆربەیان زۆر دەست کورت و هەژارن و زۆریان ناوکێش و حەماڵ و ئەو جۆرە خەڵکەن.

لێ زۆربەی هەرە زۆری میرانی « لێنخراوی» کورد کە توانی بوویان لە وڵاتی میسر و

کـریت بگەڕینەوە، ناچار کـرابوون لەم شـارەدا و لە ژێر چاودێری دا نیشـتـەجێ بن و توێژێکی « هەڵبژاردە» و بە دەسـەڵاتیـان پێک دەهێنا و لە خـەڵکی خۆیان دابڕابوون و بەناچاری کەم و زۆر بوو بوون بە نیمچە تورک.

## ٤
## ماڵباتی بەدرخان

جا لەنێو ئەم توێژە هەڵبژاردەیەدا، نەوەکانی میر بەدرخان جێیەکی گرنگیان گرتبوو، کەس تا ئێستا بە تەواوی ژمارەی فەرزەندانی ئەم میرە نازانێ، بە قسـەی میـجەر نۆئیل ٩٠ کـوڕی هەبووە. بە قسـەی تراترکنسـول چل کـوڕ و ١٤ کـیـژی هەبووەو بە گـوتەی ئەلفنتۆنیش ٦٥ کوڕی هەبووە.

میـر کـامـەران بەدرخـانی نەوەی « پاشـای کـوردسـتـان» زۆر جـار دەیگوت: «دەڵێن باوەگەورەم ٩٩ منداڵی هەبووە. ئەوەی ئاشکرایە کە مرد ٢١ کوڕ و ٢١ کیژی لە ژیاندا بوون. من بە خۆم ١٥-١٦ مام و پوری خۆم دەناسین.»[15]

بە هەر حاڵ ژمارەیەک لە نەوەکانی میر بەدرخان لە بزاڤی نەتەوەیی کوردا بەشداریان کردووە و کەم و زۆر دەوری گرنگیان گێڕاوە.

**کوڕەکان:**

- عوسـمـان و حوسـێن «ڕێبـەرایەتی شـۆڕشی سـاڵی ١٨٧٩ یان کردووە» حوسێن لە ئەنجامدا لە سـاڵی ١٩١٠ ئیعدام کرا.
- مـەدحـەت بەگ دامـەزرێنەری ڕۆژنامـەی کـوردسـتـان (ڕێبـەرایەتی شـۆڕشی سـاڵی ١٨٨٩ ی کرد).
- کـامیل بەدرخـان ، پەیمانێـکی دەگەڵ ڕوسـەکاندا بەست. لە سـاڵی ١٩١٧ لەلایەن ڕوسـەکانەوە کرا بە حاکمی ئەرزڕوم، پاش ئەوە چووە تەفلیس و لەوێندەر ژیا.
- خەلیل، بۆ حاکمی مەلاتیە پاڵێورا.
- حەسەن بەدرخـان، لەهەڵبژاردنەکانی سـاڵی ١٩١٠ دا وەکو نوێنەری کـوردسـتـان بۆ ئەندامـەتی پەرلەمـان پاڵێورا و لە گـەڵ حسێنی برای دا بە نوێنەر هەڵبژێردرا، لێ دوای شـەش مـانگ پاش ئەوەی حـسینی برای تەوقیف کرا، خۆی شاردەوە و سـەرەنجام دەسـتگیر کراو لە زندان دا بەدرەفتاری زۆری لەگەڵ دا کرا، کە لە زیندان ئازاد بوو، نەخۆش بوو.

- عەبدولرەحمان، لە پاش مەدحەت بوو بە سەرنووسەری کوردستان.

- بەحری، هاوکاری دەگەڵ شێخ عەبدولقادر دا کرد.

- ئەمین عـالی ( ١٨٥١ - ١٩٢٦) پارێزەر بوو، یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی یانەی کورد لە ساڵی ١٩٠٨دا.

**نەوەکان:**

- عبدولرەزاق، کوڕی نەجیب پاشای کوڕی میر بەدرخان بوو، لە شەڕێکی شەخسی دا، فەرمانداری قەستەنتەنییەی کوشت و لەگەڵ هەموو خێزانەکەیدا نەفی کراو پەنای بردە بەر روسیا و لەوێ بوو بە پەردەداری دەرباری تزار. لە ساڵی ١٩١٨ دا لە موسڵ کوژرا.

**- کوڕانی ئەمین عالی:**

- سورەیا ١٨٨٣- ١٩٣٨

- جەلادەت ١٨٩٣-١٩٥١

- کامەران ١٨٩٥- ١٩٧٨

ئەم بەدرخانیـانە و پاشـماوەکـانی مـیرانی سـۆران و بابان و نەوە و نەتیـرەی شێخ عـوبەیدوڵلا - عـەبدولقادر و تەها-ی شەمدینان - دوو جەنەراڵی کورد نەژاد بە نێـوی شەریف پاشا و لوتفی پاشا و چەند کەسێکی دیکەی پیاو ماقوڵان و سەرانی دیارەکو، هەموو پێکەوە بناغەی رابەرانی ناسیونالیستی کورد پێک دەهێنن و پاش ماوەیەک هێزە گەورەکان سەرو ساخت لەگەڵ ئەمانەدا پەیدا دەکەن.

لە سەرەتاکـانی سـاڵی ١٩٠٩ دا لایەنگرانی سـوڵتـان دژە شـۆڕشێـک ئەنجام دەدەن و سـەرانی کـوردی مـیللی بەشـداری تێـدا دەکـەن. لێ ئەم دژە شـۆڕشـە لەلایەن «تورکـانی جـەوان» ەوە سـەرکـوت دەکـرێت، ئیـدی رێبـەرانی « کـۆمـەڵەی ئیـتـحـاد و تەرەقی» لە بەڵێنەکانی خۆیان ژیوان دەبنەوە و دەست بە «تورکاندنی کوردەکان دەکەن و هەموو یانەو کۆمەڵە و رۆژنامە و گۆڤار و قوتابخانە کوردییەکان دادەخەن.

ئەمین عـالی بەدرخـان و شـەریف پاشـا حـوکـمی ئیـعـدام دەدرێن، لێ هەڵدێن، سـورەیا بەدرخـان کـە لە قـاهیـرە گەڕابۆوە و خـەریکی دەرکـردنی رۆژنامـەی کـوردسـتـان بوو، بە ناچاری و جارەکی دی وڵات بەجێ دەهێڵێ.

لە ساڵی ١٩١٠ دا، دوو خوێندکاری قوتابخانەی کشتوکاڵی هالکالی، بە نێوی خەلیل

خەیاڵی خەڵکی مۆتکی ئۆمەر و خدر بەگی جەمال پاشازادە، بەهاوکاری فوئادی تەمۆی خەڵکی وان وزەکی ئەفەندی خەڵکی دیاربەکر ئەنجومەنێکی خوێندکاری « پێشکەوتوتر» لە ئەنجومەنەکانی پێشوو دادەمەزرێنن و ناوی دەنێن هیڤی. ئەم ئەنجومەنە کە لە موسڵ دا بە «هیوا» ناسراوە و تا سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەم بەردەوام دەبێت، دەتوانێ گۆڤارێک بە نێوی (رۆژی کورد) دەربکات.

هەروەها گۆڤاری سێیەم بە نێوی «ژین» لەلایەن مەمدوح سەلیم (سکرتێری گشتی نایندەی ئەنجومەنی کورد) و کەمال فەوزی بەگ ( کە لە ساڵی ١٩٢٥ دا لە دیاربەکر ئیعدام کرا) و هەمزە ئەفەندی یەوە بڵاو دەکرێتەوە.

لە ساڵی ١٩١٢ دا هەولێک دەدرێ کە « تورکانی جەولن» و ناسیونالیستانی کورد ئاشت بکرێنەوە. هەر دوای ئەم هەوڵە هەندێ هەراو ئاژاوە لە هۆتان دا روو دەدات کە لە ئاکامدا سلیمان بەدرخان بەدەستی پۆلیس دەکوژرێ.

پاشان لەساڵی ١٩١٣ دا لە ئاکامی دکتاتوریەتی ئەنوەر پاشادا، بەینی «تورکانی جەولن» و ناسیونالیستانی کورد بە تەولوەتی تێک دەچێت. ساڵی دواتر جەنگی جیهانی یەکەم هەڵدەگیرسێت و کوردەکان بەگەڵ عوسمانیان دەکەون و دژی هاوپەیانان دەجەنگن و بەشێک لە کوردستان لەلایەن هێزەکانی بەریتانیاو فەرەنساوە داگیر دەکرێ.

سەرکەوتنی هاوپەیانان ساتێکی بێ وێنە بەڵام نە زۆر شانازی ئامێز، لە مێژووی کوردا پێشان دەدا: بۆ یەکەمجار رێبەرانی کورد راستەوخۆ کاری دیپلۆماسی دەجەرێنن و دەچنە نێو دنیای دیلوماسیەتەوە: ئیمپراتوریەتی عوسمانی ژێر کەوتووەو مەحکوم بە داب‌ەش کردنە. و وا بە دیار دەکەوێ کە بە یەکجارەکی ورد و خاش بووە، رێبەرانی کورد دەرفەتیان دەدرێتێ لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس دا، دەنگی خۆیان بە دنیا بگەیەنن و لە هەمان کاتدا دەتوانن لە قەستەنتەنییە دا نوێنەرانی هێزە گەورەکان بدوێنن.

« کوردستان» هێشتا بوونی نیە، لێ نوێنەرانی کورد کەم و زۆر هەن و لە باری سیاسیەوە حەساویان بۆ دەکرێ. بە پێی بەڵێنەکانی سەرۆک ویلسن و بە گوێرەی بەیاننامە یەک لە دوای یەکەکانی ئینگلیز و فەرەنسا وەختی ئەوە هاتووە کە کورد «ئازادی تەواوی خۆی هەبێ» واتە ئەو زەمانە هاتووە کە بتوانن « لە رێگەی ریفراندۆم و هەڵبژاردنی ئازادانەی خەڵکی کوردەوە دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان » دابمەزرێنن.

بەڵام ئەم ئومێد و چاوەروانیە گەوردیە، زوو کاڵ دەبێتەوە: سەربەخۆیی کوردستان،

بەرلەوەی بە دروستی بکەوێتە بەرچاو، لە نێو تەم و مژی خەیاڵێکی دوورە دەست دا گوم دەبێ. هەڵبەتە خۆپەرستی و بێ شەرمی دەوڵەتانی گەورەو « بەریتانیا و فەرەنسا » بچووک « ئیتالیا و یۆنان» کە دەیانویست ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە بنج و بناوانەوە دەربێنن، دەورێکی یەکجار گەورەی لەو بارەیەوە هەبوو.

**لێ ڕێبەرانی کوردیش لەم مەیدانەدا یەکجار سادەو ساویلکە و بێ توانا بوون: ئەم سەرانە بوونە داردەست و کەمەی هێزە گەورەکان.**

## ٥
## شەریف پاشا

لە پاریس دا، یەکێک لە سیاسەتوانانی عوسمانی کە لەپڕ نەژادی کوردی خۆی بیر دەکەوێتەوە، توانی وەکو «سەرۆکی شاندی نوێنەرایەتی کورد» خۆی لە کۆنفرانسی ئاشتی دا بسەپێنێ.

شەریف پاشا لە سلێمانی لە دایک بوو بوو، دەگەڵ شێخ مەحمودا لە لای بابە خواجە دەرسی خوێندبوو، پاشان لە قستەنتینیەدا و لە دام و دەزگاکانی عوسمانی دا کار دەکات و بەرەبەرە پلەوپایەی وەرگرتبوو، بوو بوو بە یەکێک لە پیاوانی دەوڵەت. ئیدی جگە لە نەژاد و رەگەز، چ نیشانەیەکی دیکەی کوردبوونی پێوە دیار نەبوو. لە کۆتایی ساڵی ١٨٩٠ دا لەلایەن سوڵتانەوە لە سەفارەتخانەی عوسمانی لە ستوکهۆڵم، دادەمەزرێنرێ و تێکەڵاوی لەگەڵ گەلێک سیاسەتواناندا بێ ئەوەی کەمترین ئاگادارییان لەمەڕ کوردبوونی ئەو هەبێ، پەیدا دەکات.[١٦]

ئەم پیاوە زۆر پابەندی بیروباوەڕ نەبوو، لە پێناوی پێشکەوتنی خۆیدا، هەموو بیرو باوەڕێکی وەلاوە دەنا: سەرەتا دەگەڵ ڕێبەرانی « ئیتحاد و تەرەقی» دا یەکی گرت و پاش کودەتای ساڵی ١٩٠٨ چونکە نەیانکرد بەسەفیر لە پاریس لە گەڵیان تێک چوو.

کاتێ کە شەڕ دەستی پێکرد، شەریف پاشا کە دژی ئەوە بوو دەوڵەتی عوسمانی بەگەڵ ئەڵمانیا بکەوێ، لە فەرەنسادا مایەوە و زۆربەی ڕۆژانی شەڕی لەوێندەر و لە ڤیلا تایبەتیەکەی خۆیدا بە ناوی « مۆن کیف» لە مۆنتیکارلۆ دا بەسەر برد.

کوڕی یەکێک لە دەوڵەمەندەکان لە نووسینێک دا دەڵێ: «شەریف پاشا، نەجیب زادەیەکی تەواو بوو... پیاوێکی ئیسراحەتخواز بوو، ڕمودەی شامپانی و شەویانان بوو، شەیدای ژەیانی خۆش بوو... بەرواڵەت پارەیەکی زۆری هەبوو.»[١٧]

بەڵام ئینگلیزییەکان کە حەزیان لێنەدەکرد بە جۆرێکی دی باسیان کردووە: ئەم کابرایە، بە هۆی جل و بەرگە عەنتیکەکەیەوە لە نێو تورکاندا بە شەریف کڵاوخوار ناسراوە، پیاوێکی یەکجار شۆڕەت و پلەوپایە خوازە... لە رادەبەدەر کەوەدەنە! تەنیا لە بەردەوڵەمەندیەکەیەتی کە لە نێو تورکان و موسوڵمانانندا تازە دەسەڵاتێکی هەیە: دۆڤیرێکی میسری دەوڵەمەندی خواستووە...»[١٨]

شەریف پاشا، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩١٤ دا پەیوەندییەکی ناکام دەگەڵ ئینگلیز ـکاندا دەکات، لە کۆتایی جەنگ دا سەرلەنوێ پەیوەندییان لەگەڵدا پەیدا دەکاتەوە و لە ١٩١٨/٦/٣ دا لە مارسیلیادا سێرپەرسی کۆکسی کۆمیسەری وڵاتی بەریتانیا و بەرپرسی کاروباری دۆڵی دوو رووبار دەبینێ: لەم دیدارەدا بە سێرپەرسی کوکس دەڵێ کە بەریتانیا هەر لە ئێستاوە ئۆتۆنۆمی بە کورد بدات و « بۆ ج دوو دڵی و ڕاراییەک موسڵ» بکات بە مەڵبەندی ئیدارەی کوردستان- هەڵبەتە موسڵ کەوتبووە شوێنێکەوە پێدەچوو بەر فەرەنسا بکەوێت.

لێ پاش پەیمانی ئاگر بڕی مەدرەس ٣١ /. ١٩١٨/١ دەڕوات بۆ سویسرا، لەوێندەر داوا لە کۆنگرەی عوسمانیانی ئازادی خواز، کە پرنس سەباحەدین سەرۆکی بوو، دەکات کە کۆ ببنەوە و لە ئەنجومەن و کۆڕە سیاسیەکانی ئەورووپادا، خۆی وەکو داکۆکیکار لە مافی عوسمانیان دەناسێنێ.[١٩]

ئایا شەریف پاشا گەیی بووە ئەو قەناعەتەی کە ناتوانێ سوود لە «ناو» ی کوردستان، واتە لە ناوی ئەو خەڵکەی کە بە رواڵەت کەس بە لای دا نەدەهات، وەربگرێ؟ نەخێر، هەرگیز! پتر لە لەندەن و پاریس دەچێتە پێش و پەیوەندی زیاتریان پێوە دەکات.

لە لەندەن دا بە ساردی پێشوازی دەکرێ، چونکە پێشنیازی «لامەرکەزی ئیداری» کە لە لایەن ئەوەوە دەکرێ بە هیچ جۆرێ لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتی بەریتانیادا، کە لێبڕا بوو بەشە غەیرە تورکەکان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جیا بکاتەوە نەدەگونجا. **شەریف پاشا خوازیاری ئۆتۆنۆمی کوردستان بوو لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا، کە بۆ ج دەستکارییەک وەکو خۆی بێنێتەوە**[٢٠].

پاریس، تۆزێ لەگەڵی گەرمتر دەبن، لەوێندەر یەکێک لە فەرمانبەرە گەورەکانی وەزارەتی دەرێ کە دەبینێ ئەم پیاوە خۆی بۆ بەرپرسی «ئیماراتی کوردستان» ئامادە کردووە هیچ پێی سەیر نابێ و هانی دەدات کە « داوای ئۆتۆنۆمییەک بکات لە سایەی فەرەنسادا»[٢١].

ئیدی لەو ساتەوە شەریف پاشا قۆڵی لێ هەڵدەماڵێ وکۆششی بۆ وچانی خۆی وەگەڕدەخات و پەیوەندی بە هەموو دەوڵەتان و سەرانی وڵاتان و سەفیرانەوە دەکات.

لە ١٩١٩/٢/٦ یادداشتنامەیەک سەبارەت بە ماف و داخوازییەکانی کورد دەدات بە کلیمانسۆی (کلیمانسۆ ١٨٤١-١٩٢٩ لە ساڵانی ١٩٠٦-١٩٠٩،و١٩١٧-١٩٢٠ دا سەرەک وەزیرانی فەرەنسە بوو.) سەرۆکی کۆنفرانسی ئاشتی، لەم یادداشتنامەیەدا خوازیاری کوردستانێکی خودموختارە کە دیاربەکر، خەرپوت، بەتلیس (بەدلیس) و موسڵ و باژێری ئورفە بگرێتەوە.

**شەریف پاشا ،لەم یادداشتنامەیەدا، دووپاتی دەکاتەوە کە ئەوەی ئەو داوای دەکات لایەنی هەرە کەمی داخوازی کوردانە، چونکە «کوردستانی یەکگرتوو» دەبێ بە ئەرزەروم دا تێ بپەڕێ و کوردستانی ئێرانیش بگرێتەوە.!**

دوای چەند هەفتەیەک لە نامەیەک دا بۆ ویلسن و کلیمانسۆ و لوید جۆرج (Lioyd George ١٨٦٣-١٩٤٥ لە ساڵانی ١٩١٦، -١٩٢٢ سەرەک وەزیرانی ئینگلیستان بووە.) و ئورلاندو (Orlando ١٨٦٠-١٩٥٢ لە ساڵانی ١٩١٧- ١٩١٩ **سەرەک وەزیرانی ئیتالیا بووە.) داوای دامەزراندنی «دەوڵەتی کاتی کوردستان» دەکات[٢٢] و ئەدی یادداشت لە دوای یادداشت لەمەڕ مەسەلەی کورد دەنێرێ.[٢٣]**

**دژایەتی فەرەنسا:**

لێ فەرەنسا دژایەتی دامەزراندنی «ئیمارەتێکی کوردی» دەکات: چونکە ئەم نەخشەیە بە دەستکرد و تەگبیری ئینگلیستان دەزانێ و بە دژی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەزانێ. لێ شەریف پاشا گوێ نادات و لەسەر بەرنامەکانی خۆی دەڕوات و هەوڵ دەدات دڵی ئینگلیزەکان نەرم بکات.

**مامەڵەی بەریتانیای مەزن:**

لە ١٩١٩/٥/٢٠ دا شەریف پاشا، داوا لە لویس ماللێ سەفیری بەریتانیا لە پاریس دەکات کە هەڵبژاردنی ئەو بۆ بەدەست هێنانی ئیمارەتی کوردستان، بە بالفور (Balfor ئارسر جێیمز ١٨٤٨-١٩٣٠ لە ساڵانی ١٩٠٢-١٩٠٥ دا سەرەک وەزیرانی ئینگلیستان بوو.) رابگەیەنێ و زۆر زوو ئەم « مامەڵە و سەودایە»ی خوارەوە دەخاتە بەردەم بەریتانیا:

بەریتانیای مەزن، دان بە سەربەخۆیی کوردستاندا بنێ و «لەوێ حکومەتێکی مەرکەزی دابمەزرێنێ کە لەلایەن خۆیەوە مافی هەموو سەرانی کورد لە چوارچێوەی سیستەمی فیودالی دا قەبوڵ بکات».

جا لەبری ئەوە، دەوڵەتی بەریتانیا «دەتوانێ لەوە دڵنیا بێ کە لە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی ئیداری و ئابوری و سوپایی دا دەستێکی بالای دەبێ، هەڵبەتە بەو پەڕی نهێنی پاریزیەوە واتە بە هەمان ئەو نهێنی پاریزی و سر قاییەوە کە تایبەتە بە دەسەلاتدارانی بەریتانیاوە».

شەریف پاشا لەگەڵ راگەیاندنی ئەوەدا کە «هەموو سەرانی کورد و هەموو نەجیب زادەکانی ئاکنجی قەستەنتەنییە ئەویان بۆ سەرۆکایەتی خۆیان هەڵبژاردووە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە دەبێ «ماتنگانەیەکی» وەکو ئەوەی کە بە عەرەبیان دەدرێ، بدرێ بەوانیش تابەلای خۆدا رایان بکێشن. هەڵبەتە نەک تەنێ ئەوانەی کە لە ناوچەکەدا نیشتەجێن بەڵکو ئەوانەش کە لە قەستەنتەنییەشدا دەژین»[24]. بەلام ئینگلیزەکان لەگەڵی رێک ناکەون.

دوای چەند هەفتەیەک یەکێک لە گەورە فەرمانبەرانی وەزارەتی دەرێی ئینگلیز دەنوسێت: **« دەوڵەتی بەریتانیا پێی وایە کە زۆری ئەمەنی و ئیقامەتی دوورودرێژی لە پاریس کۆسپن لە رێگەی ئەوەی کە بتوانێ لە پۆستی سەرۆکایەتی دەوڵەتی ئایندەی کورد، دەورێکی شایستە بدینێ»** و فەرەنسیەکان هەندێ قەواڵە و بەڵگەیان لەلایە کە قەناعەت بەخۆیان بکەن کە شەریف پاشا لە ئینگلیستاندا « هەموو شتێکی دەست خستووە»[26].

ئەگبەتی شەریف پاشا ئەمەیە کە ئینگلیزەکان « بە هەوادارێکی ئەگوڕ و کارامەی فەرەنسە»ی دەزانن!

لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا مێژوونووسان، زۆر بە باشی و بە ئینسافەوە ئەم شەریف **پاشایە، کە پیاوێکی زۆر هەڵپەرستە، هەڵدەسەنگێنن: دەڵێن ئەگەر ئەو ئەبوایە دەنگی کوردستان نە دەگەیەیە گوێی سەران و سەرۆک وەزیرانی ئەو وڵاتانەی کە لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس دا کۆ بوو بوونەوە.**

لێ ئەم قسەیە تەواو نادروستە: لە راستیدا ئینگلیزەکان رێگەی چ پەیڤدارێکی دیکەی کوردیان نەدا بێت بۆ پاریس و بەمەش زەمینە بۆ ئەم تاقە نوێنەرەی کورد خۆش

بوو. هەر وەکوو چۆن لە بەیروت و دیمەشق بە دەستووری ئاشکرای کۆمیسەری ولاتی بەغدا ڕێگەی سەفەری دوو نوێنەری شێخ مەحموود ی پاشای کوردستانی باشور نەدرابوو، هەروەها هەموو نوێنەرە کوردەکانی دیکەش کە دەیانویست لە ڕێگەی قاهیرەوە بێن بۆ کۆنفرانسەکە « مۆڵەتنامەیان » نەدرایێ.

بەلام پاشان بیرێکی سیاسی گرنگ بە هزر وبیری شەریف پاشا داهات کە بووە مایەی ئابوتی ئەو! شەریف پاشا کە بەردەوام پەیوەندی بە سیاسەتوانانی ئەورووپایی و ئەمەریکاییەوە هەبوو، هەر زوو پەی بە زەروورەت و پێویستی حەل و فەسلی دژمنایەتی و ناکۆکی نێوان کورد و ئەرمەنیان برد، ئەم دوو کەمینەیە خوازیاری یەک سەرزەمین بوون. ئەرمەنیەکان سوودیان لە ڕەوتی بیری گشتی کە بە قازانجی ئەوان بوو وەردەگرت: چاپەمەنی ئەورووپا ڕۆژانە باسی ئەو کوشتارانەیان دەکرد کە ئەرمەنیەکان بە درێژایی یەک سەدە دووچاری بوو بوون.

بەڵێ شەریف پاشا بوغوس نوباری (Boghos naubar) سەرۆکی شاندی نوێنەرانی ئەرمەنییانی قەناعەت پی کرد کە قەواڵە و ئاشتی نامەیەکی هاوبەش ئیمزا بکەن. بەلام ئەم شاکارە سیاسیە قەرقەشەیەکی توندی لە قەستەنتەنیەدا هەڵگیرساند و حاشا لە شەریف پاشا کراو ئەویش ناچار بوو لە ١٩٢٠/٤/٢٧ دا ئیستقالە بدات و چاوی لەو هەموو خەون و خەیاڵە پۆشی کە بە دامەزراندنی «ئیمارەتی» کوردستانەوە دەیبینی.

**یانە کوردییەکانی قەستەنتەنیە:**

هەر کە پەیمانی وەستانی شەڕ ئیمزا کرا، ئیدی یانە کوردییەکان کەوتنەوە چالاکی و چەلەنگی خۆیان. لە پایتەختی عوسمانی دا دوو کەسایەتی بەسەر کۆڕ و ئەنجومەنە نەتەوەییەکانی کوردا زاڵ بوون: یەکێکیان سیناتۆر عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوللا بوو کە لەکاتی لەشکرکێشی باییدا بۆ سەر ئێران لەساڵی ١٨٨٠ دا ڕێبەرایەتی هێزەکانی بابی کردبوو. دووەمیان ئەمین عالی بەدرخان بوو کە لە پاش مەرگ یان بێ سەرو شوێن کردنی ژمارەیەک لە برا گەورەکانی. سەرۆکی بێ هەڤرکی تایفەی بەدرخان بوو. ئەم دووانە «کۆمەڵەی تەعالی کوردستان»یان دامەزراند. عەبدولقادر بوو بە سەرۆک و ئەمین عالی بەدرخان بوو بەجێگری سەرۆکی کۆمەڵەی ناوبراو، ئەندامە سەرەکیەکانی دیکەی کۆمەڵە بریتی بوون لە خەڵکانی وەک ڕەمزی بەگی خەڵکی خەرپوت، ئەکرەم بەگی جەمیل پاشا لە دیاربەکر، ئەجمەدین حوسێن، مەمدوح سەلیم، دکتۆر شوکری محەمەد،

ئەمین زەکی بەگ، حەسەن ئەمین بەگ نوێنەری جارانی خەرپوت، محەمەد بەگ نوێنەری جارانی مەلاتیە، سەرهەنگ خەلیل بەگ، لە دەرسیم، مەحمود نەدیم پاشا لە ئورفە، جەنەراڵ مستەفا پاشا لە سلیمانی، جەنەراڵ حەمدی پاشا.

وەکو دەبینن تاقەیەک شۆرشگێر دەنێو ئەمانەدا نیە! ڕێبەرانی بزاڤی نەتەوەیی کورد، کەسانی ئیشراف و زۆربەیان خودان پایەی بەرزن چ لە نێو لەشکر و سوپادا، چ لە نێو دام و دەزگاکانی حکومەتی عوسمانیدا.

سیناتۆر عەبدولقادر سەرۆکی ئەنجومەنی حکومەت و یەکێک لە سیازدە وەزیرەکەی دەوڵەتی داماد فرید بوو تا کاتی کەوتنی ئەم دەوڵەتە لە پاش داگیر کردنی سمیرنە لەلایەن یونانیەکانەوە (١٤-١٥/٥/١٩١٩) سەرهەنگ خەلیل بەگ سەرۆکی پۆلیسی قەستەنتەنییەیە. میر کامەران بەدرخانی کوری ئەمین عالی بەدرخان نیو سەدە دواتر دەڵێ: «زۆربەیان پایەکیان لە نێو بەرەی کوردان بوو، و پایەکی دیکەیان دەنێو دامودەزگای عوسمانی و ئیسلامی دابوو. دەیانویست ببنە وەزیر» [٢٦]

ئیدی بە زوویی و خێرایی یانەی کوردان لە شارە گەورەکانی کوردستانی عوسمانی دا، لەشارانی وەک مەلاتیەو ماردین و خەرپوت و دیاربەکر کرانەوە.

## ٦

## ڕەوت و ڕێبازە سەرەکیەکانی ناسیونالزمی کوردی

لێ، نەتەوە پەروەرانی کورد، چ لە شارەکانی کوردستاندا و چ لە پایتەختی عوسمانیدا زۆر جیاوازن لە نێو خۆیاندا. دەتوانرێ سێ ڕێبازی سەرەکیان تێدا دەست نیشان بکرێ:

- ڕێبازی « تەیار» «تورک - کورد» و پان ئیسلامی کە ناسیونالستانی تورک پشتیوانیان دەکرد تاڵەو ڕێگەیەوە لە کوردستانی باکوردا شۆرشێک دژی ئینگلیز هەڵگیرسێنن و نەیەڵن لە ئایندەدا دەوڵەتی ئەرمەنی دروست ببێ: هەروەها لەو خاڵەش غافڵ نەبوون کە لە حاڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیدا ڕێ لەوە بگرن کەدەوڵەتی نێوبرلو بکەوێتە سار پەناو ژێر دەسەڵاتی بێگانانەوە.
- ڕەوتی ئوتۆنۆمی خواز، سیناتۆر عەبدولقادر نوێنەری سەرەکی ئەم ڕەوتە بوو.
- ڕەوتی « خۆبوون خواز» ئەمین عالی بەدرخان ڕێبەری ئەم ڕێبازەی دەکرد.

کە مستەفا عارف بەگ دەبێتە وەزیری ناوخۆ و: ئیدی پەیوەندی نێوان کورد و دەوڵەت

هەندێ ئاسان دەبێت: چونکە ئەم پیاوە دۆستی بەدرخانیەکان بوو، خەلیل بەگ دەکات بە حاکمی مەلاتیە و ئەمین عالی بەدرخان بۆ پارێزگاری دیاربەکر کاندید دەکات.[٢٧]

لەو گفتوگۆیانەوە کەلە ساڵی ١٩١٩ دا لەم بارەیەوە دەکرێن: وا بەدیار دەکەوێ کە ناسیونالاتی کورد، حەز بە لایەنگری «عوسمانی» دەکەن.

چەندین کۆبوونەوە لە نووسینگەی سەرەک وەزیران دا ئەنجام دەدرێ و ئەو کوردانە بەشداری لەکۆبوونەوەکاندا دەکەن: سیناتۆر عەبدولقادر، ئەمین عالی بەدرخان، مراد بەدرخان، مەولان زادە رەفعەت و دوو ئەفسەری کورد بە ناوی: سەرهەنگی دووەم ئەمین بەگ و سەرگورد عەونی بەگ.

نوێنەری دەوڵەتیش ئەمانە دەبن: حەیدەری زاد (شێخولئیسلام) ئابوک پاشای کۆنە وەزیری جەنگ و وەزیری کاروباری گشتی و عەونی پاشای وەزیری دەریاوانی.

تورکەکان رازی دەبن ئۆتۆنۆمی لەسایەی حوکم و دەسەڵاتی سوڵتان و پەرلەمان دا (بە بەشداری نوێنەرانی کورد) بە کوردستان بدەن. بەو پێیە حاکم و پۆلیس و فەرمانبەری ناوچەیی هەموو کورد دەبن، بەشی هەرە زۆری دەرامەتی ناوچەکە لە کوردستاندا سەرف دەکرێ. کوردەکان ئازاد دەبن لەوەی کە سوود لە راوێژکارانی بێگانە وەربگرن، بەڵام ئەم دەوڵەتە کوردییە لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دەبێ و هەرگیز لێی جیا نابێتەوە.

هەڵبەتە رێبەرانی کورد گومان لە نیاز و نیەتی تورکان دەکەن، لەوە دەترسن کە رۆژێ لەرۆژان کوردستان گیرودەی داوی گرفتی نابووتی و هەرمەهێنانی عوسمانی بکرێ.
لێ تورکەکانیش هەر زوو لە وەعد و بەڵێنی خۆ ژێوان دەبنەوە و فەرامۆشی دەکەن.[٢٨]

**کێشەی نێوان یانە کوردیەکان و دەوڵەتی عوسمانی:**

بەڵام زۆر زوو کاری گفتوگۆی ژێراو ژێر و نهێنی دەبێ بە دەمبۆڵە و مشتو مڕ و شەڕی ئاشکراو دەوڵەتی عوسمانی شەڕی راگەیاندن دژی ناسیونالیستانی کورد، رادەگەیەنێ.

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە گۆڤاری (Vakit) گوتارێکی دوور و درێژ و توند دژی کوردەکان بڵاو دەکاتەوە، لەم گوتارەدا دەڵێ: «ئەمڕۆکە هەر باس کردنێکی سەربەخۆیی کوردستان خۆی لەخۆیدا پشتیوانییە بۆ سەرکەوتنی ئەرمەنیەکان! ئەو خەڵکانەی بانگەشە بۆ ئەو جۆرە بیر کردنەوەیە دەکەن. نە دڵسۆزی کوردن و نە فریان بە کوردەوە هەیە. ئەگەر دڵسۆزیایەن، لە جیاتی لە ئەستەنبوڵدا خەریکی خۆتێهەڵدان و گوتاربێژی بوایەن، ئەوا

دەچوون بۆ کوردستان و وەختی خۆیان بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی فیکری و رۆشنبیری خەڵکی کورد تەرخان دەکرد، کە ئەوەندە ئەزان و پاشکەوتووە: جا ئەوانەی لەم وەزع و حاڵەدا داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکەن، گەورەترین دوژمنانی خەڵکی کوردن.»[29]

ڕێبەرانی کورد، هەوڵدەدەن و بێ ئەوەی بچنە ـو مشتومڕەوە، ـ گۆڤارەکەی خۆیاندا (ژین) داکۆکی لە هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان بکەن. :«ئێمە دەزانین کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . وەزع و حاڵێکی فرە دژوار و ناهەموار دا تێدەپەڕێ، بەڵام لە لایەکی دیەوە دەکرێ چاوەنۆڕی ئەوە لە کوردی مەینەتباری سەدان ساڵە بکرێ کە داوای ماف و چاکبوونی وەزع و حاڵی خۆی نەکات؟ هەر کاتێ کوردان، شەکوای حاڵی خۆیان کردبێ بە ئاژاوەگێڕ تاوانبار کراون و دەسەڵاتداران لە بری بە عەدالەت و ئینسافەوە مامەڵە دەگەڵ ئەم سکاڵا و داوایانەدا بکەن بەزۆر (دایان مرکاندۆتەوە)و سەرکوتیان کردوون.»[30]

دەوڵەت شان بەشانی ئەم شەڕی ڕاگەیاندنە، لە بازێڕە کوردەکاندا کەوتە بڵاو کردنەوەی نووسراوی پڕ لە درۆ و دەلەسە و هەڵچوو. نیوەرۆکی ئەم نووسراوانە دژی هەوڵی سەربەخۆیی کوردستان لە ساو پەنای بێگانەدا بوو: لە بروسکەیەکی سەرانی کوردا بۆ دەوڵەت ( ک/٢/ ١٩٢٠) دەگوترێ: «هەندێ خراپە خوازانی خەڵکی کورد، داخوازییەکی دەستەجەمییان ئامادە کردووە بەمەبەستی پشتیوانی کردن لەو خواستەی کە کوردستان لەسایەی دەسەڵاتێکی بێگانەدا بێ، ئەم داخوازییانە دروستکراون و ئێمە نەفرەت بۆ ئامادەکارانی دەنێرین.»

سەرەنجام وەزیری ناوخۆ مۆڵەتی کارکردن بە (حیزبی دیموکراتی کوردستان) نادات. ئەوەبوو پاش ٢٥ ساڵ دامەزرێنەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە بازێڕی مهاباد هەمان ناویان لە حیزبەکەی خۆیان نا.

حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ڕاستی دا ڕەنگدانەوەی سیاسی «کۆمەڵەی تەعالی کوردستان» ە. کە نەجمەدین حوسێن سکرتێری بوو، بەر لەوەی مستەفا کەمال قەستەنتەنییە بگرێ چەندین یادداشتنامەی بۆ دەوڵەتی عوسمانی و هاوپەیمانان نارد.

دەسەڵاتدارانی عوسمانی بە ڕادەیەک شوڵی لێ هەڵدەکێشن کە ژمارەیەک لەڕێبەرانی کورد دەگرن و یەکێک لە وانە هەمزە بەگی بەڕێوەبەری گۆڤاری ژین دەبێ. هەمزە بەگ دەدرێتە دادگاو لە کۆتایی ساڵی ١٩١٩ دا حوکمی ئیعدام دەدرێ. چونکە لە دانیشتنێکی تایبەتیدا لە ماردین گوتبووی کە « کوردان پێویستە خۆیان ئازاد بکەن.»[31]

ئاشکرایە کە لە هەل و مەرج و وەزع و حاڵی وەهادا، ڕێبەرانی کورد نەتوانن بە ئاشکرا باسی خۆزیبوونی کوردستان بکەن چونکە: چاوەنۆڕ بوون، تا دڵنیا بن لەوەی کە کۆنفرانسی ئاشتی جارێکی دی جڵەوی چارەنووسی کوردستان ناداتەوە دەستی تورکان.

**مشت و مڕو ناتەبایی و کێشەی ناوخۆیی بزاڤی کورد لەمەڕ ئامانجی ستراتیژی بزووتنەوەکە: ئۆتۆنۆمی بێ یان سەربەخۆیی؟**

لێ ڕێبەرانی کورد زوو بە زوو ناچار بوون لە قاوغی خۆیان بێنە دەرێ: شەریف پاشای نایندەیان لە پاریس لە ۱۹۱۹/۱۲/۲۰ ڕێکەوتننامەیەکی دەگەڵ بۆغوس نۆباری **نوێنەری ئەرمەنیەکان لە پاریس ئیمزا کردبوو: «کە هەردوو میللەت ئارییاین و یەک بەرژەوەندی و یەک ئامانجیان هەیە، واتە سەربەخۆیی و ئازادی.»**

**«بەڵام سەبارەت بەو شوێنانەی کە مشت و مڕیان لەسەری هەیە، وسەبارەت بە سنووری هەردوو وڵاتی ئایندە، ئێمە بە ڕەسمی ڕای دەگەیەنین کە هەموو ئەم مەسەلانە دەخەینە بەر دەستی کۆنگرەی ئاشتی و بە بڕیار و قەراری کۆنگرە دەکەین.»**[۳۲]

ئەم ڕێکەوتننامەیە کە ئومێدی ئەوەی لێدەکرا ببێتە مایەی دۆزینەوەی سەرەداوی گومی کلافەی ئاڵۆزکاوی ناکۆکیەکانی نێوان کورد و ئەرمەن. لەلایەن کۆڕ و ئەنجومەنە سیاسییە ئەورووپی و ئەمریکاییەکانەوە بە گەرمی پێشوازی لێکرابوو، لە قەستەنتەنییەدا وەکو بۆمبا تەقیەوە: ئەگەر کورد داوای سەربەخۆیی بکەن هەر نەیسە، چونکە هیچ کوردێک ڕۆژێ لە ڕۆژان لە حوکم و دەسەڵاتی ئایینی سوڵتان- خەلیفە بەگومان و دڕدۆنگ نەبووە بەڵام کە بێن و پەیمان دەگەڵ ئەرمەنیاندا ببەستن، ئەمە پەیمان بەستن بوو دەگەڵ دژمنێک دا کە مایەی نەفرەت و رق و کینەی هەموو تورکێک بوو، ئەمە خیانەت بوو!

دەم و دەست ناکۆکی و دووبەرەکی کەوتە نێو ڕێبەرانی کوردەوە:ڕێکەوتننامەکەی نێوان شەریف پاشا و بوغوس نوبار، لە ڕاستیدا ناچاری کردن کە ڕاو بۆچوونی خۆیان لەمەڕ ئامانج و ستراتیژی مەسەلەکەیان ساغ بکەنەوە: ئوتونومی بێ، یان سەربەخۆیی؟ ئەم بابەتە لە زەین و هزری زۆربەیاندا ئەوەندە روون نەبوو،هەربۆیەش **نەجمەدین حوسێن ی سکرتێری گشتی حزبی «مۆڵەت نەدراوی» دیوکراتی کوردستان لە داوا نامەیەکدا بۆ « دەوڵەتی بەریتانیای مەزن» دەنووسێت: «سەربەخۆیی کوردستانی یەکپارچە لە چوارچێوەی سنوری ئاسایی و نەتەوەیی خۆیدا. باشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی بە یەکجاری و بۆ هەمیشە کۆتایی بە گیروگرفتەکانی ئاسیای بچووک (تورکیا) بهێنرێ.»**

بەڵام هەر زوو پاشەکشەی کردەوە و دەڵێ: «کوردەکان، تەنێ کاتێ دەتوانن ببن بە فاکتەری دابینکردنی ئاشتی جیهان، کە لەچوارچێوەی سنوورێکی ئاوەدا و لەسایەی ئاڵای کوردستانی ئوتونۆمی دا زندگی بکەن.»[٣٣]

میر ئەمین عالی بەدرخان، خێرا خۆی گەیاندە ریزی پێشەوەی باڵی لایەنگرانی سەربەخۆیی تەواوی کوردستان و لە هەڤپەیڤینێک دا بۆ رۆژنامەی لوبوسفور (Lebosphore) رایگەیاند: «ئێمە هەمووسان سوڵتان بە خەلیفە دەزانین، بەڵام جەماعەتێک کە نوێنەری باڵی بەهێزی بزووتنەوەکەن دەیانەوێ لە باری سیاسیەوە بە تەواوی لە تورکیا جیا ببنەوە. هەندێکی دیکە کە هەلپەرستێ و لەوە دەترسن کە ئەورووپا دەست بەرداریان بێ، ئەمانە بزووتنەوەیەکن دەیانەوێ تورکیامان رووبەروو بکەنەوەو لە حاڵی حازر دا بە ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی تورکیادا رازین و خۆشحاڵن، بەڵام ئەمانە ژمارەیەکی زۆر کەمن. جا کە ئێستا هەموو لایەک سوود لە پرەنسیپەکانی سەرۆک ویلسن دەبینن، بۆچی ئەم پرانسیپانە سەبارەت بە کوردستانیش بەکار نەهێنین؟ ئەم مامەڵەیەی ئێمە مایەی نارەزایی دەوڵەتی مەرکەزیە بە تایبەتی هێزە میللییەکان؟ لەم رووەوە دەتوانین چ بکەین؟»

ئەمە کارێکی زۆر بوێرانە بوو. زۆر بەدڵی باڵی « هەلپەرستان» بە سەرۆکایەتی سیناتور عەبدولقادر نەبوو! عەبدولقادر لە هەڤپەیڤینێک دا دەگەڵ رۆژنامەی الاقدام (١٩٢٠/٢/٢٧) هەوڵی دا، رێکەوتننامەی شەریف پاشا و نوبار پاشا، بێ بایەخ نیشان بدات و گوتی: « تورکان، هاو نەژاد و برای ئازیزی ئێمەن. وێرای ئەوەی کە ئێمە هەموو موسڵمانین و مەحالە کینە و دژمنایەتیمان بکەوێتە بەین! ئێمە تەنێ ئەوەندەمان دەوێ کە مافی گەشە کردن و پەرەسەندنی ئازادانەمان بدرێتێ ئەو دەنگۆیەش کە گوایە رێککەوتننامەیەکی دژ بە تورکیا، لە نێوان شەریف پاشا و بوغوس نوباردا ئیمزا کراوە، درۆیە. چ باسێکی واش نەکراوە کە ئێمە رۆژێک لەرۆژان کاری لەو بابەتە بکەین!»

کوڕەکەی شێخ عوبیدوڵلا پاشان لەسەری دەڕوات: «ئەورۆکە ٥-٦ باژێرو دەڤەری کوردنشین هەیە. دەبا دەوڵەت ئوتونومی بەو باژێرانە بدات تا ئێمە بە پشتیوانی خەڵکانی ئابرومەند و دادپەروەر خۆمان وەقفی پەرەپێدانی ئەو باژێرانە بکەین. وەکو گوتم ئێمە چ دژمنایەتیەکمان دەگەڵ تورکاندا نیە و تەنانەت حەز دەکەین لەو دەوڵەتە ئوتونومی دارە کە داوای دەکەین، تورکانیش بەشداری بکەن...»[٣٤]

پاش چەند رۆژێک شێخ عەبدولقادر لە هەڤپەیڤینێکی دیکەدا، ئەمجارەیان دەگەڵ رۆژنامەی « تصویر افکار» زمان حالی « ئیتحاد و تەرەقی» دێتە سەر هەمان بابەت: «ئەمە درۆیە کە دەڵێن کوردەکان دەخوازن لە تورکیا جیا ببنەوە. من بەش بە حاڵی خۆم دەگەڵ بیروبۆچوونی جوداخوازی دا نیم. ئایا دەکرێت پیاو لەم بارەیەوە جگە لەمە بیروبۆچوونێکی دی هەبێ؟ تەنێ یەکێتی دەتوانێ پێشکەوتن و تەرەقی موسلمانان دابین بکات. کوردان، رێز و حورمەتیان بۆ خەلافەت هەیە.

هەمووان ئەمەیان پێ خۆشە و من بەش بە حاڵی خۆم یەکێکم لەو کەسانەی کە خوازیاری ئوتونومی کوردستانن، ئەمە تەنێ خواستی من نیە، بەڵکو (کۆمەڵەی تەعالی کوردستانیش) خوازیاری ئەوەیە. ئێوە بە خۆتان دەزانن کە ئەم کۆمەڵەیە بە پێی ویست و خواستی کوردەکان دامەزراوە. هەڵەو خەتاکانی دام و دەزگای ئیداری عوسمانیان بە درێژایی سالانی رابردوو، وای لە کوردەکان کردوە کە داوای ئوتونومی بکەن»[٣٥]. سەبارەت بە هەوڵ و تێکۆشانەکانی شەریف پاشاش دەڵێ: «ئەم چالاکی و چەلەنگیانە نەک هەر بە قازانجی کوردن، بەڵکو بە قازانجی تورکیاشە.»

ئەم گوتانە وێڕای نەرمییان، بوونە هۆی هاروژاندنی پەرلەمانی عوسمانی. نوێنەرانی کورد (لایەنگرانی دەوڵەت) ئیعتیرازیان لە قسەکانی سیناتور عەبدولقادر گرت و تەنانەت خوازیاری دەرکردنیشی بوون لە پەرلەمان، گوتبوویان ئەو کارەی «پێچەوانەی ئەو سوێندی وەفادارییەیە کە دەرهەق بە وڵات و میللەت و سوڵتان» خواردبووی.[٣٦]

لە ١/٣/١٩٢٠ دا نوێنەرانی ناوچە کوردنشینەکان وەکو وان و ئەرزروم و تەرابزون و هەکاری و بایەزید، لایحەی دەرکردنی ئەویان دا بە ئەنجومەن! ئەنجومەن لایحەکەی پەسەند کرد و ناردی بۆ پەرلەمان. لە کۆبوونەوەیەکی داخراودا، عەبدولقادر بە رادەیەک بەر گوشار و هێرش خرابوو، ناچار بوو بوو گوتەکانی ١٥/٣ی خۆی بە درۆ بخاتەوە.

## ٧
## پارچە بوونی بزاڤی کورد

بەڵام ئەم بیروبۆچوونانە لە نێو یانەی کوردیش دا جۆرە ئاژاوەیەکی نایەوە. بەتایبەتی ئەندامانی ماڵباتی بابان وەکو نارەزایی لە هەڵس وکەوتی سەرۆکی کۆمەڵە «یانە» دەستیان لە ئەندامیتی کۆمەڵە «یانە» کێشایەوە.

لە سەرەتای هەیڤی چاری ١٩٢٠ دا شێخ عەبدولقادر لە کۆمەڵێک کوردی ئاکنجی

ئەستەمولەوە، کە زۆربەیان لە توێژە کۆمەڵایەتییە هەرە هەژارەکانی کوردەواری بوون، نامەیەکی پێکەیی دەڵێ کە تەنێ ئەو شایەنی ئەوەی هەس بە ناوی گەلی کوردەوە قسان بکات.

لە لایەکی دیکەوە کۆمەڵێک لەو رۆشنبیرانەی کە لە دەوری میر ئەمین عالی بەدرخان گرد بوو بوونەوە، عەبدولقادریان لە سەرۆکایەتی لابرد و لە کۆمەڵە «یانە» دەریان کرد.

لە ئەنجامدا دوو بەرەکییەکە بوو بە راست و لە قەستەنتەنییەدا دوو رێکخراوی ناسیونالیستی کورد کە وتنە چەلەنگی« کۆمەڵەی کۆمەلایەتی کورد» کە ئەمین عالی بەدرخان سەرۆکی بوو و مەمدوح سەلیم سکرتێری گشتی بوو، کۆمەڵەی « کوردو کوردستان» بەسەرۆکایەتی عەبدولقادر، هەڤرکانی عەبدولقادر، بەتایبەتی ماڵباتی بەدرخان قەت بە چاکە باسیان نەکردووە. هەر هەموو ئەو سیاسەتوانە بێگانانەی کە مامەڵەیان دەگەڵ کردووە، شایەتی ئەوەی بۆ دەدەن کە پیاوێکی بە سام و تام و بەشەخسییەت بووە. چونکە پیاوێکی زۆر مەزەبی و ئاینی بوو، بۆیە ریزی لە حوکم و دەسەلاتی سوڵتان وەکو خەلیفەی موسڵمانان، دەگرت. هەڵبەتە ئەم پابەندییەی بە ئاینەوە یەکێک بوو لەو فاکتەرانەی کە کردبیە کارێک پتر بەلای ئوتونومی کوردستان لە سایەی تورکاندا دای بکێشێ. لێ کورەکەی عەبدولقادر بەڵگەو بیانوی سیاسی تری هەبوو بۆ سنووردار کردنی داواکانی خۆی.

لە گفتوگۆیەکی دا دەگەڵ دیپلۆماسییەکی بەریتانیایی سەر بە کۆنسولییەتی بالای بەریتانیا لە قەستەنتەنییە، پەندێکی کوردی بۆ دەگێڕێتەوە: «دژمنت گەر میرولەیەکیش بێ مادامێکی دژمنە نابێ لێی غافڵ بی و دەبێ حەساوی بۆ بکەی.»[٣٧] عەبدولقادر وێرای شکستی تورکان و داگیرکردنی بەشێک لە خاکی عوسمانی لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە، بە چاکی ئەوەی دەزانی کە ئەمە هێشتا سەرەتای کارە. ئەگەر هاوپەیمانان بۆ ناچار کردنی تورکان بەوەی هەموو مەرجەکانی ئاشتی قەبوڵ بکەن، هێزی تەواویان لەبەر دەست دا نەبێ، ئەوا کوردەکان بە داوا کردنی سەربەخۆیی زەرەر بە خۆیان دەگەیەنن.!

***

بەلای عەبدولقادرەوە دوو شت بنەرەتی بوو: یەکەم زەمانەتی ئوتونومی یان خۆبوونی کوردستان، دووەم «یەکێتی کوردستان» بە پێچەوانەی ئەمین عالی بەدرخانەوە،

عەبدولقادر پێی وابوو ئوتونومی کوردستانێکی یەکگرتوو لە سار پەنای عوسمانییەوە باشترە لە کوردستانێکی سەربەخۆی پڕ ئاژاوە و هەراو هەنگامە. سیناتور عەبدولقادر، بە خۆی نهێنی بیرو هزری خۆی بۆ M. derobec. کە یەکێک بوو لە نێردەکانی حاکمی بالای بەریتانیا لە قەستەنتەنیە دەدرکێنێ و دەڵێ: «ئەگەر دەوڵەتی پاشای ئینگلیستان مەبەستی بێ سەربەخۆیی کوردستان رابگەیەنێ و پارێزگاری بکات، بەخۆی دەیکات، بەلام لەم هەل ومەرج و بارە نادیارەی ئێستادا کاری وەها چ سوودێکی نابێت.»[٣٨]

## ٨
## گەڕان بە دووی زیرەڤان و پشتیوانێک دا

پاش چارەکە سەدەیەک خەباتی چەکداری لە رای سەربەخۆییدا، ئەو قەناعەتە چێ بوو کە هەر کارێکی چەکداری، بە بێ پشتیوانی کاری سیاسی و دیپلۆماسی، هیچ بە هیچ ناکات، بۆیە رێبەرانی کورد (کە زۆربەی هەرە زۆریان کوڕ و نەوەی رێبەرەکانی پێشوون،) بەلای کاری سیاسیدا با دەدەنەوە و بەشی هەرە زۆری چالاکی خۆیان بۆ سەرنج راکێشانی نوێنەرانی هێزە ئەوروپاییەکان تەرخان دەکەن. جا بەریتانیای مەزن کە بە روالەت دەسەلاتی خۆی بەسەر هەموو رۆژهەلاتی ناڤین دا کێشا بوو، لە ریزی پێشەوەی ئەو هێزانە بوو، پاشان فەرەنسا بوو. «هەر کوردێک ئاوەزی هەبێ، ئەو قەناعەتەی لەلا چێ بووە، کە کوردستانی ئایندە بە بێ هاوکاری و پشتیوانی بەریتانیا ناژێ و گەشە ناکات. ئێمە ئامادەین جڵەوی چارەنووسی خاکی خۆمان بدەینە دەستی ئینگلیستان و هەرچیمان لە توانادایە بۆ خزمەتی ئەم هێزەی بەکار بهێنین.!»

ئێستا راستە ئیشەکە دیارە، بەلام ئەم قسەیە بەلای کەمەوە لەبەر ئەوەی لەلایەن رێبەرێکی ناسیونالی کوردەوە کراوە، جێی سەرسوڕمانە، ئەمە بەشێکە لە نامەیەکی نەجمەدین حوسێن ی سکرتێری گشتی حیزبی دیموکراتی کوردستان بۆ کۆمیسەری بالای بەریتانیا.[٣٩]

هەموو رێبەرە دیارەکانی کوردی ئەم سەروبەندە، بە هەمان شێوە دەخوازن لە ئینگلیستان و فەرەنسە نزیک ببنەوە و سیناتۆر عەبدولقادر لە سالی ١٩٢٥ دا لە پێناوی ئەم کاردا سەری دادەنێ.

ئەمین عالی بەدرخان لە یادداشتێکی دا بۆ کۆمیسەری بالای فەرەنسە لە قەستەنتەنییە، پاش ئەوەی لیستێکی تەواوی ناوی ئەندامانی خێزانەکەی رێک دەخات کە لە پێناوی

سەربەخۆیی کوردا گیانی خۆیان بەخت کردووە، دەڵێت: «ئێمە دەسەلاتێکی زۆرمان لە کوردستاندا هەیە، بەتایبەتی لەو شوێنانەدا کە کەوتوونەتە بەر سایە و زیرەڤانی فەرەنسە، جا دەوڵەتی ئێوە دەتوانێ بۆ مەبەستی خۆی کە بریتییە لە دابینکردنی ئاشتی و خۆشگوزەرانی ئەو ناوچانەی کەوتونەتە سایەیەوە، سوود لەو دەسەلاتەی ئێمە وەربگرێ.»[40]

لە مانگی چواری ۱۹۲۲ دا لە حاڵێکدا کە دەسەلاتی بریتانیا بڕێک لە کەمی دەدات و فەرەنسە پەیوەندییەکانی خۆی دەگەڵ ناسیونالیستانی کەمالیدا، پتەو دەکات، عەبدولقادر لە پوانکارە (Poincare ۱۸٦۰ - ۱۹۳٤ . لە ساڵانی ۱۹۱۲-۱۹۱۳-۱۹۲۳ - ۱۹۲٤ دا سەرەک وەزیران بوو) دەگەیەنێ کە ئەگەر فەرەنسە لە دەوڵەتی مستەفا کەمالدا دەسەلاتی خۆی وەگەڕ بخات و کارێک بکات کە دەوڵەتی ئێوبراو ئوتونومی بە کوردستان بدات، من وەکو سەرۆکی کوردستان ئامادەم قەولنامەیەک ئیمزا بکەم و بەڵێن بدەم کە هەموو دەسەلاتی خۆم بۆ ئاسانکردنی ئەرکەکانی فەرەنسە لە سوریادا بەکار بێنم» و لەسەری دەڕوات: «تەنێ کالای فەرەنسەیی لە بازاڕی کوردستاندا ڕێ دەدرێ.»[41]

کامیل (لە دەقەکەدا klamil) بەدرخان کەلەگەڵ روسەکاندا بووە و لە تەفلیس دژیا لەمانگی ۱۹۱۸/۱ دا پێشنیاز بۆ ئینگلیزەکان دەکات کە «لە کوردستاندا ئاگرێکی گەورە هەڵگیرسێنێ کەلە سنوری ئێرانەوە تا ئەو دیوی دیاربەکر بگرێتەوە» ئەگەر هاریەیانان پشتیوانی لەو ئەخشەیەی ئەو بکەن. پاشان کامیل بەگ لەسەری دەڕوات «دەبێ من بیم بە سەرگەورەی ئەو کوردانەی کە لە دەورمان خڕ دەبنەوە!»[42]

ئەگەر چاوێک بە قەواڵە و پێشینە سیاسییەکانی ئەو ساڵانەدا بگێڕدرێ ئەوا ئەوە دووپات دەبێتەوە کە هەموو ڕێبەرانی نەتەوەیی کورد هەمان (مامەڵە و سەودایان) لەگەڵ **بەریتانیا و فەرەنسەدا کردووە و پێشنیازی ئەوەیان کردووە کە «ئەگەر ئێوە کارێکی وەها بکەن، ئێمە ئوتونومی یان سەربەخۆیی وەربگرین ئەوا؛ ولاتی ئێمە لەبەر دەستی ئێوەدا دەبێ». بە بێ ئەوەی تێ بگەن کە ئەم مامەڵە کردنە خۆی لە خۆیدا پێچەوانە و دژی داواکاریەکەی خۆیانە.**

هەر هەموو ئەم ڕێبەرانە لە هەمانکاتدا کە داوای ئازادی کوردستانیان دەکرد، لە خەمی بەرژەوەندی خۆشیان دابوون و هەر یەکێکیان دەیویست ببێ بە میریان پاشا یان سەرۆک کۆماری ولاتی تازە - ئەمە جگە لەو موچەو خەرجیانەی کە بۆ خۆیانیان داوا دەکرد. - لە

هەموو حاڵێکدا وا بیر دەکەنەوە کە دەبێ ئەو شتانەیان (پێ بدرێ) و دڵنیان کە ئەمانیش لە بەرانبەر ئەوەدا شتگەلێکیان هەیە کە سەرنجی هێزە گەورەکان رابکێشن.

**وەکو چۆن یەکێک لە فەرمانبەرە گەورەکانی ئەو کاتەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لەم بارەیەوە دەنووسێت: «خەونی ئەم حیزبە تازەیەی کورد، کە دەیەوێ بە پارە و پشتیوانی خەڵکی بێگانە بێ بەسەرەکی ئەو وڵاتە کوردیەی کە بۆی دادەمەزرێ، خەونێکی بە تاڵە و نایەتەدی»[٤٣].**

بە هەر حـاڵ لە ئەنجـام دا کـوردان، پاش زەرەرو زیانی زۆر بۆیان بەدەردەکـەوێ کەسەربەخۆیی دەسەنرێ و نادرێ.

بۆ کەمکردنەوە و سوک کردنی باری مەسئولیەتی رێبەرانی کورد، دەبێ ئەم خاڵەش بگوترێ کە ـ جگە لە سیناتور عەبدولقادر. ئەمانە خەڵکێکی نەدار و هەژار بوون. بەڵام چونکە وەکو پایەی کۆمەڵایەتی میر و خانەدان بوون، ناچار بوون دەست و پێوەند رابگرن و ژیانێکی خۆش و پڕ خەرج بەرنەسەر.

لەو زەمانەدا قەستەنتەنییە بوو بوو بە بنکە و مەڵبەندی فێڵ و دەغز و دەسیسە و لەوێندەرەوە بە سەرانسەری خاکی عوسمانیدا بڵاو دەبووەوە، لەوێندەر گەندەڵی گشتی هەبوو: یەکێک لە وەزیرانی ناوخۆ کە ئەوسا (١٩١٩) سەرۆکی (ئەنجومەنی دۆستانی بەریتانیا) بوو بە مەزەندەی فەرەنسەییەکان مانگانە ١٥٠٠٠٠ لیرەی لە ئینگلیزەکان وەردەگرت. فـەرەنسەییەکانیش سەرەنجام و بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر توانیان ئەنجومەنێک بە نێوی (ئەنجومەنی دۆستانی فەرانسە) دابمەزرێنن کە سەرۆکەکەی دەستکردی ئینگلیزەکان بوو[٤٤].

لێ کوردستان دوور بوو، ئینگلیزەکان بەشێکی گەورەی کوردستانی باشووریان داگیر کردبوو، و فەرەنسەییەکانیش هەموو ئەو رێگایانەیان بە دەستەوە بوو کە دەچوونەوە بۆ کوردستان رێی باکور لەلایەن تورک و روس و ئێرانیەکانەوە گیرابوو.

لە کۆنفرانسی ئاشتی دا، کە رۆژی ١٨/١/١٩١٩ لە پاریس دستی پێکرد، بەریتانیا و فەرەنسە مشتومڕێکی زۆریان لەمەڕ دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کرد. بێ ئەوەی گوێ بە داخوازییەکانی کورد بدەن، لە کاتێکا خاکی کوردان لە ناو جەرگەی ئەو ناوچەیەدابوو کە فەرەنسا و ئینگلیز شەڕیان بوو لەسەری.

کوردەکان، کە هەموو «خوتبە» و بەیانەکانی سەرۆک ویلسن یان لە مەڕ مافی دیاری

کردنی چارەنووسی میللەتان، لەبەر کردبوو، لەنێو ئەمەریکاییەکانیش دا، چ دۆستێکیان نەدۆزییەوە: ئەندامانی کۆمیتەی لێکۆلینەوەی کینگ کرین ی ئەمەریکایی چوون بۆ سوریا و قەستەنتەنییە، لێ چ ئاوڕێکیان لە دۆڵی دوو رووبار و ئەنادۆل نەدایەوە (45).

ولاتە گەورەکان بۆ گەیشتن بە پەیمانی سیڤەر ١٩٢٠/٨/١١ نە خۆی لە خۆیدا پارچە کاغەزێکی بۆش و بەتاڵ و خەلقەندەیەکی لەبارچوو بوو، یەک ساڵ و نیو لەگەڵ یەکدی دا چەنەیان ا . ا، ئەوجاش ئەو پەیمانە نەبوو کە بتوانێ مەسەلەی رۆژهەلات چارەسەر بکات، لێ بەلای خەلکێکی زۆری کوردەوە، ئەم پەیمانە **یەکەمین ئیعترالی جیهانە بە بوونی کورد.**

مادەی (٦٢)ی ئەم پەیمانە ئەوەیە کە ئەنجومەنێک لە نوێنەرانی ئیتالیا و فەرەنسا و بەریتانیا کە بارەگاکەی لە قەستەنتەنییە دەبێ، لە ماوەی شەش هەیڤاندا زەمینە بۆ ئۆتونومییەکی ناوچەیی لەو دەڤەرانەی کە زۆربەی دانیشتوانیان کوردن، خۆش دەکات. - واتە لە دەڤەرەکانی رۆژهەلاتی فورات و باشوری سنوری ئەرمەنستان - و لە باکوری سنوری تورکیا لەگەڵ سوریا و دۆڵی دوو رووباردا.

بەپێی مادەی (٦٤) ناوچەی ئۆتونومی کوردستان، بۆی هەیە لە ماوەی ساڵێکدا سەربەخۆیی خۆی وەربگری[٤٦].

**سەرچاوە و پەراوێزان:**


١- پێتی دولاکروا، لە ١٧٦٥. یەکگرتووی دووری ئەفەندی، پاریس ١٨١٠، ل٩٥

٢- بجەر، نەستوورییەکان و، ل ٣٠٥

٣- دکتور رایت، یەبکی پەیام و بوستون ١٨٤٦ ل ٣٨١

٤- هەمان ژێدەر

٥- هەمان ژێدەر

٦- سێر ئاوستین هنری لیارد، گەران و پشکنین لە شوێنەوارێن نەینەوا ١٨٥٣ ل. ٥٤

٧- نامەی ١٨٤٥/٧/١١ لە ئاوریلەوە وەرگیراوە، لە کلدەی دیانان تۆمار کراوە ل. ٦١

٨- بە گوتەی (دکتور شێرکۆ جەلادەت بەدرخان) ١٨٦٨ و بە گوتەی مێجەر نوئێل ١٨٧٠یە.

٩ - کوردەکان بە روایەتی خزیان. باسیل نیکتین، ئاسیای فەرانسە ١٩٢٥، ل ١٤٩

١٠- هەمان سەرچاوە، ل ٩٩

١١- جۆرج کرزن. مەسەلەی ئێران، لەندەن. ١٨٩٢ ل. ٥٥٣

١٢- کتێبی شین، ژمارە ٥، ١٨٨١ ل٥٤

١٣- ساموئیل جی. ویلسن، ژیان و نەریتی ئێرانیان- نیویورک ١٩٠٠، ل١٢٢

١٤- و. جویدە بزاڤی نەتەوەیی کورد. نامەیەکە دراوە بە زانکۆی سیراکوز، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ١٩٦٠و ل٢٩٢

١٥- دیمانەیەک دەگەڵ نووسەردا، پاریس ١٩٧٥/٧.

١٦ دووبارە، پەیماننامەی فەرەنسا و ئینگلیز ١٩١٨/١١/٨

١٧- حەسەن ئەرفەع، کوردەکان ل ٣١

١٨- هەمان سەرچاوە، ل ٣١

١٩- نووسراوێک لەمەر شەریف پاشا ١٩٢٠/٤/١٩ ئۆفیسی هند.

٢٠- ئەرشیفی وەزارەتی جەنگی فەرەنسا، پاریس.

٢١- ئوفیسی هند.

٢٢- نووسراوی زانکۆی پاریدەدەری بەڕێوەبەری کاروباری ئاسیا، ئەرشیفی وەزارەتی کاروباری دەرێی فەرەنسا، پاریس.

٢٣- نامەی ١٩١٨/٤/١٥ ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا ٣١١-٣٣١.

٢٤- بەتایبەتی نووسراوی رۆژی ١٩١٩/٤/٩

٢٥- یادداشتێکی تەسلیم کراو بەرابرت رانستیارت، سکرتێری یەکەمی سەفارەتی بەریتانیا لە پاریس (١٩١٩/٧/٢٩) بۆ بالفور، ئۆفیسی هند.

٢٦- پیشون، دابەشکردنی رۆژهەلاتی نزیک، پاریس، ل ١٧٤.

٢٧- دیمانەیەک لەگەڵ نووسەردا، پاریس ١٩٧٥/٧.

٢٨- ئەمین عالی بەدرخان، لە بروسکەیەک دا لە ناوەراستی ١٩١٩/٤ بە ناوی پیاولن و ناودارانی ئەسیبین خۆیان بۆ ئەم پۆستە دەپاڵێون ( یادداشتنامەی میجەر نوئیل)

٢٩- دەربارەی ئەم داواسستانە دوو ریوایەت هەیە. یەکێکیان یادداشتنامەی ئەو دەمانەی کالسترو بی دەریا سالاری کۆمیسەری بالای بەریتانیایە، لە قەستەنتەنییە کە راپۆرتێکی لەمەر داواستانی ١٩١٩/٧/١٠ی نێوان تورک و کورد سازداوە. دووەمیان ریوایەتی دکتور شیرکۆ (جەلادەت بەدرخان) لە سالی ١٩٣٠ دا. هەردوو هەواڵەکە کەم و کورییان هەیە. بروانە نووسراوی کاریت ١٩٢٠، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلیستان، ژمارە ٣٧١٥٠٦٧ و ژمارەی ١٩١٩/٧/١٠ ئۆفیسی هندو مەسەلەی کورد لە نووسینی دکتور شیرکۆ سالی ١٩٣٠.

٣٠- ئەرشیفی وەزارەتی جەنگی فەرەنسا، ١٩١٩/١٢/١٧.

٣١- ئەرشیفی وەزارەتی جەنگی فەرەنسا، ١٩١٩/١٢/١١ هەمان سەرچاوە.

٣٢- دیمانەی ئەمین عالی بەدرخان دەگەڵ بسفوردا.

٣٣- ئەرشیفی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا ٣١١-٣١٢

٣٤- نووسـراوی حـیزبی دیموکـراتی کـوردسـتان بۆ کـونسـولی باڵای بەریـتـانیـا لە قـەسـتـەنتـەنیـیـە ٨/ ١٠/ ١٩١٩، وەزارەتی جەنگی فەرەنسە.

٣٥- وەزارەتی جەنگی فەرەنسا

٣٦- هەمان سەرچاوە

٣٧- وەزارەتی جەنگی فەرەنسە

٣٨- راپۆرتی کۆنسولی باڵا روبک، قەسـتەنتەنییە ٩/١٢/١٩١٩، تۆفلیسی هند.

٣٩- راپۆرتی ١٦/ ٤/ ١٩٢٠ وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیستان.

٤٠ - پاشکۆی ژمارە ٥، راپۆرتی ٢٢/ ١٠/١٩١٩ وەزارەتی جەنگی فەرەنسا.

٤١- ١٦/ ٧/ ١٩٢٠ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا ٣١٢، ٣١٣ ل. ١٦٩.

٤٢- نامەی ٥/ ٤/ ١٩٢٢ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا ٣١١/ ٣١٣.

٤٣- نامـــە بۆ ســـەرهەنگی دووەم پایک ٢٣/ ١/ ١٩١٨ تەفلیس، وەزارەتی کـــاروباری دەرەوەی ئینگلـستان. ٣٧١٥٠٦٨.

٤٤- نووسراوی شوباتی ١٩٢٠ ی گاریت وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٥٠٦٧ .

٤٥- وەزارەتی جەنگی فەرەنسا.

٤٦- بڕوانە کۆمیـسیونی کینگ کرین، نووسینی هاری هاوڕد، ل١٧٢- ١٧٣ و ٢١٥.

٤٧- عەبدولرەحمان قاسملو، کورد و کوردستان، لەندەن ١٩٦٥، ل ٤٩

پەیمانی سیڤەر کە جورە سەرابێتکی ئوتونومی و سەربەخۆیی بۆ کوردان دەنواند، لە راستیدا راگەیاندنی ژیانەوەی تورکیا بە رێبەرایەتی مستەفاکەمال و لە دایک بوونی عێراقی سایەی حکومەتی فەیسەڵ پاشا بوو.

مەسەلەی هێشتنەوەی موسڵ بە مۆڵەقی کە پەیمانی لۆزان یش نەیتوانی چارسەری بکات، خۆی لە خۆیدا زەمینە خۆشکردن بوو بۆ دەستی پێکردنی سالانی تەنگ و تارو گوشار و سەرکوتکاری.

کوردەکان کە کەوتنە سایەی حوکمی هەرسێ دەوڵەتی تورکیا و ئێران و (لە رێگەی عێراقەوە) ئینگلستانەوە ئیدی دڵخۆشی خۆیان بەوە دەدایەوە کە دەتوانن سورد لە ناکۆکی ئینگلیز و تورک یا تورک و ئێران و یان ئێران و ئینگلیز ببینن.

لە تورکیا دا «یانەی کوردەی قەستەنتەنییە کە توانی بووی هەندێ یارمەتی روالەتی لە یونان وەربگرێ، لە سەرەتادا هەوڵی دا سوود لە ناکۆکی نێوان ئینگلستان و تورکیا ببینێ، ئەمە لەسەروبەندێک دا بوو کە «لوید جورج» ئامادە بوو خۆی لە شەڕی مستەفاکەمال رزگار بکات، بەلام ئەم هەوڵ و کۆششە نەگەییە ئەنجام و دەوڵەتی تورکیا شۆڕشی سالی ١٩٢١ی کوردەکانی شکاند و ئەو یارمەتیەی کە کوردەکان بە تەما بوون لە بەغداوە بیانگاتێ هەرگیز نەگەیی.

لە ئێران دا، سمکۆ کە هەست بە مەترسی سیاسەتی «مەرکەزیەتی» رەزاخان ی شای ئایندەی ئێران دەکات هەوڵ دەدات سوود لەو ناخۆشیەی نێوان ئینگلیز و ئێران وەربگرێ کە لە ناکامی ئیمزا کردنی پەیمانی ١٩١٩ وە کەوتبووە بەینیانەوە، ئەم پەیمانە هەرگیز لەلایەن ئەنجومەنی ئێرانەوە پەسند نەکرا. بەلام تورکان خیانەتیان لە سمکۆ کرد و ئینگلیزەکان پشتیان تێکرد.

لە عێراق دا، شێخ مەحمود بە پێی بەلگە و قەوالان دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە لەوەی پتر پشت بە ئینگلیزان نەبەستێ، بۆیە روو دەکاتە تورکان کە بەلای کەمەوە هێندەی روو دەدەنێ کە ئومێدی ئەوەی لا دروست ببێ کە بتوانێ ناکۆکی و ململانێی نێوان تورک و ئینگلیز بە قازانجی «قەڵەمرەوی حکومەتەکەی» بقۆزێتەوە، لێ ئەو حیسابی یەک شتی نەکردبوو: حسابی ئەوەی نەکردبوو کە دووپاشا لە هەرێمی عێراق دا جێی نابێتەوە و ناگونجێ.

ئەوەی سەیرە و جێی داخە ئەمەیە کە شۆڕشەکانی کورد تا پتر لە زەمانی ئێمە نزیک دەبنەوە ئەوپەردەی بێ دەنگیەی کە دەکەوێتە سەریان، قورستر دەبێ.

## فەسڵی یەکەم

## شۆڕشی کوردستانی تورکیا ۱۹۲۱[1]

ڕێبەرانی ئاکنجی قەستەنتەنییە کە نەیانتوانی بوو باری سەرنج و سۆزی هێزە گەورەکان، بەتایبەتی بەریتانیای مەزن بەلای خۆیان دا رابکێشن، دەگەڵ کەمالیەکانیش دا هیچیان بە هیچ نەکرد و چ سەرکەوتنێکیان بەدەست نەهێنا.

مستەفاکەمال کە لە ساڵی ۱۹۲۰ دا لە باری عەسکەرییەوە وەزعی دژوار و خراو بوو، پەیمانێکی دەگەڵ کوردەکاندا بەست، کە بە گوێرەی سەرچاوە کوردییەکان، تەنانەت پەیمانی دا کە هەر کە سوپای یونان ئاودیوی سنوری تورکیا کرا و پەیمانی ئاشتی بەسترا دان بە هەمان ئەو مافانەدا بنێ کە پەیمانی سیڤەر دانی پێدا نابوون و بڕیارەکانی پەیمانی ناوبراو لە مەڕ کوردان جێبەجێ بکات.»

لێ لە ساڵی ۱۹۲۱ دا هەر کە خەتەری لەسەر نەما، هەموو وەعد و بەڵێنەکانی خۆی فەرامۆش کرد و وەک بڵێی هەرگیز قەول و قەرارێک لە نێوان دا نەبووە.

لە بەهاری ساڵی ۱۹۲۱ بەملاوە کوردستانی تورکیا چەندین شۆرش بە خۆوە دەبینێ، ئەم شۆڕشانە پتر ناوچەیی بوونە و زادەی نارەزایی خەڵکی کورد بوونە، لەو هەموو گوشارەی کە کەمالیەکان کردویانەتە سەریان بۆ سەرباز و پارە و مەڕ و ماڵات بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستیەکانی جەنگی یونان و تورکیا.

بەڵام هەر ئەم شۆڕشانەن کە پەرە دەسەنن و رەهەند و مەودای شۆڕشی گشتی پەیدا دەکەن.

تورکەکان لەم ڕووەوە سیاسەتێکی تایبەتی خۆیان هەیە و تاکو ئەمڕۆش بەردەوامە، ئەویش ئەوەیە پەردەی بێدەنگیەکی تەواو بەسەر ئەم شۆڕشەدا دەکێشن و هەر بۆیەش زۆر لایەن و رەهەندی ئەم شۆڕشە ئاشکرا نیە و نەکەوتۆتە بەرچاوان.

لە سەرەتادا، شۆڕشگێرانی کورد لە ناوچەی ماردین و بە فەرماندەیی پەریزاد بەکر، کە فەرماندەی سوپای چوارەمی لەشکری سەردەمی عەبدولحەمید دەبێ، چەندین سەرکەوتن وەدەست دێنن.

لە حوزەیرانی ۱۹۲۱ کەمالیەکان، هەندێ نوێنەری خۆیان بەمەبەستی گفتوگۆ بۆ لای پەریزاد بەکر دەنێرن: کوردەکان داوای ئۆتۆنۆمی بۆ بازێرە کوردنشینەکان دەکەن ، کوردەکان

داوا لە دەوڵەت دەکەن هەموو فەرمانبەرە ئیداری و جەندرمە تورکەکان لە کوردستان بگێڕێتەوە و هەموو سەربازانی کورد لە خزمەتی عەسکەری مەرەخەس بکات[٢].

شاندی نوێنەری مستەفاکەمال دەڵێ کە لەم بارەیەوە دەسەڵاتی بڕیادان و قایل بوونی تەواوی نیە و بۆ ئەنکەرە دەگەڕێتەوە.

لە ئەیلولی ١٩٢١ دا شاندێکی تازە لە نوێنەرانی ئەنجومەنی نەتەوەیی و دەوڵەت بەرەو وان و بەتلیس دەڕوات. لێ لە راستیدا کەمالیەکان گفتوگۆ و رێکەوتنیان مەبەست نابێ، بەڵکو ئەمە جۆرە چاووراوێک بوو بۆ وەخت بە فیڕۆ دان و دامرکانەوەی ئەو بارە هەڵچووە میللیەی کە لە ئارادابوو. بەڵام تورکەکان لە ئوکتوبەری ١٩٢١ دا کەوتنە «تازە کردنەوەی بونیاتی ئیداری وڵات» و سەربازگیری و ئەمەش دەبێتە مایەی هەڵگیرسانەوەی سەر لەنوێی شۆڕش، شۆڕش پەرەدەستێنێ و بەرەو دەرسیم دەکشێ.

## ١
## ئینگلیزەکان و شۆڕشی کورد

فەرەنسایییەکان چ گومانێکیان لەوە نەبوو کە ئەم شۆڕشە ئینگلیزیەکان هەڵیان گیرساندووە، چونکە دەیانویست بەم کارە هەڕەشەی کەمالیەکان لە ویلایەتی موسڵ و عێراق دوور بخەنەوە. ژەنەراڵ «پلە Pelle»ی نوێنەری باڵای فەرەنسە لە رۆژهەڵاتدا، دڵنیا بوو لەوەی کە ئینگلیزەکان دەیانەوێ بە هەر شێوەیەک بووە پەرە بە شۆڕشی کوردان بدەن و بە هێزی بکەن تا بتوانن لە نێوان فەیسەڵ و ناسیونالەکاندا، گرۆپێک لە زێرەڤانانی بەهێز بێننە ئاراوە.[٣]

لێ ئێستا کەم و زۆر روون بووەتەوە کە ئەگەر ئینگلیزەکان «دەستیان» لە هەڵگیرساندنی ئەم شۆڕشەدا بووبێ، لە سنووری هەڵگیرساندنەکە هێوەتر نەرۆیشتوون.

بۆ یەکەمجار بیری « دەست تێوەردان) لە پایزی ساڵی ١٩٢٠ دا هاتە ئاراوە. بە پێی نەخشەیەک کە لەم سەروبەندەدا ئامادە کرا بڕیار درا کە بە شێوەیەکی کاتی «جەزیرە» داگیر بکرێ، چەک بە کوردان بدرێ و گەرەنتی ئەوە وەربگیرێ کە «پاش ئازادی ناچنە ژێرسایەی حوکمی فەرەنسە».

ئەم پرۆژەیە لە ئەنجامی قایل نەبوونی وەزیری بەرعوزەی کاروباری هند کە چەک بە کورد بدرێ لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی وەلانرا (١٩٢٠/١/١٨) لە حوزەیرانی ١٩٢١

دا سێرپەرسی کوکوس هاتە سەر ئەوەی کە ئەگەر شکستی کۆنفرانسی لەندەن (شوبات-ئازار ۱۹۲۱) ببێتە مایەی شەڕی ئاشکرادەگەڵ کەمالیەکاندا، ئەوا ئەم نەخشەیە جێبەجێ بکات. بۆیە بەو پەڕی ئەهێنی پێشنیاری کرد کە ئەگەر بەریتانیا بیەوێ ئەم نەخشەیە پەسند بکات ئەوان بە هاوکاری نوئێل Noel و یەکێک لە ئەندامی مالباتی بەدرخان کە بە رواڵەت هەمیشە «داردەستی» ئینگلیزن، ئەم کارە راپەڕێنن.

لە ئوکتۆبەری ۱۹۲۱ لەگەڵ هاتنی خەلیل بەدرخان و چوار ئەندامی یانەی کوردی قستەنتەنییە دا کارەکە شێوەیەکی تازەی گرتەخۆ[٤].

بەپێی گوتەی خەلیل بەدرخان، کۆمیسەری باڵای بەریتانیا لە قستەنتەنییە کە مۆڵەتی هاتنی دابوون، ئاگاداری کاری ئەوان بوو ئومێدی «سەرکەوتنی» بۆ کردبوون.

## ٢

## نەخشەی خەلیل بەدرخان

خەلیل بەدرخان لە دیدارێکی دا دەگەڵ سێرپەرسی کوکسی کۆمیسەری باڵای بەریتانیا لە عیراق دا، گوتبووی ئەو شۆڕشەی کە یانەی کوردی قستەنتەنییە «شەش ساڵە تەدارەکی دەبینێ» لە ئان و ساتدایە کە هەڵبگیرسێ و کوردی دەرسیم و دیاربەکر و ولن و بەتلیس هەموو وێکرا هەڵدەستن ئەوە ساڵێکە باج بە تورکان نادەن و چاوەنۆڕی منن کە وەکو نوێنەری ماڵباتی بەدرخانیەکان، خاوەندارێتیان بکەم و یەکیان بخەم!

خەلیل بەدرخان ئاشکرایشی کردبوو کە هاتووە داوای کۆمەک لە کومیسەری باڵا بکات! جا بۆ ئەوەی هانی بدات بۆ دانی ئەو کۆمەکە، بە زمانێک دەیدوێنێ کە بە داخەوە نە لەرووی شێوە و نە لە رووی ناوەرۆکەوە هیچ تازەییەکی تێدا نیە.«[٥].

ئەم ئەوە مەغرورەی میر بەدرخان دەڵێ « ئێمە بە دڵ و بە گیان لە گەڵ بەریتانیادایین. ئێمە خوازیاری سایەو پەنای بەریتانیایین، و ئەگەر بەریتانیای مەزن یارمەتی ئێمە بدات، ئەوا ئێمەش لەلای خۆمانەوە لە نێوان عێراق و دژمنانی دا واتە روسیا و تورکیا، وەکو وڵاتێک دەبین بە قەڵغانی بەریتانیا. هاوکاری ئەرمەنی و مەسیحیەکان دەکەین».

ئەو کۆمەکەی کە خەلیل بەدرخان لە بەریتانیای چاوەنۆڕ دەکرد بەر لە هەموو شتێک ئەوەبوو کە چەند ئەفسەرێکی ئینگلیزی وەکو میجەر نوئێل بنێرێ کە بە جلی کوردییەوە بچنە ناوچەکە تا بە چاوی خۆیان وەزعەکە ببینن و بە دەوڵەتی ئینگلیستان رابگەیەنن کە « ئەو شۆڕشەی من بەڵێنم داوەتێ راستە یان نا.»

خەلیل بەدرخـان داوای چەکـیش دەکـات، بەلای کـەمـەوە دوو تۆپی جـەوەلی، چەند رەشاشـێک، ٥٠٠٠ تفەنگ و تەقـەمەنی، وەکـوی «وەجـبەی یەکەم» و پاشـان چەک و تەقەمەنی پێویست، بەلام لەسەری دەڕوا و دەلێ: «من پارەم ناوێ و ئەوەی بە منی دەدەن خۆی لەخـۆیدا مامـەلەو سەودایەکی ئیـعتـباریە و قەرزێک دەبێت، هەر کە کوردسـتانی سەربەخۆ دامەزرا، دەدرێتـەوە!»

بەغـرورەوە لەســەری دەڕوات، «ئەگــەر ئێــوەش رازی نەبن ئەوا من درێژە بە هەوڵ و کۆششی خۆم دەدەم و ئەگەر توانا و ئیمکاناتی هەلگیرساندنی شەڕێکی رێک و پێکیشم نەبێ، بەلایکەمەوە دەتوانم شەڕێکی ناڕێک وپێک هەلگیرسێنم!»

## ٣

## کۆمەکی یونان

بەپێی گوتەی سیر پرسیی کوکس شاندێک بە سەرۆکایەتی خەلیل بەدرخان پێشتر ١٠/ ٠٠٠ لیرەی لە بانکی قەسـتەنتەنییە وەرگرتبوو، بۆ وەرگرتنی پارەی پتر بروسکەی بۆ دەولەتی یونان کردبوو خەلیل بەدرخان، بۆ پەیوەندی کردن بە یونانیەکانەوە رەمزی تایبەتی دەسـخـتیاردا بوو. دەولەتی یونان بەلێنی یەک کەشتی چەکیشی دابوونێ. بەو مەرجەی ئینگلیزەکان رێ بدەن ئەم بارە لە عێراقەوە تێ بپەڕێ.

## ٤

## بڕیاری چەرچیل

هەندێ مەفرەزەی چەکداری پەراگەندەی تورک لە هەیقی حوزەیران بەملاوە، رەواندزیان داگیر کردبوو، ئەنجومەن و کۆڕە رەسمیەکانی بەریتانیا بەرەبەرە گومانیان پەیدا کرد و ئەم کارەیان بە پیلانێکی کەمالیەت دژ بە عێراق دەزانی و بۆیە بە رای سێر پرس کوکس ناسایی بوو کە بایەخ بە بەرزکەی یارمەتی دانی دژمنانی تورک بدرێ.

بۆیە وەزیری کۆلۆنیەکان رادەسپێرێ یارمەتی ئەو کەسانە بدات کە خەلیل بەدرخان دەیهەوێن. بەمـەرجێ کـەسـانێک بن وا بزانرێ کـە خـۆیان ئەم کـارەیان کـردووە و هیچ دەولەتێک پشـتـیـوانیـان ناکـات، تا دەولەت بتـوانێ خـۆی لە بەرعـۆدەیی ئەو کـارانە بپەرێنێتـەوە کە ئەوان دەیکەن.» لە ئەنجامـدا کۆمـیـسـەری بالا دوورپاتی دەکاتەوە کە دەولەتی بەریتـانیـا لەم بارەیەوە هەمـان کـار بکات کـە تورکـەکـان دەرهەق بە ناڕەزایی

بەریتانیا دژی بوونی ئەفسەرانی تورک لە رەواندز دا دەبکات.

دەربارەی پەراندوونەی چەک و تەقەمەنی لە رێگەی عێراقەوە سێر پرسی کوکوس دەڵێ کە جۆرە چاوپۆشییەک لەم کارە بکەن با «کوردەکان بە باشترین شێوە سودیان لێ وەربگرن.» بەلام لە هەمان کاتدا داوا دەکات کە بەریتانیا بەخۆی چەکیان نەداتێ.

بەلام پاش چەند رۆژێک چەرچیل بە رەسمی دەستور بە سێرپرس کوکوس دەدات «کە لەم کاتەدا خۆی لە هەموو جۆرە هاندان و دەست بە پشتادانێکی کوردان دوور بگرێ.

## ٥

## سەرکوتکردنی شۆڕشی کوردان

رژێمی مستەفاکەمال لە مانگی ١٠/١٩٢١ دا دووەمین رێککەتننامەی دەگەڵ فەرەنسەدا ئیمزا کرد و بەمەش هێندەی دی پشت ئەستور بوو و چ ترسێکی نەما. ئیدی ئەوە بوو شۆڕشی ت٢/١٩٢١ شوباتی ١٩٢٢ی کورد لەلایەن جەواد پاشاوە تێک شکێنرا[٦].

لە بەغداش، رەفعەت بەگ کە دیتبووی بەریتانیا هیچ جۆرە یارمەتیەکی شۆڕش نادات، لە کۆتایی سالی ١٩٢١ دا بۆ قەستەنتەنیە چوو بووە و خەلیل بەگ کە دەبینێ ژیانی لەوێندەر دەکەوێتە مەترسیەوە، تا هەیڤی ئاپاری ١٩٢٢ بەو هیوایەی پۆستێکی وێدەن لە بەغدا ئەم پێ و ئەو پێی کرد و لەوەدا بە ناچاری بۆ قەستەنتەنییە گەڕایەوە.[٧]

### سەرچاوە و ژێدەران

١- دکتۆر شێرکۆ (جەلادەت بەدرخان)، مەسەلەی کورد ١٩٣٠

٢- نووسراوی ٢٩/١١/١٩٢١ی جەنەراڵ پەلە، کونسولی بالای رۆژهەلات، دەربارەی شۆڕشی کورد. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا ٣١١-٣١٣

٣- هەمان سەرچاوە

٤- بەتایبەتی مەولانا زاد رەفعەت بەگ و مستەفا پاشا، کە دەچێتە رەواندز و مەهاباد و دیدەنی سمکۆ دەکات.

٥- سەبارەت بەم رووداوە، بروانە راپۆرتی ٢٨/١٠/١٩٢١ ی سێرپرسی کوکس، ئۆفیسی هند.

٦- بروسکەی ١١/١١/١٩٢١ ئۆفیسی هند.

٧- کونسولی بالا، بەغدا، وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ٨٩-١٠-٣٧١

## فەسڵی دووەم

## سمکۆ[1]

ئیسماعیل ئاغای ناسراو بە سمکۆ کوڕی محەمەد ئاغای سەرۆکی هۆزی شکاکە، کە لە ساڵی ١٩١٨ دا نزیکەی دوو هەزار خێـزان بوو ( هۆزی شکاک دوو تیـرە بوون: عەبدۆییەکان، کە نیشتەجێی دەوروبەری چەهریقی ئەو پەڕی باکووری ورمێ بوون و راستەوخۆ وابەستەی سمکۆ بوون، و مامەدەییەکان کە لەبەشی باشورتری دەڤەرەکەدا دەژیان و سەر بە عومەرخانی مامی سمکۆ بوون، کە ملیان بۆ حوکم و دەسەڵاتی سمکۆ دابوو.)

پاش مردنی محەمەد ئاغا، سەرۆکایەتی هۆز کەوتە دەستی جەعفەر ئاغای برا گەورەی سمکۆ، پایەو دەسەڵاتی جەعفەر ئاغا لە ئاستێک دا بوو کە نیزامولسەڵتەنەی فەرمانڕەوای تەورێز هاتە سەر ئەوەی ئەم کۆسپە لەسەر رێگە لابدات (پێشتر تزاری روسیە نیکۆلای دووەم، جەعفەر ئاغا و عەبدولرەزاق بەدرخان و سەید تەهای شەمدینانی بۆ روسیا بانگهێشت کردبوو). نیزامولسەڵتەنە کە بینی ئاژاوە و پاشاگەردانی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە، بەتایبەتی لە دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٠٦ وەناردی بە شوێن جەعفەر ئاغای شکاک دا کە بێت بۆ تەورێز تا دەربارەی ئەمن و ئاسایشی دەڤەرەکە گفتوگۆ بکەن، ئیدی ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٠٧ دا بە فێڵی ئەو بۆسەیەکی بۆ نرایەوە و جەعفەر ئاغایان بەبەرچاوی ئەوەوە کوشت.

ئیدی لەو کاتە بەدواوە سمکۆ کەرب و کینەیەکی زۆری لە ئێرانییەکان هەڵگرت و کەوتە ئەوەی هاوپەیمانانێک دژی ئەوان پەیدا بکات هەربۆیەش هەندێ جار رووی دەکردە تورکەکان و هەندێ جار دەچووە نک رووسەکان و جاروبارێش پەنای وەبەر ئینگلیزەکان دەبرد... جا هەر لەبەر ئەمەشە کە پەیوەندی دۆستانە دەگەڵ کاپتن دیکسۆنی بەرعودەی سوپایی بەریتانیا لەوان دەبەستێ.

لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم دا سەرکردایەتی سوپای بەریتانیا حەزی دەکرد ئەرمەنییەکان و ئاشوورییەکان و کوردەکانی سمکۆ دژی عوسمانییەکان یەک بخات و بەمە تۆڵەی هەرەسهێنانی جەبهەی روسیا بکاتەوە. لێ سمکۆ خۆی لە گەمەی هاوپەیمانەکان نەدا و ملی بۆ ئەم کارە نەداو لە ١٩١٨/٢/٢٥ مارشیمونی سەرۆکی ئاشوورییەکانی

کوشت.

سمکۆ که دوای پاشەکشەی هێزەکانی عوسمانیان و ئیمزای پەیمانی شەڕ وەستان لە هەیڤی ۱۹۱۸/۱۰ بوو بوو بە گەورە و یەکە پیاوی دەڤەرەکە، بەرەبەرە ناوچەکانی نێوان دەریاچەی ورمێ و سنوری ئێران و عوسمانی داگیر کرد.

دیارە هەرەسی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی لە دوا ساڵەکانی پاشایەتی ماڵباتی قاجاریان دا، یارمەتیەکی زۆری سمکۆی دا کە ئەو سەرکەوتنانە بەدەست بێنێ، ئێران بۆ بەرەڤانی لە خاکی بەرینی خۆی تەنێ ۱۲۰۰۰ جەندرمە و ۷۰۰۰ سەربازی هەبوو! تا کودەتای ساڵی ۱۹۲۱ ی رەزاخانش سەربازەکان لە ژێر فەرماندەیی بێگانانَدا بوون، واتە لە ژێر فەرماندەیی ئەفسەرانی بێلەروس دابوون و ئازووقە و پێداویستی سەربازەکان لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیاوە دەدرا، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا یارمەتیەکی فراوانی بە دەوڵەتی ئێران کرد کە لە کۆتایی جەنگ دا تووشی ناوبوتی بوو.

دەوڵەتی ئێران هەر لە سەرەتاوە هەوڵیدا کە سمکۆ لەنێو بەرێ. ئەوەبوو بەستەیەک بابەتی تەقینەوەیان بۆ نارد، هەرچەندە بۆمباکە تەقیەوە و یەکێک لە براکانی سمکۆ کوژرا، بەڵام سەرۆکی هۆزی شکاک لەم پیلانە دەرباز بوو و بەسەلامەتی دەرچوو.

لە هاوینی ۱۹۱۹ دا سمکۆ رەزاییەی «ورمێ»ی گرت و چەکدارەکانی شاریان تاڵان کرد. ئەوسا دەوڵەتی ئێران هەرچی هێزی لە ناوچەکەدا هەبوو هەمووی کۆ کردەوە و بە فەرماندەیی عەقید فیلیپوف ی روسی کەلە خزمەتی تیپی قوزاق دا بوو، ناردی بۆ سەر سمکۆ.

فیلیپوف لە ناوچەی شاپوردا (سەلماسی ئێستا -وەرگێر) هێرشی کردە سەر سمکۆ و تا چەهریق راوی نا، بەڵام لەبری ئەوەی لەنێوی بەرێ، لەگەڵی کەوتە گفتوگۆ و ئەویش بەڵێنی دا کە دەست نەخاتە کاروباری ناوچەی رەزاییەوە.!

پاش گەڕانەوەی فیلیپوف، سمکۆ سەرلەنوێ هەموو ئەو ناوچانەی گرتەوە کە پێشتر گرتبوونی.

ساڵی ۱۹۲۰ ونیوەی یەکەمی ساڵی ۱۹۲۱ تا رادەیەک نارام بوو، بەڵام هاتنی هێزی یەدەک و هیمداد لە تارانەوە بۆ تەوریز، سمکۆی ناچار کرد بەر لەوەی ئەو هێزانە لەگەڵی بکەونە شەڕ، سابلاغ (مەهاباد) بگرێ.

## ١
## گرتنی سابلاغ (مەهاباد) پایزی ١٩٢١

تەهای زاوا (تەها، لە راستیدا زاوای جەعفەرئاغای برا گەورەی سمکۆ بوو، واتە مێردی گولزار خانمی کیژی جەعفەر ئاغا بوو) و راوێژکاری سمکۆ[٢] لە ١٩٢١/١٠/٦ دا بە چەند سەد سوارێکەوە هێرشی بردە سەر سابلاغ (مەهاباد) ٥٥ جەندرمەی ئێرانی بەرگرییان لە شار دەکرد و چارەنووسی جەنگ نادیار بوو، رۆژی دواترسمکۆ بە دوو هەزار سوارەوە هاتە یارمەتی دانی سەید تەها، زۆر بە خێرایی سەنگەرەکانی پێشەوەی تێک شکاند و جەندرمەکانی بۆ ناوشار راونا، لەوێندەر بێرەحمانە قەتڵ وعامی کردن.[٣]

تێکشکانی هێزە دەوڵەتیەکان حەیا بەرە بوو، چوار سەد جەندرمەی ئێرانی و هەموو ئەفسەرەکانیان جگە لە دوو سێ کەسیان لەگەڵ فەرماندەکانیاندا بەدیل گیران. کەوتنی شاری مەهاباد زیاتر ئەنجامی بێ توانایی فەرماندەی هێزە ئێرانیەکان بوو کە کەمترین تەگبیری بۆ بەرگری لەشار نەکردبوو و جەندرمەکانی مەشق دا نەدابوو، بەڵام هۆی راستەقینەی شکستی مەهاباد تەوقیف کردنی دوو کەسی خانەدانی کورد بوو، کە ئەمە رقی خەڵکی شارەکەی هەستاند بوو.

هێزەکانی سمکۆ دوای گرتنی مەهاباد کەوتنەی تاڵانکردنی شار و ئەم کارەش بووە هۆی ئەوەی کە بەشێکی زۆری خەڵکەکە لێی دوور بکەونەوە. لە ئەنجامی شەردا یەکێک لە گەورە پیاوانی شار بە نێوی قازی لەتیف کوژرا و ماڵی هەموو گەورە پیاوانی دیکەش تاڵانکرا. دوای چەند هەفتەیەک سمکۆ لەگفتوگۆیەکی دا دەگەڵ مستەفا پاشای نێردەی یانەی کوردی قستەنتەنیە باسی ئەم رووداوانەی کرد. بە گوتەی ئەو کاتێ کە لە مەهاباد نزیک بووەوە ناردی بە شوێن سەران و گەورە پیاوانی شاردا کە بێن بۆ لای بەڵام ئەوان نەچوون، خەڵکی شاریش نوێنەرێکی خۆیان بۆ لای ئەو (نەنارد). سمکۆ لەسەری دەروات و دەڵێ کە ئێرانیەکان شاریان کرد بە شەرگە و خۆیان دایە پەنای دیوارەکانی شار و لە ئەنجامدا شار بەزەبری هێرش و پەلامار گیراو، خەڵکی شار بوونە قوربانی ئەم کارە، ئەوە بوو شکاکەکانیش زەرەروزیانیان دا.

بەڵام سەبارەت بە تاڵانکردنی شار سمکۆ پێی وایە هەر چەندە ئەو رازی نەبوو، بەڵام ئەمە کارێک بوو رێی لێنەدەگیراو، دەڵێ: «هەموو دەمەو دڵی خەڵکەکە بدەمەوە و ئەمەیان لە دڵ دەربێنم.»[٤]

لێ وا دیارە هەولی سمکۆ لەم بارەیەوە بێ سوود بووە، چونکە تاکو ئەمڕۆش پیاوماقولانی مەهاباد، بە خراپی باسی دەکەن، ئەگەرچی بە یەکێک لە ناسیونالستە گەورەکانی کوردی ئێرانیش دەژمێردرێ.

لەد وای داگیر کردنی مەهاباد، ئیدی هێزە دەولەتیەکانی ئازەربایجان بە سەرۆکایەتی سەرهەنگ «عەقید» لوند بەرگی سویدی دووچاری زنجیرەیەک تێشکان بوون.

سمکۆ هێرشی کردە سەر هێزێکی میلیشیایی حکومەتی کەلە خەلکی ئازەری پێک هاتبوو و ئەمیر ئەرشەد سەرکرایەتی دەکرد، سمکۆ ئەم هێزەی بەزاند و ئەمیر ئەرشەد و دوو سەد چەکداری کوشت.

ئەوجا بایدایەوە سەر هێزەکانی سەرهەنگ لوند بەرگ کە لە ئەنجامی کەمی تەقەمەنی دا، زوو بەزوو پاشەکشەی کرد، جەندرمەکان تفەنگی ئینگلیزیان پێ بوو، کەچی ئەو فیشەک و تەقەمەنیانەی لە دەڤەرەکەدا هەبوون، هی تفەنگی روسی و فەرەنسی بوو.(٥)

دوو تێشکانی دیکەش، یەکەمیان لە ناوەراستی ١١/١٩٢١ لە ئەزدیکان و دووەمیان، لە سەرەتای ئەیلولی ١٩٢١ لە قەرەتەپە، هێزە دەولەتیەکانی ناچار کرد کە لەسەرەتاکانی مانگی ١٢/١٩٢١ دا خوی چۆل بکات.

پاش ئەو زنجیرە سەرکەوتنانە ئیدی داشی سمکۆ بە جۆرێ سوار بوو کە هەموو تیرە کوردەکانی ئەو دەڤەرە گویرایەلی فەرمانی بن، ناوچەکانی ژێردەسەلاتی سمکۆ هەموو رەخی رۆژئاوای دەریاچەی رەزاییەی گرتەوە، هەر لە خویەوە بیگرە تا دەگاتە بانە و بەسایەی هاوپەیانێتی دەگەل تەهادا، تا وەکو بیرە کەپرەی دەڤەری زێباریش رۆیی.

٢

## سمکۆ

ئێستا تارادەیەکی باش سەربەخۆیە. سمکۆ هەرچەندە ئێرانیەکان (حەسەنی ئەرفەع) و تورکەکان (ئوزدەمیر) بە «تالانچی» و «رێگر» و «شەقاوە»یان « هیچ و بەرەللا» ی ئێو دەبەن، بەلام لە حەقیقەت دا کەسایەتیەکی ئالۆز و دژوار بوو. وێرای ئەو بانگەشانەی کە ناسیونالیستانی کوردی ئێرانیش دەستیان تێدا بوو و دژی دەکرا و دەیانویست وای بنوێنن کە شەقاوەیەکی سادە و جەنگاوەرێکی فیۆدالە، ئەتەوەپەروەرێکی راستەقینە بوو.

سمکۆ پیاوێکی پر ئەزاکەت و سەلار بوو، جوانی جل و بەرگەکەی زۆر کاری لە ئینگلیزەکان کرد، بلوزێکی قویچەداری لەبەر بوو، پانتۆلەکەی دەتکوت دەستدروی

**وساڤیل رۆیە ( ساڤیل رۆ: فرۆشگەیەکە لەلەندەن.) و جووتێ چەکمەی رووسی جوانی لەپێ بوو، ئەم پیاوە قۆز و تەیمەت جوانە، کە رواڵەت و سیمای ئەوروپاییانی هەبوو، سمێڵەکانی لە سمێڵی (ئەفسەرێکی ئینگلیز دەچوون)[٦] و زەردەخەنەیەکی نارێتە (بە شەرم و شکۆ)ی هەبوو.**

بارەگاکەی لە چەهریق ی نزیکی سنووری تورکیا و لەوبەری باکووری دەریاچەی ورمێ دابوو، لە کەناری ئەو قەڵایەدا کەبابی لەسەر تاوێرێکی ناوەندی روباریدا دروستی کردبوو و کە بەراستی لە هێلانە هەڵۆیان دەچوو، کۆشکێکی گەورەی هاوچەرخی دروست کردبوو کە موبەق و تەویلە و شتی دیکەشی لە دەوری دروست کردبوو ئێرانیەکان دوای شکستی سمکۆ، پیانۆیەکیان لەم کۆشکەدا دۆزیەوە[٧] لێ مێژوو باسی ئەوە ناکات کە چۆن ئەم پیانۆیە لەم نێوەندە کێوی و بەربەرییەی کوردستاندا ئاوارە بووە و کێ لێی داوە.

نوێخوازی سمکۆ یەکێک بوو لە دیزەدە سەیردکان، خەنیکی تەلەفۆنی لە بارەگاکەی خۆیەوە لە (چەهریق) بۆ سابلاغ و دیلمان و زۆربەی ناوچە سەرەکییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی راکێشابوو.

ئێرانییەکان زۆر باناوو ناوەوە دەیگێڕنەوە کە سمکۆ نەیارانی خۆی لەسەر قەڵاتەکەی پاییەوە هەڵدەدانە خوارەوە و دەیکوشتن. بەڵام ئەم حیکایەتەی خوارەوە کە گێڕانەوەی یەکێکە لەو ئەفسەرە ئێرانییانەی بەشداری سەرکوتکردنی شۆڕشی سمکۆی کردووە ئەوە دەسەلمێنێ کە سمکۆ ئەو کەسە (سادە و ساکارە) نەبووە کە ئێرانییەکان دەیانەوێ وەهای نیشان بدەن.

**لە پاش جەنگی ئەزەیکان (ناوەڕاستی ١٩٢١/١١) داوا لە یەکێک لە دەرەجەدارە دیلەکان دەکات، کە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو رەشاشە ئێرانییەی پیشان بدات کە لە ئێرانییەکانی گرتبوو، کابرای دەرەجەدار رازی دەبێت رەشاشە سەقەتەکەی بۆ بەکار بخاتەوە، مەخزەنێکی دەخاتە سەر و لەپڕ لوولەی رەشاشەکە بە ئەنقەستی کوشت دەکاتە سمکۆ.**

**سمکۆ خێرا خۆی بەسەریدا دەدات، دەستی دەگرێت و دەڵێ (سوپاس حالی بووم چۆنی بەکار بێنم) سمکۆ هێندە بوێری و دلێری ئەم پیاوەی کە ویستبووی لە نێو ئەو هەموو کوردەی کە دەوری سمکۆیان گرتبوو بیکوژێ، لە کاتێکدا چاک دەیزانی کە بێگومان خۆشی دەکوژرێتەوە، بە دڵدا چوو کە نەک هەر ئەو، بگرە هەموو ئەو دیلانەی لەگەڵیشی بوون ئازادی کردن و سەرو سکەی زێڕی بە هەموویان دابوو و فەرمانی دا تا سنووری ئێرانییەکان بەرێیان بکەن.[8]**

بەڵام سمکۆ لەوە دڵنیا بوو کە داروخان و هەرەسی رژێمی پاشایەتی ئێران جیابوونەوەی کوردستانی لێ دەکەوێتەوە جا چ بەسەربەخۆیی بێ، چ بە ئۆتۆنۆمی، لە ساڵی ١٩٢٢ دا و لەنامەیەکی تەوس ئامێزدا بۆ زەفەر ودەولە (حەسەن موقەدەم) کە ئەو سەردەمە فەرماندەی فەوجێک بوو لە ئازەربایجان وپاشان گەیە پلەی فەرماندەیی **هێزەکانی تەهران لە ئازەربایجان دەنووسێت: «ببینن چۆن میللەتانی بچووکی جیهان کە چواریەکی هێزە کوردەکانیش نین، خودموختاری خۆیان لە دەوڵەتانی گەورەی وەکو دەوڵەتی ئەڵمان وەرگرت. ئەگەر میللەتی گەورەی کورد نەتوانێ مافی خۆی لە تەهران وەربگرێ، پێی باشترە (لە هەل وەمەرجی ئاودا) بڕێ و نەمێنێ. دەوڵەتی ئێران بیمرێ و نەیەوێ ئێمە کوردستان**

**ئازاد و خودموختار دەکەین، ئیدی گوناحە بەخۆڕایی خوێنی خەڵکی کورد بێتە ڕژان.**[10]

وا دیارە سمکۆ هەلی بۆ نەرەخسا راو بۆچوونی خۆی دەربارەی شێوەی بەڕێوەبردنی ئەم خودموختاریە دەربڕێ.

لە وەلامی مستەفا پاشای نێردراوی یانەکانی کوردی ئەستەنتەنییەدا کە هاتبوو لە نیاز و نییەتی ئەو حاڵی بێ و لێی دەپرسێت ئایا ڕێکخراوێکی هەیە، بە تەمایە چۆن ئەو ناوچانەی ژێر دەسەلاتی خۆی بەڕێوە بەرێت، بۆچی ئالایەکی نییە، دەڵێ: **«لە حاڵی حازردا ڕێکخراوێکی تایبەتی نیە، من ئاغە کەسێکی کوردستانم، گرنگ ڕزگار کردنی ولاتە، گرنگ نییە کێ حوکمی بکات، من لەم ڕووەوە ج تەماح و تەمایەکم نیە، سەبارەت بە ئالا و بەیداخ و ئەم جۆرە شتانە، پێم وایە پێویست بەو شتانە ناکات. وەکو بە خۆت دەبینی هەر تیرەو تایفەیەکی شکاکان بەیداخ و ئالایەکی هەیە.**[11]

لە کۆتایی ساڵی ۱۹۲۱ دا ڕێبەرانی کوردی ئەستەنتەنییە کە خەریکی سازدانی شۆڕشێکی سەرلەسەری بوون (بەشی دو. م. فەسڵی یەکەم) بیریان لەوە کردەوە کە سمکۆش بێننە ناو ئەم شۆڕشەوە، ڕەنگە مەبەستی سەرەکی سەرداتی سمکۆ لە لایەن مستەفا پاشاوە هەر ئەمە بووبێ. کە لە سمکۆ دەپرسێت بۆچی لەبری شەڕی ئێران، جارێ ناچێتە هیمداد و هاوکاری کردنی کوردانی وان و ئەرزەرۆم و هەکاری و خەرپوت، کە زۆر بە توندی لەلایەن مستەفا کەمالەوە سەرکوت دەکرێن؟ سمکۆ لە وەلامدا دەڵێ کە نایەوێ بە یەکجارەکی پەیوەندی خۆی دەگەڵ تورکان دا ببڕێ، چونکە چەکی وێدەدەن.

لێ دوور نیە دەگەڵ بیرۆکەی دامەزراندنی (کوردستانی گەورەدا) نەبووبێ، چونکە بەخۆی نەیدەتوانی ببێ بە سەرۆکی! مستەفا پاشا بێ ئومێدی خۆی ناشارێتەوە و زۆر بە خراپی باسی سمکۆ دەکات و بۆ کورەکەی دەنووسێت: سمکۆ پیاوێکی نەزانە، بەیەنی خۆشە دەگەڵ ناسیونالیستە کەمالیەکاندا، چونکە چەک و تەقەمەنی وێدەدەن. لە کۆتاییدا دەڵێ: ئەم کارە ج ئەنجامێکی نییە.»

## ۳

## سمکۆ و ئینگلیزەکان

سمکۆ کە پێدەچێ بە تەگبیری تەها بووبێ، لە ساڵی ۱۹۱۹ کەوتە سەرکەلکەڵەی ئەوەی کە بەریتانیای مەزن بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و یارمەتی لەوان وەربگرێ. لە مانگی ۱۹۱۹ دا تەهای بۆ بەغدا نارد، تا ڕەزامەندی ئینگلیزەکان وەربگرێ کە

کوردستانی ئێران بخرێتە سەر ئەو دەوڵەتە کوردیەی کەلەو سەرو بەندەدا باسی دامەزراندنی دەکرا. تەهاچەزدین جار ویلسنی بینی و لە دوورە پەریزی ویلسن لەو مەسەلەیە، زۆر ناومێد بوو: ئینگلستان سەرگەرمی گفتوگۆی ئەوە بوو کە پەیمانێک دەگەڵ ئێراندا ببەستێ و بە گوتەی وەزارەتی دەرێی بەریتانیا . چەندە دەوڵەتی ئێران هەرگیز حوکمرانییەکی توند و تۆڵی کوردستانی ئێرانی نەکردووە، بەڵام جیا بوونەوەی یەکجارەکی ئەم دەڤەرە لە ئێران، بێگومان لە تاران دا هەروا هەنگامەیەک دەنێتەوە و دیارە ئەمە.ی سەرەتایەکی باش نابێ بۆ ئەو (سەردەمە) تازەیەی کە ئومێدی ئەوە هەیە بە مۆر کردنی پەیمانی دوو قۆڵی نێوان ئینگلیز و ئێران دەست پێ بکات»[12]

سمکۆ لە ساڵی ١٩٢١ پەیوەندی بە سێرپرسی کوکسەوە کرد کە تازە لە کاری گفتوگۆ لەمەڕ پەیمان بەستن دەگەڵ ئێراندا بوو بووە و بۆ بەغدا گەڕابووەوە... وەزع و حاڵی گۆڕابوو، چونکە پەیمانی نێو براو هەرکە لەلایەن دەوڵەتی وثوق الدولەوە ئیمزا کرا، [13] جەماوەری خەڵک رووبەرووی وەستانەوە و سەرەنجام لەلایەن دەوڵەتی سەید زیائەدین تەباتەباییەوە، کەلە ١٩٢١/٢/٢٠ بە زەبری کودەتایەک هاتبووە سەر کار، هەڵوەشێنرایەوە.

لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢١ کاتێ سمکۆ رایگەیاند کە نامادەیە بۆ دیداری مامورێکی ئینگلیزی تا شنۆ بڕوات تا (قەرارێک تەرتیب بکات کە بە قازانجی هەردوولابێ) و گوتبووی کە (بەر لە هەموو شتێک ئارەزووی ئەوە دەکات کە پەیوەندیەک لەگەڵ بە ریتانیادا دروست بکات).[14] ئەوسا سێر پرسی کوکس لە ١٩٢١/٨/١٩ دا ئەسڵی پەیوەندییەکەی سمکۆی پەسند کرد.

**هۆی چ بوو کە سمکۆ لە هەرەتی دەسەڵاتی خۆیدا، ئەوەندە پەرۆشی پەیوەندی دەگەڵ ئینگلیزییان بوو؟**

رەنگە هاتنە سەرکاری رژێمی تازەی تاران، ئەوی نیگەران کردبێ: رەزاخان دەسەڵاتی قاجارەکانی لابردبوو، هەڵبەتە سمکۆ کە بەخۆی لە ساڵی ١٩١٤وە هێرش و پەلاماری تورکان و روسان و ئینگلیزانی لە کوردستاندا دیتبوو، هەقی بوو لە هاتنە سەرکاری تاقمێکی تازە. بەتایبەتی بە سەرۆکایەتی پیاوێکی چالاک و چەلەنگی وەکو رەزاخان نیگەران و دڕدۆنگ بێ.

سمکۆ پەی بەوە بردبوو کە ئەگەر لەو دەڤەرەی سنووری ئێران و تورکیادا، کە خۆی لە خۆیدا بن بەستێکە لەو گۆڕەی بەتەنێ وەمێنێ، ناتوانێ ماوەیەکی زۆر لەبەر هێرشی

هێزەکانی ئێران دا خۆی بگرێ، ئەگەر هێزێکی دەرەکی پشتیوانی لێنەکات.

سمکۆ بە ئاشکرا دەیگوت: «ئێمەی کورد، لە هەموو شتێک پتر پێویستمان بە تەقمەنیە، ئەگەر چەک و تەقەمەنیمان دابین نەکرێ، گیرۆدە دەبین».[15]

گفتوگۆی نێوان سمکۆ و بەرپرسانی ئینگلیزی لە بەغدا، لە رێگەی یەکێک لە سەرۆک عەشرەتەکانی نزیکی سنوور بە ناوی بابەکر ئاغا، بۆ ماوەی سێ هەیڤان بەردەوام بوو.

لێ لە مانگی ١٠/١٩٢١ دا کوکس، هەر بۆ دڵنیا کردنی دەوڵەتی ئێران، لێبرا کە ج کەسێک بۆ دیداری سمکۆ نەنێرێ و هەر بەوەندە واز بێنێ کە بە پێی توانا هەندێ زانیاری لەمەر جمو جۆڵ و ئەگەری سەرکەوتنی و رادەی خۆراگرتنی لەبەردەم هێرشی هێزەکانی ئێران دا خر بکاتەوە.[16]

سمکۆ لە رێگەی مستەفا پاشاوە بۆ دوا جار دەچێتە نک ئینگلیزەکان، {من و سەید تەها قەولی شەرەفتان دەدەینێ کە ئەگەر بەریتانیا چەک و تەقەمەنیمان بداتێ و راستەوخۆ لە ژێر باڵی خۆیان بگرێ و مە.حەکانی ئێمە قەبوڵ بکات، ئەوا وان و ئەرزرۆم و سیولس و هەکاری و بەتلیس لە ناسیوناڵە تورکەکان پاک بکەینەوە و دەرسێکی چاکی ئەوانەش دا بدەین کە لە رەواندز دان، ئێمە دەتوانین ئەنقەرەش بگرین (!). ئەگەر بەریتانیا دەنگ نەکات دەتوانین لە ماوەیەکی کەمدا ئێرانیەکان لە سنە دەربکەین.[17]

دەوڵەتی فەرەنسە دڵنیا بوو کە سمکۆ (هەر لە هەوەڵەوە یارمەتی و پارەو پوڵی لە ئینگلیزەکان وەردەگرت، بۆیە هەوڵی سمکۆ لەمەر پەیوەندی کردن بە فەرەنسە، بێ ئەنجام مایەوە).[18]

## ٤

## سمکۆ و تورکان

سمکۆ لە ئەنجامدا ناچار بوو یارمەتی لە تورکان وەربگرێ. پەیوەندی سمکۆ دەگەڵ تورکاندا دوو لایەنە بوو، سمکۆ لەلایەکەوە «لە ناسیونالیستە تورکەکان بێزارە و نەک هەر بە دوژمنی کوردیان دەزانێ، بەڵکو لە ئێرانیەکان پتر بە دوژمنی کوردیان دەزانێ».[19]

بەلام هەرگیز پەیوەندی خۆی لە گەڵیاندا نەبڕی، چونکە تورکەکان چەک و تەقەمەنیان بۆی دابین دەکرد و ئەویش زۆر پێویستی بەو چەک و تەقەمەنیانە هەبوو. بەلام تورکەکان عەقید عەلی شەفیق ناسراو بە (ئۆزدەمیر) کە جاران سمکۆی بە گیلە پیاو دەزانی،

سەرەنجام و دوای ماوەیەک کە سمکۆ هەموو کوردستان دەخاتە ژێر رکێف و دەسەڵاتی خۆیەوە، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە (پیاوێکی کارامەیە و شایستەی ئەوەیە کە لەلایەن ئەواتەوە بکرێ بە حاکم و فەرمانڕەوای دەڤەرەکە).[20]

دەوڵەتی ئێران هەوڵ دەدا بە یارمەتی تورکەکان کۆتای . سمکۆ بێنێ و بەو مەبەستەش (بۆ کۆتایی هێنان بە هاندانی کوردەکان لەلایەن ئینگلیزەکان و ئەبەڵەوە لە ناوچەی خۆیاندا)[21] لە ٢٥/١٠/١٩٢٢ لەگەڵ تورکیا پەیمان دەبەستێ. ئەمەش یەکەمین .یانی ئەو زنجیرە پەیمانانەیە کە لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا دژ بە کورد دەبەسترێ.

٥

## سمکۆ و روسەکان

بە گوێرەی هەندێک پرۆپاگەندان، سمکۆ هەوڵی داوە یارمەتی و پشتیوانی سۆڤیەتەکان وەدەست بێنێ و بۆ ئەم مەبەستە لە بەهاری ساڵی ١٩٢٢ نوێنەرێکی خۆی بۆ باکۆ ناردووە.[22]

هەڵبەتە کاتێکی یەکجار نالەبار وخراپی بۆ ئەم کارە هەڵبژاردبوو، رژێمی تازەی ئێران لە ٢٦/٢/١٩٢٢ دا بەپێی پەیمانێکی دوو قۆڵی پەیوەندییەکانی خۆی دەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا ئاسایی کردبۆوە و یەکێتی سۆڤیەت هەموو یارمەتییەکی خۆی لە رێبەرانی حکومەتی شۆڕشگێڕی گەیلان (١٩٢٠-١٩٢١) بڕی بوو.

رێکەوتنی (سۆڤیەت و ئێران)[23] سەرەتایەک بوو بۆ کۆتایی هاتنی کاری سمکۆ، شای ئایندەی ئێران ئیدی هەموو هەوڵێکی خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان دەکات کە دەستی گرتووە: کە بریتیە لەوەی هەموو تیرەکان بێنێتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی و چەک کردنیان و تێک شکانی هێز و توانای سەرانی تەقلیدی ئەو تیرانە.

رەزاخان لە مانگی ١/١٩٢١ وە سوپا تازە دەکاتەوە، قوزاق و هێزی جەندرمە و هێزە ناوچەییەکان، کە تا ئەو کاتە بریتی بوون لە یەکەی جۆراوجۆر و سەربەخۆ و فەرماندەکانیان خەریکی رق بە رقێی یەکدی بوون، یەک دەخات.

رەزاخان کە لیبرا بوو کۆتایی بە کاری سمکۆ بێنێ، پێی وابوو سەرکەوتنە یەک لە دوای یەکەکانی سمکۆ زیاتر زادەی بێ توانایی فەرماندەکانی ناوچەکە بووە کە لەبری هێزی گەورە، وردە هێزیان ناردۆتە شەڕی سمکۆ و ئەویش یەک لە دوای یەک دەیشکاندن.

## ٦
## شەڕی میاندواو ١٩٢٢/٤

جەنەرال شیبانی لە مانگی یەکەمی ١٩٢٢ دا دێتە تەورێز، و ئەویش خۆی دەجەرێنێ و دەشکێ، جەنەرال شیبانی لە مانگی چواری ١٩٢٢ دا (٥) سەد چەکداری جارانی شۆڕشگێرانی گەیلان، بە سەرۆکایەتی یەکێک لەسەر گەورەکانیان بە نێوی خالۆ قوربان لە میاندواو دا خڕ دەکاتەوە، تا لەوێندەرەوە پەلاماری مەهاباد بدات. هێزەکانی سمکۆ هێرشیان دەکەنەسەر، چەکدارانی خالۆ قوربان (خالۆ قوربان: دوای هەرەس هێنانی حکومەتی گەیلان بە پلەی سەرکوردی لە هێزی جەندرمەی ئێران دا دەست بەکار بوو.) لە شەڕگە هەڵدێن، و خالۆ قوربان دێتە کوشتن.

ئەم کارە نزیکەی سێ مانگێک بەو دەقەوە و بەبێ چارەسەر دەمێنێتەوە: لە دوای تێشکانی میاندواوە ئیدی خەڵکی عە ' بەر خۆ لە شەڕی کوردان دەدزنەوە.

جەنەراڵ ڕەزاخان ی وەزیری جەنگی تازەی ئێران بە پاشکۆی عەسکەری ئینگلیز دەڵێ، گیروگرفتی هەرە گەورەی ئەو پارەیە! ئەگەر بە ئەندازەی پێویست پارەی هەبێ دەتوانێ لە زەرفی چەند هەفتەیەک دا سمکۆ تەفرو تونا بکات.[٢٤]

گیروگرفتی ڕەزاخان، لە شەڕی سمکۆدا گیروگرفتی نائاساییە. بۆ وێنە چوارسەد سەربازی مەشق دانەدراوی بێ چەک و تەقەمەنی لە مەخفەری سنەدا بوون: ئەو فیشەکانەی کە پار بۆ ئەم مەخفەرەیان ناردووە، هی تفەنگە روسیەکانی مەخفەری ئەسفەهان بووە، ئەو فیشەکانەی کە دەبوایە بۆ کوردستانیان بناردایە، چوو بوو بۆ ئەسفەهان.[٢٥]

سمکۆش لەلای خۆیەوە، ناتوانێ سود لەو وەزعە لەبارە وەرگرێ کە بۆی رەخساوە، ئەویش تەقەمەنی نیە! رق بە رقێی عەشایەری ناوخۆ و هەواڵی هاتنی هێزی هیمداد بۆ پشتیوانی هێزە دەوڵەتیەکان، دەکەنە کارێک کە نەتوانێ زیاتر دەسەلاتی خۆی لە باشوردا پەرە پێ بدات.

سمکۆ لە حوزەیرانی ١٩٢٢ دا لە شەمدینان، لەگەڵ حەیدەر بەگی والی جارانی موسڵ دا کە سەرۆکی شاندی تورک دەبێت، دیدار دەکات، چ شتێک لەمەڕ ئەم دیدار و گفتوگۆیانە دیار نیە و نەزانراوە، جگە لەوەی کە زیاد لە پێویست دەسەلاتدارانی ئینگلیزی عێراقی سەخڵت و نیگەران کردووە.

له مانگی ۱۹۲۲/۷ دا ئەو هێزانەی لە تارانەوە هاتبوون، دەگەڵ هێزەکانی دیکەی ناوچەکەدا، ئامادەی کار دەبن، فەرماندەی تازە، واتە جەنەراڵ جیهانبانی، تیپێکی هەڵبژاردەی لە تارانەوە هاتوو، (تیپی تەوریز)ی کە پێک هاتبوو لە هەندێ یەکەی لەشکری ئازەربایجان و بەتالیۆنێکی خۆبەخشی ئەرمەنی، بە فەرماندەیی سەرهەنگ بەگ زۆرا بوفی ئەفسەری جارانی تزاری، دەخزمەت دابوو.

بە هەر حاڵ ئەو ۸۰۰۰ چەکدارە ئێرانیەی کە لە باکووری دەریاچەی ورمێ دا مۆڵی خواردبوو لە ۱۹۲۲/۷/۲۳ بەنیازی هێرش بۆ سەر سمکۆ بەرەو سەلماس جوڵان.

## ۷

## شەڕی شەکریازی ۱۹۲۲/۷/۲۵

شەڕی چارەنووس ساز تۆ بڵێی هەوەڵین و ئاخەرین شەڕ لە ۱۹۲۲/۷/۲۵ لەشەکریازی روویدا، هێزی پیادەی کورد، چار جاران هێرشی کردە سەر هێزە ئێرانیەکان و چوونە ناو سوپای پیادەی ئێرانەوە و کەوتنە شەڕی دەستەویەخەو بە خەنجەر و شمشێر تێیان کەوتن و زەرەرێکی زۆریان لە هێزە دەوڵەتییەکان داو زۆریان لێ کوشتن، بەڵام لەئەنجامدا راونران.

سمکۆ دوای ئەوە هێزی سوارەی خۆی هێنایە مەیدان، بەڵام عەسکەری پیادەی ئێران، ئەوانیشی شکاند و راونا، گوللەی تۆپخانەی کورد، تۆپچییەکانیان تورک بوون، نیشان پێک بوون، بەڵام زۆربەی گوللە تۆپەکان نەدەتەقینەوە، ئەنجام لە شەڕی دوای نیوەڕۆدا، کوردەکان شکان.

سمکۆ لە سەرەتای شەڕدا ۱۰۰۰۰ کەسی دەگەڵ بوو، بەڵام بۆ ئێواری لە هەزار کەسێک پتری دەگەڵ نەمانەوە، ئەوانەش ئەندامی عەشیرەتەکەی خۆی بوون، هۆی شکانی سمکۆ زۆری چەکدارەکانی خۆی و باڵا دەستی سوپایی هێزە ئێرانیەکان بوو.[۲۶] هێزە ئێرانیەکان بەرەو ورمێ درێژەیان بە پێشڕەوی خۆ داو لە هەیڤی هەشت دا (ئاب) چوونە نێو شارەوە، پاش ئەوەی بۆ ماوەی چوار ساڵان لە ژێر دەسەڵاتی کوردان دابوو (ئازاد)یان کرد!

هێزەکانی ئێران پاش ئەوە بەرەو چەهریقی بارەگای سمکۆ وەرێکەوتن، یەکەیەک لەو هێزانە چوو بۆ سەر سنوور، تا داوا لە تورکان بکەن کە هەر چەکدارێکی سمکۆ لە سنوور بپەڕێتەوە چەکی بکەن.

## ٦
## شەڕی ساری تاش (١٩٢٢/٨)

سمکۆ، هێرشی کردە سەر ئەو یەکە ئێرانییەی کە گەیی بووە سەر سنوور و ناچاری کرد پاشەکشە بکات، بەڵام ئێستا لە هەزار کەسێک پتری دەگەڵ نەبوو، گەیشتنی هێزی هیمدادی تازە نەفەس بە هێزەکانی ئێران، سمکۆیان ناچار کر پەنا وەبەر کێوی ساری تاش بەرێ (هێزی هیمدادی تازە نەفەس بریتی بوو لە یەک هەنگی تۆپخانە). پاش زنجیرە شەڕێکی قورس، لەوێندەرەوە بەرەو تورکیا هەڵکەنرا. تورکەکان سمکۆیان گرتە خۆ و پیاوەکانیان چەک کرد.

## ٩
## بەجێ هێشتنی وڵات

لە مانگی ١٩٢٢/١٠ دا سمکۆ دەگاتە نیزیکی هەولێر لە عێراق، سەڵت و قوڵت هەموو شتێکی لە دەست داوە، تۆپەکانی، رەشاشەکانی، تەقەمەنی و کەرەستەی شەڕ، ژنەکەی کوژراوە و کوڕە شەش ساڵانەکەی کە تاقانەی بوو یەخسیر بووە، لێ بە گوتەی ئینگلیزییەکان کە دەیبینن، چ رق و کینەیەکی تایبەتی بەرانبەر بە ئێرانیەکان نیە، (بە گوتەی خۆشی) ئێستا پاک لە پاکن و چ هەق و حساوێکیان دەگەڵ یەکدی دا نیە.[٢٧]

بەڵام دەیەوێ تۆڵە لە تورکان بسێنێ، چونکە بەڵێنیان دابووێ کە یارمەتی بدەن و پشتیان تێکردبوو، بێ پەردە دەیڵێ کە بەو نومێدە هاتووە کە ئینگلیزەکان لەو حاڵەدا ببینێ کە (ئامادەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کوردانی دژ بە دوو دەوڵەتێک بێ کە دژمنایەتیان دەگەڵیاندا هەیە)[٢٩]

سمکۆ لە گفتوگۆیەکی دووردورێژدا دەگەڵ یەکێک لە پایەدارانی ئینگلیزدا (سی. جی. ئەدمۆندز) لە دیرە dera لە ١٩٢٢/١١/١٢ پێی سەیر دەبێت کە دەبینێ ئینگلیزەکان ئەوەندە نیگەران و پەرۆشی ئێرانیانێکن کە بە درێژایی سنور هاوکاری ئەو تورکانەن کە دەیانەوێ ئینگلیز لە رەواندز وەدەرنێن.

١٠

## پێشوازی شێخ مەحمود

سمکۆ کە لە رەفتاری ئینگلیزەکان بێ تاقەت و نا ئومێد بوو بوو لە تەها جیا دەبێتەوە و دەڕوات بۆ سلێمانی و لەوێندەر لە ١٩٢٣/١/٨ وەکو سەر دەوڵەتێک پێشوازی لێدەکرێ دەگەڵ هاتنی دا حەوت تۆپیان بۆ بەخێرهاتنی دەتەقێنرێ، شار لە جموجۆل دەکەوێ، سمکۆ لە نمایشێکی رێو رۆیشتنی سوپایی دا کە بە خۆشی ئەومەوە ساز دەکرێ، بەشدرای دەکات!

بەڵام ئەو کۆمەک وهاوکارییەی کە ئەو عەوداڵ و پەرۆشی بوو، لە دام و دەزگاکەی شێخ مەحمودیش دا دەستی ناکەوێ.

پەیوەندییەکانی ئێوان بەغداو سلێمانی لە خراپی دایە، و شێخ مەحمود ناتوانێ تەنانەت لە بەرخاتری (جەنابی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ، قارەمانی دلێری کوردستان)[٢٩] خۆی بخاتە بەر شەپۆلی رووداوی دووره دەست. سمکۆ یەک مانگ و هەندێک لە سلێمانی دەمێنێتەوە، تا پچرانی پەیوەندییەکانی شێخ مەحمود و ئینگلیزەکان، (هەنگێنی هاندەدرێ کە سلێمانی بە جێبهێلێ)[٣٠]

١١

## ساڵانی ئاوارەیی

سمکۆ لەوە بە دواوە بۆ ماوەی یەک ساڵ لە تورکیادا ون بوو، لە ساڵی ١٩٢٤ دا سەرلەنوێ لە ئێرانا سەری هەڵدایەوە وخۆی تەسلیم بە جەنەراڵ تەهماسوبی فەرماندەی هێزەکانی ئێران لە باکور کرد و مۆڵەتی وەرگرت کەلە چەهریق دا دانیشێ، لە ساڵی ١٩٢٥ دا رەزاشا پێشوازی کرد و سمکۆ بەڵێنی داین کە تا هەتا هەتایە ئەمەکداری بێ.

بەڵام دوای یەک ساڵ بە چەند سەد کەسێکی کوردی هەرکییەوە دەشتی سەلماسی گرت و گەمارۆی سەلماس (شاپور)ی دا، بەرگەی هێزەکانی ئێرانی نەگرت و تا سنووری ئێران و تورکیا راونرا، هەرکە لە سنوور ئاودیو بوو هێزی تورک دەوریان گرت و چەک و دەست بەسەریان کرد.

دوای چەند مانگێک دیسانەوە لە عێراقەوە سەری هەڵدایەوە (کۆتایی ساڵی ١٩٢٦) پاشان لە تورکیاوە ١٩٢٧ و ئەوجا جارێکی دیکە و لە ساڵی ١٩٢٨ دا لە

عێراقەوە سەری هەڵدایەوە. وەکو کەسێکی بێ ماڵ و حاڵ دەربەدەر جگە لە دە دوازدە کەس پتری لەگەڵ دا نەبوو.

دەوڵەتی عێراق بە بیانووی ئەمەی کە خەتاکانی سمکۆ (سیاسی)ی[21] قەبوڵی نەکرد کە تەسلیم بە ئێرانی بکاتەوە، بەڵام چونکە ترسی لە بوونی سمکۆ لە عێراقا هەبوو گوشاری خستە سەر ئێران کە مووچە و خەرجیەکی بۆ ببڕێتەوە.

ئەنجام سمکۆ مۆڵەتی وەرگرت کە بۆ ئێران بگەڕێتەوە و ببێ بە فەرمانڕەوای شنۆ- لێ ڕەزا شا لەلای خۆیەوە حوکمی دابوو، دوای چەند ڕۆژێک بە غەدر لە لایەن سەربازانی ئێرانیەوە کوژرا. (١٩٣٠).

## سەرچاوە و پەراوێزان:

١- حەسەن ئەرفەع، کوردەکان، ل ٥٨

٢- ئەم مێژووە کونسولی فەرەنسا لەتەوریز، نەقڵی کردووە، بە گوتەی حەسەن ئەرفەعی سەر لەشکر، ئەم هێرشە لە ناوەراستی ئەیلولی ١٩٢١ ئەنجام دراوە.

٣- بە گوتەی کونسولی فەرەنسە لە تەوریز «خەڵکی» لایەنی هێرشبەرانی کوردیان گرت، بڕوانە بروسکەی ١٣/ ١٠/١٩٢١و ٣١١-٣١٢.

٤- نامەی مستەفا پاشا بۆ کورەکەی ٢٠/١١/١٩٢١، نوفیسی هند، ٣٧١٧٧٨١

٥- حەسەن ئەرفەع، لەسەر دەمی پێنج پاشایاندا، ل ١٢٢

٦- سی.جی ئەدمۆندز کوردەکان، ل ٣٠٧

٧- حەسەن ئەرفەع، لە سەردەمی پێنج پاشایاندا ل ١٣٧

٨- هەمان سەرچاوە ل ١٢٥

٩- نامەی نێوبراوی مستەفا پاشا

١٠- نامەی ٣١/٥/١٩٢٢ی سمکۆ بۆ زەفەرو دەولە، ئەم نامەیە تەتەریکی سەر بە کونسولی بەریتانیا لە تەوریز، گەیاندوویەتی.

١١- مستەفا پاشا دوای دوو گفتوگۆی تێروتەسەل لەگەڵ سمکۆ و تەعادا، لە نامەیەکی دوورودرێژدا بە نێوی پرسیار و وەڵام ئەم بابەتەی خستە روو، سانسۆری بەریتانیا لەعێراق، بەرلەوەی نامەکە بۆ جێ مەبەست بنێرێ، نوسخەیەکی لەبەرگرتەوە و مستەفا پاشا کە لەم کارە کەوتبووە گومانەوە، لەنامەیەکی دیدا نووسی: «هەموو شتێک لە نامەدا ناگوترێ.»

١٢- نوفیسی هند ٧٨٢- ٧٨١/ Lpus ٣/٧/ ١٢٠/ ١٩١٩/٥

١٣- بە گوتەی حەسەن ئەرفەع لە سەردەمی پێنج پاشایاندا ل ١٠٩ وسوق دەولە بۆ نیمزای ئەم پەیمانە ١٣٢/٠٠٠ لیرەی وەرگرتبوو.

١٤- نووسراوی نهێنی یاریدەدەری حاکمی سیاسی (ئەفسەری سیاسی) لە راتیە گرلدا ئیسمیت بۆ حاکمی سیاسی سلێمانی لە ١٩٢١/٧/٢٠، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٦٢٤٧.

١٥- نامەی مستەفا پاشا

١٦- پەیامی ١٩٢١/١٠/١٨ ی گاریت، سکرتێری کونسولی بالای بەریتانیا لە بەغدا، بۆ حاکمی سیاسی سلێمانی، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان.

١٧- نامەی مستەفا پاشا.

١٨- چەند زانیارییەک دەربارەی بزاڤی کورد، لە مانگی ١٩٢٢/٧ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا. E٣١١-٣١٣ .

١٩- نامەی مستەفا پاشا.

٢٠- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ٣٧١٩٠٠٤

٢١- نووسراوی ١٩٢٢/٧/٢٨ دەربارەی شۆرشی کورد. وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا ٣١٣- ٣١١ E

٢٢- راپۆرتی ١٩٢٢/٧/٣ کونسولی بەریتانیا لە کرمانشا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ٣٧١٧٨٠٨

٢٣- حەسەن ئەرفەع لە سەردەمی پێنج پاشایاندا، ل ٩٤و٩٥ و ١٢٦

٢٤- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٣٧١٧٨٠٨، ١٩٢٢/٧/١٥

٢٥- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٧٨٠٨، ١٩٢٢/٧/٣

٢٦- بۆ زانیاری زیاتر لەمەر جەنگی شەکریازی بروانە ل ١٣٥-١٣٦ ی لە سەردەمی پێنج پاشایاندا، نووسینی حەسەن ئەرفەع.

٢٧- هەمان سەرچاوە ل ١٤١ لە راستیدا نووسەر دەیەوێ هێرشە هاوبەشەکەی ئێرانیەکان و تورکەکان وەکو رشەو دەستەوڵاژان بخات و وەیشێرێت. سی جی ئەدمومونز بە ئاماژە ئەمە دەڵێ ل ٣٠٥.

٢٨- سی. جی ئەدمونز. کوردەکان ل ٣٠٧

٢٩- ئەمە ئەو مانشێتانەیە کە لە ژمارە ٨ی گۆڤاری رۆژی کوردستانی شێخ مەحمود هاتوون.

٣٠- سی.جی ئەدمونز، کوردەکان.

٣١ - راپۆرتی سالانە دەربارەی ئێران، سالی ١٩٢٨، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١٣٧٩٩ ٣٧١.

## فەسڵی سێیەم

## شۆڕشەکانی شێخ مەحمود

«من ئیدی هەرگیز بەشداری دروستکردنی هیچ پاشایەک ناکەم، کارێکی لە رادە بەدەر قورسە» .[1]

ئەم ئیعترافەی گرترودبیلی یاریدەدەری سێرپرسی کوکس و ویلسن لە بەغدا بە جوانی بێ شەرمی ئینگلیزەکان بەرجەستە دەکات کە هەمیشە گوتوویانە، عێراقیان لە پارچەی جیاواز پێکەوە ناوەو فەیسەڵ زۆر دوورە لەو پاشا چاکەی کە ئەوان ویستوویانە.

بەرای لایەنگرانی سیاسەتی (ئیمپراتۆریەتی بەریتانیای مەزن) پێویست بوو دۆڵی دوو رووبار لە ژێر حوکم ودەسەڵاتی ئینگلیستاندا بمێنێتەوە، چونکە (ئەگەر دۆڵی دوو رووبار بڕۆخێ ئێران دەروخێ و هندش بە ناچاری دەڕوخێت).[2]

گرنگ پایەداری ئەم حوکم و دەسەڵاتە بوو، ئیدی شێوە و رواڵەتی کار گرنگ نەبوو، ویلسن بە خۆی لایەنگرێکی تەواو و ئاشکرای سایەنشینی (حمایە وانتداب)بوو. بەڵام پاش شۆڕشی مەترسیداری هاوینی ١٩٢٠ کە بووە مایەی کوشتنی خەڵکانێکی زۆر لە هێزە هندی و ئینگلیزیەکان، دەسەڵاتدارانی بەریتانیا لە دۆڵی دوو رووبار هیچ چارەیەکی دیکەیان بە دەستەوە نەما. تەنیا ئەوە نەبێ کە سێر پرسی کوکس گوتەنی یان « جلوبەلاسیان» کۆ بکەنەوە و بڕۆن یان پاش بەرقەراری سەرلەنوێی ئەمن و ئاسایش، حکومەتێکی نیشتمانی دابمەزرێنن.

### ١

### میر فەیسەڵ

لەو کاتەدا میر فەیسەڵ کە فەرەنسیەکان لە ١٩٢٠/٧/٢٤ دا لە دیمەشق دەریان کردبوو لەگەڵ ٢٥ هاوسەر و ١٧٥ گاردی شەخسی لە هێزەکانی حیجاز و ٢٥ ئەسپ وچوار تۆن باروبنەدا لە بیابانی پشت ئەردەنەوە سەرگەردان بوو، ئامادە و لە بەر دەست دا بوو.[3]

دەوڵەتی فەرەنسە بە « پیاوێکی بودەڵە و نەفس نزم، بەڵام بەوەج و خەتەرەی[4] دەزانی. کە بیستی ئینگلیزەکان چاویان لەوەیە کە بیکەن بە پاشای عێراق «لە تووڕەییدا» هاواری کرد ئەمە بووە مایەی ئەوەی کروزن بۆ ماوەیەک ئەم ئەخشەیە پشت

گرێ بخات.

سەیر ئەوەیە کە کرۆزن بە خۆی خۆشی بەم پیاوەدا نەدەهات و پێی وابوو پیاوێکە «بودەڵە و لە دیمەشقدا لە لیبۆکێک پتر نەبووە»[٥]

بەڵام چونکە لە دامەزراندنی «کۆمارێکی» پێچەوانەی «... ەتی ئیسلامی»[٦] لە بەرنامەدا نەبوو، و هەموو پالێوراوەکانیش رەفز کرابوون، کرۆزن و دەوڵەتی بەریتانیا سەرەنجام و پاش کۆنفرانسی دووەمی قاهیرە لە ١٢-٢٤-٣/١٩٢١ لێبڕان میر فەیسەل لەسەر تەختی پاشایەتی دۆڵی دوو رووبار دابنێن و ناوچە کوردنشینەکانی بە گەڵ بخەن و بەمە پانتاییەکەی فراوانتر بکەن.

لکاندنی ناوچە کوردنشینەکان بە وڵاتی عێراقەوە بە دوو قۆناغان ئەنجام درا، یەکەم وێلسن بە ماوەیەکی کەم پاش کۆنگرەی قاهیرە و لە رۆژی ١٩٢١/٥/٦ دا بەیاننامەیەک دەردەکات و لە کوردان دەپرسێت کە لە وڵاتی عێراقدا چ جۆرە سیستەمێکی ئیداری پەسەند دەکەن ئەم بەیاننامەیە بە جۆرێ دارێژراوە کە مەسەلە بنەرەتی یەکەی، واتا ئایا دەیانەوێ لە سایەی حوکمی دەوڵەتی عێراقدا بژین یان جیا ببنەوە، بە تەواوی شارد بووەوە.

ریفراندۆم لە هەلومەرجێکی ناهەمواری ئەوتۆدا، کە کەس باوەر ناکات، ئەنجام دەدرێ، لە سلێمانی دا، تەنیا ئەو کەسانە دەیان توانی دەنگ بدەن، کە ماڵەکانیان بایی هەزار ریاڵ بووبێ لەو ٢٠٠ دەنگدەرەی کە بەو شێوەیە هەڵبژێردران ١٩٠ کەس لە هەڵبژاردن دا بەشداری دەکەن و لەو ١٩٠ کەسە تەنیا ٣٢ کەس رازی دەبن کە سلێمانی بە عێراقەوە بلکێندرێ. دەنگی خەڵکی هەژار دەنگی «رەش و رووت»ە.

گەرەک بە گەرەک پیاوان بانگ دەکەن و داویان لێدەکەن دەنگ بدەن -پێدەچێت دەنگ دانەکە بە دەست بەرز کردن بووبێ، ئاخۆ هەستی نەتەوەیی دەبێ چەند توند بووبێ، کە بەو حاڵەشەوە چ کەسێک دەنگ بۆ لکاندنی سلێمانی بە عێراقەوە نەدات. تەنیا لە گەرەکی جولەکاندا نەبێ. لەوێندەر ئەوەندە دوو دەنگ رازی وچوار دەنگ نارازی بوون.

لە ناوچەکانی دیکەی سلێماندا، قائیمقام پیاوەکانی خۆی بۆ گوندەکان دەنێرێ. لە کۆی شەش هەزار دەنگدەر، پێنج هەزاریان دژی لکاندنی ناوچەکە بە عێراقەوە دەنگ دەدەن و ئەوانەی دی دەنگ بۆ بەریتانیا دەدەن.

چوار کەس لە پیار ماقوڵانی کورد لە کۆبوونەوەیەکدا دەگەڵ یەکێک لە پایەدارانی

**ئینگلیزی دا دەیسەلمێنن کە گەمارۆی گومرکی کە (ئینگلیزەکان هەرەشەی ئەوەیان لێدەکەن کەئەگەر رای دژ بدەن ئەوا گەمارۆی گومرگ دەخەنە سەر سلێمانی) بۆ سلێمانی ئاکامی خراپ و ناخۆشی دەبێت، بەڵام دوورباتی دەکەنەوە کە ئەم ئاکامە خراپ و ناهەموارەیان پێ باشترە (لەوەی لە سایەی رژێمێکی سەرکوتکاری عەرەب دا بژین.)**

کۆمیسێری ولاتی بەریتانیا، چ روونکردنەوەیەک دەربارەی شێوەی راگیری ناوچەکانی دیکەی کوردستان، واتە دهۆک و زاخۆ و ئاکرێ و هەولێر و ئامێدی بەدەستەوە نادات، بەڵام پێدەچێ کە دەنگدەرەکان راوێژیان بە ئەنجومەنی پیاو ماقولاتی ناوچەکانی خۆیان کردبێ.

**بۆ وێنە لە هەولێردا دەنگدەرەکان دەچوون و تەگبیریان بە ردێن سپیاتی تورکمانی شار دەکرد، ئەوەش لە ناوچەیەکدا کەسەر لەبەری کوردنشینە، جا هەر لەمەوە بە دیار دەکەوێ کە ئەنجومەنی پیاو ماقولان چتۆ ئەنجومەنێک بووە!**

سەرەنجام جگە لە سلێمانی هەموو ن... کوردنشینەکان دەنگیان بۆ چوونە پاڵ عێراق داو لە دەنگدانی دووەم دا -واتە لە دەنگ داندا بۆ هەڵبژاردنی میر فەیسەڵ بۆ پاشای عێراق- بەشدارییان کرد.

## ۲

## راپرسی:ریفراندۆمی گشتی

کۆمیسێری بەریتانیا بەو حاڵەشەوە فایلی تەواوی هەڵبژاردن و ریفراندۆم و دەرهێنانی ئەنجامی رایەکان بۆ لەندەن نانێرێ.

بە پێی ئەو نیشانە و بەڵگانەی بەدەستەوەن، جۆری راگیری لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی دەگۆڕێ، لە هەندێ شوێن دا یەکێک دێت بۆ بارەگای را وەرگرتن و دەڵێ: من دەنگ بەم کۆمەڵە پاڵیوراوە (واتە ئەم کۆمەڵە پیاوەی کەتەمەنیان لە ۲۰ ساڵ بە بانەوەیە) دەدەم. و ئەندامانی بارەگای راگیری رایەکەی لە «پێرستی دەنگدان» تۆمار دەکەن.

لە شوێنێکی دی دا سەرۆکی عەشیرەتێک ۲-۳ هەزار کەس لە عەشیرەتەکەی خۆی دێنێ و بەخۆی رای رەزامەندی دەدات و هەموو ئەوانی دی چاو لەو دەکەن.

جا مەسەلەکە هەر لێرەدا ناوەستێ، زۆر شتی عەنتیکەتر دێتە کایەوە: لە کەرکوک بە پێی هەواڵێکی رەسمی کە لە سێرپرسی کوکسەوە بە دەست کەوتووە، راوێژکاری

ئینگلیزی نامەو پەیامێکی کومیسێری دەوڵەت بۆ ئەنجومەنی پیاوماقوڵانی شار دەخوێنێتەوە و ئەنجومەن بە تیکرای دەنگ فەیسەڵ هەڵدەبژێرن.! لێ ئەندامانی ئەنجومەن کە بۆ ماڵی خۆ دەچنەوە، چەند کۆبوونەوەیەکی تایبەتی دەکەن و لەو بڕیار و رایەی خۆیان ژیوان دەبنەوە. لە ۷/۲۳ دا لە کۆ بوونەوەیەکی تایبەتی دا کە لە ماڵی موفتییەک دا دەکرێ، بڕیار دەدرێ، فتوایەک دژی فەیسەڵ دەربکرێ.

دەست و پێوەند و پیاوانی سێرپرسی کوکس سەرلەنوێ دەست بەکار دەبنەوە و ئەنجامی کارەکانیان مایەی پێکەنین دەبێ، «گەورە سەرۆکان رای دەگەیەنن کە بە دڵی بەریتانیا دەنگ دەدەن، بەڵام نە فەیسەڵیان دەوێ و نە حکومەتێکی عەرەبی.»[۷]

**بە پێی ئەنجامگیرییەکانی ئامادەکاری راپۆرتی رەسمی « ناوچە کوردنشینەکان خوازیاری دەوڵەتی کوردین.»** بەڵانەکی کاتێ لە ۱۹۲۱/۸/۱۸ ئەنجامی ریفراندۆمەکە بە سەرپەرشتیاری ریفراندۆم رادەگەیەنرێ، ئەوە بە دیار دەکەوێ کە ۹۶٪ دەنگدەران دەنگیان بۆ فەیسەڵ داوە. دیارە ئەم ئەنجامە زۆر سەیرە و زۆر لە راستییەوە دوورە، چونکە دەبێ ئەوەش حساو بکرێ کە شیعەی باشوور زۆر لە کورد پتر نەیاری فەیسەڵ بوون.[۸]

لە ۱۹۲۱/۸/۲۳ دا میر فەیسەڵی کوڕی شەریفی مەکە، بە نەوای سروودی « خوا پاشا بپارێزێ»[۹] دەکرێ بە پاشای عێراق! بێ ئەوەی نوێنەرانی سلێمانی یان کەرکوک ئامادە بن.[۱۰]

## ۳

## مەلیک فەیسەڵ

«لیبۆک»ەکەی لەمەڕ کروزن هەر کە لەسەر کورسی پاشایەتی عێراق دادەنیشێت، بە جۆرێ ئیشتیای دەسەڵات پەیدا کردنی دەجوڵێ کە هەر زوو دەبێتە مایەی نارەحەتی ئینگلیزەکان.

چەرچل لەم بارەیەوە دەڵێ ( لەو هەموو بروسکە دووردرێژەی لەمەڕ فەیسەڵ و وەزع و حاڵی ئەو دەگەنە دەستمان بێزار و بێ تاقەت بووم، ئەوە شەش مانگە نیمە پارەی لیستی حیساباتی میوانخانەی ئەو لە لەندەن دەدەین. ئێستاش واناچارم هەموو رۆژێک نامەیەکی هەشت سەد وشەیەیی دەربارەی شوێن و پایە و پێوەندییەکانی دەگەڵ وڵاتانی بیانی دا وەخوێنم.»[۱۱]

هەنووکە شێوەی مامەڵە کردن روون بووەتەوە! ئینگیزەکان زوو زوو بیری فەیسەڵ

دەخەنەوە کە لە بیری نەچێت ئەوان کردویانەتە پاشای عێراق، لێ فەیسەڵ تەنێ یەک شتی لەبیرە: قایم کردنی پایەو کۆڵەگەی دەسەڵات، فراوان کردنی سنووری ئەو قەڵەمڕەوەی دراوەتە دەستی ئەو، بۆیە هەر لەو ڕۆژانەوە مەسەلەی کورد بایەخێکی بنەڕەتی پەیدا دەکات، بەراستی فەیسەڵ باوەڕی وابوو کە ئینگلیزەکان لە هەمان کاتدا کە پیشتیوانیان لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبی سەربەخۆ دەکرد، ئامادەن کە جار جار و لە کاتی پێویست دا( بۆ قازانجی خۆیان کورد بە گژ عەرەبدا بکەن، ئەگەر مامەڵەی عەرەب دەربارەی «سەربەخۆیی» زۆر بە دڵی ئێمە نەبێ.)[١٢]

مەسەلەی کورد بەلای تازە پاشای عێراقەوە، لایەنێکی دیکەی گرنگی هەبوو، فەیسەڵ لەلایەن کەمینەیەکی زۆر کەمی سونیانی عەرەبەوە پشتیوانی لێدەکرا، کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەغدا بوون. لایەنگرانی ڕاستەقینەی فەیسەڵ تەنیا چەند ئەفسەرێک بوون کە لە «حیجاز»ەوە لەگەڵی دا هاتبوون. بەڵام هەموو خەڵکی باشوری عێراق کە شیعە مەزەب بوون، لە رووی مەزەبییەوە دژمنانەتی کورەکەی شەریفی مەکەیان دەکرد کە سونی مەزەب بوو.[١٣] لەمانگی ئەیلولی ١٩٢١ وە فەیسەڵ بیری لە پەرلەمانێک دەکردەوە کە بە هەڵبژاردن دابمەزرێ، دەیویست ئەو پەرلەمانە نەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی شیعەیان و ئەوان زۆرینەی پەرلەمانەکە پێک بێنن، ئەگەرچی لە رووی (چەندی وچۆنی)یەوە زۆرترن.[١٤]

فەیسەڵ دەیزانی کە کوردی ئێران بیر لەوە دەکەنەوە لە ئێران جیا ببنەوە و کوردی تورکیاش هەمان شتیان دەویست و «زۆری پێناچێت کە هەندێ ناوچەی کوردنشینی عێراق یان هەموو کوردستانی عێراق لە عێراق جیا دەبێتەوە. تا پەیوەندی بە ناوچەکانی تری کوردستانەوە بکات.» بۆیە بە سێرپەرسی کوکسی کە بوو بوو بە کۆمیسێری «مندوب» باڵای بەریتانیای گوت کە بە ڕاشکاوی پێی بڵێ «بە فەیسەڵ» ئینگلیزەکان بە تەمای چین و دەیانەوێ چ بکەن: «ئایا بەراستی دەمانەوێ هەموو ناوچە کوردنشینەکان لە عێراق جیا ببنەوە و پەیوەندی بە کوردانی باکورەوە بکەن؟ ئەگەر وانیە مەبەست و ئامانجی ئێمە چیە؟»

وەلامی سێرپەرسی کۆکس زۆر تەم و مژاوی بوو، پاش بیر هێنانەوەی ئەم بابەتەی کە دەوڵەتی بەریتانیا لە دوای کۆنفرانسی مارسی ١٩٢١ی قاهیرە، بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی داوە بەڵام ئەو پێی وا نیە کە ئامانجی دەوڵەتەکەی ئەمە بێ کە (ناوچە کوردنشینەکان) لە عێراق جیا بکاتەوە. و «پاش گەڕانەوەی لە قاهیرە بۆی دەرکەوتووە کە

(کوردەکان) لەمەڕ جیابوونەوەیان لە عێراق یەک دەنگ و یەک ڕەنگ نین.»[14]

وەڵامەکەی سێرپرسی کوکوس هەرچەندە تا ڕادەیەکی زۆر کوردەکانی «ئازادە» کردبوو، بە دڵی فەیسەڵ نەبوو. فەیسەڵ هەر دوای چەند ڕۆژێکی دی هەمان بابەتی هێنایەوە مەیدان و لە کومیسیری باڵای پرسی: «ئایا دەبێ وەکو «عێراقیەک» قـ ـکات کە کوردستان بە بەشێکی لە جیا بونەوە نەهاتووی عێراق دەزانێ یان وەکو پاشای وڵاتێکی عەرەبی کە کوردستان بەشێکی ئەو وڵاتە نیە. ؟»

سێر پر-ی کوکس بە توندی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە. دەڵێ: ( ئێمە قسە دەگەڵ هەمان فەیسەڵ دا دەکەین کە بەرلەوەی بێتە سەر تەختی پاشایەتی قایل بوو بوو ئەم مەسەلەیە بەو چاوەوە تەماشا بکات کە مەسەلەیەکی «باس هەڵگرە»!.

فەیسەڵ گوێی نەدا و کومیسیری «مندوب» باڵای بە زنجیرە پرسیارێکی ناخۆش داگرتەوە و وەزع و حاڵەکەی بە باری قازانجی خۆیدا گوڕی:

«ئایا بەریتانیای مەزن ئامادەیە ئەگەر دەست درێژیەک یان زێدە گافیەک بکرێتە سەر کوردستان، داکۆکی لێ بکات و تا چ ماوەیەک ئەمە دەکات؟ ئایا بەریتانیای مەزن ئامادەیە مەسئولیەتی نەهێشتنی ئاژاوەی ناوخۆی کوردستان بگرێتە ئەستۆ و تا چ ماوەیەک ئەمە دەکات؟».

فەیسەڵ دەیزانی کە بەریتانیای مەزن لەم سەروبەندەدا تا چ ڕادەیەک لەشەڕ وپێکدادانی تازە بێزارە و ئامادە نیە تەنانەت تاقە یەک سەربازیش بۆ داکۆکی و بەرگڕانی لە کوردستان، بنێرێ.

بەریتانیای مەزن سەبارەت بە مەسەلەی کورد لە نێوان دوو بەرداش دابوو، لە لایەکەوە بەرداشی پەیمان و بەڵێنە نێو نەتەوەییەکان بوو، لەلایەکی دییەوە بەرداشی فەیسەڵ بوو. بۆیە هەوڵی دەدا ئەوەندەی لە توانادایە مەسەلەی (ئازادی) یەکجارەکی کورد دوا بخات و کۆسپی بخاتە ڕێ.

بەڵام فەیسەڵ گەیی بووە مەرامی خۆی و مەگەر گۆڕانکاری و ڕووداوی چاوەنۆڕ نەکراو یەخەیان پێ بگرتایە، دەنا چ کۆسپ و لەمپەرێکی دەرتیە نەبوون.

## ٤

## جموجۆڵی تورکان لە کوردستاندا

فەیسەڵ کە تورکەکان بە چاوی هاووڵاتیەکی «تاوانبار» تەمەشایان دەکرد، هەر کە هاتە سەر حوکم ناچار بوو روو بەرووی تورکان بوەستێتەوە و لەو کوردستانەیان وەدەر بنێ کە ئەم «فەیسەڵ» چاوی تێ بڕی بوو. وەزعەکە ئەوەندە ئاڵۆز بوو کە هەندێ ناوچەی کوردستان هێشتا لە سایەی سەرپەرشتی راستەوخۆی ئینگلیزەکان دا بوو، ئەوان بەڕێوەیان دەبرد. سنووری نێوان تورکیا و عێراق هێشتا دیار نەبوو، ئینگلیزەکان قایل نەدەبوون کە گفتوگۆی راستەوخۆ لە نێوان فەیسەڵ و تورکاندا بکرێ.

لە مانگی ١٩٢١/٦ کەمالیەکان ئەفسەرێکیان بە نێوی فازل ئەفەندی بۆ کوردستان ناردبوو کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سمکۆوە گەیی بووە رەواندز.

لە مانگی هەشت دا عەشایەری دەوروبەری رەواندز بەرە بەرە بە شێوەیەکی مەترسیدار هەستان و ئینگلیزەکان لە رەواندز دا (شوێنی خڕبوونەوەی دژمن) یان لە رۆژهەڵات و لە باکورەوە بۆردومان کرد.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٢١ دا دژواری بارودۆخەکە دەبێتە مایەی نیگەرانی دەوڵەتی بەریتانیا، بەریتانیا ئەم ئاژاوە و ناارامیانەی بە دەستی فەرەنسا و «کە بە تەماحی نەوتی موسڵەوە هاوکاری تورکەکان دەکات» و بە دەستی کۆمپانیای ستاندارد نویل دەزانێ.»[١٦]

پاش ئەوەی فەرەنسییەکان لە ٤/١/ ١٩٢٢ دا کیلیکیە (ئەرمەنستانی بچووک، ئەمرۆ بازێری ئیجل و هەندێک لە بازێری مەرعەش دەگرێتەوە) چوڵ دەکەن، ئیدی کەمالیەکان دەیانپەرژێ هەموو هێزەکانی خۆیان بۆ شەڕی ئینگلیز لە ناوچەی موسڵ تەرخان بکەن.

لە ناوەڕاستی هەیڤی ئازاردا، کەمالیەکان قایمقامێک بۆ رەواندز دادەنێن، کە لە کۆتایی مانگی ئاپاردا دەگاتە ئەوێندەر. تورکەکان لە مەیدانی بانگەشەو راگەیاندندا زوو بەزوو سەرکەوتنی باش بەدەست دێنن. لە کۆتایی هەیڤی ئاپاردا کوردانی جەباری لە نزیکی چەمچەماڵ رادەپەڕن. لەناوەڕاستی هەیڤی شەشدا دوو ئەفسەری ئینگلیز بە نێوی بۆند Bond و مەکلت Makant لە سەر دەستی کەریمی فەتاح بەگی سەرۆکی عەشیرەتی هەمەوەند دەکوژرێن، عەشیرەتی نێوبراو دژی ئینگلیزەکان دەجمێن.

لە نیوەی دووەمی حوزەیرانی ١٩٢٢ دا عەقیدێکی تورک بە نێوی عەلی شەفیق ناسراو بە (ئۆزدەمیر) گەییە ناوچەکە تا فەرماندەیی یەکە چریکی (غیر منظم)ەکانی رەواندز بگرێتە دەست. بە هەوڵ کوششی ئۆزدەمیر، تورکەکان بە زوویی کۆمەڵێک سەرکەوتنی دی بە بەدەست دێنن.

لە دەڤەری سلێمانیەش، وەزع و حاڵ زۆر خراپ دەبێت، بەڵام بەغدادا لەو کاتەوە کە کوردانی سلێمانی بە وردی و بە زیرەکی ڕێگەی جیابوونەوە لە عێراقیان هەڵبژارد، زۆربەی بابەدلرانی ئینگلیز بە هەمان توندی و توندڕەوی هەر عەرەبێکی رەگەزپەرست)ەوە خۆ لەو حەقیقەتە دەدەزنەوە کە ئەم خەڵکە هەقی خۆیەتی چاوی لە هەر جۆرە هاوکاری و یارمەتیەکی ئەوان بێ.[١٧]

کومیسێری باڵا کە هەموو ئەوزار و تواناکانی خۆی دەخزمەت دەوڵەتی عێراق و سەرکردایەتی هێزەکانی بەریتانیا نابوو، بە کردەوە چ توانایەکی نەبوو. تاقە مەسەلەی گرنگ و مەبەستی سیر پرسی کوکس ئەوە بوو کە کەسایەتیەکی دیار و بەرجەستەی کوردی دەست بکەوێ کە راستەوخۆ ناوچەیەکی بۆ بەڕێوە بەرێ.

لێ ئینگلیزەکان لە هەڵبژاردنی ئەم کەسایەتیەدا بۆچوونی جیاوازیان هەبوو: هەندێکیان دەیانویست حەمید بەگی بابان کەپاشماوە و وەچەی میرانی بابانی سلێمانی بوو، راست بکەنەوە و دەسەڵاتی بدەنە دەست، لێ حەمید بەگ زمانی کوردی نەدەزانی و ئەوەندەی ئاشقی مێژووی ماڵبات و بنەماڵەکەی خۆی بوو،ئەوەندە دڵی بە سیاسەتەوە نەبوو.

هەندێکی دی دەیانویست شێخ مەحمود بۆ سلێمانی بگەڕێننەوە کە لەسەرانی ناسراوی ناوچەکە بوو و ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٩٢١ دا لێیان خستبوو.

ئەدمونز بەخۆی دەیویست سەید تەها بکات بە دەسەڵاتدار و تا کۆتایش هەر بەرگری لێکرد.

بەڵام خێرایی رووداوەکان، سیرپرسی کوکسی ناچار کرد کە بڕیاری خۆی بدات.

## ٥

## چۆڵکردنی سلێمانی ١/٩/١٩٢٢

لە کۆتایی مانگی ٨/١٩٢٢ دا «هێزی لیوی Levies» (هێزی لیوی، بەو کەسانە دەگوترا کە ئینگلیز لە خەڵکی ناوچەکە پێکی دەهێنان و دەیخستنە ژێر چەک و ڕێکی دەخستن.) سلێمانی دەچێت بۆ شەڕی ئەو یەکە چریکییە تورکانەی کەلە رەواندزەوە

پێشڕەوی دەکەن و دەگەنە نزیکی ڕانیە. ئەم هێزە دوچاری زۆر گیروگرفت دەبێت و دوو لقی سیک دەنێرنە هاوکاری ئەو هێزە، ئەم هێزە کە بە ستونی ڕانیە نێوی دەرکردووە لە ۸/۳۱ دا لە دەروروبەری دەربەند و لە نزیکی زێی بچوک، بەر هێرش و پەلامار دەکەوێ و ناچار پاشەکشە دەکات و و زۆری پێ ناچێت ئەم پاشەکشەیە دەبێت بە بەزین و هەڵاتن. «دوو تۆپ و هەر هەموو ئەوزار و کەرەستە و تفاقەکەیان لە وێدا بەجێ دەهێڵن، دوو ئەفسەری ئینگلیز بریندار دەبن و ۳۰-٤۰ سەربازی چیک بریندار دەبن و دەکوژرێن.»(۱۸)

ئینگلیزەکان لە ترسی ئەوەی نەبادا کورد و چریکی تورک پەلاماری سلێمانی بدەن، بە شێوەیەکی «سەرشۆڕانە» سلێمانی چۆڵ دەکەن.

بەرەبەیانی ۱۹۲۲/۹/۱ چەند فڕۆکەیەک لە قەراخی شار دەنیشنەوە و کارگێران و پایەدارانی ئینگلیزی بە شێوەیەکی شەرمەزارانە لە مەیدانی شەڕ هەڵدێن. پێشتر کلیلی خەزێنە کە بایی ۳۰/۰۰۰ لیرەی ئەستەرلینی ڕوپیەی تێدابوو، هەروەها کلیلی جبەخانەکەشیان کە ٥ سەد تفەنگی ئینگلیزی و ٥ سەد تفەنگی تورکی تێدا بوو، دابوو بە شێخ قادری برای شێخ مەحمود.

## ٦
## گەڕانەوەی شێخ مەحمود

پاشان سیر پرسی کوکس دێتە سەر ئەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی بگەڕێتەوە. کوکس وەکو خۆی دەڵێ ئەمە چارەسەرێک بوو کە خەڵکی سلێمانی بەسەریدا سەپاندیان. کە هەموو یەک دەنگ و یەک قسە خوازیاری گەڕانەوەی کەسێک بوون کە تەنێ ئەو دەیتوانی «هارودۆخەکە ئارام بکاتەوە».(۱۹)

سیر پرسی کوکس کە هێزی پێویستی بۆ سەر لەنوێ گرتنەوەی شار لەبەر دەست دا نەبوو، بە هیوا بوو بتوانێ نەتەوەییەکانی کورد لە دەوروبەری شێخ مەحمود کۆ بکاتەوە و بیانکات بە گژ دەسەڵاتی تورکاندا. کوکس بەخۆی و بەوپەڕی بێ شەرمەییەوە دەڵێ: «ئێمە بەسەر لەنوێ تاقیکردنەوەی شێخ مەحمودج شتێکمان لە دەست نەدەدا.»

بەڵام وەزع حاڵ زۆر خەتەر و خراپ بوو: جەنەراڵ Fraser فریزەری فەرماندەی بەرزی هێزەکانی بەریتانیا، لەوە دەترسا کە کوردەکان و تورکەکان لە مانگی ئەیلول دا و لە دۆڵی زێی گەورەوە دەست بە هێرش بکەن وبینە هەردشە بۆسەر ئاکرێ و هەولێر.!

شێخ مەحمود وەکو «حوکمدار»یان حاکمی کوردستانی سەربەخۆ پێشوازی دەکرێ. چاپەمەنییە ناوخۆکان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە مێجەر نوێنیلی ئەفسەری پەیوەندییەکانی بەریتانیا، لە حەقیقەت دا تەنیا «کونسولێک» یان پێناوێکە «واسیتە. رابیتە» لە نێوان شێخ مەحمود و «کۆمیسەری بالادا».

## ٧

## شێخ مەحمود (مەلیکی کوردستان)

شێخ مەحمود کە لە ساڵی ١٩٢٢دا تەمەنی ٤٤ ساڵ بوو، پاشان بوو بە یەکێک لە دژمنە سەرسەخت و سەرەکییەکانی بەریتانیا لە کوردستاندا، پیاوێکی یەکجار دلێر و بێ باک بوو.

شێخ مەحمود وێڕای ئەوەی تیرەندازێکی کارامەو جەنگاوەرێکی بەناوو دەنگ بوو، هەموو سیفەت و تایبەتمەندیەکانی سەرۆکێکی کوردی تێدا بوو، باش قسەی دەکرد، گۆرانی فولکلۆری کوردی باش دەگوت، سام و دەسەلاتێکی زۆری بەسەر دەوروبەری خۆیدا هەبوو، «تەنیا بە نیگای تیژو بەسامی» خۆی و بە حوکمی پایەی میراتگری شێخانی بەرزنجە، خەڵکی بە تەواوەتی دەخستە ژێر کاریگەری خۆیەوە.[٢٠]

وا باو بوو کە گوللە نایبرێ، لایەنگرانی شێخ سوێندیان دەخوارد کە بە چاوی خۆیان دیتویانە گوللە دیواودەر کونی کردووە و بریندار نەبووە، وەکو کاک ئەحمەدی باوە گەورەی دەتوانێ بیری بەرانبەرەکەی بخوێنێتەوە.

شێخ کە بە زمانی تورکی و عەرەبی و فارسی و کوردی قسەی دەکرد، بۆ هاوولاتیانی خۆی نووسەرێکی «باش» بوو.

جگە لەمانە، پیاوێکی دەستەبالا بوو، روخسار و شێوەی کوردی بوو، سەری زۆر گەورە و دەموچاوی پان و چاوانی رەش بوون.

کەم کەس توانیویەتی بە قەدد ئەو رق و کینەی دژمنانی خۆی هەستێنێ: تاقە ئینگلیزێک نابینیەوە کە بە باشی باسی ئەوی کردبێ. سۆن sone کە ئەفسەرێکی ئینگلیزی بوو، سالانێک بەر لەم رووداوانە بە کوردستاندا گەشتی کردبوو، لە کتێبەکەی خۆیدا بە نێوی «گەشتی نەناسێک بۆ کوردستان» بە ناجۆری باسی بابی شێخ دەکات و دەڵێ: « شێخ بە ئاشکرا لایەنی زوڵم و زۆرداری و تاوانەکانی بابی دەگرێ!»

مامورێکی ئینگلیزی کە لە ساڵی ١٩١٩ دا راپۆرتێک بە ناوی «پوختەیەک لەسەر

**باروەزخی کاروباری باشوری کوردستانە دەنووسێت، شێخ « لە باری تێگەیشتن وتەقلەوە وەکو منداڵێک پیشان دەدات» بەڵام منداڵێکی یەکجار دەغەڵکار و پڕ فێڵ و بەدمەز و بەرژەر... لەمانەش بترازێ کۆمەڵێک زمان لوسی مەرایی کەر دەوریان دلوەو بیرو خەیاڵی عەجیب و غەریب و گەوجانەی وەهای دەیەنە مێشکەوە کە خۆی بە سولتانی هەموو کوردستان بزانێ.«**

مرۆڤ ناچار لە خۆی دەپرسێت کە شێخ ئەو جۆرە پیاوە بوو، ئەدی بۆچی پایەدارانی بەرعۆدەی بەریتانیا ئەویان بە حوکمداری سلێمانی دانا؟ لە ساڵی ۱۹۲۲شدا، وەڵام هەر هەمان وەڵامی ساڵی ۱۹۱۸ : بوو. لەم پوختەی کاروبارەدا، ئەمە دەخوێنینەوە: **« بەبێ هاوکاری، بە بێ یارمەتی ئەو دەبوایە حامیەیەکی بەهێز لە سلێمانی دابنرایە، کە ئەمەش لە بەرنامەدا نەبوو»!**

شێخ مەحمود بەسەرکەوتووی بۆ سلێمانی گەڕایەوە و هەر دوای چەند رۆژێک و لە ۱۰/۱۰/۱۹۲۲ دا بە فەرمانێک لە سلێمانی پایتەختی کوردستان»ەوە دامەزراندنی کابینەی کوردستانی بە بەشداری هەشت وەزیر راگەیاند.

شێخ قادر سەرەک وەزیران، شێخ مەحمود وەزیری بەرگری، وەزیرەکانی دی بریتین لە: کەریمی ئەلەکە کە «دیانە» وەزیری دارایی، شێخ محەمەد غالب، وەزیری ناوخۆ، حەمەد ئاغا وەزیری کاروباری گشتی، شێخ عەلی کەلداری وەزیری داد، سەید ئەحمەد، سەرۆکی پۆلیس، حاجی مستەفا پاشا، وەزیری فێر کردن.

دوای پتر لە یەک هەیڤ رانە لە ۱۸/۱۱/۱۹۲۲ دا شێخ مەحمود خۆی دەکات بە «پاشای کوردستان»

ئالاکەی هەر هەمان ئالاکەی ساڵی ۱۹۱۹ بوو: سەوز، بازنەیەکی سوور، لە نێو بازنەکەدا هەیڤۆکێکی (هیلال) سپی هەبوو.

شێخ هەندێ پولیش دروست دەکات.نەخشی دوو خەنجەری کوردی یەکتر بڕی تێدا دەبێ لەگەڵ دەستەواژەی : «دەولەتی کوردستانی باشورە

## ٨

## چاپەمەنی کوردی لە زەمانی پاشایەتی شێخ مەحموددا

مستەفا پاشا لە سەرەتای نابی ١٩٢٢ گۆڤاری «بانگی کوردستان»ی دامەزراند. و ١٣ ژمارەی لێ چاپ و بلاو کردەوە.

شێخ مەحمود دوای ماوەیەک لە گەڕانەوەی، مستەفا پاشای لە وەزیفەکانی لابرد و گۆڤارێکی نوێی بە ناوی رۆژی کوردستان دامەزراند و یەکەمین ژمارەی لە ١٩٢٢/١١/١٥ دا بلاو بووەوە.

رۆژی کوردستان کە گۆڤارێکی «رەسمی، سیاسی و ئەدەبی» بوو بە هاوکاری رۆشنبیران و شاعیرانی ناوداری سلێمانی بەتایبەت عارف سائیب و رەفیق حیلمی تا ١٩٢٣/٣/٣ هەفتەی جارێک بلاو دەبووەوە.

**گۆڤارەکەی شێخ مەحمود هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ چاپەمەنیەکانی بەغدادا کە باسی کوردستانی باشوریان دەکرد کە گوایە بەشێکەلە عێراق» و بە «لیوای سلێمانی» ناوی دەبەن و بە «کابینەی کوردستان» دەڵێن «ئەنجومەنی ئیداری شار» دەکەوێتە مشتومڕێکی توندەوە.**

نووسەری گوتاری «رۆژی کوردستان» پاش ئەوەی سەرسامی خۆی لەوە دەردەبڕێ کە «هاوسێی گەورە و دۆستی ئێمە (عێراق) چۆن دەتوانێ مافی هەزار ساڵەی ئێمە ژێر پێ بنێ یا.

فزونکاری بۆسەر سنوورەکانمان بکات.» دوویاتی دەکاتەوە کە کورد و عەرەب بەلای کەمەوە بەرانبەر و یەکسانن! لە ئەنجامدا دەڵێ کە کوردیش « هەقیان لەو ماف و سنوورانەدا هەیە کە کۆمەڵی نێو نەتەوەیی دانی پێدا ناوە.»(٢١)

**خوێندنەوە و موتالای ئەم گۆڤارانە یارمەتی ئەوەمان دەدەن کە رەوتی پەیوەندییەکانی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بناسین.**

ئێستاش وپاش تێپەڕبوونی پتر لە نیو سەدە، زۆر زەحمەتە ئەوە بزانرێ کە ئینگلیزەکان جارێک شێخ مەحمودیان تاقی کردبۆوە، بۆچی مەجبوری ئەو بوونەوە. بەتایبەتی وەکو دەبینین هەر کە گەڕایەوە و نەگەڕایەوە پەیوەندییەکانیان ئالۆز کاو شێوا.!

**شێخ مەحمود بە ئاشکرا وەکو جاران پارەی وابوو کە پەیام و ئەرکێکی مێژوویی دەستێ دایە و ئەم پەیامەش ئەوەیە کە کوردستانی باشور لە سایەی حوکم و دەسەلاتی**

خۆیدا یەک بخات و بەپێی سەرەتاکانی سەرۆک ویلسن ولاتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنێ.

پایەدارانی ئینگلیزی ئاکنجی بەغدا بەخۆیان نەخشە ویلاتێکی «یەک لاکەرەوە»ی تایبەتیان لەم بارەیەوە نەبوو دەیانویست شێخ مەحمود رۆڵێکی ناوچەیی ببینێ. ئەرک و رۆڵی ئەو ئەمە بوو، کە نەیەڵێ تورک لە ناوچەی سلێمانی ئارام بگرێ.

ئەگەرچی ئینگلیز بە وردبینی و کنوکۆکاری ناسراون، بەڵام مرۆڤ لەم حاڵەتانەدا کەچۆن هەرسەکیانە شێخیان لە زیندان دەرهێنا، تا هەر کاتێ لە تەگبیر و رایان دەربچێت، دیسان بەرەو داوی بەرن.

## ٩

## مەسەلەی کەرکوک

مەسەلەی کەرکوک — هەر لەسەرەتاوە- هۆیەکی گەورەی ململانێیەکانیان بوو. شێخ مەحمود لەهەندێ گفتوگۆیاندا کە بەر لە گەڕانەوەی بۆ سلێمانی و لە ناوەراستی ئەیلولی ١٩٢٢ دا و لە بەغدا دەگەڵ سیر پرسی کۆکس دا کردبووی، بەڵێنی دابوو کە هەقی بەسەر ئیدارە و بەڕێوەبردنی ناوچەکانی کەرکوک و هەولێرەوە نەبێ.

کەرکوک لەم سەروبەندەدا، بارودۆخێکی تایبەتی هەبوو: بە رواڵەت سەر بە عێراق نەبوو: زمانی رەسمی نێوان بەغداو کەرکوک زمانی تورکی بوو، قانونی عوسمانی وەکو جاری جاران لە گەڕ دابوو، شارەوانی سەربەخۆیی تەواوی خۆی هەبوو، ئاڵای عێراق بە سەر دەرگای قەلای شارەوە نەبوو.

پارێزگارێکی تورک بە هاوکاری راوێژکارێکی ئینگلیزی کەرکوکی بەڕێوە دەبرد، وێڕای هەر هەموو ئەمانە بەرای یەکێک لە نوێنەرانی ئینگلیز، «کەرکوک لەو زەمانەدا لە راستی دا بە جۆرێ بەڕێوە دەبرا وەک بڵێی بەشێک بوو لەعێراق»[٢٢]

هەڵبەتە بە زەبری گوشاری فەیسەڵ، ئەم وابەستەییەی کەرکوک بە عێراقەوە رۆژ بە رۆژ زیاتر بوو و کارگێرانی ئینگلیزی دەستووریان وەرگرت کە خانەدان و پیاوماقولانی کەرکوک هان بدەن تا رازی بن ئەم ناوچەیە بەشداری ریفراندۆم و هەڵبژاردن بکەن (بڕوانە فەرمانی ٢٣/ ١٠/ ١٩٢٢ی مەلیک فەیسەڵ)

شێخ مەحمود بە ئاشکرا دژی ئەم رەوتە کاری دەکرد، بەلای ئەوەوە کەرکوک ناوچەیەکی کوردنشین بوو، هەرچەند دانیشتوانی شار تورکمان بوون. (کورد و تورکمان بوون و کوردیش زۆرینە بوون نەک تورکمان).

شێخ مەحمود لە مانگی ١٢/١٩٢٢ دا دوو کەرکولی زادەی کرد بە یاریدەدەری خۆی تا بەوە بیسەلمێنێ کە کەرکوک بە بەشێک لە قەڵەمڕەوەکەی خۆی دەزانێ و لە کۆتایی هەمان ساڵدا رۆژی کوردستان، هەواڵی سەردانی سەرۆک عەشیرەتەکانی کەرکوکی بۆ سلێمانی بڵاو کردەوە.

خولاسە، هەردوو لایەنەکە کە تاکتیکی سالامی یان بۆ خۆ بەکار دێنا، واتە هەر لایەنە دەیویست دەستکەوتی پتر بە دەست بێنێ تا لایەنی هەڤرک ناچاری مامەڵە و مەسەلەت بکات.

## ١٠
## شێخ مەحمود و تورکەکان

بەڵام شێخ مەحمود بە ئانقەست خۆی لەگەمە سیاسیەکانی بەغدا دەدزێتەوە، میجەر نوئیل مرخی لەوە خۆش کردبوو کە هاوکاری و هاوئاهەنگیەک لە نێوان شێخ مەحمود و سمکۆ و تەهادا، دژ بە تورکەکان دروست بکات.

سمکۆ، دڵی بەوەوە نەبوو کە بەشداری کارێکی تەواو ناوچەیی بکات. بەڵام تەها یەکسەر و بێ چەند و چون خۆی دەخزمەت و ئیختیاری ئینگلیزەکان نا. ئەوەبوو ئینگلیزەکان لە ناوەڕاستی مانگی یازدەدا بە هێزێکی سەدو پەنجا سەربازی کوردی عێراقیەوە بۆ ناوچەی رەوندار یان نارد. بەو ئومێدەی کە ئۆزدەمیر لە ناوچەکە راوبنێ.

جموجۆڵ و چالاکی لەشکری رەواندز ج سەرکەوتنێکی لێنەکەوتەوە. تەها لەمەیدانی پراتیکی دا ئەو تەهایە نەبوو کە چاوەنۆڕ دەکرا، ئەمە جگە لەوەش کەباران هێزەکەی لەکار خستبوو، خۆ کە تورکەکان رانیەیان چۆڵ کرد لەبەر ئازایەتی ئەو نەبوو، بەڵکو بەهۆی زەبری هێزی ئاسمانی رانیەیان چۆڵ کرد.

تاقە ئەنجامی عەمەلیاتی «لەشکری رەواندز» بەرز بوونەوە وزیاد بوونی ئیحتوبار و دەسەڵاتی شێخ مەحمود بوو کە ملی بۆ هاوکاری کردنی ئینگلیز دژ بە تورک نەدابوو.

زۆری نەبرد کە شێخ مەحمود کەوتە نامە ونامەکاری دەگەڵ عەلی شەفیق «ناسراو بە ئۆزدەمیر» و گوتی کە « ئامادەیە لە پێناوی سوپای تورکیەدا گیانی خۆی بەخت بکات» و رای گەیاند کە ئامادەیە ئەم سەربەخۆییەی ئێستا بە ئۆتونومی سایەی تورکیە بگورێتەوە. (٢٣)

ئاشکرایە کە شێخ دەیویست بەم بەرانبەرێن کردنەی ئینگلیز لە گەڵ تورکاندا بەهای «

مزایەدەکە، زیاتر بکات. بەلام تورکەکانیش ساکار نەبوون، عەقید عەلی شەفیق هەوڵ جار بە «پیاوی ئینگلیزەی لە قەڵەم دەدات و سەرەنجام دەگاتە ئەم قەناعەتەی کە « ئێمە چە کارێکمان بەم شێخە نیە زۆر فێلبازە» بەلام تورکەکان بێ ئەوەی چ کەلێنێکی بدەنێ هەوڵ دەدەن لە بازنەی هەوڵ و تەقەلای خۆیاندا بۆ وەرگرتنەوەی موسڵ کە لەم سەروبەندەدا چارەنووسی لە هەموو کاتێکی دی نادیار تر بوو، سوودی لێ وەربگرن.

## ١١

## بەیاننامەی سەری ساڵی ١٩٢٢ی بەریتانیا

رۆژی جەژنی سەری ساڵی ١٩٢٢ کومیسێری بالای بەریتانیا لە بەغدایە بەیاننامەیەک بەم نیوەرۆکە بلاو دەکاتەوەکە «دەوڵەتی بەریتانیا و عێراق بەرەسمی دان بە مافی کوردی ناو سنووری عێراقدا دەنێ کە دەوڵەتی کوردی لە چوارچێوەی ئەو سنوورە دا دابمەزرێنن و هیواداریین لایەنە جیاوازەکانی کورد بە زووترین کات لەسەر شێوە و سنووری ئەم دەوڵەتە لەنێو خۆیاندا رێک بکەون و نوێنەری بەرپرسی خۆیان بە مەبەستی گفتوگۆ لەسەر پەیوەندیە ئابوری و سیاسیەکانی خۆیان دەگەڵ هەردوو دەوڵەتی بەریتانیا و عێراقدا بۆ بەغدایە بنێرین.»

یەکێک لە ئەفسەرانی سیاسی بەریتانیا (ئەدموندز) کە رادەسپێردرێ ئەم بەیاننامەیە بۆ سەرانی عەشایەری کورد بخوێنێتەوە، سەرسامی خۆی لە نیوەرۆکی ئەم بەیاننامەیە ناشارێتەوە. بەغدا هەرگیز تائەم رادەیە لەگەڵ ئەتەوە پەروەرانی کوردا نەهاتبووە پێشەوە. بەلام ئەمرۆ هەر کەسێک لەخۆی بپرسێت چ شتێک بووبوە هۆی ئەوەی کە دەسەلاتدارانی بەغدایە بەیاننامەیەکی وەها دەربکەن، بۆی بە دیار دەکەوێ کە بە تەما نەبوون بەڵێن و نیووەرۆکی ناو ئەم بەیاننامەیە جێبەجێ بکەن.

## ١٢

## لێ خستنی شێخ مەحمود

پاش ناکامی یەکەمین کۆنفرانسی لۆزان (١٩٢٣/٢/٤) ئاژاوە و پاشەگەردانی لەسەرانسەری کوردستاندا دەست پێدەکات و پایەدار و دەسەلاتدارانی بەریتانیا هەندێ زانیارییان دەست دەکەوێ کە گوایە شێخ مەحمود پەیوەندی بە رێبەرانی شیعەی کەربەلا و نەجەفەوە کردووە و بە تەمایە شۆرشێکی سەرتاسەری لە عێراقدا هەڵگیرسێنێ.

هەروەها بە تەماشە لە هەمان کاتدا و لەمانگی ئازاردا لـەگەڵ نوزدەمـیرا پەلاماری کەرکوک بدات.[٢] ئیدی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا بە پەلە دەکەونە ئەوەی شێخ مەحمود لە کۆڵ خۆیان بکەنەوە، بە پێچەوانەی ساڵی ١٩١٩ وە ئەمجارە باس، باسی شۆڕش نیە بەڵکو باسی «جوڵاندن و هاندانە».

سیر پرس کوکس لە مانگی تەموز بەم لاوە لە لەندەنە، چووە بە... اری گفتوگۆی تایبەت بەو سیاسەتەی کە پێویستە لە عێراقدا بگیرێتەبەر بکات. سێر هنری دوبز، کەپاشان لەجێی ئە... ادەنرێ، کاروباری ئەو دەکات. بەڵام چارەنوسی شێخ مەحمود دیاری کراوە.!

لە ناوەڕاستی شوبات دا، پایەدارانی سەرەکی ئینگلیز لە عێراق دا واتە سێر هنری دوبز، ئایر کمودور بورتون، بوردیلون، سکرتێری کومیسێری باڵا و ئەدموندز کۆ دەبنەوە و نەخشە و پلانی خۆیان دژی «پاشای کوردستان» ئامادە دەکەن. لە ١٩٢٣/٢/٢١ دا کە هێشتا پتر لە ٥ هەیڤ بەسەر پاشایەتی شێخ دا نەبووری بوو، شێخ مەحمود ئەم ئاگاداریەی خوارەوەی پێ دەگات. یان بە هەموو ئەندامانی دوڵەتەکەیەوەبۆ بەغدا بڕوات و نیاز و مەرامێ خۆی رون بکاتەوە یان لێدەخرێ. بڕیارە ئەم نەخشەیە بکرێ بە بەیاننامە و بە فڕۆکە بەسەر شاردا بڵاو بکرێتەوەو و خەڵکی سلێمانی لێ ئاگادار بکرێ، لە بەیاننامەکەدا ئەوە بگوترێ کە ئەگەر مقاوەمەت و بەرەڤانی بکرێ، ئەوا شار بۆردومان دەکرێ!

## ١١

## بۆردومانی سلێمانی

وەکو چۆن پێشنیاز کرابوو، شێخ مەحمود بۆ بەغدا ناچێت، لە ١٩٢٣/٢/٢٢ دا بیست فڕۆکە هەڵدەستن تا بەیاننامە بەسەر شاری سلێمانی دا بڵاو بکەنەوە، بەڵام هەژدە فڕۆکەیان لەو تەم ومژە خەستەدا کە کوردستانی داپۆشی بوو، رێ هەڵەدەکەن و تەنێ دوو فڕۆکە دەگەنەجێ.

نیوە شەوی ٢/٢٤ شێخ مەحمود داوا لە ئەدموندز کەلە کەرکوک دەبێت، دەکات بێتە تەلەگرافخانەو ئیدی بە درێژایی شەوەکە و لە رێگەی تەلەگرافەوە گفتوگۆ بەردەوام دەبێ.[٢٥] ئەنجام لە ٣/٣ دا لە کاتێک دا کەدوو نوێنەری شێخ مەحمود (شێخ قادری براو سەرەک وەزیرانی، مستەفا پاشا) دەگەنە کەرکوک، فڕۆکەیەک چەند بۆمبایەک بەسەر سلێمانی دا دەبارێنێ.

سپێدەی ١٩٢٣/٣/٢٤ شێخ مەحمود لە سلێمانی وەدەردەکەوێ و خەزینە وزۆربەی «هێزی ناوخۆ»ی سلێمانی لەگەڵ خۆیدا دەبات.

لە ئەشکەوتی جاسەنەی سورداش لا دەدات و لە وێندەر لە ٣/٢٨ دا گۆڤارێکی تازە بە ناوی «بانگی حەق» دەردەکات کە یەکەمین ژمارەی فتوای جیهادی تێدا بڵاو کراوەتەوە و[٢٦] بە سوپای (میلی کوردستان)ەوە کە لە چەند سەد کەسێک پتر نابێ بە فەرماندەیی سالح زەکی ئامادەی شەڕ دەبێ.

## ١٤
## شەڕی نۆزدەمیر

سێر جان سالموندی فەرماندەی هێزی هەوایی بەریتانیا لە عێراق[٢٧] کە خەتەری تورکەکان بە جدی تر لە خەتەری شێخ مەحمود دەزانێ، لێدەبڕێ کە بە یەکجارەکی و بۆ هەمیشە کۆتایی بەبوونی تورکان لە رەواندز بهێنێ.

رەتلێک سەربازیبەریتانیایی بەناوی رەتلی کۆیە و بە مەبەستی جیا کردنەوە و داپڕانی شێخ مەحمود لە تورکان، لە موسڵەوە بەرەو هەولێر و کۆی سنجاق حەرەکەت دەکات.

رەتلێکی دی بە ناوی رەتلی سنوور، کە لە هێزی لیوی و پۆلیس پێک دێت راستەخۆ و بۆ دێرێ و سپیلک ورەواندز دەڕوات.

عەقید عەلی شەفیق «نوزدەمیر» کە چاوی بە زۆری هێزی دوژمن دەکەوێ، خۆی لە شەڕ دەپارێزێ و لە ١٩٢٣/٤/٢٢ کـە رێکەوتی رۆژی پێش دەســتــپــێکردنی دووەمین کۆنفرانسی لۆزان دەکات رەواندز چۆڵ دەکات.

## ١٥
## دانانی سەید تەها بە حوکمداری رەواندز

ئینگلیزەکان دوای چەند رۆژێک تەها دەکەن بە قایمقامی رەواندز ونیەدەی بە هاوکاری هێزێکی بچوک لە بەکرێگیراوانی ئاشوری، دژی تورکان سەنگەر دەگرێ.

بە شێوەیەکی گشتی ئەم نەوەیەی شێخ عوبەیدوڵلا و راوێژکاری جارانی سمکۆ، لەوە بە دواوە دەورێکی گرنگی وەها لە رووداوەکانی کوردستاندا نابینێ و تا کۆتایی بیستەکان لە سەر ئەم کارەی دەمێنێ ولەساڵی ١٩٣٩ دا و لە کەش وهەوایەکی ئاڵۆز و نادیاردا لە تاران دا بەهۆی ژەهراوی بوونەوە دەمرێ.[٢٨]

## گرتنەوەی سلێمانی ١٩٢٣/٥/١٦

دەسەڵاتدارانی بەغدا کە خەم و ترسی هێرش و پەلاماری تورکیان نامێنێ، ئیدی دەتوانن هەموو توانا و هێزێکیان بۆ شێخ مەحمود تەرخان بکەن کە لە ئەشکەوتی جاسەنەی نزیکی سورداش دا حوکمرانی دەوروبەری دەکرد و وەکو جاری جاران باج و سەرانەی وەردەگرت.

بۆچوونی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز و عێراقی لە بەغدا، لەمەڕ ئەوەی کە چ سیاسەتێک لەو بارەیەوە پەیڕەو بکرێ، کوک و یەک نەبوو، دەوڵەتی عێراق بێ گوێدان بە بەیاننامەکەی جەژنی سەری ساڵی ١٩٢٢[٢٩] دەیویست دەزگایەکی ئیداری وەها لە کوردستاندا دابمەزرێنێ کە کەم و زۆر گوێڕایەڵی فرمانی ئەو بێ، هەڵبەتە ئەمە شتێک بوو کە ڕێبەرانی کورد پێی قایل نەبوون.

لەلایەکی دیکەوە سێر هنری دوبز پێی وابوو تاشێخ ئازاد بێ مەحاڵە بتوانرێ ڕژێمی «ئوتونۆمی» لە کوردستاندا دابمەزرێنرێ. ئەمە خۆی لە خۆیدا بیروبۆچوونی دەسەڵاتدارانی ناوچەیی بەریتانیا لەمەڕ ئوتونۆمی، بەروونی نیشان دەدا.

بەڵام کۆمیسێری باڵا پێی وابوو مادامێکی شێخ مەحمود نەکوژراوە یان ئەسیر نەبووە پێویستە پێکهاتنی لەگەڵ بکرێ.

لێ لایەنگرانی سەرکوتکاری لەم ململانێیەدا باڵا دەست بوون و گرەویان بردەوە لە ١٩٢٣ /٥/٨ هەندێ بڵاوکراوە لە سلێمانی دا بڵاوکراونەوە کە رای دەگەیاند بەو زووانە سلێمانی دەگیرێتەوە.

لە ٥/١٢ دا دوو فەوجی سوپای هند هاوڕێ لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی ئینگلیز و ئەدمونزدا لە کەرکوکەوە بۆ سلێمانی وەرێکەوتن.

لێ ئەمجارەیان سلێمانی بەبێ شەڕ و خوێن ڕشتن گیرا: شێخ مەحمود بە تەما بوو لە ملەی تاسلوجەدا بەردەمی هێزەکانی ئینگلیز بگرێ، بەڵام پێشڕەوی هێزی ئینگلیز لە چەکدارانی شێخ خێرا تر بوو، کە بینی هێزی ئینگیز لە ملەکە ڕەت بووە، دایە کێو.

سلێمانی لە ١٩٢٣ /٥/١٦ دا گیرا.

ئەدمونز لە نووسینگەی کاری شێخ مەحمود، واتە لە قوتابخانەی ناوەندی سلێمانی کەلە ساڵی ١٩١٩ دا نووسینگەی کاری میجەر نوئیل بوو، بارەگەی خست.

تەنیا ئەم شتانە لە ژوورەکەی شێخ دا بەرچاو دەکەوتن. وێنەیەکی شێخ مەحمود بە دیوارەوە بوو کە شریتێکی سووری لە دەور بوو، ئالای کوردستان، تاجێک کە بەبەیداخی پاشایەتی پولەکە دۆزی کرابوو.

ئەدمۆندز هەوڵ دەدات بە هاوکاری ئەو گەورە پیاو و پیاو ماقوڵانەی کە ئامادەن لەگەڵ بەغدادا هاوکاری بکەن دامەو دەزگای ئیداری «ئوتونۆمی» کوردی لە ناوچەکەدا دابمەزرێنن.

شێخ قادری برای شێخ مەحمود و سەرەک وەزیرانی جارانی کوردستان کە هەمیشە بەلای ئینگلیزدا دایکێشاوە، دەکرێ بە بەرعودەی دابینکردنی ئاسایشی شار، بەرعوّدەی دەزگای بەڕێوەبردن بە ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ دەسپێردرێ کە یەکێک بوو لە خانەدانانی سلێمانی. شارەوانی سەر لەنوێ دەکەوێتەوەکار.

لە ١٩٢٣/٥/٢٠ دا هێزێک بەرەو ئەشکەوتی جاسەنە دەنێردرێ. شێخ مەحمود کەلە سلێمانی دەردەچێت لەوی «جاسەنە» بارەگای سەرکردایەتی خۆی دادەنێ.

بە دیوارێک ئەشکەوتەکە کراوە بە دوو بەشەوە، بەشی پشتەوە تەنگترە و لە ئەدیوی دایە. ناوەوەی ئەشکەوتەکە ژوورێکی بچوکە. شتەکانی نێو ئەم ژوورۆچکەیە بریتیە لە قەرەوێڵەیەکی ئاسنین، چەند تەختێکی دانیشتن، تایپێک و تەلەفونێک کە پەیوەندی نێوان کۆشکی پاشایەتی و گوندەکانی ئەو دەوربەرە دابین دەکات. کە هێزە ئنگلیزییەکە نزیک دەبێتەوە شێخ مەحمود لەگەڵ چەند سوارێک دا ئەو ناوچەیە بە جێدێڵێ و بەرەو سنووری ئێران دەڕوات.

## ١٧

## هەشەلهێنانی رژێمی «هاوکاران»

بەهەر حاڵ بەریتانیا و هاوکارانی لە خانەدان و پیاوماقوڵانی سلێمانی، ناتوانن ئەمن و ئاسایشی سلێمانی دابین بکەن و بە ئاسانی بەڕێوەی بەرن، بەڵکو دووچاری گیروگرفتی یەکجار گەورە دەبن، پاشان کومیسێری باڵا، ئیعتراف دەکات کە دۆزینەوەی کەسایەتیەکی کوردی وەها کە «هێندە بە دەسەڵات بێ کە بێ پشتیوانی هێزی بەریتانیا بتوانێت بەرانبەر بە دەسەڵاتی شێخ مەحمود بوەستێ» کارێکی مەحاڵ بوو.[٣٠] ئەمە جگە لەوەی کە خانەدان و پیاوماقوڵانی کورد ئامادە بوون هاوکاری دەگەڵ ئینگلیزەکاندا بکەن، بەڵام ئامادە نەبوون هاوکاری لەگەڵ فەیسەڵدا بکەن.

لە کۆتایی مانگی ٥/١٩٢٣ دا عەبدولموحسین ئەلسەعدونی سەرەک وەزیرانی عێراق، لەگەڵ ساحیب بەگ ئەشئەت (لە کوردی هەولێر بوو) سەرۆکی شارەوانی بەغدا، لەگەڵ کورنوالیس- کە فەرمانبەرێکی گەورەی بەریتانیا بوو، دەچێت بۆ سلێمانی.

کورنوالیس، رای دەگەیەنێ کە دەوڵەتی بەریتانیا بریاری داوە ژمارەی هێزەکانی خۆی لە عێراق دا کەم بکاتەوەو تەنێ شەش فەوج بهێڵێتەوە و رەتڵی رانیە لە نیوەی ٦ دا لە سلێمانی سەحب بکاتەوە.

سێر هنری دوبز و ئەدمۆندز و کورنوالیس باسی (سەفەرەکەی سەرەک وەزیران بۆ سلێمانی) ناکەن و پەردەی بەسەردا دەدەن.

بەڵام ئەگەری گەورە ئەوەیە کە سەرەک وەزیرانی عێراق بەو مەبەستە چووەتە سلێمانی تا هەندێک پێشنیازان دەربارەی پەیوەندیەکانی ئایندەی نێوان سلێمانی و عێراق بکات.

بەڵام وێرای هاتنی کومیسێری باڵا، -سێر هنری دوبز- بۆ سلێمانی لە ٢/٦/١٩٢٣ خانەدان و پیاوماقوڵانی کورد نەیانتوانی لەگەڵ بەغدا پێک بێن و ئەوە بوو لە ١٤/٦ دا ئەنجومەنی کاتی شاری سلێمانی « بە کۆمەڵ ئیستیقالەیان کرد!»

قەرار بوو هێزەکانی بەریتانیا لە ١٧/٦/١٩٢٣ سلێمانی چۆڵ بکەن. سێ رۆژ لە پاش ئەوە بە بۆچوونی ئەدمۆندز « مۆتەکەی راستەقینە» بوو: شێخ قادر ئامادە بوو ئەمن و ئاسایشی شار دەستۆی خۆی بگرێ، بە مەرجێک کە ئینگلیزەکان پارەی پێویست بۆ راگرتنی هێزێکی بەرگری ناوچەیی ٣٥٠ نەفەری و بەلای کەمەوە ئەفسەرێکی ئینگلیزی بۆ یاریدەدانی ئەو، بخەنە بەردەستی، لێ سێر هنری دوبز، ئەرم نابێت و ئایەتە رەدا: بریاری کشانەوەی بەریتانیای مەزن لە سلێمانی، بریاری یەکجارەکیە. لە ١٧/٦/١٩٢٣ دا رەتڵی کۆیە لە سلێمانی وەدەرەدەکەوێ و حەشاماتێکی ٢ هەزار نەفەری لەو «پەنابەرانەی کە کەم و زۆر هاوکاری ئینگلیزەکانیان کردووە، بە دوایەوەن!»[٣١]

## ١٨

## گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی ١١/٧/١٩٢٣

دەسەڵاتدارانی بەریتانیا کە پێشبینی گەڕانەوەی شێخ مەحمودیان بۆ سلێمانی کردبوو، لە رێگەی ئەدمۆندزەوە کە لەو سەروبەندەدا دەوری گرنگ دەگێڕێ، دەست بە کۆمەڵێک هەنگاونانی ئیداری دەکەن، رانیە و قەڵادزێ لە باکوورەوە، چەمچەماڵ لە رۆژاواوە و قەرەداخ و هەڵەبجە لە باشوورەوە، لە ناوچەی سلێمانی جیا دەکەنەوە.

و «پاشای جارانی کوردستان» کاتێ کە لە ١٩٢٣/٧/١١ دا بە سوپای میللی کوردستانەوە کە لەم کاتەدا بە فەرماندەیی ماجد مستەفا بوو، دێتەوە سلێمانی، دەبێ حوکمی سلێمانییەکی کلک و گوێ کراو بکات واتا «کەمەربەندێکی تەندروستی» (کەمەر بەندی تەندروستی ئاماژەیە بەو کەمەربەندەی کە هاوپەیمانان پاش شۆڕشی ١٩١٧ی روسیا، بە دروست کردنی حکومەتانی وەکو حکومەتی ئەتاتورکی تورکیا و رەزاشای ئێران، لە دەوری ولاتی تازەی یەکێتی جەماوەری سۆڤیەتی سوسیالیستی دا کێشایان تا بەمە زیاتر رێگە لە بلاوبوونەوەی «میکرۆبی کۆمونیزم» لە جیهاندا بگرن.) لە سلێمانی و ناوچەکانی دەوروبەری سلێمانی تا دەگاتە سنووری نێوان ئێران کە هەرهەمووی لە ژێر حوکم و دەسەلاتی دەولەتی عێراقی دایە، دادەمەزرێنێ.

ئەم ئەخشە و تەگبیرانە لە ١٩٢٣/٧/٢٠ لەلایەن کۆمیسێری بالاوە -سێر هنری دوبز- دەکرێ بە نامەیەک و بە شێخ مەحمود رادەگەیەنرێ.[٣٢]

لە هەمانکاتدا دەولەتی عێراق دەربارەی ئەو کوردانەی کە لە گەل شێخ مەحمود دا نین بەیانێک دەردەکات و لەو بەیانەدا رایدەگەیەنێ کە (جگە لە فەرمانبەرانی هونەری بەتەما نییە چ فەرمانبەرێکی دیکەی عەرەب لە ناوچە کوردنشینەکاندا دابمەزرێنێ. هەروەها پێوەن کە دانیشتوانی کوردی ئەم ناوچانە ناچار نەکەن هەر بەزمانی عەرەبی نووسراوی رەسمی بنووسن و مافی هاولاتییەتی و ئایینی خەلکی ئەم ناوچانە پارێزراو دەبێ.»[٣٣] ئەم رەوت ورەوشە جیاوازیەکی زۆری دەگەل بەیاننامەکەی جەژنی سەری سالی ١٩٢٢دا هەیە.

**راستە پەیمانی لۆزان تازە ئیمزا کرابوو ١٩٢٣/٧/٢٢ ئەم پەیمانە هەرچەندە مەسەلەی موسلی چارەسەر نەکردبوو، بەلام لە جیاتی ئەوە ئەخشەی سەربەخۆیی کوردستانی زندە بەچال کردبوو.**

لە عێراق دا بۆ هەموو کوردێک (تەنیا سارپلەکە و نەزانان نەبێ) روون و ئاشکرا بوو، کە[٣٤] چارەنووسی هەول و ئاخیری ولاتە کۆستکەوتووەکەیان ئەوەیە کە بە گەل ولاتی عێراق بکەوێ.

بەلام شێخ مەحمود بە روالەت تەسلیم نەبوو! شێخ وێڕای هەڕەشەکانی کۆمیسێری بالا، پەلوپۆی بۆ دەڤەرەکانی دەوروبەر دەهاویشت و لە کاری خۆی بەردەوام بوو.

دەسەلاتدارانی بەریتانیا بۆ ئەوەی کە « وەهۆش بێنەوە» لە ١٩٢٣/٨/١٦دا

بارەگاکەی لە سلێمانی دا بۆردومان دەکەن و لەم بۆردومانەدا بۆ یەکەمجار بومبای گەورەی سەد کیلۆیی بەکار دەهێنن.

دوای چەند مانگێک و لە رۆژی جەژنی سەری ساڵی ۱۹۲۳ دا چەند فڕۆکەیەک بەمەبەستی بوردومانکردنی سلێمانی لە هەولێرەوە هەڵدەستن، بەڵام نیوەی ئەو فڕۆکانە لەنێو تەم و مژی چرِدا رێ گوم دەکەن و لە نیوەی رێ دەگەڕ...ەوە. دوو فڕۆکەش لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شێخ مەحمود دا بە ناچاری دەنیشنەوە. دەسەڵاتدارانی ئینگلیزی «دستوور «ا» بە شێخ مەحمود دەدەن کە ئاگای لە فڕۆکەکان بێ، ئەویش بە گوێیان دەکات!

## ۱۹

## ئەنجومەنی دامەزرێنەران و پەیمان و رێککەوتن لەگەڵ بەریتانیای مەزن دا

لێ دەسەڵاتدارانی بەریتانیا و عێراق نیگەرانی و خەمێکی دیکەشیان هەبوو، ئەم نیگەرانییەش سەبارەت بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دامەزرێنەران بوو، کە لە هاتنە سەرتەختی فەیسەڵەوە تا ئێستە بەردوام تەگەرەی کەوتبووە رێ.

دەسەڵاتی عێراقی پاش دامرکاندنەوەی بزووتنەوەی شیعەیان، یان دوورخستنەوەی هەندێک لە رێبەرەکانیان، ئیدی رێیان بۆ خۆش بوو بوو دەیانتوانی هەڵبژاردن بکەن- بە جۆرێ هەڵبژاردن بکەن کەچ رووداوێکی چاوەنوڕنەکراو و ناخۆش نەقەومێ، لە هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان دا، هەموو پیاوانی پێگەییو « دەنگدەرانی دەوری یەکەم» دەنگدەرانی دەوری دووەم هەڵدەبژێرن و لە هەڵبژاردنێکی دی دەنگدەرانی دەوری دووەم دا نوێنەرانی ئەنجومەن هەڵدەبژێرن.

سەیر ئەوەیە کە گەورە بەرپرسانی ئینگلیز دوایی زۆر بە بێ شەرمی باسی کاریگەری و چاکی، ئەم جۆرە کارە دەکەن، « زۆربەی دەنگدەرانی دەوری دووەم- بەتایبەتی نوێنەرانی عەشایەر داوای راوێژ لەبەرپرسان دەکەن سەبارەت بە چۆنیەتی بەکارهێنانی مافەکانیان. لە ئەنجامدا کەرکوک و سلێمانی نوێنەرانێکی باش بۆ ئەنجومەن ڕێ دەکەن ». [۳۵]

هەڵبژاردن لە رۆژی ۲٤/۳/۱۹۲٤ «تەواو دەبێ» کوردستان ۱۷ نوێنەری لە ئەنجومەنی دامەزرێنەران دا هەبوو، هەندێ لەم «نوێنەرە باشانە» و لە هەموویان ناسراوتر، شێخ قادری برای شێخ مەحمود و ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ (سلێمانی) و ساڵح ئەوتچی زادە (کەرکوک) و جەمیل بەگی بابان (کفری) و شێخ حەبیب تاڵەبانی (عەشایەر)[۳٦]

سەیر ئەوەیە ئەم هەڵبژاردنە وێڕای هەموو فەرمایشی بوونێکی زۆر بەو جۆرەش نەبوو کە دەیئواند.

ئەنجومەن پاش یەکەمین کۆبوونەوەی خۆی، بە ماوەیەکی کەم، ناڕەزایەکی توندی لەمەڕ پەیمانی رێکەوتن دەگەڵ بەریتانیادا - کە ماوەکەی لە بیست ساڵەوە بۆ چوار ساڵ کەم کرابووە -دەربڕی.

هەراو هەنگامە، بە تایبەتی لە بەغدا، بەرپابوو، هێرش کرایە سەر دوو نوێنەری قایل بە پەیمانەکە.

ئەم هەراو هەنگامەیە بە خێرایی گەیییە کوردستان: لایەنگرانی شێخ مەحمود ئەو رووداوە ناخۆشەی کەرکوکیان بە قازانجی خۆیان قۆستەوە. لەو رووداوەدا بە کرێگیراوانی ئاشوری لە بازاڕدا تەقەیان لە خەڵکی کردبوو و نزیکەی پەنجا کەسێکیان لە خەڵکی کوشتبوو، جارێکی دی پایەو ئیحتویاری شێخ مەحمود بە خێرایی بەرز بووەوە.

ئەم هەراو هەنگامەیە، جۆرە کاردانەوەکیش بوو بۆ ئەو بێ سەروبەریەی پێش گفتوگۆی « زمانەی بسفوورە. ئەم گفتوگۆیە بۆ دیارکردنی سنووری نێوان عێراق و تورکیا بوو بە پێی پەیمانی لۆزان.

## ٢٠

## بۆردومانی سلێمانی (١٩٢٤/٥)

دەسەڵاتدارانی بەغدا دەیانەوێ شەڕی شێخ مەحمود لەکۆڵ بکەنەوە: زیاتر گلەیی ئەوەی لێدەکەن کە بە «بەبێ پرس کەوتۆتە سەرباز گرتن» و « کۆکردنەوەی باجی نایاسایی» و «سەرکوتکردنی خەڵکی» و «بەرپا کردنی پەیوەندی دەگەڵ دژمنانی وڵاتدا».

لە ١٩٢٤/٥/٢٠ بە فڕۆکە بەیانێک بەسەر شاری سلێمانی دا بڵاو دەکەنەوە و خەڵکەکە ئاگادار دەکەنەوە کە ئەگەر شێخ مەحمود تا ٥/٢٥ نەچێت بۆ بەغدا، ئەوا شار بۆردومان دەکرێ.

ئینگلیزەکان لە ٢٧ و ٥/٢٨ دا سلێمانی بۆردمان دەکەن و کاریگەری ئەم بۆردومانە زوو بە دیار دەکەوێ.

بە پێی گوتەی سەرکردایەتی گشتی هێزی هەوایی بەریتانیا لە بەغدا، چونکە خەڵک، کە پێشتر ئاگادار کرابوونەوە، ژمارەی خەسارە وزیان کەمە، لە کۆی ٣/٠٠٠ خانوو ماڵی

شار «نزیکەی ٥٠-١٠٠ خانوو کە یەکێک لەو خانووانە خانووە کۆنەکەی شێخ مەحمودە، زۆر زیانیان پێ کەوتووە.»[٣٧]

بەڵام بە قسەی تورکەکان کە لە ٩/٣ دا سکاڵایان بردە لای کۆمەڵەی نەتەوەکان: خەسارەتەکە قورس بووە و دوو لە سێی شار وێران بووە!

ئەم بۆردومانە وێڕای توندی خۆی، کۆتایی بە مقاوەمەت و بەرگری شێخ مەحمود ناهێنێ و لە بەغدایە دژایەتی پەیمانی «ئینگلیز و عێراق» زیاد دەبێت.

ئینگلیزەکان بە ناچاری نوێنەرانی ئەنجومەنی دامەزرێنەران ئاگادار دەکەنەوە کە دوا مۆڵەتی پەسند کردنی پەیمانەکە پێش نیوەشەوی ٦/١٠ و ئەگەر ئەمە نەکرێ ئەوا بەلای ئینگلیزەوە ئەم کارە بەرەفز کردن حەساو دەکرێ و دیارە ئەم جۆرە رەفزکردنەش ناکام و ئەنجام و ناقیبەتی خۆی هەیە.

هەنگینێ پەیمانەکە لە هەڵومەرجێکی زۆر عەنتیکەدا لەلایەن ئەنجومەنەوە پەسەند دەکرێ: چەند دەقیقەیەک بەر لە نیوەشەوی ١٩٢٤/٦/١٠ کۆبوونەوەیەک ساز دەدرێ وسەد نوێنەر بەشداری لە کۆبوونەوەکەدا دەکەن و لە کۆی ئەو سەد نوێنەرە ٦٩ کەسیان رازی دەکەن و نیدی پێشنیازی پەسەند کردنی پەیمانەکە دەخرێتە بەردەم ئەنجومەن و پەیمانەکە بە رەزامەندی ٣٧ دەنگ و دژایەتی ٢٤ دەنگ و بێ لایەنی ٨ دەنگ پەسەند دەکرێ.

نوێنەرانی کورد، لە گەڵ دوو نوێنەری دەفەری موسڵ دا پتر لە نیوەی دەنگە رازییەکان دابین دەکەن.

مەلیک فەیسەڵ هەقی بوو کە هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی بۆ لکاندنی ناوچە کوردنشینەکان بە عێراقەوە تەرخان کردبوو.

## ٢١

## گرتنەوەی سەرلەنوێی سلێمانی (١٩٢٤/٧/١٩)

دەسەڵاتدارانی عێراقی لە سەرەتای تەمووزی ١٩٢٤ دا لێبڕان سەر لەنوێ سلێمانی بگرنەوە. هۆ و هەنجەتی ئەم بڕیارە بە دروستی دیار نیە، بێگومان پاش شکستی گفتوگۆی قەستەنتەنییە و بە مۆڵەتی مانەوەی مەسەلەی ویلایەتی موسڵ، عێراقی و ئینگلیزەکان دەیانویست « کارتی براوە» بەیەکجارەکی لە دەستی هەڤرک و بەرانبەرەکەیان دەربێنن و ئەم کۆسپە لە رێگەی خۆیان لابدەن، ئەم کارتە شێخ مەحمود بوو. بێگومان لەم

کاردا دەبێ دەستی فەیسەڵیش ببینرێ.

لێ ئەم بڕیارە، بەتایبەتی لەم ڕووەوە مایەی سەرنجە کە بێ راوێژ دەگەڵ دەوڵەتی لەندەن دا، درابوو.

وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی کۆلۆنییەکان کە لەم بڕیارە ئاگادار بوون، کاردانەوەیەکی توندیان نیشان دا و زۆریان بە لاوە سەیر بوو کە «کۆمیسیێری بالا بڕیارێکی وەها گرنگی بە بێ راوێژ و تەگبیری پێشوەختە دەگەڵ خاوەن شکۆ پاشای ئینگلیستاندا داوە.» بەلام هاتنە سەر ئەوەی کە «بێدەنگی لێبکەن.»[38]

تازە درەنگ بوو بوو، دەوڵەتی لەندەن کاتێ لە بڕیارەکە ئاگادار بووەوە، هێزەکانی بەغدا گەیی بوونە دەروازەکانی سلێمانی ولە ۱۹۲٤/۷/۱۹ دا سلێمانی گیرا.

## ۲۲

## ئاقیبەتی کار

شێخ مەحمود بە بێ شەڕ سلێمانی بە جێ نەهێشت: دوای ئەوەی کە لە شاروەدەرکەوت، بەخۆ و ۱۵۰ نەفەرێکەوە « بە گوتەی ئینگلیزەکان» پەنای وەبەر گردێکی باکوری رۆژهەلاتی «پایتەختەکەی » برد و لەوێندەرەوە تا ۲۷ی تەموز شەڕی داگیرکەرانی کرد.

پاشان چووبۆ بەرزنجەو ئەوجا پێنجوین، لایەنگرەکانیشی تا کۆتایی ساڵ لە قەراخ شارەوە دەچوونە سەر هێزە داگیرکەرەکانی بەغدا.

لە کۆتایی مانگی یازدەی ۱۹۲٤ دا ئەدمۆندز بە خۆی رێنوێنی بۆردومانی ناوچەی سیتەکی سەر بە شارباژێر دەنەستۆ دەگرێ، و هێزی ئاسمانی بەریتانیا بۆ یەکەمجار لە کوردستاندا بۆمبای سوتێنەر بەکار دێنێ.

حوکمرانی ناوچەی سلێمانی بە شێوەیەکی کاتی بە یەکێک لە پایەدارانی سیاسی بەریتانیا، بە ئێوی جاپمەن دەسپێردرێ کە ئەرکەکانی پارێزگار بەڕێوە دەبات و راستەوخۆ پەیوەستە بە کومیسێری بالاوە.

مەلیک فەیسەڵ رۆژی ۱۹۲٤/۱۲/۲۰ بۆ یەکەمجار بۆ کەرکوک دەڕوات، بە بۆنەی ئەم دیدارو سەردانەوە ئالای عێراق بۆیەکەمجار لەسەر سەرای حکومەتی کەرکوک هەڵدەکرێ.

پاش ئەوەی مەلیک دەڕوات بۆ کفری و ئالاکە هەر بە دەقی خۆیەوە دەمێنێتەوە. بەلام مەلیک ناچێت بۆ سلێمانی. دەسەلاتداران دەلێن گوایە بەفر شاری گرتووە و رێگە و بانەکان خراپ بووە. بەلام راستییەکەی مەلیک فەیسەل زاتی نەکرد وا زوو بچێ بۆ پایتەختی کوردستانی باشور و رقی نەتەوە پەروەرانی کورد بهاروژێنێ.

بەلام لە راستیدا فەیسەل گەمەکەی بردبووە: شێخ مەحمود چوو بوو بۆ ئێران.

ئیدی سالێک دواتر لە ١٦/١٢/١٩٢٥دا کۆمەلەی نەتەوەکان، راپۆری «کۆمیتەی لێکۆلینەوە»ی لەمەڕ لکاندنی ویلایەتی موسل بە عێراقەوە پەسەند کردو «هێلی بروکسل» (بۆیە بە هێلی بروکسل، ناسراوە، چونکو کۆبوونەوەی ئەنجومەنی کۆمەلەی نەتەوەکان، بۆ ئەم مەبەستە لە بروکسل کراوە.) بە رەسمی کرا بە سنووری تورکیا و عێراق.

سەبارەت بە کوردەکان کۆمەلی نەتەوەکان داوای لە دەولەتی بەریتانیا کرد کە کاری پێویست بۆ «دامەزراندنی دام و دەزگایەکی ئیداری ناوچەیی»[٣٩] بکات.

**سەرچاوە و پەراوێزان:**

١- گرترو دبل. نامەکان ل ٤٩٢

٢- هەمان سەرچاوە ل ٣٩٥

٣- نامەی ڤایکانت سامونیل ل ٢٠٤-٢٠٥

٤- برتولد، وەزیری کاروباری دەرەوەی فەرەنسا، بۆ للوید جۆرج، قەوالەی پەیوەست بە سیاسەتی دەرەوەی ئینگیز. نهێنی ١، بەرگی ٢، ١٩١٩، ل ٧٢٠-٧٢١ لە نی کندورییەوە نەقل کراوە.

٥- نامەی ١٥/٨/ ١٩٢٠ی کرزن بۆ ڤایکانت سامونیل. ڤایکانت سامونیل.

٦- سێر پرسی کوکس، نامەکانی گرترو دبل ل ٤٣٢

٧- ئەنجامەکان سەبارەت بە کەرکوک بەمجۆرەیە.

| | رازی | نارازی |
|---|---|---|
| شاری کەرکوک | ٦٤ | ٢٧٨٦ |
| شارۆچکەکان | ١٩٧ | ٧٢٠ |
| ئالتون کوپری | | ١٥٠٠ |
| داقوق | | ١٠٠٠ |
| مەملەحە | | ١٥٠٠٠ |
| شوان | | ١٢٦٣ |

٨- پیاوی مەزهەبی بەغدایە بوو، لە نەوەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانیە، سەرۆکی کاتی حکومەت بوو.

٩- بۆ هەڵبژاردنی مانگی ٥ و راپرسی ١٩٢١/٧ بروانە راپۆرتی سەر پەرس کوکس. نوفیسی هند s10 Lpu /١٩٦٢

١٠- نامەکانی گرترودبل، ل ٥٠٠

١١- نووسراوی ١٩٢١/١١/٢٤ی چەرچل بۆ shuchbury یاریدەدەری وەزارەتی کۆلۆنیەکان، کە لە کلیمنەوە وەرگیراو، بناغەی سیاسەتی بەریتانیا لە رۆژهەڵاتی ناڤین ل ١٦٦

١٢- تا ویلسن، لەپێشەکیەک دا بۆ چاپی ساڵی ١٩١٩ی کتێبەکەی سون گەشتی خۆگۆڕێک بۆ کوردستان.

١٣- ئەو چیرۆکەی تا ئەورۆکەش لە باشووری عێراقدا دەیگێرنەوە: لە مەجلیسێکدا شێخێک بە فەیسەڵ دەڵێت تۆ بە سواری کەر بۆ ئێرەهاتی، ئێستا دەتەوێ حوکمان بکەیت!

١٤- نووسراوی ١٩٢١/٩/٢٠ی سێر پرسی کوکس، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٦٣٧٤ ٤٧١ لە راستیدا هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دامەزرێنەران دووساڵی کێشا.

١٥- هەمان سەرچاوە

١٦- نووسراوی ١٩٢١/١٢/١٣ی وەزارەتی کولونیەکان، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٦٣٤٧ ٣٧١.

١٧- سی. جی. ئەدمونذز، کوردەکان ل ١٢٣

١٨- راپۆرتی سون لەمەڕ چۆل کردنی سلێمانی ١٩٢٣ و Jcasx

١٩- نووسراوی سێر پرسی کوکس، نامەکانی گرترو دبل ل ٤٣٣

٢٠- بنەچەی شێخانی بەرزنجە دەگاتەوە ئیمام موسای کازم و لە گەڵ ماڵباتێن سوڵتانی مەراکش و ئەمیر بەحیای یەمەن و شەریفی حەزرەمەوت دا چوڕا ماڵباتیان پێک دەهێنا کە رەگ و رەگەمایان بە ئیمامی ئێوبراو دەگەیی، و شەریفەکانی مەکە دەیانگوت خزمی ئەوانن.

٢١- بروانە ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە ئەدمونذز لەمەڕ چاپەمەنی سلێمانی کردوویەتی. JCASX، ١٩٢٥ (گۆڤاری ئەنجومەنی پاشایەتی ئاسیای ناوەندی.

٢٢- ئەدموندز و کوردەکان ل ٢٨٠

٢٣- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٣٧١٩٠٠٤.

٢٤- ئەدمونذز، کوردەکان ل ٣١٤، هەروەها بروانە شەڕ لە باشووری کوردستاندا (گۆڤاری وەزری سوپا، هەیڤی ١٩٣٦/١) (کتێبخانەی نوفیسی هند)

٢٥- ئەدمونذز، کوردەکان ل ٣١٤

٢٦- بروانە گوتارەکەی ئەدمونذز لە گۆڤاری ئەنجومەنی پاشایەتی ئاسیای ناوەندی، ژمارەی ١٩٢٥،

دوو ژمارەی دیکە لە بانگی حەق چاپ دەبن، بەلام ژمارەی۲ بڵاونابێتەوە، ژمارەی ۳ دامەزراندنی کۆمیتەی بەرگری میللی رادەگەیەنێ.

۲۷- یەکێک لە بڕیارەکانی کونفرانسی قاهیرە ۱۹۲۱/۳ سپاردنی فەرماندەیی هەموو هێزەکانی بەریتانیا دەعێراقدا، بە فەرماندەیی هێزی ئاسمانی بوو.

۲۸- نووسراوی سێر هنری دوبز، نامەکانی گرترودبل ل ٤٤٠.

۲۹- ئەدمۆندز، کوردەکان ل ۳۱۲

۳۰- نووسراوی سێر هنری دوبز، نامەکانی گرترودبل لاپەڕەی ٤٤٠-٤٤١

۳۱- ئەدمۆندز، کوردەکان ل ۲۳۷

۳۲- لە راستیدا ئەم نامەیە ئەدمۆندز نووسی بووی.

۳۳- ئەدمۆندز، کوردەکان ل ۲٤٤

۳٤- هەمان سەرچاوە

۳۵- هەمان زێدەر ۳۸۳

۳٦- ئەم گفتوگۆیانە، تا رادەیەک لە ئەنجامی کەللە رەقی سێرپرسی کوکسەوە فەشەلی هێنا، سێرپرسی کوکس داوای هەندێ شوێنی دەکرد کە هەرگیز بەشێک نەبوون لە ویلایەتی موسڵ. وەکو دەڵەری هەکاری کەلەساڵانی ۱۹۱۹وە تا ۱۹۲۳، حەوت، هەشت هەزار کەسی لێ راگوێزرابوون.

۳۷- نووسراوی سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی لەمەڕ شەڕی سلێمانی، ۱۹۲٤/۹/۱٦. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ۱۱۳-۱۰ ۳۷۱.

۳۸- نامەی رۆژی ۱۹۲٤/۷/۱۸ی وەزارەتی کولونییەکان، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بەریتانیا، ۱۱۳-۱۰ ۳۷۱.

۳۹- هێزێکی هاوبەش لەسوپای عێراق و بەکرێگیراوانی ئاسووری، لە دوو هەنگی سوارە، سەد پۆلیسێک، بە زرێپۆشەوە، بەشداری هێزی فڕۆکەوانی پاشایەتی (بەریتانیا) (نووسراوی سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی).

## فەسڵی چوارەم

## شۆڕشی شێخ سەعید (١٩٢٥)

ناسیونالیستانی تورک لەساڵی ١٩١٨ وە زۆر بەکارامەیی و ناقڵی دڵی کوردەکانیان ڕادەگرت و بەڵێنیان دەدانێ و بۆ قازانجی خۆیان بە گژ ئینگلیز و یونانیاندا دەکردن و بە تەما بوون بۆ وەرگرتنەوەی ویلایەتی موسڵ سودیان لێ وەربگرن، هەڵبەتە نیاز و نیەت و مەبەستی ڕاستەقینەی خۆشیان هێند بە کارامەیی شارد بۆوەوە کە کوردەکان پەی پێ نەبەن. ڕۆژان هاتن و چون، مستەفا کەمال هاتە مەیدان و لە ڕۆژی ١٩٢٤/٣/٣دا خەلافەتی هەڵوەشاندەوە و ڕژێمی کۆماری ڕاگەیاند. بەم کارە پەردە لەسەر نیازو مەبەستی تورکان وەلاکەوت و کوردان هەستیان بە ڕەنج بێبەری و هەڵخەڵەتاوی خۆیان کرد.

ئیدی ئەو هەودایەی کە کوردی بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەوە دەبەست، واتە حورمەت و ڕێزی ئەفسانە ئامێزی کورد دەرهەق بە خەلیفە، کە خۆی لە خۆیدا و تا ڕادەیەک مایەی شکستی خەباتی ناسیونالیستە کوردەکانی قەستەنتەنیە بوو- بە ناچاری پچڕاو دەهۆڵ دڕاو دەنگی بڕا.

لێ مەخابن، تازە زۆر درەنگ بوو و کار لەکار ترازا بوو. چونکە کاتێ کە هەموو کوردی تورکیا ئامادە بوون لە پێناوی سەربەخۆیی دا بخەبتێ و بجەنگن، کاری پارچە پارچە کردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تەواو بوو بوو و سنوورە تازەکان دیاری کرابوون و ئەم هەوڵ و تەقەلایەی کورد ئیدی سەرنجی کەسی ڕانەدەکێشا. کوردەکان کە لەناوچەی ئەنەدۆڵ و ئێران دا بە تەنێ مابوونەوە، هاروژان، شەڕی زۆر سەخت و دژواریان کرد، بەلام کەسێک ناوڕی لێنەدانەوە و شایەتی بۆ سەرکەوتنەکانیان نەدا.

کوردستانی تورکیا لە ساڵی ١٩٢١ وە تا ساڵی ١٩٢٧ بە کردەوە لە شۆڕشی بەردەوام دابوو، بەلام شتێکی ئەوتۆ لەمەڕ ئەم شۆڕشانە کە تا ڕادەیەک بە شێوەیەکی نادروست تەنیا ناوی شێخ سەعید (١٩٢٥)و شۆڕشی ئارارات (١٩٣٠) و شۆڕشی دەرسیم (١٩٣٧)یان بە خۆوە گرتووە، نەزانراوە.

## ١
## شۆڕشی شێخ سەعید

لە ١٩٢٥/٢/١٥ ئاژانسی ئەنەدۆل کورتە هەواڵێکی بڵاو کردەوە کە لە گوندی پیرانی نزیکی گەنج، ناخۆشیەک لە نێو مەفرەزەیەکی جەندرمە و پیاوێک بە نێوی شێخ سەعید کە ٥٠ کەس لە موریدەکانی دەگەڵ دەبێت روو دەدات. بە پێی هەمان هەواڵ لەو بەینەدا دوو جەندرمە کوژرابوون.

لە ٢/٢٣ دا چاپەمەنیەکانی تورکیا بڵاویان کردەوە کە ئەم «پەلامارە رێگرانەیە» شتێکی گەورەترە لەوەی بووە. بەڵام پاشکۆی عەسکەری بەریتانیا لە قەستەنتەنییە پێی وایە کە دەوڵەتی تورکیا بۆ مەبەستی سیاسی و سیاسەتی ناوخۆ و لە پێناوی ناشتکردنەوە یان لە نێودانی نەیارانی خۆی، مەسەلەکە «گەورە دەکاتەوە».[1]

لە ٢/٢٤ دا وەزیری ناوخۆی تورکیا رایدەگەیەنێ کە نەخشە و بەرنامەی کار ئەمە بووە کە لە ئاخر و ئۆخری مانگی ئازاردا شۆڕشێکی سەرانسەری هەڵگیرسێت، ژمارەی لایەنگرانی شێخ سەعید دەگاتە ٧٠٠٠ کەس و ژمارەیەک سەربازی فیراریش پەیوەندییان پێوە دەکەن.

هەندێ لە رۆژنامەکان بڵاوی دەکەنەوە کە بەریتانیای مەزن پشتیوانی شۆڕشگێڕەکان دەکات. وێڕای هەموو ئەمانەش رۆژنامەی «وەتەن» پێی وایە رەگی شۆڕش لە خراو بەڕێوە بردنی ناوچەکە دایە.

لە ٢٦/ ٢ دا چاپەمەنییان رای دەگەیەنن کە هەموو ناوچەکە بەدەستی شۆڕشگێڕەکانەوەیە و بزووتنەوەکە لە بنەڕەت دا تەبیعەت و سروشتێکی ئایینی هەیە و ئامانجی ئەوەیە کە یەکێک لە کوڕانی سوڵتان عەبدولحەمید بهێنێتە سەر حوکم.!

بەڵام هیچ رۆژنامەنووس یان دیپلۆماسییەکی ئەوروپایی نە لەکاتی شۆڕشی شێخ سەعیدا و نە تا سێ ساڵ لەوە دواتریش دەتوانێ بچێتە کوردستان وتاڵیبی حەقیقەتی رووداوەکان بکات. بۆیە مرۆڤ ناچارە سەبارەت بەو هەواڵە یەک لایەنانەی کە لە چاپەمەنی تورک دا بڵاو بونەتەوەو پەنا وەبەر مەزەندە و گومانان بەرێ. تەنانەت ئەمڕۆکەش وێڕای هەبوونی هەندێ قەواڵەو بەڵگەنامان، دیسان ساغ کردنەوەی ئەم رووداوانە زۆر ئەستەمە.

## ٢
# شێخ سەعید

سەیر ئەوەیە زانیاریەکی ئەوتۆ دەربارەی ئەو پیاوە بەدەستەوە نیە، کە بەو جۆرە رژێمی مستەفا کەمالی هێنا بووە لەرزە.

تەمەمەنی، قەلافەت و سیما و دیەنی، بۆ ئێمە ناسراو نیە!

ئەوە گوتارانەی کە چاپەمەنیەکانی تورک دەربارەی دادگاییەکەی کە لە دیاربەکر ئەنجام درا، بلاویان کردووەتەوە بە هیچ جۆرێ بواری ئەوە بۆ پیاو خۆش ناکەن کە وێنەیەکی روون لەمەڕ کەسایەتی شێخ سەعید لە زەینی خۆیدا بەرجەستە بکات.

ئەو شێخ سەعیدەی کە تورکەکان بە دێهاتی و نیمە شێت و قەشمەرجاری باس دەکەن، جێنشینی عەلی بابی بوو کەلە شێخانی نەقشبەندی دەڤەری پالو بوو، شێخ سەعی پیاوێکی «سەنگین و بەدین و یەکجار بەناوبانگ بووە»[٢]

نیاز و مەبەستی شێخ لە شۆڕشەکەیدا چ بوو؟ ئایا شۆڕشێکی مەزەبی و ئاینی بوو دژی حکومەتی ئەنقەرە کە سالێ لەوە پێش خەلافەتی ئیسلامی هەلوەشاند بووەوە. یان لە بنج و بناواندا شۆڕشێکی نەتەوەیی بوو؟ دیارە ساغ کردنەوەی ئەمە کارێکی ئەستەم و دژوارە و تەنانەت زانینی ناوی هاوڕێ و هاوکارەکانیشی، یارمەتی مرۆڤ نادەن کە وەلامی دروستی ئەو پرسیارەی سەرێی دەست بکەوێ. چونکە لایەنگرانی مستەفا کەمال، ئەم شۆڕشەیان کرد بە هەنجەتێک بۆ سەرکوتکردنی تێکڕای نەیارانی حکومەتی تورک و هەر هەموو ڕێبەرانی کوردیان، چ بەشداربووانی شوڕش و چ بەشدار نەبووانی لە نێوبردرا.

هەر بەم بیانووە وە هەموو ئەو کەسایەتیە ناسیونالیستە کوردانەی کە لە بزووتنەوەکانی سالی ١٩١٩ دا بەشداریان کردبوو، یا خود لەبەر ئەوەی وەکو ڕێبەرانی بزاڤی نەتەوەیی کورد ناوناوبانگیان هەبوو، گیران و لە سێدارە دران.!

هەلبەتە چ بەلگەیەکی بنج بڕ بە دەستەوە نیە کە خەلکانی خوێنەواری وەکو دکتور فوئاد دیاربەکری و تۆفیق بەگی دادوەر، بەراستی «یاریدەدەرانی» شێخ سەعید بوو بوون.

بەلام شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوللا کە بوو بە قوربانی دەسیسەیەکی پۆلیسی بە هیچ جۆرێ لەم شۆڕشەدا بەشداری نەکردبوو.

تاقە هاوکاران و هاندەرانی شێخ سەعید دوو کەس بوون: خالید بەگی سەرۆکی

عەشیرەتی جەبرانلی و کەوتە عەقیدی ئەرماندەی یەکێک لە تیپەکانی حەمیدیە. عەقید ئەڤرەس.

## ٣
## سازدانی شۆڕش

سەرەتای بەسەرهاتی غەمگینی شێخ سەعید دەگەڕێتەوە بۆ هەیڤی ١٩٢٤/١١ لەم مانگەدا، بێ ئەوەی نیاز و مەبەستی خۆی وەشێرێ بە یاوەری نزیکەی سەد سوارەوە بە نیازی سەردانی عەشیرەت و تیرەکانی دەوروبەر لە دیاربەکرەوە تێ دەپەڕێ. ئەم کارە لە لایەن ڕێبەرێکی ئایینی یەکجار دەوڵەمەندەوە کە تا ئەو کاتە چ دژمنایەتیەکی حکومەتی نەکردبوو نابێتە مایەی سەرسوڕمانی هیچ کەسێک.[٣]

بەم جۆرە شێخ سەعید بێ ئەوەی سڵ بکاتەوە و یان گومانێکی لێ بکرێ لە سەرانسەری ناوچەکەدا کەوتە بانگەشە. «هەموو ئەو گوندانەی پێیاندا ڕەت دەبوو، دووی خۆی دەخست» داوای لە قەڵاو وەرزێرانی کورد دەکرد کە یەکگرن و بەشداری جیهاد بکەن دژی کافرانی ئەنقەرە و دڵنیای دەکردن کە چ زەرەرێکیان پێناگات، هەر لە پەنای ئەوەشەوە داوای لێدەکردن کە لە پێناوی «ئوتونۆمی کوردستان»یش دا بخەبتێ.

هۆی سەرکەوتنی خەباتی بانگەشەی شێخ سەعید تا ڕادەیەک ئاشکراو دیار بوو، دەوڵەتی ئەنقەرە لە ماوەی نێوان ئیمزای پەیمانی لۆزان و لابردنی خەلافەت دا، زنجیرە کارێکی دژی کوردلن ئەنجام دابوو، - قوتابخانە کوردییەکانی داخستبوو، قسە کردنی بە زمانی کوردی قەدەغە کردبوو، سەرانی کوردی نەفی کردبوو.

ئەمە جگە لەوەی کە ڕەوشی ئابوری وڵات خراپ و کارەسات ئامێز بوو. تەقسیم بەندی ئیداری تازە لە وڵاتدا کرابوو، ویلایەتەکانی جاران نەمابوون و شارۆچکەکانی جاران کە تازە کرابوون بە پارێزگا، خەڵکی وا کرابوون بە پارێزگاریان کە زۆر لە حوکمدارانی جارلن بە زەبروزەنگ تر و زۆردارتر بوون.

سەرەنجام دەوڵەتی تورک بە پەیڕەو کردنی سیاسەتی «تورکاندن» و بە تورک کردنی ناوچەکە و دانی بەشە مولکی ئەرمەنیە نەفی کراوەکان یان قەتڵ و عام کراوەکان و ئەنانەت دانی مولکی کوردانی هەڵاتوو یان نەفی کراوی زەمانی جەنگی جیهانی بە کۆنە سەربازانی تورک، هەموو دێهاتیانی کوردیان لە خۆ بێزار و تەوەلا کردبوو.

## ٤
## دەستی ئینگلتەرە

شۆڕشی کورد لە کاتێکدا بەرپا دەبێت کە ئەندامانی لیژنەی نەتەوەیی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ دیاری کردنی ئایندەی موسڵ و سنووری نێوان عێراق و تورکیا لە موسڵ دەبن!

مستەفا کەمال هیچ گومانێکی لەوە نیە کە بەریتانیا ئەم شۆڕشەی هەڵگیرساندوە.

**« تورکیا لە مەترسیدایە بەریتانیا لە پشت کوردانە... و بەردەوام دژایەتی تورکیایان بۆ دەکات، پیاولن و نۆکەرانی لە ناوچەکەدا هاتوچۆ دەکەن، تیرە و تایفەکان چەکدار دەکەن و هانیان دەدەن. بەریتانیا موسڵ و نەوتی موسڵی گەرەکە، کلیلی موسڵ و عێراق لە دەستی کورداندایە».[٤]**

چاودێرانی بێ لایەنیش هاوزەمانی ئەم دوو رووداوە دوویات دەکەنەوە: « رۆژنامەوانی تورک، ئینگلستان بەوە تاوانبار دەکەن کە یارمەتی بزاڤی کوردان دەدات. گریمان ئەمە بوختانێکە و تەواو، بەڵام بەراستی دەبێ ئافەرینی ئەم بەخت و ئێتوجەوانەش بکرێ کە بە خۆرایی دۆستانی ئینگلیزی لوتف باران دەکات.[٥]

لێ لە قەستەنتەنییە دا ئالبیرت ساروی سەفیری فەرەنسە ئەوە دوویات دەکاتەوە کە دادگاکان « قەوالەو بەڵگەنامەیەکی سەلماویان نەخستۆتە روو کە نیشانەی دەست تێوەردانی ئینگلستان بێت»

بەڵام ئەوەی راستی بێ ئینگلیزەکان لە سەرەتاوە لە خۆیان دەپرسی ئەگا ئەم شۆڕشە، پیلانێکی تورکیا بێ تا بیەوێ لەو رێگەیەوە یەکە ی خۆی لە ناوچەی سنوری ویلایەتی موسڵ جیگیر بکات و پاشان بەو بیانووەی کە نەیەڵێ کوردی دیاریەکر، یارمەتی شۆڕشگێرەکان بدەن، هێزەکانی خۆی بۆ ناوچەکە قرێ بکات.[٦]

## ٥
## رۆڵی سۆڤیەتەکان

بە گوتەی ئینگلیزەکان( ٥ ) خالید بەگی جەبرانلی پەیوەندی بە کونسولی روس لە ورمێ کردبوو، کونسولی ناوبراو لەگەڵی پێک نەهاتووە و بەرێی کردووە، جا ئەم گوتەیە دروست بێ یان نادروست ئەوە دەسەلمێنێ کە شۆڕشی شێخ سەعید بەدەر لە هەر هاندانێکی رۆژئاوایی پەرەی سەند و پاشان تێک شکاو روخا.

له کاتێکدا که یەکێتی سۆڤیەت به شێوەیەکی زۆر رەسمی و به زمانی ئیزڤیستاوە به شۆڕشێکی فیودالی کۆنەپەرستی له قەڵەم دەدا که بوو بووە ئالەتی دەستی ئینگلیزەکان.[٧]

## ٦

## هەڵوێستی پیاو ماقوڵ و خانەدانانی شارەکان

هەر زوو ناکۆکی دەکەوێتە نێوان شارو گوندەوە، له دیاربەکرا ژمارەیەک له دەوڵەمەند و پیاو ماقوڵان پەیوەندی به کەمالیەکانەوە دەکەن، پرینجی زادە سدقی، سەرۆکی حیزبی گەل و سێ کەس له نوێنەرانی ناوچەکە له ئەنجومەنی ئەنقەرەدا، که بریتی بوون له پرینجی زادە فەیزی بەگی کەونە وەزیری ناوخۆ و موفتی زادە شەرەف و زولفی زادە.

بەڵام تەنانەت تیرەی جەمیل پاشازادەش که بێگومان له مەسەلەکە دابو، به ئاشکرا تێکەڵی مەسەلەکە نەبوو. قاسمی «برا» گەورەی که له ساڵی ١٩١٩ دا بەوە تاوانبار کرابوو که دەستی لەگەڵ دژمندا تێکەڵ کردبوو، بۆ ئەوەی چ گومانێک لەسەر خۆی نەیەڵێ بەعالەمی ئاشکرا چو بوو بۆ قەستەنتەنییە.

یەکێک له ئەندامانی تیرەکە «محەمەد بەگ» تەنانەت بەشداری سەرکوتکردنی شۆڕشەکەی کردبوو، ژمارەیەک له چەکدارانی گوندەکەی خۆی بردبوو و شان به شانی هێزی سوپایی چووە شەڕی لایەنگرانی شێخ سەعید.

## ٧

## سەرەتای شۆڕش

زۆری پێ ناچێت که شێخ سەعید هێزێکی ١٠٠٠٠ کەسی له دەوری خۆی دەبینێ که ئامادەن به دڵ و بەگیان له پێناویدا تێ بکوشن. بەڵام ئەم هێزە چەک وتەقەمەنی نیە، زۆربەیان جگە له شمشێر و نێزە چ چەکێکی دیکەیان پێ نیە. یەکەمین پێکادان له نیوەی مانگی شوباتدا روو دەدات.

دوا به دوای ئەو رووداوەی که له ١٩٢٥/٢/١٣ له پیران دەگەڵ لایەنگرانی شێخ سەعید دەقەومێ، فەرماندەی سەربازخانەی دیاربەکر، پێنج فەوجی هەڵبژاردەی سەربازخانەکە بۆ سەر شۆڕشگێڕەکان دەنێرێ، له ٢٢ی شوباتەوە برینداران دەگەنەوە دیاربەکرد و ئیدی داستانی ئەفسانە ئامێز زارەو زار دەکات.

کوردەکان هەر پێنج فەوجەکەیان بە تەواوەتی دەنێو بردووە و تاقە کەسێکیان لێ دەرنەچووە.

لە ٢٤ی شوبات دا کە وەزع و حاڵەکە خراپ دەبێت، دەسەڵاتدارانی تورک لە دیاربەکر و خەرپوت و ئورفەدا حکومەتی عورفی « حوکمی عەسکەری» رادەگەیەنن و ژمارەیەک لە کەسایەتی ناودار دەگرن، لەوانە جەمیل پاشا ئەکرەم و دکتۆر فوئاد.

## ٨
## گرتنی خەرپوت (١٩٢٥/٢/٢٦)

لە ٢٦ی هەیڤی دوودا جەنگاوەرانی شێخ سەعید دەچنە ناو خەرپوتەوە و پەیوەندی نێوان خەرپووت و دیاربەکر دەپچڕێ. شار زوو بەزوو چۆڵ دەبێت، دیار نیە ئاخۆ هێزەکانی دەوڵەت لە شار وەدەرنران، یان بە خۆیان و نارەزوومەندانە چەک و تەقەمەنی و تفاقەکانیان تەسلیم کردو لە شار وەدەرکەوتن.

بەڵام ئێستا هەموو ناوچەکانی باکوری دیاربەکر بە ئەرگەنە و پالو و پیران و خەرپوتەوە کەوتبووە دەستی شۆڕشگێران بە پێی گوتەی رۆژنامەی جەمهوریەتی دەوڵەتی، یەکە سوپایی و جەندرمەییەکان کە خەڵکی ناوچەکە بوونە، لە خزمەت هەڵاتوون و پەیوەندییان بە شۆرشگێرانەوە کردوە و ئەنجومەنە دەوڵەتیەکانی ئەنقەرە ئێستا شپرزە و ترساون.

## ٩
## گەمارۆ دانی دیاربەکر (٤-١٩٢٥/٣/٧)

رۆژی دووی ئازارە، هێزەکانی شێخ سەعید چەند سەعاتێک لە دیاربەکرەوە دوورن. دەسەڵاتدارانی تورک لە ٢/٢٧ دا خەڵکی شاریان چەک کردوە.

لە ٣/٤ دا کە شار دەکەوێتە گەمارۆوە، فەرماندەی سەربازخانەکە ٢٠ تۆپ لەسەر قەڵای شاردا دامەزرێنێ، هەر هەموو قوتابخانە و سەربازخانە و خەستەخانەکانی دەرێی حەساری شار چۆڵ دەکات.

ئەو دەروازانەی کە بۆ هاتوچۆ لە حەسارەکە کراون، بە شێوەیەکی کاتی دەگرێ.

نیوە شەوی ٣/٧ هێرش بۆ سەر شار لە دەروازەی خەرپوتەوە دەست پێدەکات. هێرشەکە دەشکێ و کوردەکان زەرەروزیانی قورسیان لێدەکەوێ. بەڵام لە سەعات دووی پاش نیوەشەو، لە دەروازەی ماردینەوە دەست بە هێرشێکی قورس دەکەنەوە، دەستەیەکی سەد

کەسیان دەتوانن بە نهێنی دزە بکەنە ناو شارەوە، ئەم گروپە ڕمبایەکی نزیکی حسارەکە دەگرن و هەموو سەربازەکانی دەکوژن. ئەوجا دەڕژن تا لە پشتەوە هێڵی بەرگری شار بگرن. لەنکاودا ڕووبەڕووی مەفرەزەیەکی سوارەی تورک دەبن و لە ناو کۆڵانەکانی شاردا لە نێو دەچن. لە سەعات ٣ دا بەرە بەرە ماند، بوون بە کور انەوە دەردەکەوێ، لە سپێدەدا پاشەکشە دەکەن.

سەربازخانەی دیاربەکر کە لە چەند سەد سەربازێک پتری تێدا نەبوو، بەرانبەر بە ٦-٨ هەزار کورد دەوەستێ و بەرەڤانی دەکەن. ڕاستە سەربازەکان لە پەنای حسارێکی قایم و مکومەوە دەجەنگن، بەڵام بە هەر حاڵ بەرەڤانیان کرد.(٩)

ئەم فەشەلهێنانە بۆ شێخ سەعید شکستێکی قورس بوو، لە ڕاستیدا مەبەستی سەرەکی ئەو دیاربەکر بوو، گەیشتنی هێزی هیمدادی تورک، ئەو ئومێدەی پوچەڵ کردەوە کە هێرشێکی تازەی بۆ بکرێ.

دەسەڵاتدارانی تورک لە ٣/٨ دا جەنازەی ئەو کوردانەی کە شەوێ کوشتبوویانن لە کوچە و کۆڵانەکان دا، هەڵواسی. هەموو دانیشتوانی دیاربەکر لە نێو چوار دیواری شاردا حەپس بوون و ماڵ بە ماڵی گەڕەکە کوردەکان پشکێنرا. سەدان کوردی زازایی بە تۆمەتی هاوکاری دەگەڵ شۆڕشگێراندا گیران. لە ڕاستیدا بە پێچەوانەی ئەو پروپاگەندانەی کەلە ئەنقەرە و قستەنتەنییە بڵاو بوو بووەوە ئەم خەڵکە یارمەتی شۆڕشگێرانیان نەدابوو کە بێنە ناو شارەوە، بەڵام ئەمە بیانوویەکی باش بوو بۆ سەرکوتکردنی خەڵکی گومان لێکراوە.

بەڵام بەدرێژایی شەوی دوایی دەنگی تەق و تۆق بەردەوام بو لە ناوشاری دیاربەکر، ئەم دستریژ و تەقانە لەو کوردانە دەکران کە لە پشکنین هەڵدەهاتن و دەیانویست خۆ لەشار دەرباز بکەن.

## ١٠

## پەرەسەندنی شۆڕش

شێخ سەعید کە لە نزیکی دیاربەکر بوو لە ٣/١٠ بەملاوە بەرەو باکور و ڕۆژاوای ناوچەکە دەچێ و سولیڤان و هازرۆ و ئەرگەنەو چەرمک دەگرێ و بەرەو سیڤەرەک دەچێت.

پاش ٣/١٥ کە شۆڕش پەرە دەستێنێ، هەموو ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژئاوای ولن

دەکەویتە دەستی جەنگاوەرانی شێخ سەعید.

شۆڕشگێڕان پاش تێک شکانی هێرشی سوپای تورکیا، بینگۆل و کێگی دەگرن و لە ڕۆژهەلاتەوە تا مەلازگرد دەچنە پێشێ و لە باکوری سیرت دا دەست بەسەر شاری سلیڤان دا دەگرن و ماردین دەدەنە بەر پەلامار.

لە ڕۆژاواوە تا مەلاتیە دەڕۆن، پەلاماری مەلاتیەش دەدەن[١٠] دەوڵەتی تورکیا بە جۆرێ تەنگەتاو دەبێ کە لێدەبڕێ لە «هێزە ئەورپاییەکان» بەتایبەتی فەرەنسە «نزیک بێتەوە» و لە زەرفی چەند ڕۆژێک دا لەسەر هەموو مەسەلە ئالۆزکاوەکان دەگەڵ فەرەنسادا، پێک دێت.[١١]

## ١١
## دەزگای سەرکوتکاری

بەلام دەوڵەتی تورکیا پاش ئەم سەر لێ شێواوی و پەشۆکاوییە، دێتەوە سەرخۆی و سەرکوتکاریەکی زۆر بێرەحمانە ئامادە دەکات.

تورکیابۆ ڕێبەرایەتی عەمەلیاتی عەسکەری دژی کوردەکان کەمالەدین پاشا لە سەفارەت خانەی تورکیا لە بەرلین دێنێتەوە. ئەم پیاوە بە بۆچوونی وەزارەتی جەنگی ئینگلستان یەکێک بوو لە جەنەراڵە هەرە باشەکانی تورک.

لە سەرەتای مانگی ٣ دا دەسەلاتدارانی تورک داوا لە دەوڵەتی فەرەنسا دەکەن مۆڵەتی گواستنەوەی ٢٠-٢٥ هەزار سەباز بە هەموو چەک و تفاقێکی جەنگیەوە بدات بۆ شەرگە، واتە لە ڕۆژێک دا چوار قیتار سەرباز بە هێڵی ئاسنی بەغدا یا بۆ ناوچەکە بنێرێ.

دەوڵەتی تورکیا لە ٣/٥ دا دوو «دادگای سەربەخۆ» دادەنێ، حوکمی ئیعدامی دادگاکانی ئەنقەرە دەبێ لەلایەن ئەنجومەنەوە پەسەند بکرێ، بەلام حوکمی ئەم دادگایانەی کەلە ناوچەکانی شۆڕشدا بەرپا کراون، فەوریە و هەر لە جێوە جێبەجێ دەکرێ.[١٢]

مستەفا کەمال پاش ئەوەی سەرلەنوێ داوا لە عیسمەت پاشا دەکات کە پۆستی سەرەک وەزیران وە ئەستۆ بگرێ لە ٣/٩ دا دەبێ بە خاوەنی ئەو سەرەک وەزیرانەی کە « ئامادەیە سیاسەتی سەرکوتکارییەک جێبەجێ بکات کە غازی (ئەتاتورک) دەیەوێ».[١٣]

ئەو دەستورەی کە بە هێزەکانی سەرکوتکاری دراوە یەکجار توند و تیژە: «گوندەکانی ژێر دەسەلاتی شۆڕش تەخت بکەن، ڕەحم بە شۆڕشگێران و خێزانەکانیان نەکەن و ئەمانیان

ئەدەن، یا ئەم دەرسە و پەندە هێندە سامناک بێ کە هەموو خەڵکی وڵات لە یادیان بێنێ»[١٤] بەڵام ئەم عەمەلیاتانە دەست بە جێ دەست پێناکرێ: هاتنی هێز لە سووریاوە بە خەتی ئاسنی بەغدادا و کۆبوونەوەیان لە ماردین دا ماوەیەک دەبات.

هەروەها دەوڵەتی ئەنقەرە دەبێ ڕوویەڕووی «ناستەنگی دارا- » بێتەوە کە لە ئەنجام دا لە شۆڕشی کورد مەترسیدارتر دەبێ»[١٥] دەوڵەت لە ٢٠/ دا داوا لە ئەنجومەن دەکات قەراری تەرخانکردنی دە ملێون لیرە، بە مەبەستی سەرکوتکردنی شۆڕش پەسند بکات.

## ٢١

## عەمەلیاتی عەسکەری دژی کوردان

عەمەلیاتەکان لە کۆتایی مانگی سێی ١٩٢٥ دا دەست پێدەکات. هێزەدەوڵەتیەکان بۆ پێشگرتن لە تەشەنە کردنی شۆڕش لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و بۆ ئەوەی ڕێگەی پاشەکشە بۆ عێراق و ئێرانیان لێ بگرن، سەرەتا دەوریان دەگرن.

کوردەکان زۆر زوو لە هەموو ئەو شارانەی کە گرتبوویان، ڕاو دەنرێن و لێدەبرێن لە ناوچە شاخاوییەکانی گەنج دا بەرەڤانی بکەن.

بەڵام هێزی هێمداد کە لە ناوەڕاستی ئازارەوە لە دیاربەکر خڕبوونەوە لە ٤/٨دا دێتە مەیدان و مەسەلەکە هەر زوو دەبڕێتەوە، چونکە لە ١٩٢٥/٤/٥ شێخ سەعید بەخۆی و سی کەسەوە کە هەندێکیان شێخ و ئاغا دەبن لە نزیکی گەنج ئەسیر و دیل دەبن.[١٦]

بەپێی هەندێ پروپاگەندە، ئەمە خیانەتێک بوو لە شێخ سەعید کرا، چونکە خەڵات بۆ سەری شێخ دانرابوو.[١٧]

هەر هەموو ئەو پێنج قەوجەی کە لە هەیڤی شوبات دا لە دیاربەکرەوە بۆ سەر شۆڕشگێڕان نێردرابوون، بە ساغ و سەلامەتی لە ئۆردوگاکەی شێخ سەعید دۆزرانەوە. هەر ئەمە بۆ خۆی نیشانەیەکە کە شێخ سەعید لە شەڕدا دڕندەکاری نەکردوە!، لەوەشە ویستبێتی بەمکارە مرۆڤ دۆستانەیە پشتیوانی و ناوبژیوانی هێزە ئەوروپاییەکان بەدەست بێنێ.»[١٨] عەمەلیاتی عەسکەری تەواو بوو، بەڵام کاری سەرکوتکاری هەر بەردەوام بوو.

## ١٣

## سەرکوتکاری

ئێستا، ٣٠/٠٠٠ سەربازی تورک ڕژابوونە کوردستانەوە و شەلم کوێرم و دوور لەهەموو بەزەییەک کەوتبوونە سەرکوتکاریەکی بێ ڕەزا. لە دیاریەکرا، زۆربەی ئەو زازایانەی کە دوای گەمارۆی شار لەلایەن هێزەکانی شێخ سەعیدەوە، حکومەتی تورک گرتبوونی لە دەرێی دیوارەکانی شاردا بەر دەستڕێژی گوللەدران یان لە مەیدانی گشتی شاردا لە داردران. «بێ ئەوەی کەس فزەی لێوە بێ. کەس دەنگ هەڵبڕێ، حوکمدارەکانیش وەکو تەماشاکەرەکان مات و کروکپ بوون. لە ڕێورەسمێکی سامناکی نیوسەعاتی دا زەمینەی ئیعدام کردنەکەیان فەراهەم کرد و نە کەسێک لێیان پاڕیەوە و نە کەسێک هەڕەشەیەکی کرد.»(١٩)

لە پازدەی نیسان بەملاوە چوار ناوداری کوردیان لە سێدارە دا، کە یوسف زیای نوێنەری جارانی ئەنجومەن و عەقید پەلید یان بێ ا بوو. لە ٤/١٨ دا شێخ عەبدولقادر، کە لە دوورویەری قەستەنتەنییە نەجوڵا بوو و دوازدە ناوداری تری کوردیان گرت. کۆتایی کاری کوڕەکەی شێخ عوبەیدوللا دڵەزێنە. ئەو کە لە ساڵی ١٩١٣دا لە ترسی ئەوەی بە تۆمەتی خیانەت لە وڵات تاوانبار نەکرێ، لەگەڵ میجەر نوئیل دا بۆ کوردستان نەچوو بوو، شەش ساڵ لە دوای ئەوە بوو بە قوربانی دەسیسەیەکی پۆلیسی: لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٤ دا یەکێک لە هاوکارانی شێخ لەگەڵ «تەمپلی» ناوێکدا کە خۆی وەکو بەرێوبەری کاروباری ڕۆژهەلاتی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستان ناساندبوو، پەیوەندی دروست دەکات. بەلام ئەم پیاوە لە ڕاستیدا ماموری پۆلیسی «ئەمن»ی تورکیە بوو، شێخ پەیمان دەگەڵ ئەم کەسەدا دەبەستێ: «پەیمانێکی وەکو ئەوەی کە ئینگلیز دەگەڵ شەریفی مەکەدا بەستویەتی» بەپێی قەواڵەو بەڵگەنامەی حاشا هەڵنەگر شێخ عەبدولقادر بوو بوو بە قوربانی پێ داگرتنی کوێرانەی خۆی بە «داواکردنی یارمەتی لە ئینگلیزەکانە و حوکمی ئیعدام دراو، لە سێداوە درا.

## ١٤

## دادگایی

لە ئەنقەرە و دیاریەکردا دادگا سەربەخۆکان بێ وەستان لە کاردان. لە دیاربەکردا یەکەم فایلی کە دەخرێتە بەر لێکۆلینەوە فایلەکەی دکتۆر فۆئادە کە «هەمیشە ئامادەی چاکە

کردنە لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا و ئەوەندە گێلە کە خەتەر نیەﻪ»[٢٠] دکتۆر فوئاد دوای دادگاییەکی کورت، حوکمی ئیعدام دەدرێ.

ئەفەری دووەم ئەکرەم جەمیل پاشایە. ئەو جا نۆرەی شێخ سەعید دێ. بە گوێرەی ئیدیعانامەی دادوەر، ئەوە بەدیار دەکەوێ کە شێخ سەعید [illegible]ـا پیاوێکی توندڕەوی مەزهەبی نەبووە.

هۆکار و ریشەکانی ئەو شۆڕشەی کەلەو دواییانەدا لە شارەکانی رۆژهەلاتی ولاتی هەمیشەیی تورکدا هەلگیرسا، هەمان ئەو هۆکارانەن کە بۆسینا و هەرزەگۆڤینای لێ هەلگیراینەوە. ئەو مەبەست و ئامانجانەی کە بوونەتە هۆی سەرهەلدانی شۆڕشی کوردان هەمان ئەو مەبەست و ئارمانجانەن کەسوریا و فەلەستینیان لێ کردین، رێنوینی هەندێکتان غرور و لوتبەرزی بوو، هەندێکی ترتان لە ژێر کاریگەری حەسوودی سیاسی بێگانەدا بوون. بەلام هەمووتان لە خالێک دا هاوبەشن: **دەتانویست کوردستانێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن، ئێستاش سزای تاوانەکانتان لەناوەیە و دەبێ بیدەنە**[٢١]

سەرکوتی قەزایی شۆڕش زوو بەزوو لەناو ولاتدا شێوەی عەمەلیاتێکی سیاسی بەرین بەخۆوە دەگرێ[٢٢] و دەکەوێتە گیانی هەر هەموو لایەنگرانی گەڕانەوەی خەلافەت و کۆمەنیستان و بە تایبەتی « حیزبی تەرەقی خوازە کە بەهۆی پایە و ئیعتباری خۆی و ناوداری سەرۆکەکانیەوە هەڕەشەیەکی مەترسیدار بوو. هەرگیز ئەوە نەسەلماوە کە حیزبی تەرەقی خواز هاوکاری شۆڕشگێرانی کردبێ، بەلام کوردانی دیاربەکر و قەستەنتەنییە بۆیە پەیوەندییان بەم حیزبەوە کردبوو چونکە لە بەرنامەیەکدا بەلێنی جۆرە (لامەرکەزیەتێکی ئیداری) دەدا، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا خواستی سەرانی کورد بوو.

یەکێک لەپایەدارانی گەورەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بە دلنیاییەوە ئەوە دەلێ کە مستەفا کەمال بە لاسایی کردنەوەی «شێوازەکانی موسولینی» لە ئێستە بە دواوە هەر هەموو ئەوزارەکانی سەرکوتکردنی نەیارانی خۆی و زمان بەستنی هەموو رەخنەگرانی لە دەست دایە»[٢٣]

## ١٥
## پاشهات و دەرەنجامەکانی شۆڕشی شێخ سەعید

ئەگەرچی دەولەتی تورکیا، لە کۆتایی نیسانی ١٩٢٢ دا شۆڕشی کوردان بە کۆتایی هاتوو دەزانی، بەلام شۆڕش بە شێوەیەکی پەراگەندە هەر بەردەوامە. کوردەکان کە

ریبەرانی خۆیان لە دەست داوە و پەرش و بڵاوبونەتەوە، دەست دەکەن بە کاری پارتیزانی.

سیاسەتوانێکی فەرەنسەیی لەکۆتایی هەیلی ١٩٢٥/٥ دەری دەخات کە رەوشی کوردستان نەگۆڕاوە: « کوردەکان کوێستانەکانیان بە دەستەوەیە» و دەوڵەتی تورکیاناچارە جارێکی دی داوا لە فەرەنسە بکات کە رێی تورکیا بدات لە رێگەی هێڵی ئاسنی بەغداوە هێزی هیمداد بۆ شەرگە بنێرێ.

توندرەوی لە سیاسەتی «جیاکردنەوەی ئاین لە حکومەت» کە مایەی سەرکوتی تەکیەی دەرویشانە بەو حەساوەی «مەڵبەندی گەندەڵی و نەزانین» هەروەها دورخستنەوەی شێخان وسەرانی تەقلیدی و سەرکوتکردنی جەماوەری خەڵکی دەبنە هۆی سەرهەڵدانی زنجیرە شۆڕشێکی تا رادەیەک ناوچەیی، کە یەکێک لەو شۆڕشانە، شۆڕشی حاجۆیە لە نەسیبەن، کە لە مانگی ئازاری ١٩٢٦ دا روو دەدا.

## ١٦
## پەنا بردنە بەر عێراق

کوردەکانی عێراق چ ئاگادارییەکیان لەمەڕ شۆڕشی شێخ سەعید نابێ. تا لە دەوروبەری ئەیلولی ١٩٢٥ دا ژمارەیەک لە ئاوارەو پەنابەری کورد و دیان دەگەنە ناوچەکانی زاخۆ و دهۆک.

ئینگلیزەکان کە چاویان بەو هەموو پەنابەرە دیانە دەکەوێ، زۆریان لەبەر گران دەبێ: دە- دوانزە هەزار کەس کەلە گوندەکانی گویانی و شەرناک راونرابوون.[٢٤]

خۆ ئاوارە کوردەکانیش زۆرن، ئینگلیزەکان ئەم خەڵکە لە سێ ئۆردوگای جیاواز لە زاخۆ و دهۆک و بەرسەڤیی نزیکی سنوور دا جێ دەکەنەوە.

لە نێو پەنابەرە کوردەکان ژمارەیەکیان لەو ئاغایانە بوون کە «ملیان بۆ دەستووری تورکان نەدابوو و بەشداری کوشتاری دیانەکانیان نەکردبو» ژمارەیەکیان ئەندامی لیوای شەست و دوەمی تورک بوون و لە خزمەت هەڵاتبوون، هەندێکیان لە قەڵاو وەرزێرانە بون کە لە ئۆردوگای کاری بێگاری، هەڵاتبوون جگە لە کۆمەڵێک دەوار نشین.[٢٥]

## لەسەرکوتکارییەوە بۆ پاکتاو کردنی نەژادی

هاتنی ئەو هەمو ئاوارە کورد و دیانە بۆ عێراق زوو بەزوو، گیروگرفتێکی زۆری بۆ دام ودەزگای ئیداری وڵات دروست کرد.

لە کۆتایی مانگی ١١/١٩٢٤ دا سێرهەنری دوبزی کۆمیسێری باڵای بەریتانیا لە عێراق، لە مەجلیسێکی فراڤینی رەسمی داو لە ئەنقەرە باسی ئەم مەسەلەیە دەکات، بەڵام وەڵامێکی سەیرو سەمەرە لە تۆفیق رشید بەگی وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیا دەژنەوێ، کە تورکیا نەک هەر ئەو کوردانەی پەنایان وەبەر عێراق بردووە وەرناگرێتەوە. بەڵکو «بەتەمایە و پێیوایە هەمرو کوردەکانی ئەنەدۆڵ دەربکات، وەکو چۆن یونانی و ئەرمەنیەکانی راونا.»[٢٦]

دوای چەند هەفتەیەک وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیا، لە دیدارێک دا دەگەڵ «کلیرک»ی سەفیری بەریتانیای مەزن، هەمان بابەت دووبارە دەکاتەوە و «تیۆری فەلسەفی- مێژوویی» دەوڵەتی تورکیا هێند بە بێ شەرمی و بێ ئەدەبی باس دەکات کە سیاسەتوانی بەریتانیا باوەڕ بە گوێی خۆی ناکات «بە پێی ئەم تیوری»یە باوی ئیمپراتوریەتان هاتۆتەوە و ئێستا ئیتر سەردەمی سەربەخۆیی و جیابوونەوەی میللەتانی بچووکی یەک دوو ملیۆنی «وەکو ئەلبان» بەسەر چوو، کوردەکانیش هەمان چارەنووسیان دەبێ. بەڵام ئەمانە «کوردەکان» ناستی رۆشنبیری و ئەقڵیان هێندە نزم و پاشکەوتووە کە ناتوانن بە ئاسانی لەگەڵ کۆمەڵگەی تورکیادا بگونجێن و بسازێن.

ئەم خەڵکەش وەکو هندزکەکانی ئەمریکا (کلیرک دەڵێ رەنگە جەنابی وەزیر مەبەستی سورپێستەکانی ئەمەریکا بێ!) چونکە لەم ململانێیە ماندا ناتوانن لە رووی ئابوورییەوە خۆیان لەگەڵ هەل و مەرج و بارودۆخ دا بگونجێن و شان بە شانی تورک زۆر پێشکەوتووەکانی ناوچە کوردنشینەکان دەربچن، بە ناچاری نامێنن و لە ناو دەچن.

«ئەوەتا ئەمرۆکەش ژمارەی کوردی تورکیا لە ٥٠٠٠٠٠ کەمترە، ولەم ژمارەیەش چەند بتوانن رەوانەی ئێران یان عێراقیان دەکەن و ئەوەی دەمێنێتەوە بە کورتی و کرمانجی وبە روونی و بە راشکاوی وەکو رەگەزی ناسازگار لەگەڵ ژینگەدا لە بەین دەچن.»[٢٧]

دوای چەند مانگێک دەوڵەتی توکیا بە رەسمی قانونێکی پەسند کراوی راگەیاند (قانونی ژمارە ١٠٩٧ لە ١٩ /٦/١٩٢٧) کە ئەم قانونە رێگەی بە دەوڵەت دەدا لەبەر

«هێزی سوپایی و کۆمەلایەتی » لە شار و ناوچەکانی رۆژاواوە ١٤٠٠ کەس بە خاوخێزانەوە و لە شارو ناوچەکانی رۆژهەلاتەوە هەر هەموو ئەوانەی کە «بە سزای قورس حوکمدراون» رابگوێزێ.

دوو سالان پاش شۆڕشی شێخ سەعید کاری کوردستانی تورکیە گەییە بن بەستی تەواو « ٣٠٠٠٠ سەربازی تورک بە زەحمەت کۆنترۆلی ئەو دەڤەرەیان پێ دەکرێ کە لە باشوری والەوە تا رۆژهەلاتی دەریاچەی وان دەگرێتەوە، ئەم ژمارە سەربازە تەنانەت زەحمەت نادەنە خۆ کە ناوچەکە لە بوونی دوژمن پاک بکەنەوە، ئەوەندە ناوچەیەکی سەخت و ناهەموارە». (٢٨)

تورکەکان کە لەیەک لاکردنەوەی مەسەلەی کوردەکان نائومێد دەبن، دەکەونە خۆ کە یارمەتی لە ئێران وەربگرن، لێ ئێران ئەم کارە پەسند ناکات، چونکە کوردەکانی ئێران چ گیروگرفتێکیان بۆ ئێران نەناوەتەوە و ئێرانیش بە هیچ جۆرێ نایەوێ سەریەشەیەکی وەها بۆخۆی دروست بکات. (٢٩)

**سەرچاوە پەراوێزان:**

١- راپۆری ١٩٢٥/٣/٤ میجەر هارنک، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ١٩٨٦٧ ٣٧١.

٢- بەگوێرەی شایەتی فەرمانبەرێکی بانقی عوسمانی، دانیشتووی دیاربەکر، لەنامەیەک دا بە زمانی فەرەنسی لە ١٩٢٥/٦/٢، ئەمە تەنیا بەلگەنامەیەکی باوەڕپێکراوە کە یەکسەر پاش شۆڕش لەوێندەر نووسراوە.

٣- نامەی فەرمانبەری ئێوبرلوی سەرەوە، وەزارەتی کاروباری ئینگلستان، ١٠٨٦٧ ٣٧١.

٤- گفتوگۆی ئەنجومەنی نیشتمانی بۆلتنی بنکەی لێکۆلینەوەی کوردی، کامەران بەدرخان ژمارە ٢، ١٩٤٨

٥- Lepeuple برۆکسل، ١٩٢٥/٢/٢٨

٦- نووسراوی جی، مۆرگان وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٠٨٦٧ ٣٧١، ١٩٢٥/٣/٤.

٧- راپۆری ئیرکمودور، عێراق ١٩٢٧/٢، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ١٢٢٥٥ ٣٧١.

٨- بڕوانە کتێبی یەکێتی سۆڤیەت و کوردەکان. لێکۆلینەوەیەکە دەربارەی کەمینەیەکی نەتەوەیی، نامەیەکە دراوە بە زانستگەی ڤیرجینا. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ١٩٦٥، نووسینی ویلسن هارل.

٩- راپۆری لیندزی گەورە سەفیری بەریتانیا لەئەنکەرە ١٩٢٥/٣/٩. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بەریتانیا ١٠٨٦٧ ٣٧١.

١٠- قسەکانی عیسمەت پاشای سەرەک وەزیر، لە ئەنجومەنی نیشتمانی، ١٩٢٥/٤/٧. وەزارەتی

کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ٨٦٧ ١٠ ٣٧١.

١١- راپۆرتی ١٩٢٥/٣/١٤ی گەورە سەفیری فەرەنسا. قەستەنتەنییە، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا ٣١١-٣١١ E.

١٢- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٨٦٧ ١٠ ٣٧١.

١٣- نووسراوی ٣/٩ی گەورە سەفیری بەریتانیا لە قەستەنتەنییە، لیندر

١٤- راپۆرتی جەنەراڵ مۆجن ١٩٢٥/٣/٢٩ ئەنکەرە، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسە، ٣١٣ E ٣١١

١٥- ـــ ـگی دووەم کارتو پاشکۆی عەسکەری لە قەستەنتەنییە ١٩٢٥/٣/١٧. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا ٣١٣- ٣١١ E.

١٦- شێخ عەبدوڵلا شێخ عەلی مەهوەند (مەحمود؟) ئاغا، تەیمور ئاغا، خرگە پازارلی رەشید ئاغا، قاسم عەلی و کۆنە سەرگوردی سوپای تورکیا.

١٧- حەسەن نەرفەع، کوردەکان ل ٣٧.

١٨- نامەی فەرمانبەری بانقی عوسمانی

١٩- هەمان سەرچاوە.

٢٠- هەمان سەرچاوە

٢١- قەیدی ١٩٢٥/٦/٢٨، لە کتێبی «لە کوردستانی عێراقدا، بوونی نەتەوەیی، ل ٣٤٧ەی عیسمەت شەریف وانلی وەرگیراوە.

٢٢- ئالبیر ساروی گەورە سەفیری فەرەنسا ١٩٢٥/٦/٢٣ وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسە، ٣١٣- ٣١١ E.

٢٣- نووسراوەی ١٩٢٥/٣/١٦ ی وەزارەتی دەرەوەی ئینلگستان، ئامادە کردنی ئازەبوون، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٨٦٧ ١٠ ٣٧١

٢٤- chronicle Rally، لیستێک لەمەڕ «ئەو خوێن رێژیانەی کە لەمەرزێن دوڵی دوو رووبار روویان داوە» بە دەستەوە دەدات.

٢٥- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١١٤٧٠ ٣٧١

٢٦- مە جلیسی فراقین، رۆژی ١٩٢٦/١١/٢٣. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٢٢٥٥ ٣٧١.

٢٧- راپۆرتی ١٩٢٧/١/١٧ی سێر جی کلارک دەربارەی گفتوگۆی ١/١٦ دەگەڵ وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٢٢٥٥ ٣٧١.

٢٨- راپۆرتی میجەر هارنکی پاشکۆی عەسکەری بەریتانیا لە ١٩٢٧/٣/٣.

٢٩- گفتوگۆی میجەر هارنک دەگەڵ پاشکۆی عەسکەری تهران، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١٢٢٥٥ ٣٧١.

## فەسڵی پێنجەم

## کۆماری ئارارات (١٩٢٧-١٩٣١)

### ١

### دامەزراندنی خۆی بوون «سەربەخۆیی»

چۆنیــەتی دامــەزراندنی خــۆیبــوون بە دروســتی نەزانراوە، بە گــوتەی یەکـێـک لە دامــەزرێنەرانی خــۆیبــون و لە بەهاری ســاڵی ١٩٢٧ داو لە بنارەکــانی ئارارات دا بە ئامــادەبوونی نوێنەرانی چوار ڕێکخراوی نەتەوەیی کــورد واتا: «تەعــالی کــوردســتــان» «تەشکیلاتی کــوردســتــان» «میللەتی کــورد» و «کۆمیــتەی ســەربەخۆیی» کۆبوونەوەیەکی فــراوان دەکرێ و هەر هەمــوو بڕیــار دەدەن کە خۆیان هەڵوەشێننەوە تا لە یەک ڕێکخــراودا واتە لە «کۆمەڵەی خۆیبوون» دا یەک بگرن.[1]

بەڵام پێدەچێت ئەم کــۆبوونەوەیە لە شــاری حــەمــدونی لوبنان دا کــرابێ، هەڵبــەتە ئەم بۆچوونە دەچێتە ئەقڵەوە و لە ڕاســتیــەوە نزیکە، چونکە کوردستان لەو دەمەدا مەیدانی کاری عســکەرتاریەت بووە.[2]

کــۆمیــتــەیەکی ناوەندی کــۆمــەڵەی خۆیبــوونی بەڕێوە دەبرد. بارەگــای ئەم کــۆمیــتــەیە لە حەڵەب بووە تا هاوینی ســاڵی ١٩٢٨ کە لەلایەن دەســەڵاتدارانی فەرەنسیەوە «پەرتەوازە» دەکرێ گەلێک لە ناوداران و پیاو ماقوڵانی کوردی ئاکنجی قەستەنتەنیەیە، بە تایبەتی بەدرخانییەکان، ئەندامی کۆمیتەی ناوبراو دەبن، جەلادەت بەدرخانی کوڕی ئەمین عــالی بەدرخان سەرۆکی کۆمیتەکە بوو، ئەندامانی دیکەی کۆمیتە بریتی بوون لە کامەران و سوریا بەدرخانی برای جەلادەت، مەمدوح سەلیم و شاهین بەگ.

( سەرکردە و ڕێبەرە دیارەکانی خۆیبوون بریتی بوون لە: قەدری جەمیل پاشا، جەلادەت عالی بەدرخان، حەسەن ئاغا حاجۆ، ئیحسان نوری پاشا، ئەکرەم جەمیل پاشا، مەمدوح سەلیم و عارف عەباس. )

ســەرکردایەتی «خــۆیبــوون» بڕیار دەدەن کــە دەرس و پەند لە شکســتــیــەکــانی رابردوو وەربگرن. بۆیە دەیانەوێ زۆر بە نهــێــنی و بە پارێزەوە کــار بکەن، هەمــوو تیــرەو تایفــە کوردەکان بەلای شۆڕش دا رابکێشن، کرداری چەکداری خۆیان ڕێک بخەن، جەنگاوەرانی

کورد بە چەک و تەقەمەنی تازەو هاوچەرخ چەکدار بکەن و بەرە بەرە فێری یاسا و ڕێسای جەنگیان بکەن.

ئەم گروپە کە چەندین ساڵ بەر لە مامۆستایانی جەنگی پارتیزانی ئەمەریکای لاتینی، ڕێسای «بنکەی شۆڕشگێری»یان داهێنا، لێدەبڕێن «لە یەکێک لە شارەکانی کوردستانی بن دەستی تورکاندا مەڵبەندێکی سوپایی دامەزرێنن کە لە شەڕی یەکجارەکی و چارەنووس سازی خۆیاندا لە بری مەخفەر و مەڵبەندی فێربوون و ڕاهێنان و بارەگا بەکاری بێنن.» و ئەم مەڵبەندە لە ژێر دەستی «سەرکردایەتی هێزی یەکگرتووی کورد بێت.»

ڕێبەرانی «خۆیبوون» کە سوورن لە سەر ئەوەی تا «وەدەرنانی دوا سەربازی تورک لە مەرزی کوردستان» درێژە بە شەڕ بدەن، هەموو هەوڵێکی خۆیان دەخەنە کار کە دژمنایەتی وڵاتانی دراوسێ نەکەن و ڕای دەگەیەنن کە «خوازیاری ئەوەن باشترین پەیوەندی دۆستانەیان دەگەڵ دەوڵەت و میللەتی ئێرانی براو دۆست دا هەبێ» هەرچەندە ئەمە ڕێ لە ئێران ناگرێ، ڕاستە تا ڕادەیەک بە دەستی خۆی نابێ، لەسەرکوتکردنی بزووتنەوەی کوردا یارمەتی تورکان بدات.

سەبارەت بە عێراق و سوریا- خۆیبوون، دوویاتی دەکاتەوە کە «ڕازی و خۆشحاڵە بەو مافانەی کە بە پێی بڕیارەکانی سایەنشینی بە کوردی ئەم دوو وڵاتە دراوە و خوازیاری مافی سیاسی پتر نیە بۆیان» هەڵبەتە ئەم تەگبیرە سەبارەت بە بزووتنەوەکە تەگبیرێکی زیرەکانەیە و خۆ پاراستنە لە دژمنایەتی بەریتانیا و فەرەنسا.

سەرەنجام، ڕێبەرانی ڕێکخراوی تازە «خۆیبوون» دێتە سەر ئەوەی هەر هەموو بەدحاڵی بوون و ساردییەکی نێوان کورد و میللەتی ئەرمەنی بە یەکجارەکی حەل وفەسڵ بکەن.[3]

لە ڕاستیدا، پەیوەندییەکی نزیک لە نێوان خۆیبوون و حیزبی ناسیونالی ئەرمەنیان «داشناک» دا هەبوو، هەڵبەتە ئەو بانگەشەیە ناچێتە ئەقڵەوە کە گوایە خۆیبوون «لە سەر داوای» ف. پاپازیانی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی داشناک دامەزرابوو، بەپێی ڕاپۆرتی ئینگلیزان.[4] پاپازیان بەخۆی لە کۆبوونەوەو بەشێک لە تەقەمەنی وچەکی شۆڕشگێڕەکان لە ڕێگەی ئەورووپاوە دابین دەکەن. زانیارییەکی ڕوونی ئەوتۆ لەمەڕ جۆری پەیوەندی کردنی کۆمەڵەی خۆیبوون لە حەڵەبەوە، بەهێزە چەکدارەکانی خۆیانەوە لە ئارارات لە دەست دا نیە، چونکە یەکێک لە کارەکانی دیکەی کۆمەڵە ئەوە بوو کە لە ئەورووپادا پروپاگەندە بۆ شۆڕشی کورد بکات. دەیتوانی زۆر بە ئاسانی ئەوە لای خەڵکی بسەلمێنێ، کە بە

ئەوانەتی جلەوی شۆڕش و پێشمەرگەی لە دەست دایە. کە تاقە رشتەی پەیوەندەی ئەوان بوو بە جیهانەوەیە.

لە ساڵی ١٩٢٥ دا و لە بواری پراکتیکی دا شۆڕش لە کوردستانی تورکیادا، بەتایبەتی لە ناوچەی بایەزید و ئارارات دا کۆتایی نەهاتبوو.(٥)

بەلام دامەزرێنەرانی کۆمەڵی خۆیبوون پێمان ناخۆش نییە بڵێین بزووتنەوەیەکیان چێکر کە بەر لەوان لە راستیدا وجودی هەبوو، بەلەز و پاش رۆیشتنی فەرماندەی گشتی هێزەکانی «ئیحسان نوری» لە هەل و مەرجێکی هەلاتن ئامێزدا جلەوی شۆڕشیان لە دەست دەرچوو، وە چ دەسەلاتیکیان بە سەرییەوە نەما، بەلام گومان لەوە دا نییە کە کۆمەڵەی خۆیبوون لە دەرێی مەیدانی شەڕدا زیاتر گروپە نەتەوەییە کوردەکانی لە دەوری یەکدی خر دەکردەوە و لقی لە هەموو جیهان و تەنانەت لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بەتایبەتی لە دیترۆیت دا هەبوو.(٦)

## ٢

## رووبەڕووبوونەوەکانی ساڵی ١٩٢٧

راپۆری سیاسەتوانانی ئاکنجی ئێران و تورکیە ئەوە دەگێرنەوە کە لە ساڵی ١٩٢٧ دا سەرتاسەری کوردستانی تورکیا لە جموجۆڵ دابووە، لە دەوروبەری دیاربەکر و موش، خنیس و بولانیک، شێخان ترس و لەرزیان خستۆتە ناوچەکەدا.

ناوچەی بەتلیس و کۆساری ئاراراتیش وەتر

یەکێک لە هێرشە سەرەتاییەکانی لەشکری تورکیا لە ئەیلولی ١٩٢٧ دا لە دۆڵی زیلان، دووچاری شکستێکی کارەسات ئامێز دەبێت، شۆڕشگێرانی کورد بە هاوکاری ئەو چەکدارە عەشایەرانەی کە لە ئێرانەوە دێن، حەشرێک بەم لەشکرە هەشت هەزارییەی تورکیا دەکەن ئەوسەری دیار نەبێ، پاشەکشەیەکی حەیابەرەیان پێ دەکەن، چوار تۆپ و ٣٥ رەشاشیان لێدەگرن و چواردە ئەفسەر و سەدان سەربازی تورک، بەدیل دەگرن.(٧)

قوەتەکانی تورک پاش ئەم شکستە خوێناوییە بۆ دیارین دەکشێنەوە و دەوڵەتی تورک ئەم سەرکەوتنەوەی کورد دەداتە پاڵ هاوکاری تیرە کوردەکانی دەڤەری ماکۆ و بە توندی دەوڵەتی ئێران ئاگادار دەکاتەوە و داوای لێدەکات سنور داخات و ئەو کوردانەی تورکیا کە پەنا وەبەر ئێران دەبەن چەک بکات.(٨)

## ٣
## هەڵوێستی سۆڤییەت

تورکیا و سۆڤییەت دراوسێی دیوار بەدیوارن، شەڕ لە بن دیواری سنووری باشووری یەکێتی سۆڤیەتدا گەرمە، ناوچەی شەڕەکان، لە هەموو ڕوێ ـە زۆر گرنگە، کەچی سۆڤیەت هەڵوێستی نییە، یان هەیەتی وزۆر ئاڵۆز و نادیارە.

سۆڤیەت، لە بەهاری ساڵی ١٩٢١ دا دوو پەیمانی دەگەڵ ئێران و تورکیادا بەستووە، بەپێی ئەم جووتە پەیمانە ناتوانێ پشتیوانی لە شۆڕش و بزاڤێکی نەتەوەیی کورد بکات کە مەبەستی پارچە پارچە کردنی هەر یەکێک لەم دوو وڵاتە بێت.

سۆڤییەتیش وەکو فەرەنسە، بەڵام بە هەنجەت و بیانووی جیاواز لە هی فەرەنسە، مەسەلەی سەربەخۆیی کوردستانی بە دەسیسە و پیلانی شومی بەریتانیا دەزانی.

کاراخانی یاریدەدەری کومیسێری دەرێی سۆڤیەت لە هەیڤی ١٩٢٧/٧دا پەیمانێکی دەگەڵ تورکیادا مۆر کرد کە دژی بزووتنەوەی کورد بوو، ئەم پەیمانە لەمۆسکۆ لەلایەن زەکی بەگ و بە ئامادە بوونی سەفیری جارانی سۆڤیەت لە تورکیا (ئارالوف) ئیمزا کرا.[٩]

دیارە ئەو پەیمانی یەکێتی و هاوکاریەی کە لە نێوان ڕێبەرانی خۆیبوون و ڕێبەرانی حیزبی نەتەوەیی (داشناک) دا بەسترا، بووە هۆی ئەوەی کە سۆڤیەت زیاتر دژایەتی کورد بکات.

لە ساڵی ١٩٣٠ دا، لەو کاتانەدا کە شەڕی زۆر قورس لە دەورووبەری ئارارات دا دەکرا، سۆڤیەتییەکان مژولی دامرکاندنەوەی شۆڕشێکی دیکەی نەتەوەیی بوون کە لەلایەن ئەرمەنییەکانەوە هەڵگیرسێنرابوو وەختێ کە کوردەکانی سۆڤیەت و ئەرمەنیان یارمەتی شۆڕشگێرانی ئارارت دەدەن، سۆڤیەتەکان هاوکاری تورکیان دەکرد، سوپای سۆڤیەت ڕێبازگە سروشتییەکانی ئاراسیان کە سنووری نێوان هەردوو ولات پێک دەهێنێ بە تەلی درکاوی و سەکی پۆلیسی قایم دەکرد، مەخفەری دیدەوانی دادەنێن و دەوریەی سوارە بە بەردەوامی بە هێڵـە سنووریەکاندا دەگەڕێن. بەڵام وێڕای ئەمانەش سنوور هەرگیز بە تەواوەتی ناگیرێ.[١٠]

**لە کۆتایی مانگی ٧/ ١٩٣٠ دا بەر لەوەی لەشکری تورکیا هێرش بۆسەر دقوللە و قەڵایەی ئارارت بەرێ، قوەتێکی سوپایی سوارەی ٥٠٠ کەسی سۆڤیەتی دەگاتە گوندی دوەلوی نزیکی ئارلس، قوەتەکە دوو ڕۆژان لەم گوندەی دەمێنێتەوە، ئەوجا شەوێک لەبەر**

قوەتی تەوبراو «ون دەبن» دیهاتیـیـانی دوەلو دڵنیـان کـه دەنگه شـمواتی له ئاراس پەڕیونەتەوە تا بچنه هیمدادی هێزی تورکان و شەری کوردان بکەن.[11]

هەرچەندە بەشداری راستەخۆی سۆڤیـەتەکـان لەسـەرکوتکردنی بزووتنەوەی ئارارت دا هەرگیـز نایەتە سەپاندن. بەڵام هەڵوێسـتی یەکێتـی سـۆڤیـەتیش لە داپۆشینی ئایەت و خوێندنەوەی هەڵویستی سۆڤیەت زۆر زەحمەت نییە، «پاش ئەو شەرانەی کە لە ئارارات دا روو دەدەن، دیسان دەبێ دەستی ئیمپریالیزمی جیهانی ببینرێ کە دەیەوێ پەردەیەکی ئاسنین بەسەر یەکێتی سۆڤیەت دا بدات.»[12]

تورک لەسـەرەتای مـانگی ١١/ ١٩٣٠ دا بۆ جـاری دووەم هێـرش دەکـەنە سـەر خەباتکارانی ئارارات و ئەم هێرشەیان لە هێرشی یەکەم چاتر نابێ. لەشکری تورک هەر زوو ناچار دەبێ لەبایەزید بارگە بخات و زستانەکە لەوێندەر بەسەر بەرێ.

بۆ یەکەمجار ناوی فەرماندەی تازە یان «راوێژکاری سوپایی» کوردان ئیحسان نوری دەبرێ.

هەر لەم کاتانەدا کوردی دەڤەری بەتلیس رادەپەرن و تا دەوروبەر و قەراخی شار دێنە پێشێ.

## ٤

## ئیحسان نوری و راپەڕینی ئارارات

ئیـحسـان نوری کە بەتلیـسـیـیـە و سـەرکوردی جارانی سـوپای تورکـیـە، بە گـوتەی مێژوونووسانی کورد لە سـاڵی ١٩٢٥ دا لە کۆ سـارەکـانی بۆتان دا، لە بیت الشـهـاب، شۆرشێکی هەڵگیرساند و ئەوجا دەگەڵ چەند سەد پێشمەرگەیەکدا پەنای وەبەر کۆسارێن ئارارت بردبوو.

لە سـاڵی ١٩٢٧ دا وەکـو «نوێنەری شـۆرشـگەرێن ئاگری داخ (ئارارات) بەشـداری کۆنگرەی خۆیبوون دەکات. کە لەلایەن کۆنگرەوە رادەسپێردرێ «مەڵبەندێکی بەرەڤانی و مەقاوەمەت» دابمەزرێنێ. ئەویش بۆ ئەم مەبەستە کۆسـارێن ئارارات هەڵدەبژێرێ و سـاڵی ١٩٢٧ بۆ « کۆ کردنەوەی هەمـوو ئەو ئیشتمانپەروەرانە تەرخان دەکات کەپەرتەوازەی کۆسارەکانن»

ئیـحسـان نوری لە سـاڵی ١٩٢٨ دا « دەبێ بەسەرکردەی چەند هەزار جەنگاوەری ساز و ئامادە و مەشق دیتـوو» و دامودەزگای ئیداری بە ئیبـراهیم پاشا حەسکی خەڵکی تەللۆ

ئاسراو بە حەسکی تەللو، دەسپێردرێ وئالای کوردستان هەڵدەکرێ.کۆماری چکۆلەی کوردی ئارارات لەدایک دەبێ.(١٤)

٥

## ئارارات

لە جیهاندا کەم جێگە هەیە بە ئەندازەی ئارارات (ئاگری داغ) باش و لەبارو هەموار بێ بۆ وەی بکرێ بە «بنکەی شەڕی پارتیزانی.»

ئارارات، بە هەردووک لوتکەکەیەوە، واتا ئاراراتی بچووک و گەورە، و بە خەرەند و زەندۆڵەکانیەوە دەکاتە قەڵایەکی سروشتی بە پانتایی ٩٦٠ کیلۆمەتری چوار گۆشە. ئەم دوو لوتکەیەی ئارارات کە بەراستە هێڵ ١٢ کیلۆمەتر لێکدی دوورن و یەکەمیان ٣٣٩٦ مەتر و دووەمیان ٥١٥٧ مەتر لە دەریاوە بەرزن و هەردووکیان لە ملەی سەردار بولاک دا کە ٢٤٤٥ مەتر بەرزە، یەکانگیر دەبن.

لەو رۆژگارەدا سنووری تورکیا و ئێران بە کێوی ئارارت دا رەت دەبوو، لوتکەو داوێن و بناری رۆژهەلاتی ئارارات ی بچوک بەشێک بوو لەخاکی ئێران، و ئەمە خۆی لە خۆیدا کۆسپێک بوو لە رێگەی تورکەکان و دەرفەتی ئەدەدان کە ئابلوقە و گەمارۆی شۆرشگێرەکان بدەن.

ئارارات گرکانێکی خامۆش و دۆلێکی ٤٥ غرەبیە و لە ملەی سەردار بولاک دایەو، جێیەکی یەکجار ناقۆلا ونا هەموارە.

ئارارات ی گەورەش ناهەموار و پرخەرەند و زەندۆلی گرکانی و پێچ و پەنا و ئەشکەفتانە، گەورەترین ئەشکەوتی دەکەوێتە بناری رۆژهەلاتی چیایەکەو دەڕوانێتە روسیا و ٣ هەزار کەس بە خاوو خێزانەوە دەگرێ.(١٥)

پێشتر، یانی لە یەکەمەم جەنگی جیهاندا کوردێن جەلالی پەنایان وەبەر ئاراراتی گەورە بربوو، روس و ئەرمەن و چەندیان هەوڵ دا بوو لە ناوچەکە وەدەریان بنێن، ئەیانتوانی بوو بۆیان ئەچووبوە سەر و مقاوەمەت و بەرەڤانی جەلالیەکانیان پێ بەرهەق ئەکرابوو، ئەم خەڵکە کە بۆ ماوەی سێ ساڵان لە ١٥٠ کیلومەتری پشت شەڕگەوە مابوونەوە توانیان تا پێشڕەوی لەشکری عوسمانیان لە ساڵی ١٩١٨ دا لەنێو خاکی داگیرکراوی ووسیادا بەرگری بکەن.(١٦)

## دان و ستاندنێن ساڵی ١٩٢٨

دەوڵەتی تورکیە لە ساڵی ١٩٢٨ لێدەبڕێ دەگەڵ شۆڕشڤانێن کوردا بکەوێتە گفتوگۆ، جا بەم مەبەستە و بۆ وەی کەش و هەوایەکی لەبار بۆ لێکدی حاڵی بوون بڕەخسێنێ، جۆرە پاکنیازییەک بنوێنێ. چەند هەنگاوێکی عەمەلی دەنێ، نەفی کردن رادەگرێ، قانونی «راگرتنی سزای ئیعدام» بە پەسەند کردن دەگەیەنێ و (عەفوات بۆ ئەو کوردانە دەردەکات کەلە زەرفی سێ هەیڤاندا بگەڕێنەوە نێو ماڵ و منداڵی خۆ) مۆڵەتی گەڕانەوە بە نەفی کراون دەدات و زندانیان ئازاد دەکات.

### لێ زمانی کوردی هێشتا هەر پاساغە

دەوڵەتی تورکیا، سورەیا بەگی والی بایەزید رادەسپێرێ کە گفتوگۆ دەگەڵ شۆڕشڤانان بکات. والی بایەزید بە نامەیەکی دوور و درێژ حەسکی تەللۆ ئاغا ئاگادار دەکاتەوە کە واز لە شۆڕش و دژایەتی دەوڵەتی تورکیا بێنێ و ئەمە بەکارێکی «ناماقوڵ و گەوجانە دەزانێ» دەوڵەتی تورکیا، دەوڵەتێکی شەش سەد ساڵەیە و خوێنەرانی ناو نێوە ئەمە دەزانن، لە ماوەی ئەم شەش سەد ساڵەدا هەزاران کەس دژی دەوڵەت هەستاون. چییان بەچی کردووە؟ هیچ، دەوڵەت هەر سەرووەرو گەورەی مەملەکەت بوە و بەو دەقەوە ماوەتەوە» و داوا لە حەسکی تەللۆ ئاغا دەکات کە سوود لەم فەرمانی عەفواتە وەربگرێ.

والی بایەزید چەند وشەیەکیش لەمەڕ ئیحسان نوری دەخاتە سەرنامەکە «بیستوومە کە ئەفسەرێکتانیش لەگەڵدایە، من وەکو هاوپیشەیەک خەفەت بۆ حاڵی ئەم ئەفسەرە دەخۆم. من نازانم کە ئەو چ تاوان و خەتایەکی کردووە.»

بەڵام ئەم ختوکەدانی سۆزە سەبارەت بە هاوشانی و هاوپیشەیی دەگەڵ ئیحسان نوری دا بێ ئاکام دەبێ و حەسکی تەللۆ بە توندی و غروورەوە وەڵام دەداتەوە.

«ئەگەر راستە و عەفوات لە گۆڕێدایە، دەبێ ئەم عافواتە بۆ هەمووان بێ و دەگەڵ یاساکانی چەرخی شارستانیەتدا بگونجێت. ئەگەر دەتانەوێ بەم عافواتە خەڵکانی کێوی فریو بدەن، ئەمەیان باسێکی دیبە، نێوە نابێ بەو جۆرە لەگەڵ خەڵکانی وەکو ئێمەدا قسە بکەن، چونکە ئێمە بەشی خۆمان ئەزموغان هەن و دنیامان دیتووە. مرۆڤی کێوی لە هیچ شوێنێک نەماون. سەرانی گەورەی دەوڵەتی تورکیا دەبێ دان بەم حەقیقەتەدا بنەن.» و لەسەری دەڕوات «ئەگەر بەرلستی عافواتێک لە گۆڕێیە ئەدی بۆ میروبەگ و ژن و

مندالامان، که هیچ گوناهێکیان نەکردووە و دوو ساڵە لە ئاراوگەن و دژوارترین ژیانیان گوزەراندووە، بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆ نەگەڕاونەتەوە؟ تادووڕخراوەکان نەگەڕێنەوە سەر ماڵ وحاڵی خۆ، ناکرێ چ باسێک لە گەڕانەوەی ئێمە بکرێ.»[17]

هەر لەو ڕۆژانەدا یەکێک لە پیاوماقوڵانی بایەزید نامە ک بۆ یەکێکی دی لە شۆڕشڤانانی ئارارات بەنێوی نەعمان ئەفەندی دەنووسێت: نەعمانە ئەفەندی کۆنە کارمەندی دام و دەزگای دەوڵەت بووە، پاشان نەفی کراوە، لە ئاراوگە هەڵاتووە و دوای ٤٧ ڕۆژە ڕێ خۆی گەیاندووەتە ئارارات. نامەنووسی ناوبراو لە نامەکەیدا دەنووسێت کە هەمیشە لە خۆی دەپرسێت چۆن نەعمانە فەندی دەتوانێ لە نێو «کۆمەڵە خەڵکێکی جاهیل و نەزان» بژی. و داوای لێ دەکات کەڵک لەم دەرفەتی عافواتە وەربگرێ و دەڵێ کارێکی هاوتای کاری پێشووی دەدەنێ، لە هەر شوێنێکی وڵاتدا خۆی بیەوێ.

نەعمانیش بە توندی وەڵام دەداتەوە.

**«پاش ئەوەی کە دیتم و پاش ئەوەی کە بەسەرم هات و جا بێ ئەوەی کە خەتایەک یان گوناحێکم کردبێ، بێ دادگایی و بە هەوەسی دەوڵەت... بەڵێ پاش ئەم هەموو مەینەتی و پەت پەتییی کەبەسەرم هات، هاتنەوە و تەسلیم بوون بۆ باپایەکی وەکو من دەکاتە گەوجێتی.**

**منێک کە وڵاتم وێران بووە و بەراست و بە چەپ دا تاڵان دەکرێ. کە بێتە سەرژیان، لە هەر شوێنێ بژیم هەر وەکویەکە.»[18]**

دەوڵەتی تورکیا هەوڵێکی زۆری دا کە قەناعەت بە شۆڕشڤانانی ئارارات بکات تا بە عافواتەکە بێنەوە، بەڵام کە بینی بێ سوودە، لە مانگی ئەیلولی ١٩٢٨ دا شاندێکی گرنگی بۆ بایەزید نارد تا ڕاستەوخۆ دان و ستاندن دەگەڵ ئیحسان نووریدا بکەن. شاندەکە بریتی بوو لە دوو نوێنەری ئەنقەرە، والی قەرە کلێسا، فەرماندەی لیوای ٢٩ و قایمقامی ماردین و بایەزید.

ئەم دیدارە لە ١٩٢٨/٩/١٥ دا لە شێخلی کوپرودا ئەنجام درا کە لە سێ کیلومەتری بایەزیدایە و کەوتۆتە بناری ڕۆژهەڵاتی ئاراراتەوە.

ئیحسان نووری بەخۆ و شەست سوارەوە دێتە دیدار گەو چاوی بە شاندی نوێنەری تورکان دەکەوێ. تورکان، پێشنیازی ئەوە دەکەن کە خۆی و هەر هەموو هاورێکانی عەفو دەکرێن. ئەگەر بەڵێنی گوێڕایەڵی بدەن و چەکەکانیان تەسلیم بکەن.

هەروەها تورکەکان بەڵێن بە سەرۆکی سوپایی «کۆماری کوردی» ئارارات دەدەن کە پلەی جەنەراڵی دەدەنێ و موچەیەکی زۆری بۆ دەبڕنەوە و دەیکەن بە موڵحەقی عەسکەری و لە هەر وڵاتێکی ئەوروپایی دا کە ئەو بیەوێ. دیارە چ باسێکی داوار مانی گەلی کورد نەهێنرایە گورێ و ئیحسان نوریش پێشنیازەکانی دەوڵەتی ڕەفز کرد. ئەمە بە مانای نەهاتنە.

## ٧

## سەرەتای شەڕەکان

لەگەڵ سەرەتای توانەوە ی بەفرا، واتە لە ناوەڕاستی ئازاری ١٩٢٩وە، تورکان دەکەونە خرکردنەوەی دوو سوپای ١٢-١٥ هەزار کەسی لە ئیگدر و لە بایەزید، لەگەڵ نزیکەی سی هەلیکوپتەردا.

ساڵح پاشا سەرکردایەتی ئەم هێزانە دەکات، هاو زەمان دەگەڵ ئەو خۆ ئامادە سازییەدا دەسەڵاتدارانی تورک، بەتایبەتی لە ئەرزروم دا دەکەونە خەڵک گرتن، لە ئەرزروم دا نەوەت کەس تەوقیف دەکەن. کەیەکێکیان سەلاحەدینی کوڕی شێخ سەعیدی پیران دەبێت (کە ئەو کاتە تەمەنی ٢١ ساڵ نابێت) و بە ١٥ ساڵ زیندانی لەگەڵ کاری قورسدا حوکم دەدرێ، بەڵام «عەفوە» دەیگرێتەوە و ماوەی زیندانییەکەی کەم دەکەنەوە و بۆی دەکەن بە دوانزدە ساڵ و نیوا

لە ١١/٦/ ١٩٣٠ دا هێرش دەکرێتە سەر سەنگەرەکانی پێشەوەی کۆماری کوردی ئارارات و شەڕ هەڵدەگیرسێ، لە نیوەی دووەمی حوزەیران دا تورکەکان ڕووبەڕووی هێزی کورد دەبنەوە.

## ٨

## دژە هێرشی کوردان (نیوەی یەکەمی ٧/١٩٣٠)

بەڵام کوردەکان هەر زوو دەست بە عەمەلیاتی بەربڵاو دەکەن. ئیحسان نوری و ئیبراهیم بەگی سەرۆکی کوردێن جەلالی و مەحمود بەگ کە سەرگوردی جارانی لەشکری عوسمانی دەبێ، بەیارمەتی و هاوکاری عەشایەری کوردی هەردوو دیوی سنووری ئێران و تورکیا، دەکەونە پەلامار دانی پاشهێزەکانی تورکیا و هەوڵ دەدەن لێکدیان دابڕن و بە یارمەتی خەڵکی ناوچەکە بە باشور و باکوری دەریاچەی وان دارمت بێن و پەلاماری دیاربەکر بدەن.

بەو جۆرە زۆری پێناچێت کە شەڕگەیەکی ١٥٠ کیلومەتری لە ئاراراتەوە تا خۆرئاوایی ڕۆژهەڵاتی وان دروست دەبێت.

لە ٥-٩/٦/ ١٩٣٠ هێزی تورک و کورد لە دەشتی زیلانی باکوری ئەرجیس دا دەکەونە شەڕێکی قورسەوە.

کوردەکان ڕووبەڕووی مقاوەمەتێیکی توند دەبنەوە، تورک لە هەموو ڕوویەکەوە باڵا دەست تر دەبن ژمارەیان سێ هەندەی ژمارەی کورد دەبێت ولەرووی چەک و تەقەمەنی و تفاقی شەڕ زۆر لە کورد باڵا دەست تر دەبن، بۆیە لە ئەنجامدا کوردەکان دەشکێن.(١٩)

هەندێ لە قوەتەکانی کورد لە باکووری وان دا لە هێزەکانی دی دادەبڕێن و ئەوانی دی روو دەکەنە ئێران و ئارارات، زیانی کوردەکان ٩٠٠ کوژراو و ٢٤٠٠ بریندار و ٣٦٠ بێ سەرو شوێن بوو، زیانی تورکەکان لەوەش زیاتر بوو. ٢٨٠٠ کوژراو ٤٠٠ بریندار ١٧٠٠ دیل.(٢٠)

کوردەکان بڵاوی دەکەنەوە کە گوایە ٢٤ تۆپ و ٦٠ رەشاش و شەست هەزار فیشەکیان گرتووە و دوانزە فڕۆکەیان خستۆتە خوارەوە.!

هەڵبەتە ئەم ژمارانە زۆریان پێوە نراوە، بەڵام بە پێچەوانەی بانگەشەی چاپەمەنییە تورکییەکان، شۆڕشی کوردان هێشتا هەر بەرقەرار بوو، زۆر لە شکستەوە دوور بوو.

لەم سەروبەندەدا ژنێکی ئینگلیز بە ناوی رۆزیتا فاربەز راپۆرتێکی تاقانە لەمەڕ شۆڕشی ئارارات دەخاتە بەردەست، ئەم ژنە پاش ئەوەی بە بێهوودە هەوڵی دا بۆ ئەرمەنستانی سۆڤیەت بڕوات، سەرەنجام گەییە کوردستان و یازدە ڕۆژان لەگەڵ شۆڕشگێڕانی کوردا مایەوە، لەم ماوەیەدا وێنەی یەکێک لەو فڕۆکانەی گرت کە کوردەکان خستبوویانە خوارەوە و یەک دوو تۆپی لەو تۆپانەش دیتبوون کە کوردەکان گرتبوویانن.

«رۆزیتا فاربەز» لەمەڕ کۆمەکی ئێران بۆ بزووتنەوەی کوردەکان ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن «کوردەکان نەیاندەزانی ئەو تۆپانە بەکاربێنن کە گرتبوویانن و داوایان لە زەفەرئەلدەولەی فەرماندەی هێزەکانی ئێران لە ئازەربایجان (دژمنی دێرینی سمکۆ) کرد کە تۆپچییان بۆ بنێرێ.»

«هەڵبەتە روون نیە ئایا زەفەرئەلدەولە نەیویست ئەم کارە بکات یان ئێرانیەکان ترسان. بەڵام سەرەنجام زەفەرئەلدەولە بۆ ئەم مەبەستە چەند ئەرمەنییەکی نارد، کە زۆ ترسابوون و دەترسان ئەگەر تیرەندازی بکەن تورکەکان بیانکوژن و ئەگەر تیرەندازی نەکەن کوردەکان

بیاتکوژن و له زەفەرنەدەولە دەپارانەوە کەلە گەڵ خۆیدا بۆ ئێرانیان بەرێتەوە.»[٢١]

هە رنەم رۆژێتا فاریەزە لەسەری دەڕوات: «وا دیار بوو کوردەکان شەڕیان بە جۆرە سەرگەرمییەک دەزانی و هەر ژنێکت دەبینی منداڵێکی لەکۆڵ و تفەنگێکی بە دەستەوە بوو.»[٢٢]

## ٩

## کێشمانە کێشی تورکیا و ئێران

تورکەکان کە بڕیاریان داوە مەسەلەی کورد یەک لایی بکەنەوە، توشی کۆسپێکی گەورە دەبن. سنووری نێوان تورکیا و ئێران بە پێی دیاریکردنی سنوور لە ساڵی ١٩٢٤ دا بە ئارارتی بچووک دا دەڕۆیی.

بۆیە لەشکری تورک نەیدەتوانی بچێتە خاکی ئێرانەوە و گەمارۆی ئەو کوردانە بدات کە خۆیان لە ئارارت دا قایم کردبوو و شۆڕشگێڕانان هەموو کاتێک دەیانتوانی خۆ بە ئێران دا بکەن و یارمەتی و کۆمەک لە ئێران وەربگرن.

جا لەبەر ئەمە سەرکەوتنی یەکجارەکی تورک وەستا بووە سەر ئێرانیەکان، کە بە هەشت سەد سەرباز چاودێری و پاسەوانی سنووریان دەکرد، هەڵبەتە ئەم ژمارەیە بە هیچ جۆرێ بەشی ئەم مەبەستەی نەدەکرد. واتە هەرگیز بەو ژمارە کەمە چاودێری و پاسەوانی سنوور نەدەکرا.

لەلایەکی دیەوە، دەوڵەتی ئێران کە توانی بووی لە شکستی سمکۆ بەم لاوە ئاسایش لە کوردستانی ئێراندا بەرپا بکات، نەیدەویست ئەم رەوشە لە خۆی تێک بدات و قوەتی سوپایی دژی شۆڕشگێڕانانی ئارارات بەکار بێنێ کە زۆریان سەر بە تیرە و تایفەی ناکنجی ئێران بوون.

سەرەنجام ئێرانیەکان وێڕای ئەو پەیمانانەی کەدەگەڵ تورکیادا هەیان بوو، چ دژایەتیەک لەمەڕ سەربەخۆیی کوردانی عوسمانی دەرنابڕن. تاقە مەرجێک کەپێی قایل بوون ئەمەیە کە ئەرمەنیانی پێناوی «رابطە» نێوان رێکخراوە ئەرمەنییەکان و شۆڕشی کورد لە ئەرمەنیانی هاووڵاتی ئێران نەبن و نایەڵن کە ناسیونالیستانی ئەرمەنی تەورێز زۆر لەسنوور نزیک ببنەوە، یان لە ماکۆ جێگیر بن و بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە شۆڕش بەردەوام بوو، دەوڵەتی ئێران پەیوەندی خۆی نەبڕی و لە ساڵی ١٩٣٠ دا چەندین نێردەی خۆی بۆ ئارارات دەنێرێ.[٢٤]

هەردوو دەوڵەتی تورکیا و ئێران زنجیرە یادداشتێکی توند و تیژ بە یەکدی دەدەن. لە مانگی ئابی ۱۹۳۰ دا لە تاران دا بە نیگەرانییەوە باسی ئەگەری شەڕ دەگەڵ تورکیادا دەکرێ، نیگەرانی لەو رووەوە کە ئێران لە حاڵی حازردا ئامادەیی شەڕێکی ئاوهای نییە.(۲۵)

تورکەکان بە پەلەن و حەز دەکەن رۆژێ زووتر ئەم گیروگرفتە یەک لا بکەنەوە و لە کۆتایی تەموز و سەرەتای ئابدا ترسی ئەوەیان لێ دەنیشێت کە شۆڕش زیاتر پەرە بسەنێ و جڵەوی ڕەکە لە دەست دەربچێ.

## ۱۰
## موداخەلەی شێخ ئەحمەدی بارزان

لە عێراقدا شێخ ئەحمەدی بارزان لە دەوروبەری ۱۹۳۰/۷/۲۱ دا سەد یان دوو سەد جەنگاوەر بۆ کۆمەک و یارمەتی دانی کوردەکانی دەڤەری دراوسێی خۆی (ئورامار) لە قەڵەمڕەوی تورکیادا دەنێرێ.

لە ۱۹۳۰/۷/۲٦دا دەوڵەتی تورکیا بە رەسمی لە لای سەفیری بەریتانیا گلەیی لەم کارەی شێخ ئەحمەد دەکات. دوای چەند رۆژێکی دی، واتە لە دەوروبەری مانگی ئاب دا شێخ ئەحمەد دووەم گرووپی چەکداری خۆی بۆ کوردستانی تورکیا دەنێرێ، ئەم گرووپە دەم و دەست دەگەڵ هێزەکانی تورکیادا بە شەڕ دێن، بەڵام ناردنی هێزی هیمدادی تورک بۆ باشور، دەکاتە کارێک کە شەڕەکە تەشەنە نەکات.

لێ بەشداری شێخ ئەحمەد لە شۆڕشی کوردی تورکیادا، لێرەدا تەواو نابێ، پاش شکستی شۆڕش لە ۱۹۳۰ دا، ژمارەیەک لەو کوردانەی تورکیا، کەلە ناو سەرکوتکاری تورک هەڵاتبوون، لە ناوچەکەی خۆیدا پەنا دەدات و ئەم ژمارەیە لەم «پەناگایە»وە درێژە بە چالاکی عەسکەری دژی هێزەکانی تورک دەدەن.

لە کۆتایی ئەیلولی ۱۹۳۰ دا، تورکیا داوا لە نوری پاشا «نوری سەعید پاشا، سەرەک وەزیرانی وەختی عێراق بوو» دەکات کە رێی هێزەکانی تورکیا بدات بێنە خاکی عێراقەوە. تا کاری ئەو کوردانە یەک لایی بکاتەوە کە پەنایان وەبەر شێخ ئەحمەد بردووە.

دەوڵەتی عێراقی ئەوە قەبوڵ ناکات، بەڵام یارمەتی دانی کوردەکانی تورکیا لەلایەن شێخ ئەحمەدی بارزانەوە، دوای ماوەیەکی کەم، واتە لە ئەیلولی ۱۹۳۱ دا، دەبێتە هۆی راستەوخۆی ئەو شەڕانەی دژی خۆی «شێخ ئەحمەد» دەست پێدەکەن.

## ١١
## شۆڕشی حاجۆ

لە سوریادا، یەکێک لە سەرانی ناوچەیی کورد بەناوی حاجۆ، بە یارمەتی کۆمەڵەی خۆیبوون بە تواتێکی عەشایەری کەمەوە لە سنوور ئاردیو دەپێ و لە ٨/٥/ ١٩٣٠ دا گوندێکی چکۆلە لە دەڤەری نسیبین دەگرێ و لەوێندەرەوە بەیاننامەیەکی پشیتوانی کردن لەسەر بەخۆیی کورد بڵاو دەکاتەوە و هەموو کورد هاندەدات کە لە پێناوی برا جەنگاوەرەکانی ئاراراتیان دا راپەڕن.

هەر لەم سەروبەندەدا چەند شۆڕشێکی سنووورداری ناوچەیی لە جولەمێرگ (٨/٧) و نزیکی سیرت (٨/٦) و لە لیسە (کۆتایی ئاب) و لەوانەش گرنگتر لە دیاربەکر روو دەدەن.

## ١٢
## روخانی کۆماری ئارارات (ئەیلولی ١٩٣٠)

دەوڵەتی تورکیا لەنیوەی ئابەوە لیبرا کە چیتر گوێ بە ویست و مەیلی ئێران نەدات و فەرمانی بە جەنەراڵ ساڵح پاشادا کە پەلاماری ئەو کوردانە بدات کە لە ئارارات دا سەنگەریان گرتبوو.

قوەتەکانی سوپای تورکیا بۆ گرتنی شوێنە گرنگەکانی رۆژهەڵاتی ئارارات و بڕینی رێگەی پاشەکشە لە شۆڕشگێڕان، لە سنوور دەپەڕنەوە.[٢٦]

ساڵح پاشا رۆژی ٧/ ئەیلول/ ١٩٣٠ لە باکوری ئاراراتەوە فەرمانی هێرشی یەکجارەکی دەردەکات.

ساڵح پاشا رۆژی ٩/١٠ خەتی نێوان هەردوو ئارارات (واتە ملەی سەردار بۆلاک) دەگرێ. دیارە ئەمە لەباری سوپاییەوە بە کۆتایی مەسەلەکە دادەنرێ. کوردەکان کە لەلایەن تورکەکانەوە تاقیب دەکرێن، بەرەو باشوور هەڵدێن، ئیحسان نوری فەرماندەی گشتی هێزەکان پەنا دەباتە بەر ئێران. تا لە نیوەی مانگی چواری ١٩٧٦ دا مرد، هەر لە تاران مایەوە.

**بەڵام لە راستیدا هیچ شتێک کۆتایی نەهاتووە.**

تورکەکان، درۆیەکی زۆر بە گێرانەوەی رووداوەکانەوە دەنێن و کوردەکانیش ئامادە نین

بەشێکی ڕووداوە ناخۆشەکانی ئەم قۆناغە ڕوون بکەنەوە. کوردەکان بەتایبەتی خۆیان لەو **باسە دەبوێرن کە ئیحسان نوری لە چ ڕۆژ و مانگێک دا بارەگای سەرکردایەتی بەجێ هێشتوە و ڕووی کردۆتە ئێران، لە کاتێک ڕۆیشتنی ئیحسان نوری بۆ تەهران پتر وەکو هەڵاتن وایە.**

شەڕ بە درێژایی ساڵی ١٩٣١ لە ناوچەکانی سنووری ئێران و ئارارات هەر دەمێنێ. بەپێی هەندێک زانیاریان پێدەچێت کە ئیحسان نوری «لە کاتێکی زۆر ناسک» دا، لە پایزی ساڵی ١٩٣٠دا لەشەڕ هەڵاتبێ.

کۆمەڵەی خۆیبوون، کە کارەکەی ئیحسان نوری بوو بوە مایەی شەرمەزاری، ئیدی ڕێی بەخۆ نەدا کەسێکی دی وەکو فەرماندە بەسەر ئەو شۆڕشڤانانەدا بسەپێنێ کە هێشتا لە ناوچەکەدا درێژەیان بە خەبات دەدا و هەر ئەوانەی پەسەند کرد کە هەڵبژێر درابوو.[٢٧]

نامەی دەستکەوت و زیانی کۆماری کوردی ئارارات یەکجار دڵتەزێنە. کوردەکان دوو شکستی گەورەیان بەسەرداهات (زیلان و ئارارات) زۆربەی کادرەکان و قەڵاکانی ئاراراتیان لە دەست دەدا، ئەو چەک و تەقەمەنی و تفاقانەی کە بە درێژایی چەندین ساڵ پێکەوەیان نابوو، فەوتان و یان بە تەواوەتی لەنارچوون.

**وێڕای ئەوەی زانیاری تەواو لەسەر شەڕەکان لەبەر دەست دانین، بەڵام دەشێت بگوترێ کە کوردەکان لەبری شەڕی پارتیزانی دەستیان دایە شەڕی سوپایی و بەمە هەڵەیەکی زۆر گەورەیان کرد.**

ڕاستە مێژوو دووبارە نابێتەوە، لێ مرۆڤ بەدەستی خۆی نییە کە هەندێ بوبەری هاوشێوەی ئەو بوبەرانەی ئاراراتی بیر دەکەوێتەوە کە نزیکەی نیو سەدەیەک پاشتر لە عێراقدا روو دەدات.

## ١٣

## تەشەنە کردنی شەر بۆ ناو ئێران (بەهاری ١٩٣١)

دەوڵەتی ئێران، سانسۆرێکی یەکجار توندی خستەسەر ئەو بوبەرانەی کە لەناوچە سنوورییەکاندا ڕوویان دەدا.

لەنیوەی مانگی ٣/١٩٣١ دا، پاش هێرشی کوردەکان بۆ سەر ناوچەی ماکۆ، فەرماندەی عەسکەری تەورێز، قوەتێکی گەورە بە فەرماندەیی جەنەراڵێک بۆ ناوچەکە

دەنێرێ و سیاسەتوانانی دانیشتووی تاران چاوەنۆڕی توانەوەی بەفرن تا شەڕ و عەمەلیاتەکان دەست پێ بکاتەوە.

دەوڵەتی ئێران بیەوێ و نەیەوێ هەمان سیاسەتی تورکیا پەیڕەو دەکات و دەکەوێتە کۆچاندنی بەکۆمەڵی کوردە جەلالیەکانی ناوچەیی نێوان ئارارات و سنووری سۆڤیەت.

لەسەرەتای نیسانی ۱۹۳۱ دا ڕێبوارێک تووشی «ڕیزێکی درێژی ده کیلۆمەتری کوردە دەرکراوەکانی باکوور دەبێت. هەموو ژن و منداڵ دەبن و مەگەر بە دەگمەن دەنا ناقە پیاوێکیان دەگەڵ نابێ، عەرەبانە و حەیواناتی زۆریان دەگەڵ دەبێ، خەملاندنی ژمارەی دەرکراوەکان نەستەمە، بەڵام هەر نەبێ ۵۰۰۰ کەسێک دەبن.»[۲۸]

خالید ئاغا، کە یەکێک دەبێ لەسەرانی تیرەی جەلالی سەرپێچی دەکات و گوندەکەی چۆڵ ناکات، بە پیاوەکانی خۆیەوە پەنا وەبەر تورکیا دەبات، هەر لەم سەربەندەدا ڕێبوارێکی دی کە بە ناوچەی بایەزید و ئیگدر دا ڕەت دەبێ دەبینێ. «هەموو ناوچەکە پڕە لە سەربازی تورک» لە قوڵی ئاراراتەوە دەنگی هەراو هەنگامەی شەڕ دەژنەوێ، دەنگی دەسترێژی ڕەشاش و گوللە تۆپ. لەلایەکی دییەوە پاشان دەردەکەوێ کە تورکەکان بە قوڵی دە کیلۆمەتران هاتونەتە نێو خاکی ئێرانەوە و دەربارەی گۆڕینەوەی ئاراراتی بچووک بە هەندێ ناوچەی قتور خەریکی دان و ستانن دەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێران دا.

## ١٤

## هێزەکانی ئەو ناوچەیە

ژمارەی هێزین دەوڵەتی ئێران لە ناوچەکەدا لە ساڵی ۱۹۳۱ نزیکەی ۳۸۰۰ سەرباز و دوو هەزار سەربازی ئیحتیات و ۱۲۰۰ کوردی «سەر بەدەوڵەت» دەبن. هێزی هەوایی ئێران بریتی بوو لە سێ فڕۆکە کە بۆ کاری شناسایی بەکار دەهێنران.

هێزین کورد، نزیکەی ٦-٧ سەد کەسی سەر بە هۆزی جەلالی و حەیدەرانلون، سێ سەد کوردی ناوچەی ئاراراتیش هاتونەتە ناو ئەم ژمارەیەوە، ئەم سێ سەد کوردە تفەنگی تازە و ئۆتوماتیکیان پێ بوو، مەخزەنیان لە سەر بوو، هەر مەخزەنەی ۲۵ فیشەکی دەگرت.

فەرماندەکەیان فەرزەندە Farzande ناوێکە کە کۆمەڵی خۆیبوون پەسندی دەکات، سەرۆکی سەرکردایەتیان «برۆ» کوڕی ئیبراهیم ئاغای جەلالییە.[۲۹]

ئەرمەنیانی داشناک وەکو ساڵی ۱۹۳۰ یارمەتی و پەیوەندییەکانیان بۆ دابین دەکەن.

## ۱۵

## یەکەمین قۆناغی شەڕێن ئێرانیەکان (ئایار - حوزەیرانی ۱۹۳۱)

هێزەکانی ئیران لە نیوەی مانگی ئایاری سالی ۱۹۳۱ دا کە دەبینن ئیسماعیل ئاغای جەلالی پێویە شۆڕشڤانانی ئارارات کۆ بکاتەوە. لێدەبڕن ڕێگەی لێ بگرن بۆ ئەم مەبەستە دەست دەکەن بە هێرش بۆ سەر قەرە عەینی. ئیسماعیل ئاغا کە بە پێشڕەوی ئیرانیان دەزانێ، بەخۆ و جماعەتەکەیەوە پەنا وەبەر تورکیا دەبات، وئێرانیەکان ناوچەچۆڵ کراوەکە دەگرن.

لە دەوروبەری ۱۹/ ۵/ ۱۹۳۱ دا کوردە جەلالیەکان بە هاوکاری ئەو جەنگاوەرە کوردانەی کە لە تورکیاوە هاتوونە، شەبەیخون دەکەنە سەر ئوردوگای ئێرانیەکان.

بە پێی ئیعترافی کەرەم خانی سەیاحی سەرۆکی کۆمیتەی پاراستنی سنوور (سنووری ئێران و تورکیا) ئەم شەبەیخونە بۆ سوپای ئێران «مصیبەتێک» بوو لەو گوژە. لەم شەبەیخونەدا ۱۲٤۱ سەربازی ئیرانی کوژران و ۲۰۰-۳۰۰ سەبازێش زامدار بوون، لێ بەگوتەی ژێدەرێن دیپلوماسی بەریتانیا ژمارەی زەرەرو زیان سێ هەندی ئەم ژمارەیەیە.

**زیانی کورد کەمە: تەنێ حەوت کوژراو لە شەرگەکەیان دا بە جێ ماوە (کورد هەمیشە جنازەی کوژراوەکانیان دەگەڵ خۆدا دەبردنەوە)**

دوای ئەمە، سانسۆرێکی توند دەخرێتە سەر هەواڵ و ئوچەتێن ئەم شەڕە، هەر سەربازێک هەوالی شەڕ بلاو بکاتەوە دەدرێ بە دادگای جەنگی.

سەیر ئەوەیە ئێرانیەکان کە بەو جۆرە خۆیان سەخڵەت کرد و ئەو سیاسەتە توندەیان لەمەڕ کوردان گرتەبەر، پاشان کەوتنە گلەیی ئەوەی کە لەلایەنی تورکەکانەوە «هاوکاری ناکرێن» بەتایبەتی عەقید کەرەم خانی سەیاح، تورکەکان بەوە تاوانبار دەکات کە «سیاسەتی ئاشتی خوازانە»یان لەمەڕ کوردان پەیڕەو کردوە و هەر ئەم کەسە لە شەڕی سوپای ئێران دا لە ۱۹/۳/-۹/٦ گلەیی لە هەڵس و کەوت ڕەفتاری تورکان دەکات.[۳۰]

## ١٦

## قۆناغی دووەمی شەڕی (تەموزی ١٩٣١)

وێڕای ئەم قسە توند و ناخۆشانەش، هاوکاری نێوان هەر دوو سوپای تورک و ئێران بەرە دەستێنێ. لەو کاتانەدا کە سوپای تورکیا مژولی شەڕی خۆیەتی. بەپێی گوتەی سەرۆکی کۆمیتەی ئاسایشی سنوور، سوپای ئێران سێ ئەرکی لەسەرە.:

- گرتنی سنووری ئێران، بۆ ئەوەی ڕێگە لە دزەی کوردەکان بگیرێ.
- ڕاگوێزانی کوردی ناوچەی سنووری ئێران، هاتنی دەوارنشینان بۆ ناوچەی ئارارات قەدەغە دەکرێ و ئارارات دەبێ بە ناوچەیەکی چۆڵ.
- شەڕ کردن دەگەڵ ئەو کوردانەدا کە لە ناوچەکەدا دەست بە «تالآن و ڕووتکردنەوە» دەکەن.
- لە سەرەتای تەموزی ١٩٣١ دا هێزێن ئێران جارێکی دی قەرەعەینی دەگرنەوە. ئەم هێزانە لە ٤ی تەموزدا دەکەونە بەر هێرشی کوردانی ئێران و تورکیا و زیانێکی تا رادەیەک قورسیان لێدەکەوێ.

بۆ سبەینێی هەمان ڕۆژ کوردەکان خەڵکی گوندێکی ئێرانی قەتڵ و عام دەکەن، ٥٠ کەس لە خەڵکی ئەم گوندە دەکوژن و چەندین گوندی دیکەش تالآن دەکەن. ئێرانیەکان سەربازانی تورک بەوە تاوانبار دەکەن کە «جلی کوردییان لەبەر کردووە» و هاتونەتە یارمەتی کوردەکان، لەم لاشەوە تورکەکان، ڕوسیەکان تاوانبار دەکەن کە چەکیان بە کوردەکان داوە.[٣١]

## ١٧

## هاوکاری ئێران و تورکیا دژی کوردان

وێڕای گلەیی دوولایەنە، تاران و ئەنقەرە پتر لێکدی نزیک دەبنەوە، ئێرانیەکان بەو کارەی تورک قایل نین کە «تا لە توانا دابێ ژمارەیەکی زۆرتری کوردان ئاودیوی خاکی ئێران بکەن، بەو بیانووەی کە ناوچەیەکی زۆر کوێستانی نیەو لەوێندەر بە ئاسانی بەرهەق دەکرێن.»[٣٢]

بەڵام لە سەرەتای سالی ١٩٣٢ دا دوو شاندی تورک بە ڕەسمی سەردانی ئێران دەکەن، یەکێک لە شاندەکان بە سەرۆکایەتی جەلال بایاری سەرۆکی ئایندەی تورکیا دەبێت و

چەند ڕێکەوتننامەی ئابوری و دارایی دەگەڵ ئێران دا ئیمزا دەکات. شاندی دووەم بە سەرۆکایەتی تۆفیق ڕوشدی وەزیری کاروباری دەرەوە دەبێت، بەو مەبەستە دێتە ئێران کە ناوچەی ئاراراتی بچووک بەرانبەر بە هەندێ خاکی تورکیا کە بریتیە لە شەش گوندی کوردنشین، لە ئێران وەربگرێ.

ئەم مەسەلەیە بە تەدەخولی ڕاستەوخۆی ڕەزاشا حەل و فەسڵ دەبێ.[٣٣]

چەند مانگێک لەوە پێشتر واتە لە سالانی ١٩٣٠ و ١٩٣١ دا وەزیری دەرەوەی عێراق دوو سەفەری بۆ ئەنقەرە کردبوو.

لەم دیدارانەدا سەرانی تورک داوایان لە دەوڵەتی عێراق کرد کە «بۆ کۆتایی هێنان بە چالاکی و چەلەنگی یاغیان لەناوچەی بارزان، کە ژمارەیەک لە کوردی هاوولاتی تورکیا لەوێندەر جێگیر بوو بوون و ئەمن و ئاسایشی ناوچەکەیان شێواند بوو، دەست بداتە عەمەلیاتی عەسکەری»[٣٤]

**دەوڵەتی عێراق کە خوا خوای بوو «هیچ هەرایەک لە ناوچە سنووریەکاندا چێ نەبێ وکەمترین دەرفەت بە بزاڤی کورد نەدات کاری وا بکات» بە خۆشحالیەوە داوای تورکەکان قەبوڵ دەکات و بە عەمەلی دژی شێخ ئەحمەدی بارزان دەست بەکار دەبێ.**

لە نیوەی حوزەیرانی ١٩٣١ دا سەفیری ئێران لە ئەنقەرە لە «لای سەفیری بەریتانیا باسی ئەم هاوکاریەی نێوان هەرسێک دەوڵەت، کە مەسەلەی کورد بووەتە مایەی نیگەرانی و باعیسی ناکۆکی بەینی ئەوان، دێنێتە پێشەوە و گرنگی تەسلیم بوونی شێخ مەحمود دووپات دەکاتەوە.»[٣٥]

**کوردەکان، زۆر پێش ئیمزای پەیمانی سەعد ئاباد (١٩٣٧) دەرکیان بە هاوپەیمانی و یەکێتی ئەو سێ دەوڵەتە دژ بە کورد کردبو وکە بە هومێد بوون، ڕۆژێک بێت بیانکەن بە گژ یەکدی دا.**

## ١٨

## چارەسەری تورکان بۆ مەسەلەی کورد

لە ١٩٣٢/٥/٥ دا دەوڵەتی تورکیا قانونێک دەردەکات کە ڕێ بە دەوڵەت دەدات و بە تەمایە بەم تەگبیر وپیلانە سیمای کوردانەی شارەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیا بسرێتەوە. ئەمە هەمان ئەو نەخشە و پلانەیە کە دەوڵەتی تورکیا لە زەمانی دیدارە بەنێوبانگەکەی کۆمیسێری بالای بەریتانیا لە بەغدا، دەگەڵ مستەفا کەمال و توفیق ڕوشدی و لە زەمانی

دیداری سەفیری بەریتانیا لە قەستەنتەنییە لە مانگی ۱۹۲٦/۱۱ و لە مانگی ۱۹۲۷/۱ دا خەیاڵی پێوە لێدەدا.

ئەم قانوونە کە دەسەڵاتی سەران و بەگان و ئاغایان و شێخانی هۆز و تیرە و تایفە و رێکخراو و کۆمەڵەکان لەغو دەکاتەوە، رێگەی دەوڵەت دەدات کە ئەوانە بۆ باژێڕەکانی رۆژاوای وڵات رابگوێزێ، هەروەها رێی دەوڵەت دەدات « هەموو ئەو کەسانەی گومانی جاسووسیان لێدەکرێ لە ناوچە سنوورییەکان» وهەروەها هەموو ئەو کەسانەی کە «لە رۆژهەڵاتدا دەسەڵاتدارن» دووربخاتەوە.

**«بینا کردنی گەڕەک و گوندی تازە بۆ خەڵکانی غەیرە تورک زمان قەدەغەیە» هەروەها «دامەزراندنی سەندیکاو کۆمەڵە بۆ ئەم بابەتە خەڵکە» ممنوعە.**

لێ راگوێزان ودوور خستنەوەی کوردان لە راستیدا بەر لە دەرکردنی ئەم قانوونە دەستی پێکرد بوو.

لە ئەیلولی ۱۹۳۱ دا دوو هەزار کورد لە هۆزی جەلالی لەگەڵ نزیکەی ٤٠٠٠ سەر لە مەڕومالاتیان بەسەرپەرشتی یەک لیوای تورک سەرانسەری تورکیا دەبڕن و بەرەو تاراوگە دەڕۆن.

لەمە بە دواوە خەڵکی تورکیا چاویان بە دیتنی کاروانی گەورە و بچوکی کوردی راگوێزراو[۳۷] رادێت کە «زۆربەیان ژنان و منداڵانی نیمچە رووت و پێ خاوسن و بە گوند و شارۆچکە تورک نشینەکاندا رەت دەبن و یەک ریز عەرەبانەیان بە دواوەیە کە نەخۆش و کەسانی لە حاڵی مەرگ و شرە وپڕە و ناو ماڵەکانیانی تێدایە.»

ئەم خەڵکە هەر کە دەگەنە شارێکی برێک گرنگ « بۆ خەستەخانە دەبەن و لەوێندەر دەیانکوتن و گەرماو دەکەن، شەو لە نەخۆشخانەکەدا یان لە عاردی یان لەسەر چیمەنتۆی خستەکانەکە دەبەنەسەر، چونکە تەختیان نادەنێ.»[۳۸]

ئێستا کوردستان بەم خەڵکە رەش ورووتەیەوە وێرانەیەکە بۆخۆی. پێشتریش واتا لەساڵی ۱۹۳۰ دا ئەدمۆندز مۆڵەتێکی نائاسایی لە دەوڵەتی تورک وەردەگرێ و گەشتێک بە کوردستانی تورکیادا دەکات و سەردانی مەرعەش و سیڤەرک و دیاربەکر و بەتلیس و موشی کرد، بەڵام لەبەر خراپی رێگە ناتوانێ بگاتە وان، ئەویش لەم گەشتەیدا تەنیا وێرانی و کاولی دیتووە.

بەتلیس دوو رواڵەت و دیمەنێکی دڵتەزێنی هەیە... بە درێژایی نزیکەی دوو

کیلۆمەتران کەلاوە لە تەنیشت کەلاوە لە هەر دوو رەخی دۆڵەکە دا ریز بووە. ئەمە پاشماوەی شارێکە کە ٤٠٠٠٠ کەسی تێدا بووە وئێستا گوندێکە کەتەنیا ٥٠٠٠ کەسی تێدایە».

وەزع وحاڵی موش لەمەش «دڵتەزێنتره، ئەم شارە کە ٠٠٠٠ کەسی تێدابوو، ئێستا گوندێکی سێ هەزار کەسییە، و گوندێکە کاول و وێران![39] بەر لە شۆڕشی دەرسیم لە «١٩٣٧» فزە لەم وێرانانەی کوردستانی تورکیاوە نایەت.»

سەرچاوە و پەراوێزان:

١- دکتۆر شێرکۆ (جەلادەت بەدرخان) مەسەلەی کورد. ١٩٣٠

٢- ع. قاسملو ل ٥٣

٣- بەرنامەی خۆیبوون، مەسەلەی کورد، دکتۆر شێرکۆ

٤- راپۆری دەزگای هەواڵگری هێزی هەوایی پاشایەتی، عەممان، ١٩٢٨/٩/٥، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٣٧١ ١٣٠٣٧.

٥- قاسملو بەبێ ناوبردنی سەرچاوە دەڵێ پاپا زیان لە یەکەمین کۆنگرەی خۆیبووندا بەشداری کردووە. ل ٥٣

٦- دکتۆر شێرکۆ، وێنەیەکی ئەو میوانداریییەی کە بە بۆنەی کردنەوەی ئەم بەشە، پەریا کراوە (لە دیترۆیت) پیشان دەدات، ژمارەی بەشدارانی ئەم میوانداریییە ٢٤ کەسن وسێ ژنیان دەگەڵە.

٧- پەیامی تەلەگرافی کونسولی فەرەنسە لەتەورێز، لە ١٩٢٧/١٢/٥. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسە، ٣١٣- E ٣١١. ل ٢٠٠.

٨- هەمان سەرچاوە.

٩- نووسراوێک لەسەر شۆڕشی کورد، لە ٢ /١١/ ١٩٢٧، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسە ٣١٣- E ٣١١ ل ١٩٢.

١٠- رزێتا فارىز، بەرلەوەی بۆ ئارارات بڕوات دەستەیەکی دە - دوانزە کەسی ئەرمەنی بەنی بوو کە توانی بوویان لە رووبار بپەڕنەوە وخۆ بگەیەننە خاکی ئێران، لە حاڵێک دا دەیان کەس لە هەڵاتوانی ئەومەنی بە گوللەی گاردی سنووری سۆڤیەتی کوژران یان لەرووبارەکەدا خنکان.

١١- پەیامی تەلەگرافی کونسولی تەورێز لە ١٩ /٨/ ١٩٣٠ وزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١ ١٤٥٨٠.

١٢- «بزووتنەوانی شۆڕشی کوردان» نینتەر ناشنال پرس کورسپندنت، ١٩٣٠/٨/٢٨، لە کتێبی (یەکێتی سۆڤیەت و کوردەکان) ل ٢٤١ نووسینی و. هاول وەرگیراوە. کتێبەکەی جۆرج ئاغابەگوف (ئەرسی ئەهینی روس) کە لە روانگەی رێکخراوی گ. پ. ئو کوردان دەدوێنێ ناپێتە بەڵگەی

سەلماندنی رووداوی ئیوبراو، مەگەر وەختێ کە پێچەوانەی ئەم بابەتە بسەلمێت. (بڕوانە ل ١٠١ی کتێبەکەی ئاغا بەگوف).

١٣- پەیامی تەلەگرافی کونسولی فەرەنسە لە تەوریز لە ١٩٢٧/١٢/٥دا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسە ٣١٣-٣١١ E.

١٤- دکتۆر شێرکۆ، مەسەلەی کورد، هەروەها سفراستیان، کورد و کوردستان.

١٥- بڕوانە سالنامەی جوگرافیایی، داتانی شانتر، ١٨٩٣، پاریس.

١٦- حەسەن ئەرفەع، لە سەردەمی پێنج پاشایاندا، ل ١٤٨.

١٧- نامەی ١٩٢٨/٢/٢٨ی سوریا بەگ وەلامی حەسکی تللو لە کتێبی مەسەلەی کورد، نووسینی دکتۆر شێرکۆ دەرهێنراون.

١٨- هەمان کتێب.

١٩- راپۆرتی مێجەر ئولیری پاشکۆی عەسکەری بەریتانیا لە ئەنکەرا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٤٥٨ ٣٧١.

٢٠- دکتۆر شێرکۆ، هەمان کتێب.

٢١- راپۆرتی رۆژنا فاریز، لە ١٩٣٠/٧/١٦ وەزارەتی کاروباری ئینگلستان ١٤٥٨٠ ٣٧١.

٢٢- هەمان سەرچاوە، ناوبراو، دوای ئەوەی کە چەند رۆژێک لە ئاراراتدا دەمێنێتەوە روو دەکاتە رۆژاوا، بەو ئومێدەی کە تا بەتلیس بڕوات. بەلام هەرکە لەگەڵ رێنوێنەکەیدا دەگاتە کوێستانەکانی دیار دەریاچەی وان، نزیکی ئارشاس، بۆی دەردەکەوێ کەشەری قورس لە بەتلیس و موش و سامسون دا هەیە و ناتوانێ درێژە بەسەفەری خۆی بدات. سەرەنجام دەگاتەوە رەواندز.

٢٣- پەیامی تەلەگرافی ١٩٢٨/٦/٢٠ی کونسولی فەرەنسە لە تەوریز، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسە، ٣١٣- ٣١١ E.

٢٤- پەیامی تەلەگرافی کونسولی بەریتانیا لە تەوریز، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١٥٣٦٩ ٣٧١.

٢٥- راپۆرتی پاشکۆی عەسکەری بەریتانیا لە تاران، لە ١٩٣٠/٨/٢٦ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١٥٣٦٩ ٣٧١.

٢٦- ئەم زانیاریانەی کە لە ژمارەی ١٩٣٠/٨/١٣ دا لە رۆژنامەی تایمزی لەندەنی بلاو بووە، لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە بەدرۆ خرایەوە.

٢٧- پەیامی ئەستانهۆپ پالمری کونسولی بەریتانیا لە تەوریز لە ١٩٣١/٧/١٦. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١٥٣٦٩ ٣٧١.

٢٨- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣١/٤/١٧ی سەفیری بەریتانیا لە تاران، وەزارەتی کاروباری ئینگلستان، ١٥٣٦٩ ٣٧١.

٢٩- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣١/٧/١٦ی کونسولی بەریتانیا لە تەوریز، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٥٣٦٩ ٣٧١.

٣٠- چاوپێکەوتن لە ئێران بلاو کراوەتەوە، ١٩٣١/٧/١٠.

٣١- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣١/٧/١٦ی کونسولی بەریتانیا لەتەوریز.

٣٢- هەمان سەرچاوە ١٩٣١/٧/٢٣.

٣٣- حەسەن ئەرفەع، لەسەردەمی پێنج پاشایان، لە ٢٣٠-٢٣١

٣٤- پروانە نامەی ١٩٣١/٤/٣ی وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق بۆ وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ١٦٩١٦ ٣٧١.

٣٥- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣١/٦/١٧ی سێرکلارک، قەستەنتەنییە، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٥٣٦٩ ٣٧١

٣٦- لە رامبوا (PereBois) کورد و هەق، ل ٣٢-٣٣ وەرگیراوە.

٣٧- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣١/٩/٢٢ی کونسولی بەریتانیا لە تەوریز.

٣٨- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣٢/١٢/٢٠ی و: دماتیوز. ی کونسولی بەریتانیا لە مرسین، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١٦٩٨١.

٣٩- راپۆری ئەدموندز، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ١٤٥٧٩ ٣٧١.

## فەسڵی شەشەم

# دوا شۆڕشی شێخ مەحموود

شێخ مەحمود بەرزنجی پاش ئەوەی لە تەموزی ١٩٢٤ دا سلێمانی چۆڵ دەکات، لە ناوچەکانی سنووری ئێران و عێراقدا دەمێنێتەوە و بە هەمان شێوەی جاران حوکمداری ئەو هۆز و تیرانەی ئەو ناوە دەکات. هەر چەندە دەوڵەتی عێراق زۆری هەوڵ دا کاری شێخ مەحمود یەک لایی بکاتەوە، بەڵام ئەم ئاواتەی وا زوو نایەتە دی و پاش حەوت ساڵان واتە لە ساڵی ١٩٣١ دا و دوای (دوا شۆڕشی) شێخ مەحمود ئەوجا دەتوانێ بە تەواوەتی شێخ لە مەیدانی سیاسەت وەدەرنێ.

## ١

## شەڕی ١٩٢٥

یەکەم شەڕی دەوڵەتی عێراق لەگەڵ شێخ مەحموددا لە هاوینی ١٩٢٥ دا روو دەدات، واتە یەک ساڵ پاش سەرلەنوێ گرتنەوەی سلێمانی روو دەدات.

لە هەیڤی حوزەیراندا قوەتێکی سوپای عێراق بە مەبەستی لێدانی شێخ مەحمود بۆ هەڵەبجە دەڕوات، بەو ئومێدەی کە ئێرانیەکانیش لەو دیو سنورەوە هێرشی بکەنە سەر.

بەڵام چ هەواڵێک لە قوەتی ئێرانیەوە نایێ و شێخ پەنا بۆ مەحمود خانی دزلی و مەحمود خانی کانی سانانی، سەرانی تیرەکانی هەورامان و مەریوان دەبات.

کە ساڵار ئەلدەولەی شازادەی قاجار دەیەوێ کوردستان دژی رەزا شا هان بدات، شێخیش دەگەڵ ئەواندا (دەگەڵ مەحمود خانی دزلی و مەحمود خانی کانی سانانی) دا بەشداری ئەم هەوڵ و کۆششە دەکات.[1]

## ٢

## شەڕەکانی ١٩٢٦

دوای ساڵێک هەمان سیناریۆ دووبارە دەبێتەوە، قوەتێکی دیکە بۆ پەلاماردانی شێخ مەحمود ساز دەکرێ. شێخ مەحمود بە هاوکاری هەندێ کوردی ئێرانی پەلاماری قوەتەکەی عێراق دەدات، بەڵام دەرەقەت نایەت.

ئەوجا فرۆکەوانێکی ئینگلیزی و ئەندازیارەکەی بەدیل دەگرێ، ئەم دووانە چەندین

مانگ بە دیلی دەمێننەوە، بەڵام ماوەی دیلیەتییەکەیان زۆر خۆش دەبێت، چونکە شێخ مەحمود تەنانەت کابرای فرۆکەوانی ئینگلیزیش دەگەڵ خۆیدا بۆ راو شکار دەبات.[2]

ئەمجارە دەوڵەتی ئێران بە دەنگ دوو داوای عێراقیەکانەوە دێت، بەڵام بەدبەختی یەخانگیری دەبێ، چونکە ئەم هاوکارییە دەبێت بە سوکە کارەساتێک لە ٣ی ئەیلولی ١٩٢٦ دا قوەتێکی ئێرانی (٣٠٠ سەربازی پیادە و ٢٠٠) سوارە هێرش دەکەنەسەر پشتەرییەکانی قەڵادزێی عێراق، دوای شەڕێکی چەند سەعاتی ئێرانیەکان دەشکێن و نزیکەی دوو سەد کوژراو لە مەیدانی شەڕەکەدا بەجێ دێڵن و کوردەکان کۆمەڵێک دیل و تۆپێکی ئێرانی لەگەڵ خۆدا بۆ عێراق دەبەنەوە.

## ٣
## گفتوگۆ دەگەڵ کورنوالیس دا (١٩٢٦/١٠/٩)

شێخ مەحمود وێڕای ئەم سەرکەوتنە، زۆر بە توندی لەلایەن هێزی هەوایی بەریتانیاوە پەلامــار دەدرێ و نارەحــەت دەکــرێ. لە هەیڤی ١٩٢٦/١٠ دا قــایل دەبێ دەگــەڵ کورنوالیــسی کۆمیســەری باڵای بەریتانیا لە بەغدا دیدار بکات.

ئەم دیدارە لە ٩/ ١٩٢٦/١٠ دا لە شارۆچکەی خورماڵی ژێر دەسەڵاتی عێراق و بە شێوەیەکی دلێرانەی پڕ لە خۆ نواندن ئەنجامدەدرێ، دیدارەکە لە دەشتێکی ئازادی بەرین دا ئەنجام دەدرێ: هەر یەک لە دوو لایەنی گفتوگۆ کە بە سکۆرتی تایبەتی خۆیەوە دەگاتە جێ.

کورنوالیس بە هاوڕێیەتی ئەحمەد بەرزنجی یەکەمین سەد مەتری نێوان هەردوو لا دەبڕێ، شێخ مەحمود کە دەگەڵ سکورتەکەی خۆیدا لەدووری چوار سەد مەتری وەستاوە، بە هاوڕێیەتی فرۆکەوانە دیلەکەی بەریتانیا کە هێناوییە تەسلیم بە کورنوالیسی بکاتەوە، دێتە پێشێ، ئەوجا بەتەنێ بە جێیان دێڵن. ئەم دووانە پشتێنێکی کوردی رادەخەن و لەسەری دادەنیشن و بۆ ماوەی دوو سەعاتان لەسایەی چاودێری پاسەوانە تایبەتیەکانی خۆیان دا گفتوگۆ دەکەن.

کورنوالیس، بەناوی کومیسێری باڵاوە پێشنیاز بۆ شێخ مەحمود دەکات کە لە ئێراندا، لە شوێنێک کە دیاری دەکرێ، دانیشێت و بەروبومی موڵکەکانی عێراقی وەربگرێ، بەکورتی بە تەسلیم و نەفی قایل بێ.

شێخ مەحمود ئامادە نیە گوێی لە پێشنیازێک بێت کە بەبۆچوونی ئەو لە حوکمی نەفی

هەمیشەیی دایە. رای دەگەیەنێ کە چارەنووسی ئەو بایەخێکی ئەوتۆ نییە، بەڵام ئەوێک کە ژیانی خۆی بۆ خزمەتی کورد تەرخان کردووە، ناتوانێ بچێتە ژێر باری بەبادا دانی ئاوات و ئارمانجی گەلی کورد.

هەر بەو سادەیی و ساکارییەوە، کە تا کۆتایی دەربارەی مەبەست و نیازێن بەریتانیا لە لای مابەوە، بە کورنوالیس دەڵێ «هەموو کوردستانی ئێران بۆ بەریتانیا دەگرێ و خۆی وەکو نوالیس» بە ناوی بەریتانیاوە حوکمداری بکات، بەو مەرجەی دەوڵەتی بەریتانیا «ژێراو ژێر پشتیوانی لێ بکات.»[3]

کورنوالیس پێشنیاز دەکات شێخ مەحموود بروات بۆ بەغدا، بەڵام بێهودە. شێخ مەحموود پێشنیاز دەکات کە رێی بدەن لە پێنجوێن بێنێتەوە، بەڵام بێ نەتیجە.

کورنوالیس پێشنیاز دەکات لەناو خورماڵ دا دیدار بکەن. بەڵام شێخ مەحموود قایل نابێ، ئەوجا لێکدی جیا دەبنەوە، تەنانەت بۆ سبەینێ شێخ مەحموود ئامادە نابێ لە ناو کۆمەڵێک عەرەبدا دیدار دەگەڵ کورنوالیس دا بکات.

پاش ئاگربەستێکی یەک هەفتەیی، شەر دەست پێدەکاتەوە و هێرشی هێزی ئاسمانی بەریتانیا، شێخ مەحموود ناچار دەکات پەنا وەبەر ئێران بەرێ، لەوێندەرەوە بەردەوام دەبێت لەسەر شەری پارتیزانی دژی هێزەکانی عێراق.

لەساڵی ۱۹۲۷ دا دەکەوێتە گفتوگۆ دەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا و هەوڵ دەدات مۆڵکەکانی وەربگرێتەوە.

لەباری سیاییەوە، ئەم ناسیونالیستە کوردە توندرەوە، ئەبدی نوێتەری چ شتێک نییە، لێ لەباری بۆچوونی سیاسییەوە هەڵگر و پارێزەری بیرێکە کە زۆر کەس بەخەون و خەیاڵی دەزانێ: ئەو بیرە سەربەخۆیی کوردستانە، کە هەموو ئەو ئاوەدان و پیاوماقوڵانەی کورد کە لە ساڵی ۱۹۲۱ دا بە گوشاری ئینگلیز و بە تۆزی و بە دەر لە ویستی خۆیان لکێنران بەعێراقەوە و کران بە عێراقی، ئێستا پەیرەوی ئەو بیرە دەکەن.

ئەم ژمارەیە کە لە رەفتاری فەیسەڵ نومێد بڕ دەبن، گێر دەگۆڕێن و با دەدەنەوە، ئەبدی لە ساڵانی ۱۹۲٦-۱۹۲۷ دا سەرتاسەری کوردستانی عێراق دەهاڕوێنێ و دەبێ بە بنکەی جۆش و خرۆشی نەتەوەیی.

## پەرەسەندنی «کۆمەڵەیێن کوردی» لە کوردستانی عێراقدا (١٩٢٦-١٩٢٧)

هەموو چین و توێژەکانی کوردەواری دێنە سەر ئەو قەناعەت و باوەڕەی کە «حکومەتی وەزیران و کارگێڕانی عەرەبی پشت بەستوو بە هێزی سوپایی عەرەب، لەوەی پتر تەحەمول ناکرێ و قەبوڵ ناکرێ.»

تاک و تەرایەک هەن کە بە بەڵێنەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٢٦، یان جێبەجێ کردنی نیوە و نیوەچڵی ئەم بەڵێنە لەمەڕ بەکارهێنانی زمانی کوردی وەکو زمانی رەسمی کوردستانی عێراق، خۆشحاڵ و دڵخۆش بن.

ئەو «کۆمەڵە کوردی» یانەی لەم رۆژگارەدا دێنە ئاراوە، لە بنەڕەتدا کۆمەڵی روشنبری و نەتەوەیین.

لە بەهاری ساڵی ١٩٢٦ رەفیق ئەفەندی و رەمزی ئەفەندی و فایق بەگ و مەعروف بەگ «کۆمەڵەی زانستی کوردستانە (یان ئەنجومەنی ئەدەبیاتی کوردستان) لە سلێمانی دادەمەزرێنن. کە ئامانجی چاککردنی ئاستی فێر بوون و خوێنەواری «میللەتی کورد» کە بە بۆچوونی دامەزرێنەرەکانی یەکەمین مەرجی خەباتە بۆ وەدەست هێنانی سەربەخۆیی، زۆر بەرێک و پێکی قوتابخانەی شەوانە دەکرێتەوە و سەرکەوتووانە کۆڕو کۆبوونەوان ساز دەدەن.

بەلام هەر زوو ژمارەیەک لە ئەندامانی کۆمەڵەکە، لەگەڵ جەمال بەگی جێگری سەرۆکی کۆمەڵەدا دێنە سەر ئەوەی کە رەوتێکی سیاسیش بەکۆمەڵە بدەن.

هەر لەو سەروبەندەدا مستەفا پاشا بۆ مەسەلەی هەڵبژاردن (هاوینی ١٩٢٦) بۆ سلێمانی دەگەڕێتەوە و رای دەگەیەنێ کە ئەگەر بە نوێنەر (نائب) هەڵبژێردرێ، نوێنەرانی کورد لە یەک حیزب دا کۆ دەکاتەوە.

تەنها لە رەواندزدا هەوڵ دەدات ئەنجومەنێکی ئەدەبی «هۆگر» (Hogir) بە مەبەستی «پەرەپێدانی زمانی کوردی و ئاشنا بوون بە مێژوو ریشەی کورد» دابمەزرێنێ، بەلام لایەنی سیاسی ئەخشەکەی هەر لەسەرەتاوە هێندە زاڵ دەبێت کە دەوڵەت رێگەی نادات.

بەلام هەر موسڵ دەکاتە چوار ریانی کوردستان و مەڵبەندی پەیوەندی نێوان کوردێن تورکیا و ئێران و عێراق.

لە ساڵی ١٩٢٦ دا ئینگلیزەکان، ئەنجومەنێکی نهێنی بەنێوی «پێشکەوتن» کە

پەیوەندی نێوان هەموو ئەو کەسانەی دابین دەکرد، کەشف دەکەن و هەڵی دەوەشێنەوە، بەڵام زۆری پێناچێت کە ڕێکخراوێکی دیکە سەربەرز دەکاتەوە.

لە کەرکوک و هەولێریش دا کۆمەڵەی نهێنی هەبوون و شێخ مەحمود پەیوەندی بە هەموویانەوە هەبوو.

**سەرتەمەتێکی فرۆکەوانی لەم بارەوە نیگەرانی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ وەهەر هەموو کورد، فەرمانبەری دەوڵەتی و عەشایەر و خەڵکی شار، بەرە بەرە بیر لەسەربەخۆیی دەکەنەوە.ئەگەر دەستکەوتی پتریان وێنەدرێ، دوور نییە وەکو ئیرلەندا حیزبێکی کوردی وسەربەخۆ خوازی ناوخۆیی دابەزرێ و هەنگێنێ دەوڵەتی عێراق لەناو چوار دیوار و ماڵەکەی خۆیدا ڕووبەرووی دژمن دەبێتەوە.[٥]**

## ٥

## ڕاپەڕین و شۆڕشێن سلێمانی (١٩٣٠/٩/٦)

بەریتانیای مەزن لە شوباتی ١٩٢٩ دا لیبرا کە دەست لە زیرەڤانی عێراق هەڵگرێ و سەربەخۆیی بداتێ، هەروەها گفتوگۆ دەربارەی پەیمانێکی تازە کە قرێر بوو لە هەیڤی ٦/ ١٩٣٠ دا ئیمزا بکرێ، کردیانە کارێک کە زنجیرە هەڵچوون و نارەزاییەکی نەتەوەیی چێ ببێ و لە شۆڕشەکانی ئەیلولی ١٩٣٠ دا گەیشتنە لوتکە.

کوردێن میانەڕەو، رازی بوون بەوەی ئیدارەیەکی کوردی هەبێ و لە ڕێگەی کومیسێری باڵای بەریتانیاوە[٦] بە دەوڵەتی ناوەندی عێراقەوە پەیوەست بێ، ئەم رازی بوونەیان لەبەر ئەمە بوو، کە ئەرخایەن بوون لەوەی هاوکات لەگەڵ جێبەجێ کردنی بڕیاری هەیڤی دوانزدەی کۆمەڵەی نەتەوەکان دا، کە هەر کاتێ سایەداری بەریتانیا لەسەر عێراق نەما، ئەوا (کورد) سەربەخۆیی خۆیان وەردەگرن.[٧]

بەڵام دەوڵەتانی بەریتانیا و عێراق وایان بیر نەدەکردەوە، بە پێچەوانەوە بۆ ئەوەی ڕێ بۆ سەربەخۆیی بکەنەوە، مەسەلەی هەڵبژاردنی ئەنجومەن دێننە گۆڕێ.

لە مانگی شوبات بەملاوە کۆمەڵەیەکی تازە بەنێوی (خێڵی یەکێتییمن کوردان -yeke Kehli kar tyen) هەندێ بەیاننامەی دژ بە (سیاسەتی زۆرداری) بەریتانیای مەزن بڵاو دەکەنەوە.

**بە پشتیوانی کەم تا زۆری ڕەسمی توفیق وەهبی پارێزگاری شاری سلێمانی لە دژایەتی کردنی هەڵبژاردن، کەسایەتیەکانی سلێمانی لە ٢٨/ تەموز، و لە ٢٦ و لە**

**۱۹۳۰/۸/۳۰ دا چەندین داواکاری بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان دەنێرن و داوا دەکەن کەدەوڵەتێکی کوردی بەسەرپەرشتی کۆمەڵەی ئێوبراو بێتە دامەزراندن.**

دیداری غازی جێنشینی عێراق، دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی خۆپیشاندانی دژمنانە، لە ۸/۳ دا شاندێکی عێراقی سوکایەتی پێدەکرێ، وەکو نوری سەعیدی سەرەک وەزیران دەڵێ، خواستەکانی کورد بەلەز پەرە دەستێنێ.

لەسەرەتادا داوای ئەوە دەکەن هەندێ زەمانەت لەنێو پەیمانەکەدا دابین بکرێ، پاشان نارەزایی خۆیان لەمەڕ دام و دەزگای سەردەم دەردەبڕن، پاشتر خوازیاری «نیمچە ئۆتۆنۆمییەک» دەبن، و ئێستاش، باس باسی «جیابوونەوە» یە.[9]

لە شەشی ئەیلول ۱۹۳۰ دا وەزعەکە دەقلیشێتەوە.

لەم هەلومەرجە ناڵەبار و نا ئاساییەدا سوپای عێراق دەستڕێژ لە خۆپیشاندەران دەکەن و دەیان کەس دەکوژرێن.

دەوڵەتی عێراق، توفیق وەهبی پارێزگاری سلێمانی لەسەر کار لا دەبات و هەر هەموو ئیمزا کەرانی داخوازییەکان بە تۆمەتی هەڵگیرساندنی راپەڕین و شۆڕش دەگرێ.

دەوڵەتی بەریتانیا زیاتر لەمە نیگەران و نارەحەتە کە قەواڵە و بەڵگەیەک ی لە دەست دا نیە ئەوە بسەلمێنێ کە ئەم کەسایەتیانە بەلای کەمەوە لە کاتی گرتنیان دا دەستیان لە هەڵگیرساندنی ئەم ئاژاوانەدا هەبووە، گرتنی ئەم خەڵکانە لە کاتێکدا کە ئەنجومەنی کۆمەڵی نەتەوەکان بەتەمایە لە داخوازییەکانیان بکۆڵێتەوە، ئەرکی ئەو دژوارتر و قورستر دەکات.

## ٦
## شۆڕشی شێخ مەحمود لەمانگی ۱۹۳۰/۱۱ دا

شێخ مەحمود بەباشترین شێوە ئەم وەزع و حاڵە دەقۆزێتەوە، دە رۆژێک پاش راپەڕینەکانی سلێمانی نامەیەکی نارەزایی دەرهەق بە «خوێن رێژانی بێ وێنەی عەرەب لە سلێمانی» بۆ کومیسێری باڵای بەریتانیا لە بەغدا، دەنووسێت ولە نامەکەدا بەراشکاوی ئەوە نیشان دەدات کە پێویستە ئێستا کومیسێری باڵا ئەوەی بۆ روون بووبێتەوەکە «چیتر عەرەب و کورد ناتوانن پێکەوە بژین»

شێخ مەحمود داخی ئەوە دەخوات کەکوردان ئینگلیز بەدۆست دەزانن، لە کاتێک دا «

که ئینگلیز جگە لە گیروگرفت چ خێرێکیان بۆ کورد نەبووە» و خێروبێری هەر بۆ عەرەبان بووە، لەو نامەیەدا و بە ناوی ئەم میللەتە ئاریاییەوە داوا دەکات، « لەکۆتی حکومەتی عەرەبان ئازاد بین و لەعەرەب جیا بینەوە، و بخرێتە سایەی زێرەڤانی بەریتانیاوە»[10]

پاشان لە سەرەتای مانگی ۱۰/ ۱۹۳۰ دا لە بواری عەرز و حاڵ نووسیندا جۆرە خەباتێک رێک دەخات. لە یەکێک لەو یادداشتانەدا سی و دوو کەس لەسەرانی تیرە کوردەکان دلوا دەکەن دام و دەزگایەکی ئیداری سەربەخۆی کوردی لەسایەی زێرەڤانی بەریتانیای مەزن دا دابمەزرێ» و شێخ مەحمود بکرێ بە حوکمرانی هەموو کوردستان، لە یاداشتێکی دیکەدا، ئیمزا کەران لە پاڵ دەربڕینی نارەزایی بەرانبەر بەو «ستەم و بێدادییەی کەحکومەتی عەرەب لێیان دەکات» داوای دامەزراندنی دام و دەزگایەکی ئیداری سەربەخۆ دەکەن و دەڵێن کە جگە لە شێخ مەحمود چ کەسێکی دی بە حوکمداری کوردستان نازانن.

لە مانگی ۱۱/ ۱۹۳۰ دا شێخ مەحمود دەست بە کار دەبێت و راستەوخۆ دێتە مەیدان، هەڵبەتە بە ئومێدە کە بەم هێزە نواندنە کار لە کۆمەڵەی نەتەوەکان بکات. هیچ ئاشکرا نیە ئایا ئەو شەڕانەی لە ناوچەی ئارارات دا،، لە ئارادا بوون، دەوریان لەم بڕیاردانەی ئەودا هەبووە یان نا؟ بەڵام شێخ بەخۆی لەبۆیەرەکانی ئەو دیوی سنوور بێ ئاگا نەبوو. لە نامەیەکیدا بۆ کۆمیسیێری باڵای بەریتانیا لە بەغدا، ئاماژە بە «هیوای کوردانی هاوسێی ئێمە کە دووچاری بێ هیوایی بووە» دەکات.[11]

ئەگەر شێخ مەحمود بەخۆیشی بە پێی ئەخشە و بەرنامەیەکی دارێژراو شۆڕشی خۆی دەگەڵ شۆڕشی کوردێن تورکیا و ئێران هاو زەمان نەکردبێ، وەکو لە گوتەکانی سەفیری ئێران دا بە دیار دەکەوێ ئەوا دژمنەکانی قەناعەتیان وایە کە بێگومان جۆرە پەیوەندیەک لە نێوانیان هەبووە. سەفیری ئێران لە حوزەیرانی ۱۹۳۱ دا لە قسەستەنتەنییە و لەلای سەفیری بەریتانیا باسی تەسلیم بوونی شێخ مەحمود وەک هەواڵێکی «یەکجار گرنگ» دەکات.[12]

شێخ مەحمود هەوڵی دابوو کە شێخ ئەحمەدی بارزان یارمەتی بدات، بەڵام هەوڵەکەی سەرناگرێ.

شێخ ئەحمەد لە هەمان کاتدا کە دەیگوت «شانازی بە خزمەتکردنی ئەوەوە دەکات» خۆی لە شەڕی حکومەتی عێراقیش دزییەوە «چونکە حکومەتی عێراق، حکومەتێکی

عەرەبی و عێراقییە، ئەرکی موسوڵمانەتی من وا حوکم دەکات کە گوێڕایەڵی بکەمە.[١٣]

لە ٣٠/١٠/١٩٣٠ دا چەکدارانی شێخ مەحمود لە دووری پازدە کیلۆمەتری سلێمانی دا جەندرمەیەک دەکوژن و لە ١١/٣ دا قوەتێکی سێ سەد نەفەری پەلاماری پێنجوین دەدەن و بە شێک لە شار دەگرن. مەخفەری شار چل پۆلیسی تیا دەبێ و ئەمانە لە شوێنی خۆیانەوە بەرگری و بەرەڤانی دەکەن. جا بۆ پشتیوانی ئەم پۆلیسانەو بەردەوام بوونیان لە . . مقاومەت هێزی هەوایی پاشایەتی (بەریتانیا) دەورووبەری شار بۆردومان دەکات.

بەڵام کاردانەوەی دەسەڵاتداران ناساییە. چونکە بە دڵتەنگییەوە چاوەنۆڕی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکانن. کە ڤرێرە لەو یادداشتنامە و عەرزو حاڵانە بکۆڵێتەوە کە کوردەکان بۆیان ناردووە.

کۆمیسێری باڵای بەریتانیا لە بەغدا، داوا لە دەوڵەتی بەریتانیا دەکات کە هەر کاتێ ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان «عصبەتولئومەم» لەسەر داوای کوردەکان رازی بوو، ئەوا پێشوەختە ئاگاداری بکەنەوە تا بزانن چ بکات و چ نەکات.[١٤] بەڵام دەوڵەتی بەریتانیا لە ٣٠/١١/١٩٣٠ دا راپۆری کۆمیتەی هەمیشەیی پارێزڤانی کۆمەڵەی نەتەوەکان، بەرلەوەی بە رەسمی بڵاو بێتەو وەردەگرێ.

**داوای سەران و پیاو ماقوڵانی کورد لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بەسەرپەرشتی و چاودێری کۆمەڵەی نەتەوەکان و بە راسپاردە و پشتیوانی دەوڵەتی خاوەن شکۆی پاشای ئینگلستان» رەت کرایەوە.[١٥]**

## ٧

## دوا شەڕی دژ بە شێخ مەحمود

دەسەڵاتدارانی عێراقی ئیدی ترس و خەمیان نەما، دەم ودەست شەڕ دژی شێخ مەحمود دەست پێدەکاتەوە.

لە سەرەتای شوباتی ١٩٣١ شێخ مەحمود یەکەمین نامە بۆ کاپتن هۆڵتی سکرتێری بەشی رۆژهەڵاتی کومیسێری باڵای بەریتانیا لە بەغدا دەنێرێ و داوای لێ دەکات بە ئیازانجی ئەو «شێخ» بکەوێتە نێوانەوە، بەڵام لە راستیدا پاش شەڕی ئاوباریکی (٥/٤/١٩٣١) سەر بە شارۆچکەی کفری تێدەگات هەوڵەکانی بێهودەیە. لەم شەڕەدا دەرسێکی قورس بە لایەنگرانی شێخ مەحمود دەدرێ.

پاش ئەم شەڕە، شێخ خۆی بەناو خاکی ئێراندا دەکات و لە ڕۆژهەڵاتی پێنجوین دا دەحەوێتەوە. لە ١٩٣١/٤/٢٤ دا نامەیەکی دی بۆ کومیسێری باڵای بەریتانیا دەنووسێت و داوای لێدەکات کە نوێنەری بنێرێ بۆ گفتوگۆ لەمەڕ هەلومەرجی تەسلیم بوونی وی «شێخ».

ئامادەیی هێزێن ئێرانی بۆ وەدەنگەوە هاتنی دەوڵەتی عێراق لە سەرەتاکانی هەیڤی ١٩٣١/٥ دا لە مەریوان، قەناعەت لەلای شێخ دورست دەکات کە خەباتی بێهودەیە وچ ئومێدێکی لێناکرێ.

شێخ پاش ٥ ڕۆژ گفتوگۆ لەگەڵ کاپتن هۆڵت دا لە پێنجوین بەوە قایل دەبێ کە خۆی تەسلیم بکات (١٩٣١/٥/١٢) و لە هەر شوێنێ کە حکومەتی عێراقی دیاری بکات، بژی بە مەرجێ موچە و خەرجی تەواوی بدرێتێ بۆ دابین کردنی پێویستیەکانی.

دەگەڵ ژمارەیەک سوارە وپۆلیس دا دێت بۆ سلێمانی و لە ٥/١٥ دا بە فڕۆکە بۆ ئور دەبرێ، بۆماوەیەکی کاتی لە میوانخانەی هێڵی ئاسنی عێراق دا دەمێنێتەوە و پاشان بۆ ناسریە دەنێردرێ.

دوا هەوڵ و خەباتی شێخ مەحمود گاڵتەی پێدەکرا. کومیسێری باڵا لە ڕاپۆرتێکی دا لە مەڕ تەسلیم بوونی شێخ مەحمود چەندین جار ئاماژە بەو شەڕە سەختانە دەکات کەدژی ئەو کراوە، لەسەری دەڕوات کەسەرکەوتنی ئەم شەڕانە دەگەڕێتەوە بۆ «ئەو هەوڵ و توانا» نائاساییەی کەلە پشتی ئەم شەڕانەوە بووە.[١٦]

بەمجۆرە ژیانی سیاسی «پاشای کوردستان» تەواو دەبێ. شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩٤٠ دا بۆ ئەوەی بێتەوە ناو مەیدانی سیاسەت، دوا هەوڵی خۆی دەدات جابەو ئومێدەی کە بتوانێ سوود لە هەڵگیرسانی دووەم جەنگی جیهان وەربگرێ و دەورێکی وەکو ئەوەی پاش یەکەم جەنگی جیهان لە ناوچەکەد بدینێ. لە شوباتی ١٩٤٠ دا ڕۆژێک لە بەغدا چاوی بە ئەدمونز لە نووسینگەی کارەکەیدا دەکەوێ وپاش ئەوەی کە دەڵێ «ئیدی پیر بووە، تەنیا ئەوەندەی دەوێ بە ئاسوودەیی لە ماڵی خۆیدا بژی» داوای مۆڵەت دەکات کە بۆ سلێمانی بگەڕێتەوە. لە پاڵ ئەمەوە بە موبالەغەیەکی زۆرەوە دەکەوێتە باسی چالاکی گروپێک لەو کوردانەی کە بە ئازانجی سۆڤیەت کار دەکەن. بەتایبەی ئاماژە بۆ بوونی «کومەڵەی سۆڤیەت خواز» لە سلێمانی دەکات کە لە هەوڵی پەیوەندی کردندایە بە ڕوسەکانەوە.

بەڵام ئینگلیزەکان بۆ دامرکاندنەوە و پوچەڵکردنەوەی چالاکییەتین خەیاڵی یان ڕاستی سۆڤیەتییەکان لە عێراقدا، چ پێویستیەکیان بە شێخ مەحمود نەبوو، شێخ بە یەکجارەکی مالاوایی لەم خەیاڵ پلاوانە دەکرد. شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩٥٦ داو دوو ساڵ بەر لە رووخانی پاشایەتی ماڵباتی هاشمی، کە زۆر رقی لەپاشای بێنەوای کوردستان بوو مرد.

ئەمڕۆکە هەندێ کورد هەیە دەیانەوێ کە بایەخێکی ئەوتۆ بە شێخ مەحمود نەدەن و بە چاوی «پیاوی بەریتانیا» تەماشای بکەن بە چاوی کەسێک کە هەندێ جار تراژیدی و هەندێ جار کومیدی دەنوێنێ.

**بەڵام شێخ مەحمود لە ڕاستیدا «عەزابی ویژدانی» ئینگلیزانە لەمەر بارەگای مێژوودا، بەبێ بوونی ئەو، بەبێ مقاومەتی سەرسەختانەی ئەو، عێراق کوردستانی بەخۆوە دەلکاند. بێ ئەوەی ئەمڕۆ چ کەسێک ئاگای لە مێژووی دووروودرێژی ئەو «بێ بەڵێنی و خۆ دزینەوە» یەک لە دوای یەکانە بێ کە لە تایبەتمەندییەکانی مێژووی لە دایک بوونی عێراقە.**

**سەرچاوە و پەراوێزان:**

١- بڕوانە کتێبی لەسەردەمی پێنج پاشایاندا. نووسینی حەسەن ئەرفەع ل ٦٤-٦٥.

٢- بڕوانە نووسراوی گلادوین وب-ی سکرتێری سێیەمی سەفارەت لە تاران ١٩٢٦/٧/١١. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١١١٤٩١ ٣٧١

٣- نووسراوی ١٤/ ١٠/ ١٩٢٦ی وەزارەتی دەرەوە، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١١٤٩١ ٣٧١

٤- ڕاپۆرتی ١٩٢٦/٧/٢٠ی وەزارەتی دەرەوە، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١١٤٩١ ٣٧١.

٥- ڕاپۆرتی ئیرکمودور دەربارەی شۆڕشی کورد، ١٩٢٧/٣، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١٢٢٥٥ ٣٧١.

٦- هەمان سەرچاوە.

٧- کۆمەڵەی نەتەوەکان، بەریتانیای مەزنی ڕاسپارد بوو کە کارێک بۆ دابینکردنی بەشداری خەڵکی لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیاندا، بەتایبەتی « سوود وەرگرتن لە فەرمانبەری کورد لە دایەرەکان و لە دادگاکان و قوتابخانەکاندا و بەکارهێنانی زمانی کوردی وەکو زمانێکی ڕەسمی لە دەزگا دەوڵەتییەکاندا» بکات، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٤٥٣ ٣٧١.

٨- عیسمەت شەریف وانلی، کوردستانی عێراق، مەسەلەی کورد. ل ٧١

٩- نامەی ١٨/ ١٠/ ١٩٣٠ی سەرەک وەزیری عێراق بۆ سکرتێری سیاسی کونسولی بالای بەریتانیا

لەبەغدا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ۳۷۱ ۱٤٥۲۳.

۱۰- نامەی ۱۷/۹/ ۱۹۳۰ بۆ کونسولی بالاّی بەریتانیا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ۳۷۱ ۱٤٥۲۳.

۱۱- هەمان سەرچاوە.

۱۲- سێرکلارک، ۱۷/٦/ ۱۹۳۱، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ۳۷۱ ۱٥۳٦۹.

۱۳- الىریفکانی، حەقیقەتەکان ل ٤٠، لە جوریدەوە وەرگیراوە، بزوانە شۆڕشی کورد نەتەوەی کورد، خولستەکان و پەرمەندنی، نامەیەکە دراوە بە زانکۆی سیراکوز، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ۱۹٦۰.

۱٤- پەیامی تەلەگرافی ۱۳/۱۲/ ۱۹۳۰ وەزارتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ۳۷۱ ۱٤٥۲۳.

۱٥- نامەی ۳/۲/۱۹۳۱ی کورنوالیس بۆ جەمیل المدفعی.

۱٦- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ۳۷۱ ۱٥۱۳۲.

## فەسلی حەوتەم

## شێخ ئەحمەدی بارزان

شێخانی بارزان کە ڕەقیبانی دەستکورت و هەژاری شێخانی شەمدینانی سەدەی نۆزدەمن، تا یەکەمین شۆڕشی شێخ عەبدولسەلامی دووەم (١٩٠٩)، کە سەرەنجام لە سەرەتاکانی سالی ١٩١٤ دا تورکان لە سێدارەیان دا، ڕۆلی بەراستی سیاسیان نەبوو.

شێخ ئەحمەد، برای شێخ عەبدولسەلام و جێ نشینی ئەو بوو، چ ناوێکی لە نێو ناوان دا نەبوو تا کوژرانی دو ئەفسەری ئینگلیزی لە شۆڕشی هەیقی ١١ بادینان دا، هەنگینێ نا وی کەوتە سەر زاران، کە لەپڕ بوو بە قوربانی دەسیسەیەکی ئینگلیزی - عێراقی کە لە ژێر پەردەی سەرکوتکردنی بیدعەتەکانی بابایەکی هارۆژاوی مەزەبی دا، زنجیرە هێرشێک دەکرێتە سەرخۆی و براکانی، کە سەرەنجام بووە مایەی دوور خستنەوەو نەفی کردنیان لە سالی ١٩٣٤ دا.

هەلبەتە ئەمڕۆکە هەلسەنگاندن و حوکمدان لەسەر (دەروستی ئاینی) برایەکەی مەلا مستەفا بارزانی کارێکی زۆر ئەستەم و دژوارە، ئەو بەوە تاوانبار بوو کە بانگەشەی بۆ ئاینێکی تازە دەکرد یان هەلگەڕا بووە و بوو بوو بە دیان. ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە حەرام کردنی تەقلیدی خواردنی گۆشتی بەرازی هەلگرتبوو. (!)

ڕەنگە هۆی هەرە بەهێزی ئەم کارە ئەمە بووبێ کە وەکو باب و باپیرانی لە رادەبەدەر جێی ڕێز وحورمەتی موریدەکانی بووە و تەنانەت ئەگەری ئەوەش هەیە کە خۆی وەکو «تەجەلییەکی خودا» ناساندبێ.[1]

بەلام هۆکار وفاکتەرێن «شۆڕشی» شێخ ئەحمەدی بارزانیش هۆکار و فاکتەری سیاسین، و دەسەلاتدارانی عێراق و ئینگلیز پەردەی بێ دەنگی بەسەر ئەم ڕووداو و بوبەرەدا دەدەن. [١]

### سەرچەلەنامەی شێخانی بارزان

شێخ ئەحمەدی بارزان لە سالی ١٩٢٧ دا دەگەل دەسەلاتدارانی بەغدا، بۆ یەکەمین جار بە گیروگرفتەکانی خۆی دەزانێ، هەروەها هەر لەم سەروبەندەدا دەسەلاتدارانی بەغدا بۆ یەکەمجار باسی کارە بدعەتەکانی ئەو دێننە ناو ناوان و دەلێن کە شێخ ئەحمەد ئیدیعای

خوایەتی دەکات. [٣]

لێ سەیر لەوەدایە کە شێخیش لەم سەروبەندەدا لە خولیای ئەوە دایە کە دەسەلات و حوکمی خۆی لەرۆژهەلاتی رووکوچک دا، واتە لەو دەڤەرەدا کە دەسەلاتدارانی بەغدا بە قەڵەمڕەوی ئەوی ناو دەبەن، پەرە پێ بدات.(٢)

کومیسێری بالای بەریتانیا هێزێکی چریکی بە فەرماندەی ئەفسەرانی ئینگلیزی ناردە سەر شێخ ئەحمەد، بەلام کەس نازانێ ئەم هێزەی بۆچی ناردە شەری شێخ، ئایا بەو مەبەستە بوو کە بیهێننەوە سەر «ڕێگەی‌ەی راستی ئیسلام، یان بەمەبەستی سەرکوتکردنی داوا سیاسیەکانی شێخ ئەحمەد بوو. [٤]

بەهەر حاڵ مەسەلەکە هەرچیەک بوو «قودەتە چریکییەکە» روو بە رووی چ مقاوەمەتێک نەبووەوە، خێرا مەخفەرێک لە گوندی بلەی چەند کیلۆمەتەری بارزان دا دروستکرا.

١

## شێخ ئەحمەد وشۆڕشی ئارارات

دوای چوار سالان، واتە لە سالی ١٩٣١ دا شۆرش لەو دیوی سنوور گەرم بوو، سوپای تورک دەستبەکار، سەرگەرمی سەرکوت و روخاندنی کۆماری کوردی ئارارات بوو.

شێخ ئەحمەد لە مانگی تەموز و ئابی ١٩٣١ دا چەند سەد چەکدارێک بۆ یارمەتی شۆرشڤانانی ئەو دیو دەنێرێ و تورکیا لەم کارە تورە دەبێ و بە توندی گازاندە لە دەولەتی

عێراق دەکات. دوا بە دوای ئەو گلەیی و گازاندانە دەوڵەتی عێراق دەستی بە هێرشی عەسکەری کرد بۆ سەر «ئەم یاخیانە»ی دەڤەری بارزان.

دەسەڵاتدارانی ئینگلیز، چ وەڵامێکی نارەزایی نامەی تورکان لەمەڕ یارمەتی دانی شۆڕشڤانانی ئارارات لەلایەن شێخ ئەحمەدی بارزانەوە، نادانەوە و دەڵێن ئەو «هەرا» کوتوپڕەی کە ناوچەی بارزانی هێناوەتە لەرزە «ئەنجامی هەوڵ و کۆششی شێخ ئەحمەدە بۆ سەپاندنی ئایینێکی تازە.»[٣] [ ٥ ]

کارگێڕان و فەرمانبەرانی ئینگلیز، لە نووسینە مێژووییەکانی خۆیاندا، زۆر جاران باسی ئەم بابەتە دەکەن. یەکێک لەوانە دەنووسێت لە تەموزی ۱۹۳۱ دا شێخ ئەحمەد هەمدیس (ئەقڵ و هۆشی) لە دەست دا، دەستووری بە موریدەکانی دا. کە بە برژاندن و «خواردنی گۆشتی بەراز، بێنە ریزی ئاینە تازەکەیەوە»[٤]

یەکێکی دیکەیان تۆزێ لە حەقیقەت نزیک دەبێتەوە و ئیعتراف دەکات کە «دەوڵەتی عێراق بڕیاری دابوو بەر لە تەواو بوونی ماوەی سایەداری «انتداب» لە (۱۹۳۲) دەسەڵاتی خۆی بگەیەنێتە سنوور». لە سەری دەڕوات و دەڵێ ئەنجامدانی ئەم بڕیارە «لەگەڵ بدعەتە ئایینیە تازەکانی شێخ ئەحمەدا بوو بە هاوزەمان» و لە کۆتاییدا بە دڵنیاییەوە دەڵێ: «هیچ خەیاڵێک ناتوانێ ئاژاوەکانی بارزان تا ساڵی ۱۹٤۳، وەکو شتێکی هەڵقوڵاو لە هەستی نەتەوەییەوە بزانێ و پیشان بدات.»[٥]

کاوسات لێرەدایە کە دەسەڵاتدارانی عێراقی هێندە سەرکەوتوانە بانگەشە بۆ «بیدعەتی ئاینی» شێخ ئەحمەد دەکەن کە چ کەسێکی ئەو سەروبەندە ناوڕ لە چ لایەنێکی دی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە نەداتەوە و لێی ڕانەمێنێ، واتە کەس گوێ بە لایەنی نەتەوەیی مەسەلەکە نەدات.

**شێخ ئەحمەد چ پەیوەندییەکی بە ڕێبەرانی بزاڤی کوردی تورکیاوە هەبوو؟ ئایا پەیوەندی بە کۆمەڵەی خۆیبوونەوە هەبوو؟ یان پەیوەندی بە ڕێبەرانی ئاراراتەوە هەبوو؟** یان تەنێ پەیوەندی بەو سەرۆکە ناوچەییانەوە هەبوو کە لەو دیوی سنووری عێراق، واتا لە تورکیادا دەجەنگین؟ ئایا پێش هەیڤی یەکی ۱۹۳۱ ش بە نهێنی چەکداری ناردبوو بۆ یارمەتی دانی شۆڕشڤانان؟ سەرەنجام بۆ چی هەر ئەو شێخ ئەحمەدەی کە لە ساڵی ۱۹۳۰ دا خۆی لە یارمەتی دانی شێخ مەحمود دوور گرتبوو. دوای یەک ساڵ ڕازی بوو یارمەتی کوردانی تورکیابدات؟ و زۆر پرسیاری دیکەی لەو بابەتە کە ڕەنگە وەڵامیان نەبێ. [٦]

٢

## شەڕی شێخ ڕەشیدی لۆلان

هەر زوو شەڕو «ئاژاوە» بۆ ناوچەی برادۆست تەشەنە دەکات، لە مانگی یازدەی ١٩٣١ دا بارزانییەکان و برا دۆستیەکان ڕووبەڕووی یەکدی دەبنەوە.

«ماموریکی سیاسی نەناسراو» قەناعەتی بە شێخ رەشیدی لولان، کە پیاوێکی توندە تەبیعەت بوو کردبوو کەگوایە شێخ ئەحمەدی بارزان « بۆ لەنێو بردنی هەموو موسڵمانان، دەستی دەگەڵ ئاشورییەکاندا تێکەڵ کردوە»[٦] و بۆ شەڕی ئەم «بێدینە»ی هاندا بوو. ئیدی شێخ رشید لە ڕووی خۆشباوەڕییەوە، بوو بە گەمەی دەستی ئەم مامورە فیتنەگێڕەو پەلاماری شێخ ئەحمەدی داو لە ١٩٣١/١١/٢٦ شکاو زەرەرو زیانێکی زۆری لێ کەوت، دەوڵەتی عێراق کە لە هەیڤی ١٩٣١/٥ دا شەڕی شێخ مەحمودی لە یەخەی خۆی کردبووەوە، بیانووی تەواوی بەدەست هێناو بێ ئەوەی باسی یارمەتی کوردانی تورکیا لەلایەن شێخ ئەحمەدەوە، بێنێتە گۆڕێ، ئاگادارینامەیەک بە شێخ ئەحمەد دەدات کە بێ ئاکام بوو، ئەوجا لێبڕا «پەلاماری گوندی بلە، کە جێی دانیشتنی شێخ ئەحمەد بوو، بدات و جەزرەبەیەک لە خودی شێخ بدات»[٧] لە کاتێکدا دڵنیا بوو کە پشتیوانی ئەخلاقی هەموو «بیرچاکانی» عێراقی دەگەڵ دا دەبێت؟

٣

## یەکەمین لەشکرکێشی بۆ سەر شێخ ئەحمەد (١٩٣١/١٢)

یەکەمین لەشکرکێشی بۆسەر «حەساری» شێخ ئەحمەد تێک دەشکێ، قوەتێکی عێراقی (دوو سریە پیادە و دەستەیەک رەشاش) شەوی ١٩٣١/١٢/٩ بارزان گەمارۆ دەدەن، بەو ئومێدەی کە چەکدارانی شێخ ئەحمەد غافڵگیر بکەن. بەڵام کارەکە بە پێچەوانەی ئەم خەیاڵەوە دەردەچێت و چەکدارەکانی شێخ ئەحمەد کۆمەڵە دیلێک دەگرن کە یەکێکیان قایقامی بلە دەبێ.!

بۆ سبەینێ هێزی ئاسمانی پاشایەتی (بەریتانیا) گوندی بارزان بۆردومان دەکات! شێخ ئەحمەد دەم و دەست نامەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ دەسەڵاتدارانی عێراقی دەنێرێ و لە نامەکەدا پێشنیازی دانەوەی دیلەکان دەکات.

## ٤

## دووەمین لەشکرکێشی بۆ سەر شێخ ئەحمەد (شوباتی ١٩٣٢)

دەوڵەتی عێراق سوورە لەسەر ئەوەی شێخ ئەحمەد لە رێی خۆی لابەرێ. لە مانگی ١٩٣٢/١ داوا لە کومیسێری باڵای بەریتانیا دەکات کە تا ت ر کان دەست پێدەکەن، فرۆکان، هەر وەکو خۆ نواندن بۆ سەر ناوچەکانی زێبار و بارزان هەستن.

هەروەها دەوڵەتی عێراق داوای هاوکاری تەواوەی هێزی ئاسمانی رژێمی پاشایەتی بەریتانیا و بە شدارییان لە شەرەکاندا دەکات.[٨]

سوپای عێراق چاوەنۆری کوتایی زستان ناکات، لە٩/شوباتی/١٩٣٢ دا دەست بە پەلامار دانی گوندی بارزان دەکات. جارەکی دی دەشکێ! هێزی عێراقی ١٤ کوژراو و ٩ بریندار دەدات. (زیانی بارزانییەکان ٢٠ کوژراو و ٣٠ بریندار دەبێ). ئیدی دەوڵەتی عێراق لێدەبڕێ تاکو بەهار سەبر بکات.

## ٥

## سێیەمین لەشکرکێشی بۆسەر شێخ ئەحمەد ( ١٩٣٢/٣)

لە ١٩٣٢/٣/١٢ دا ئاگاداری نامەیەک بە شێخ ئەحمەد دەدرێ، دەوڵەت بڕیاری داوە «دام و دەزگای حکومەتی» لە ناوچە دابنات، و داوای لێدەکرێ لە زەرفی ٤٨ سەعاتدا خۆی تەسلیم بکات (دەوڵەت بە تەما بوو بۆ موسڵی دوور بخاتەوە)

شێخ ئەحمەد خۆی بە دەستەوە نادات.

لە ١٩٣٢/٣/١٥ دا هێزێکی گەورەی پیادە و سوارە و تۆپخانە بە پشتیوانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا دەچنە ناوچەی شێروان.

چەکدارانی شێخ ئەحمەد بۆ پەرچدانەوەی هێزێن دەوڵەتی دەست بە شەڕی پارتیزانی دەکەن و لە دوو شەڕدا لە رۆژانی ٣/١٩ و ٣ / ٤٤دا زەرەرێکی تا رادەیەک باش لە هێزێن دەوڵەتی دەدەن، کوردەکان قافلەیەکی چوار سەد هێستری بە هەموو ئازووقەوە بارەکانیەوە دەگرن. ئەنجام هێزی ئاسمانی بەریتانیا بەناو دەکەوێ و فریای هێزێن دەوڵەتی دەکەوێت و چەکدارانی شێخ ئەحمەد پاشەکشە دەکەن. لەم شەڕەدا فرۆکەوانێکی ئینگلیزی دەکوژرێ و یەکێکی دی بریندار دەبێت.

لە ١٩٣٢/٤/٦ دا کوردەکان لە نزیکی چیای لینگ Kanilig Chid دەشکێن

وسوپای عێراق دوای هاتنی هێزی کۆمەکی لە ئاکرێوە بە پەلە و بێ ئەوەی تووشی ج مقاومەتێک ببێ، بارزان داگیر دەکات.

## ٦

## کەوتنە زۆنگاوەوە (١٩٣٢/٤)

سەرکەوتنی عێراقیەکان لە راستیدا، تەنێ سەرکەوتنە درۆزنەیە: کوردەکان تاکتیکی خۆ دەگۆڕن، خۆیان لە قەرەی هیچ جۆرە رووبەرووبوونەوەیەکی جەبهەیی نادەن و دەکەونە هێرشی پارتیزانی بۆ سەر هێڵی پەیوەندیەکانی دژمن.

کوردەکان، کە لە چیاکانەوە، هێزەکانی عێراق بە جوانی دەبینن، هەر کە ئەم هێزانە حەرەکەت دەکەن، خێرا لێیان دەدەن و پەکیان دەخەن و ئەوجا بە خۆیان بۆ پشتی «روکوچک» پاشەکشە دەکەن.

دەوڵەتی عێراق هەمدیس لە ١٩٣٢/٤/١١ دا داوای یارمەتی هێزێن ئاسمانی بەریتانیا دەکات. دەسەلاتدرانی ئینگلیزی دانیشتووی عێراق، دوای هەندێک دوو دڵی (!) لەسەر داوای عێراقیەکان رازی دەبێت و هێزی ئاسمانی بەریتانیا لە ناوچەی مزوری بالادا، دەست بەکار دەبێ. لە ٤/٢٩دا فڕۆکەیەکی «واپیتی» بەریتانیایی دەکەوێتە خوارەوە و فڕۆکەوانەکەی یەخسیر دەبێت.

شێخ ئەحمەد ئەم رووداوە بە فرسەت دەزانێ و داوای ئاگر بڕ دەکات لە بری ئازاد کردنی فڕۆکەوانە ئینگلیزەکە، ئەم ئاگربڕە، سەیرە، سنووری ئاگربڕەکە تا رەخی راستی روو کوچک دەبێ.

دەوڵەتی عێراقیش ئەم فرسەت و دەلیڤەیە دەقۆزێتەوە و هێڵی هاتوچۆی کوردەکان لە «روکوچک»ەوە دەبڕێ.

هەموو پردەکان دەروخێنێ وریبازگە و بوارەکان دەخاتە ژێر چاودێرییەوە و بەمجۆرە چەکدارو جەنگاوەرەکانی شێخ ئەحمەد لە حەسارەکەی خۆیدا ئابلۆقە دەدات و لە هەمان

کاتدا داوا لە دەوڵەتی تورکیا دەکات سنور «ببەستێ».

## ٧

## دوا شەڕەکان (١٩٣٢/٦)

هێزەکانی عێراق لە ١٩٣٢/٥/٢٦ دا دەست بە زنجیرە هێرشێکی تازە بۆ سەر شێخ ئەحمەد دەکەن، ئەم هێرشانە دوا هێرش دەبن.

سەرکەوتنی ئەم شەڕە تا رادەیەک دەگەڕێتەوە بۆ ئامادەبوونی ژمارەیەک ئەفسەری ئینگلیزی لە شەڕەکاندا بە فەرماندەیی جەنەراڵ هیدلەم.(٩)

بەڵام لە راستیدا بەشداری بەربڵاوی هێزی ئاسمانی بەریتانیا و بۆردومانی بێ وچانی بارەگاکانی بارزانییەکان، شێخ ئەحمەد ناچار دەکات کە خۆی تەسلیم بکات. شێخ لە ١٩٣٢/٦/٢١ دا لە سنوور ئاودیو دەبێ و بە نزیکەی چوارسەد چەکدارەوە خۆی بە حکومەتی تورک تەسلیم دەکات.(١٠)

شێخ ئەحمەد بۆ قەستەنتەنییە وپاشان بۆ (ئەدرنە) دەبەن. دەوڵەتی تورک ژمارەیەک لە هاورێیانی شێخ بەو بیانووە دەگرێ کە گوایە لەو کوردانەن کە لە ساڵی ١٩٣٠ دا لە ئارارات شۆڕشیان هەڵگیرساندووە و پاشان پەنایان وەبەر شێخ ئەحمەد بردووە.(١١)

**بەمجۆرە شۆڕشی شێخ ئەحمەدی بارزان کە بوو بە قوربانی دەسیسەیەکی دوو لایەنیە، کۆتایی دێت. لە ئەنجامی ئەم پیلانە دوو لەولەمەی عێراق و تورکەکاندا و لە ئەنجامی پیلانی پەردەپۆش کردنی فاکتەر و هۆکارە راستەقینەکانی ئەم شۆڕشەدا، دوا کەسایەتی بە دەسەڵاتی کورد لە ناوچەی گرنگی بارزان دا لا دەبرێ.**

## ٨

## شۆڕشی شێخ محەمەد سەدیق و مەلا مستەفا بارزانی

لێ وێڕای هەموو ئەمەش، دەسەڵاتدارانی عێراقی لە کوردستانی عێراق دا ناتوانن «ئاشتیەکی عەرەبی» بەرقەرار بکەن. لە کۆتایی ئەیلولی ١٩٣٢ مودیر ناحیەی شەمدینان لە تورکیا، داوا لە مودیری ناحیەی مزوری باڵا لە عێراق، دەکات کە بە مەبەستی هاوئاهەنگ کردنی شەڕ دژی «رێگرانی بارزانی کە لە چیاکانی مانکۆلا و جەنگەڵ و بێشەکانی رووباری حاجی بەگ پەرتوبڵاون.» بێت بۆ گوندی «بیروخ»ی سەر سنوور و یەکتر ببینن.

له کۆتایی ساڵی ١٩٣٢ دا تورکەکان، ئەو کوردانەی کە لەگەڵ شێخ ئەحمەد دا بوون و گرتبوویانن، ئازاد دەکەن. محەمەد سەدیق و مەلا مستەفای برای شێخ ئەحمەد لەو کوردە ئازاد کراوانە بوون. ئەم گرووپە دێنەوە دەڤەری بارزان و لەگەڵ گەیشتنەوەیان دا شەڕی پارتیزانی دەست پێدەکاتەوە. لە ١٩٣٢/١٢/٢٢ دەنگ و باسی شەڕێکی نزیکی مێرگەسوور بڵاو دەبێتەوە.

لە مانگی ١٩٣٢/٣ دا جرووتە برایەکەی شێخ ئەحمەد نزیکەی ٣٠٠ جەنگاوەر لە دەوری خۆی کۆ دەکەنەوە و لە گوندەکانی نزیکی سنوورەوە حەشر بە هێزەکانی عێراق دەکەن. بەڵام چونکە ئەم گوندانە، لە دەشتی گزڤەندەی باکووری بارزان و لە قوڵی چل کیلۆمەتری ناو خاکی تورکیادا دەبن، مەلیک فەیسەڵ بە خۆی داوا لە سەفیری تورک لە بەغدا، دەکات کە دەوڵەتەکەی لەم ڕووداوە بکۆڵێتەوە.

فەیسەڵ دوای چەند مانگێک واتا لە ١٩٣٣/١١/٨ دا بەخۆی دەڕوات و ئەم دوا هەوڵەی دژی کوردان سەر ناگرێ، چونکە دەوڵەتی تورکیا هێزی ئاسایشی ناوخۆ لەم بەشەی دەڤەرەکەدا نابێ.

زانیارییەکی ئەوتۆ لەسەر ئەم چالاکی و شەڕە سەرەتاییانەی کە بۆ ماوەی چل ساڵان جەنەراڵ بارزانی یان لەسەر شانۆی سیاسەتی کوردستان دا بەرجەستە کرد، بە دەستەوە نیە، لێ مەلا مستەفا بارزانی و محەمەد سەدیقی برای ئەو چەکانەیان بە کار دێنا کە بەر لە تەسلیم بوون بە تورکیا، لە ساڵی ١٩٣٢ دا لە نزیکی سنووردا شاردبوویانەوە، پێدەچێت بەتەما بووبن پاش کۆ کرنەوەی جەنگاوەران لە بەهاری ساڵی ١٩٣٤ دا دژی هێزی دەوڵەتی عێراق شۆڕش بکەن.

بەڵام لە ساڵی ١٩٣٤ دا برایانی بارزانی تەسلیم بە دەسەڵاتدرانی عێراقی کرانەوە عێراقیەکان هەوەڵێ بۆ ناسرییەیان دوور خستنەوە و پاشان بۆ سلێمانیان نەفی کردن.

وێڕای هەموو ئەمانە، ئاسایش لە ناوچەی بارزان دا بەرپا نابێ، چونکە خەلیل خۆشەوی کە لە یاوەرانی بارزانی دەبێ و وەلی بەگی خالیان، تا هەیڤی ١٩٣٦/٣ هەر پایەداری دەکەن و دەستبەردار نابن.[١٤]

**سەرچاوە و پەراوێزان:**

١- ئەدموندز، میدل ئیست جۆرناڵ، ١٩٥٩

٢- هەمان سەرچاوە

٣- نووسراوی ١٩٢٣/٤/١٨، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٤٥ ١٦٠ ٣٧١
٤- لانگ ریگ. عێراق ١٩٠٠- ١٩٥٠ ل ١٩٥.
٥- ئەدمونذز، میدل ئیست جورنال، ١٩٥٩.
٦- ا. هامیلتون، ریگەی کوردستان، ل ٢٩٩.
٧- نووسراوی ١٩٣٢/٤/١٨ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٤٥ ١٦٠ ٣٧١.
٨- نامەی ١٩٣٢/١/١٨ی مەکتەبی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق بۆ سێر فرانسیس هامفری، کۆمیسەر بالای بەریتانیا لەبەغدا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ٤٥٠ ١٦٠ ٣٧١
٩- ژمارەیەک لە ئەفسەرانی پەیوەندیە بارمەتی جەنەرال هودلم دەدەن. مێجەر وارن، مێجەر کلارک، مێجەر دیکینسن، سەروان ئالفری، ستوان لاورتی، و ستوان پلی.
١٠- راپۆرتی جەنەرال رانڵ، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٤٥ ١٦٠ ٣٧١
١١- نووسراوی ١٩٣٢/٨/٢١ی سێرجان سایمنی سەفیری بەریتانیا لە قەستەنتەنیە، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٤٥ ١٦٠ ٣٧١.
١٢- نووسراوی ١٩٣٢/١٠/١، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٤٥ ١٦٠ ٣٧١.
١٣- خولاسەی راپۆرتی هەوالگری هێزی ئاسمانی پاشایەتی، ١٩٣٣/١، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٦٩١٦ ٣٧١
١٤- بە گوتەی بریفکانی، حەقیقەتەکان، ل ١٥-١٦، کە لە جویدەوە وەرگیراوە ل ٦٦٩- ٦٧٠.

تێبینی: زانیاری ناو ئەم پەراوێزانە لە رێزدار سالح مەحمود بارزانی وەرگیراون.

[١] شێخ ئەحمەد بارزانی، شێخێکی مەزن و خوا ناس بوو، پابەندی هەموو بنەما ئیسلامیەکان بوو، پاش شەهید بوونی شێخ عەبدولسەلام بوو بە جێگری ئەو. دیارە ئەو قسە و قسەلۆکانەی کە لە دین هەلگەراوەتەوە یان بووە بە مەسیحی یان خواردنی گۆشتی بەرازی حەلال کردووە، هەموو بوختانی دژمنانی کورد و بارزانیان بووە، بەتایبەتی ئینگلیز و داردەست و نۆکەرانی ئینگلیز، چونکە بارزانییەکان بەتایبەتی شێخ ئەحمەد بە دەسەلات و حوکمی ئینگلیز قایل نەبوون، ئینگلیز زۆریان هەول لەگەل دا، تەنانەت قەولیان داپێ کە زیندانی بەسرە و ئیعدام ئازادی بکەن و هەرچی بوویت بۆی بکەن. هەر بە مەرجێ ئیمزایان بۆ بکات، لێ شێخ هەر رەفزی کردن و گوتی: بۆ هەنگز ئیمزا ناکەم.

بەراز. لەلای بەرزانییەکان. گلاوە و بەر هەر شتێک و شوێنێ بکەوێ دەبێ حەوت جاران بەئاو و گلە سوور گلاوی دەربکرێ و شوێنەکەی بشۆردرێ.

ژیانی گیانلەبەران لە دەڤەری بارزاندا، پارێزراوە و راویان قەدەغەیە، بەلام شێخ کە ریگەی راوی بەرازی داوە، لەبەر ئەوە بووە کە زەرەعات و دەغل و دانی دەڤەرەکەیان دەخوارد و خراپ دەکرد، ئاشکراشە کە زەوی و زاری کشتوکالی لە ناوچە و دەڤەری بارزان کەمە. جا رێگە دانە راوکردنی بەراز بۆ گۆشتەکەی نەبووە، کە بەراز راو کراوە هەندێ لە خەلکان بۆ خۆیان بردویانەتەوە و خواردویانە دەنا

هەرگیز شێخ خواردنی گۆشتی بەرازی حەلاڵ نەکردووە، نەک هەر خەڵکی موسوڵمانی دەڤەری بارزان گۆشتی بەرازیان نەخواردوە، بەڵکو خەڵکی فەلەی گوندی «بیدیاڵ»ش وەکو بسوڵمانان گۆشتی بەرازیان نەخواردووە.

شێخانی بارزان هەرگیز لەسەر جیاوازی ئاینی کەسیان نەبوغزاندووە و زۆریش نێوانیان دەگەڵ مەسیحی و جولەکەی کوردستان خۆش بووە و تەنانەت یەکێک لە لەقەبەکانی شێخ عەبدولسەلامی شەهید ئەوە بوو کە پێی دەگوترا (شێخی مەسیحیا).

بۆیە ئەو قسە و قسەلۆکانەی ئینگلیز و دلاردەستانی ئینگلیز دژی شێخ ئەحمەد بارزانی و بارزانیان دەیانکرد و دەیانئووسین بوختان و دەست هەڵبەستی دژمنانە بوون و هیچی دی.

[٢]

[٣] شێخ ئەحمەد داوای خوایەتی نەکردووە، شێخێکی نەقشبەندی بوو.. هێزی بۆ هاوکاری شێخ سەعید نارد، هێزی بۆ هاریکاریا شۆرشا ئاوارات هەنارد، هێزی بۆ هاوکاری شێخ مەحمود هەنارد و دوو شەهیدیان لە رانییەدا دا. چواردە شەهیدی بارزانی لە کوردستانی تورکیا دا درا. پاش شەهید بوونی شێخ عەبدولسەلام، شێخ عەبدولقادر قاسیدی هەناردە نک شێخ ئەحمەد و داوای لێکرد کە لە جێی شێخ عەبدولسەلام سەرکردایەتی بزاڤی کوردی بکات، شێخ ئەحمەد وەڵامی شێخ عەبدولقادری ئەهری دایەوە کە تۆ لە جێی شێخ عەبدولسەلام ببە بە ڕێبەری کوردێتی.

بۆیە ئەو قسە و قسەلۆکانە هەمووی بوختانی دوژمنانە و جا ئینگلیز ڤیا پاش شێخ مەحمودی بێتە سەر بارزانیان، بۆیە ئەو بوختانەی هەڵبەست و کردی بە بیانوو و هەنجەت بۆ پەلاماردانی بارزان.

[٤] چونکە شێخ ئەحمەد دژی داگیرکەری ئینگلیز بوو، دەنا کێ باوەر بەو درۆیە دەکات کە بەریتانیای ناموسڵمان هێز بنێرێتە سەر شێخێکی بارزانی چونکە لەدین وەرگەراوە تا بیهێننەوە سەر راستە رێی ئایین!!.

[٥] راستە شێخی بارزانی هاوکاری شۆرشی ئاراراتی کرد، بەڵام بۆیە ئەمەیان لێکرد بە هەنجەت تا چ قوەتێک لە عێراقدا ئەمێنی کە سەرپێچی لە دەسەڵاتی ئینگلیزان بکەن، دەنا ئاینی تازە لەگۆڕێ بووە و نا هاوڕوژان و عەقڵ لەدەست دان و نە حەلاڵ کردنی خوارنی گۆشتی بەراز کە لە دەڤەری بارزان دا نەک موسڵمانان بەڵکو بەشێکی زۆری مەسیحیانیش نایخۆن.

[٦] شێخ ئەحمەدی بارزانی هاوکاری شۆرشی ئاراراتی کرد. هاوکاری شێخ مەحمودی کردووە و پەیوەندی دەگەڵ خۆیبوون دا هەبووە و لەبەر هەست و گیانی نەتەوە پەروەری، لەلایەن ئینگلیزەوە بۆغزێنراوە و بوختانی بۆکراوە.

**سەرجەلەنامەی مالباتی شێخانی بارزان**

میر زبیر یەشەی یەکەم - میری ئامێدی

میر مەنسور، ئامێدی

میر سەعید

عەبدولرەحیم

مەلا ئەحمەد - پیرمش

شێخ محەممەد

سەعید

عەبدولسەلام

مەلا تاج الدین

مەلا عەبدولرەحمان

مەلا حاجی شێخ محەممەد

مەلا عەبدوللا

شێخ عەبدولسەلام (؟- ١٨٧٢)

شێخ محەممەد

شێخ عەبدولسەلامی شەهید (١٨٨٥؟- ١٩١٤)
ئیبراهیم
شێخ سلێمان
ئیسماعیل

شێخ ئەحمەد
محەممەد خالید
جەمال
عوسمان
نەزیر
صنع

محەممەد سدیق
عەلی
نوری
شێخ عەبدوللا

بابۆ
صادق
شەفیع
ئەیوب

مەلا مستەفا
عوبەیدوللا (١٩٢٧)
لوقمان
ئیدریس (١٩٤٤)
مەسعود (١٩٤٦)
صابیر
نیهاد
دلشاد
سیدالا
سرهاد
وجیه

## فەسلی هەشتەم

## شۆڕشی دەرسیم

لە ساڵی ١٩٣٢ بە دواوە گوشار و سەرکوتکاری لە کوردستانی تورکیادا هێندە توند دەبێ، کە حکومەت ناچار دەبێت سانسۆرێکی زۆر توندیش بخاتە سەر کوردستان کە دەکرێ بەناوچەی محەرڕەمە و نایەڵێ بچوکترین شت لەمەڕ وەزع و حاڵی کوردستان بچێتە دەرێ.

چەند کورد، چەند سەد کورد، چەند هەزار کورد پاش شۆڕشی ئارارات لە زێدی خۆ وەدەرنران و دوور خرانەوە؟ ئایا جگە لە شۆڕشی ئارارات، شۆڕشی دیکەی ناوچەییش هەبووە؟ ئایا ڕێکخراوی نهێنی خەبات و بەرگری چێ بوو بوو؟ ئەو پرسیارانە و گەلێک پرسیاری دیکەی بێ وەڵام یەخەی مرۆڤ دەگرن.

لە دەرێی تورکیادا، بەدەگمەن کەسێک هەیە ئاگاداری ئەوە بێ کە دەوڵەتی تورکیا لە ساڵی ١٩٣٤ دا ناچار دەبێت جەنەراڵ کەنعان پاشای فەرماندەی سوپای چوارەمی دیاربەکر بۆ شەرناخ بنێرێ و ئەم جەنەراڵە لە مانگی ئابی ١٩٣٤ و بە مەبەستی دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی کوردان دژی ڕاگوێزانی بە کۆمەڵ[1] بۆ ماوەی پێنج ڕۆژی بێ پسانەوە چیاکان تۆپباران بکات.

جەنەراڵ کەنعان لە ساڵانی ١٩٣٤-١٩٣٥ بۆ «چاوترساندنی کوردانی ڕاپەڕیو» ژمارەیەکیان لە «معمورە العزیز» لێ لە سێدارە دەدات.[2]

بەڵام بۆ لادانی ئەو پەردەی خامۆشی و بێدەنگییەی کە بەسەر کوردستانی تورکیادا درابوو، دەبوایە چاوەنۆڕی شۆڕشی دەرسیمی ساڵی ١٩٣٧ بکرێ. ئەمەیان شۆڕشێک ی توند و گەورە بوو دەسەڵاتدارانی تورک هەرچییەکان کرد و کۆشا بۆیان نەشێردرایەوە.

### ١

### نەخشەی عابدین ئۆزمەن بۆ سڕینەوەی کەسایەتی کوردی لە لای کوردان

چەند مانگێک لەوە پێش موفەتیشی ناوخۆی شارەکانی ڕۆژهەڵات نەخشەیەکی بە مەبەستی خێراکردنی جێبەجێ کردنی سیاسەتی «سڕینەوەی تەبیعەت و کەسایەتی کوردی» لە کوردستانی تورکیادا، خستبووە بەر دەستی دەوڵەت، چونکە ئەو سیاسەتە بە دڵی دەوڵەت نەچوو بووە پێشێ.

ئەم نەخشەیە لە هەندێ ڕووەوە تەواوکەری ئەو قانونەیە کە لە ساڵی ١٩٣٢ دا لەلایەن حکومەتەوە پەسەند کرابوو، ئەو قانونە ڕێگەی دەوڵەتی دەدا کە کوردەکان بۆ ڕۆژاوای وڵات ڕاگوێزێ. جا نەخشەی گۆڕین پێشنیازی ئەوەی دەکرد کۆمەڵێک تورک لە ڕۆژئاوای وڵاتەوە بۆ ناوچەی وان و دەشت و مووش و « هەر هەمـوو ناو... کـانی کـوردسـتـان» ڕابگوێزرێن و پەیوەندی ئەم ناوچانە بە جادەی «قیرتاوو و سکەی ئینار» دابین بکرێ.

جا بۆ کۆتایی هێنان بە یەکێک لە مەرجە هەرە گرنگەکانی نەتەوەی کورد- واتا زمانی تایبەتی- ـنەتیشی ناوخۆ پێشنیاز دەکات کە قوتابخانەی «شبانە روزی» دابمەزرێنرێ کە « لەوێندەرا منداڵانی گوندێن کورد هەقی ئەوەیان نەدرێتێ بە زمانی کوردی قسە بکەن و زمانی تورکی فێر بێن»

سەرەنجام، عابدین ئوزمەن، داوای لابردنی هەموو دادگا ئاساییەکان دەکات و پێشنیاز دەکات سیستەمێکی قەزایی تایبەتی و دادوەری تایبەتی دابمەزرێ تا بتوانن بەخێرایی و بەلەز کارەکان ئەنجام بدەن.[٣]

## ٢

## قانونی ساڵی ١٩٣٧

دەوڵەتی تورکیا لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٧ دا یاسایەک دادەنێ کە ماهیەتی «سەرکوتکاری» نەخشەی نێوبراو دووپات دەکاتەوە. دام و دەزگای ئیداری ناوخۆ هەڵدەسپێردرێ، حوکمی عەسکەری ڕادەگەیەنرێ، فەرماندەێن عەسکەری دەکرێن بە حوکمداری شارەکان.

هەڵبەتە ئەم حوکمدارانە بۆ هەر کارێکی سوپایی (دەسەڵاتی تەواویان) هەیە: دادگا ناوچەییەکان دەتوانن فرمانی ئیعدام دەربکەن، ژبلی زمانی تورکی، فێربوونی هەموو زمانەکانی دی قەدەغەیە، کتێبی بێگانە و فەرهەنگی یاساغە.[٤]

سانسۆری سەر هەواڵی ئەو هەرواو هەنگامانەی کە لەبەهاری ساڵی ١٩٣٧ داو لە دەرسیم ڕوو دەدەن، هێندە توند دەبێ کە کاتێ لە نێو هەموو ڕۆژنامەکانی قەستەنتەنیەدا، ڕۆژنامەی سێن تەلەگراف لە ١٩٣٧/٥/٢٣ دا ئاماژە بۆ ئەو بوبەرانە دەکات خێرا دەستی بەسەردا دەگیرێ، تاکو ڕۆژگاری ئەمڕۆش هیچ کەسێک نازانێ کە ئەم شۆڕشە دەقاو دەق کەنگێ دەستی پێکرد و سەرانی کێ بوون، وەکو چۆن چ زانیارییەک لەمەڕ شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ نیە.

## ٣

## سەید رەزا (١٨٦٢ز- ١٩٣٧)

ئەو سیاسەتوانانەی کە لەسەردەمی شۆڕشی دەرسیم دا لەئەنقەرە بوون، لەباری مەیدانیەوە چ شتێک لەمەڕ رێبەری ئەم شۆڕشە نازانن، تەنێ ئەوەندە دەزانێ کە سەید رەزا «سەرۆکێکی ناوچەیی» و لەگینە سەرۆکی عەشیرەتێک بووبێ.

مەخابن دکتور نوری دەرسیمی، نووسەری تاقە بەرهەم لەمەڕ شۆڕشی دەرسیم[٥] کە بەخۆی چەندین ساڵ دەگەڵ سەید رەزا بووە، زۆر بە کورتی باسی ئەم پیاوەی کردووە.

بە گوتەی وی، سەید رەزا کوڕی سەید ئیبراهیم، سەرۆکی تیرەی شێخ حەسنانە، ئەم تیرەیە ئاکنجی رۆژئاوای دەرسیمە، و یەکێکە لە «گرنگترین و شەریفترین تیرەێن» ناوچەکە.

سەید ئیبراهیم، کە لە گوندی دەری ئاهری Ahri Deri دا دەژیا، وەکو سەید «دەسەلاتێکی فراوانی» دە نێو جەماوەری خەڵک دا هەبوو: چونکە (رێبەری) ئەو خەڵکە بوو.

سەید رەزا بچوکترینی هەر چوار کوڕەکەی سەید ئیبراهیم بوو لەنک یەکێک لە زانا ئاینییەکان بەنێوی محەمەد عەلی ئەفەندی دەرسی ئایینی خوێندووە، ئەم پیاوە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر ئەوەوە هەبووە و ویژدانی نەتەوەیی ئەوی بێدار کردۆتەوە.

سەید رەزا لە پاش مەرگی بابی و لەسەر وەسیەتی بابی دەبێ بە جێنشینی ئەو و لە گوندی ئاگوادری بناری چیای توجیک نیشتەجێ بوو.

بە گوتەی نووسەری ژینامەی وی «سەید رەزا هەر هەموو تایبەتمەندیەکانی کوردێکی تێدا بوو، پیاوێکی روخۆش، میهرەبان و دڵسۆز و بە ئەوازش، زۆر زاهیدانە دەژیا، یەکجار چاکەکار بوو، پاش شۆڕشی شێخ سەعید لە ١٩٢٥ دا هەزاران کوردی پەنادا.

ئەمە هەر هەموو ئەو زانیارییانەیە کە لەمەڕ وی دەیزانین. (لە قەبی سەید لە نێو کوردی شیعە مەزهەبی دەرسیم دا هەمان گەورەیی و بایەخ و چەمکی لەقەبی پایەی شێخی هەیە دەنێو کوردێن سوونە مەزهەبی ئێران و عێراق و تورکیادا.)[٦]

قەواڵەیەکی ئاناسایی- نامەیەکی سەید رەزایە کە لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیزدا بەدەست کەوتووە، ئەم وێنەیەمان بۆ تەواو دەکات.و ئەوە نیشان دەدات کە شیکردنەوەیەکی زۆر دروست و بۆ چوون و روانینێکی زۆر روونی لەمەڕ رەوش و وەزع و

حاڵەکە هەبووە: ئەم قەواڵەیە لە حەقیقەتدا بەیاننامەی شۆڕشی دەرسیمە، داوای یارمەتیە لەو دەوڵەتەی کە نامەکەی ئاراستە کراوە لێ دەوڵەتی ناوبراو بە دەنگیەوە ناچێت.[٧]

٤

**بەیاننامەی سەید رەزا**

سەید رەزا لە نامەکەیدا دەنووسێت: دەمێ ساڵە دەوڵەتی تورکیا هەوڵدەدات نەتەوەی کورد دەت[illegible]ێنێ و لە رای ئەم مەبەستەدا خەڵکی کورد سەرکوت دەکات، چاپەمەنی و بلاڤۆک و زمانی کوردی یاساغ کردووە، هەر کەسێک بە زمانی زگماکی خۆی قسە بکات دەیگرێ و ئازار و ئەشکەنجەی دەدات، لە رێگەی بەتۆبزی کوچاندنەوە خەڵکی ناوچە بە پیت و بەرەکەتەکانی کوردستان بۆ ناوچە وشک و بێ ئاوەکانی عەنەدۆل رادەگوێزێ. کە لە وێندەر کۆچ پێکراوەکان دەستە دەستە زایە دەبن و دەمرن.

لەو دواییانەشدا ، دەوڵەتی تورکیا لێبڕاوە بێتە ناوچەی دەرسیم، کە لە سایەی بەرەکەتی گوێڕایەڵی بۆ دەوڵەت، لەم ئازار و ستەمە دوور بوو.

جا خەڵکی لە بەرانبەر ئەم کارەدا، لەبری ئەوەی لە رێدا بمرن. بە مەبەستی بەرگری کردن لەخۆ، دەستیان داوەتە چەک، وەکو چۆن لە ١٩٣٠ دا لە ئارارات و دۆڵەکانی زیلان و بایەزیدیش دا وەهایان کرد.

ئەوە سێ مانگی تەواوە شەڕێکی قورس لە ناوچەکەی مندا حەشر دەکات.

وێڕای نا بەرابەری و نا یەکسانی لە ئەوزار و تفاقی جەنگ دا، وێڕای ئەوەی دەوڵەت پەنا وەبەر فڕۆکەی بۆمبا هاوێژ و بۆمبای سووتێنەر و گازی خنکێنەر دەبات، من و هاووڵاتیانم، هەوڵەکانی هێزی تورکمان پووچەڵ کردۆتەوە.

فڕۆکەێن تورک، دەرەقەتی ئێمە نایەن و لە تۆڵەی ئەمەدا، گوندەکان بۆردومان دەکەن، دەیان سووتێنن، ژن و زارۆکێن بێ چەک و بێ دەسەڵات دەکوژن، حکومەتی تورکیا لە تۆڵەی شکستەکانی خۆی بەمجۆرە تۆڵە لە هەموو خەڵکی کوردستان دەستێنێ.

«زیندانەکان تەژی خەڵکی بێ تاوانی کوردن. خوێنەواران بەر دەستڕێژان دەدەن، یان لە سێدارەیان دەدەن، یان نەفی ناوچە دوورە دەستەکانی تورکیایان دەکەن.

ئەو سێ ملیۆن کوردەی کە لە نیشتمانی خۆدا نیشتەجێن و خوازیاری چ شتێک نین جگە لە ژیان بە خۆشی و شادی و ئازادی و پاراستنی رەگ و رەچەڵەک و زمان و داب و

نەریت و رۆشنبیری و شارستانیەتی خۆیان، روو لە جەنابتان دەنێن و داوا لە جەنابتان دەکەن کە بۆ کۆتایی هێنان بەم بێدادییە، دەسەڵاتی نەخلاقی و بەرزی وڵاتەکەت بۆ پاراستنی میللەتی کورد بەکار بێنن.»

فەرماندەی گشتی دەرسیم
ئیمزا سەید رەزا

٥

## پەشێوییە سەرەتاییەکان (١٩٣٧)

بە گوتەی دکتۆر نوری دەرسیمی سەرەتای هەراو هەنگامەکانی ساڵی ١٩٣٦، ئەو کاتانە بوو کە سوپای تورکیا بە ئاشکرا بەنیاز بوو کۆمەڵێک سەربازخانە لەناوچە سەرەکییەکانی دەڤەری دەرسیم دا دابنێ.

سەید رەزا رابەر و سەرکردەی کۆمەڵێک تیرە و تایفە بوو، کە نیازی بەربەرچدانەوەی ئەم کارەی دەوڵەتیان هەبوو. لە ساڵی ١٩٣٦ دا دیار نیە لە چ وەختێکی ئەو ساڵەدا بوو، لەگەڵ جەنەراڵ عەبدوڵلا ئالپ دوغانی سەرۆکی پۆلیسخانەی «العزیز» دا دەکەوێتە دان و ستان.

سەید رەزا لە گفتوگۆکانەوە «نیاز و مەبەستی شەڕ فرۆشی» دەوڵەتی بۆ بەدیار دەکەوێ و لێندەبڕێ دکتۆر نوری دەرسیمی، بە مەبەستی « تێگەیاندنی بیری گشتی جیهان لە مەسەلەکە» بۆ ئەوروپا بنێرێ.[٨]

دوای ماوەیەکی کەم لەم دیدارە، جەنەراڵ ئالپ دوغان، بڵاوکراوەیەک دەردەکات و داوا لە هەموو تیرە کوردەکان دەکات، بەپێی رێژەی ژمارەی خۆیان، دوو سەد هەزار تفەنگ تەسلیم بە دەوڵەت بکەن. لە هەمان کاتدا کارگێڕانی دەزگا ئەمنیەکانی تورک، تیرە کوردەکان لە یەکدی هان دەدەن.

دامەزراندنی مەخفەر و قشڵەی نوێ سەرچاوە و مایەی رووداوەکانی هەوەڵە: لە دوو شوێن دا خەڵکی پەلاماری بینا تازەکان دەدەن و پاسەوانانی بیناکان، چەک دەکەن.

هەنگێنێ سەید رەزا داوا لە جەنەراڵ دوغان دەکات کە لە نووسراوەکەی لەمەڕ تەسلیم کردنی چەک، ژیوان بێنەوە و کاری پێنەکات و هەروەها داوا دەکات دام و دەزگایەکی ئیداری ئەوتۆ لە ناوچەکەدا دابمەزرێ کە مافی نەتەوەیی خەڵکی کورد دابین بکات».

کاردانەوەی دەوڵەت زۆر فەوری دەبێ، چەند فەوجێکی پۆلیس بۆ دەرسیم دەنێرێ، لە هەمان کاتدا یەکەکانی سوپای نۆیەم لە هسنوورەکانەی دەرسیم دا مۆڵ دەدا.

هەستانی رۆژانەی فڕۆکەکانی تورک بەسەر ناوچەکەدا، خەڵکی کورد تورە دەکات و لە زۆربەی ناوچەکەدا وردە پێکادان لە نێوان خەڵکی و یەکە دەوڵە کاندا روو دەدات.

زستانی دێ بەسەراو دەبێتە مایەی وەستانی عەمەلیاتی سوپایی. لێ دەرسیم هەر لە گەمارۆدایە.

## ٦
## هۆکار و فاکتەرێن راستەوخۆی شۆڕشی ١٩٣٧

هەر کە بەهاری ساڵی ١٩٣٧ هات و بەفر لە کوێستانان چوونەوە، یەکسەر کریارێن عەسکەری دەستی پێکر، جەندرمەی تورکیا بە بیانووی چەک کردنی عەشایەرەوە دەکەونە بێ سەروشوێن کردنی خەڵکی، و و ردە شەڕ و پێکادانی ناوچەیی بەتایبەتی لە ناوچەی مەلازگەرد رۆژ بە رۆژ روو لە زیادی دەکات.

لە بەهاری ساڵی ١٩٣٧ دا یەکێک لە کوڕەکانی سەید رەزا بە نێوی برا ئیبراهیم دەچێت بۆ مەخفەری تورکان لە هۆزات، تا بە ناوی بابیەوە داوا لە وفەرماندەی ناوچەکە بکات کە بە شێوەیەکی دادوەرانە مەسەلەکە یەک لایی بکاتەوە و کۆتایی بە کریارێن عەسکەری بهێنرێ. برا ئیبراهیم لەگەڕانەوەدا دەکەوێتە کەمین و بۆسەی ئەو ئەفسەرە تورکانەی کە لەگەڵ کوردێن کورگانی دا بۆی دەنەنەوە و دەکوژرێ.

کوشتنی برا ئیبراهیم دەبێتە سەرەتای ناشکرای دژمنایەتی نێوان دەوڵەت و کوردێن دەرسیم، سەید رەزا دەفەری کوردکان گەمارۆ دەدا و دەیەوێ بکوژانی کوڕەکەی تەسلیم بکەن. بەڵام بکوژەکان خەلاتیان لە دەوڵەتی تورک وەرگرتووە.[٩]

## ٧
## سەرکوتکردنی شۆڕش

تورکان، بە پەلە هێزێکی گەورە لە ناوچەکانی نزیکی سنووری شۆڕشدا مۆڵ دەدەن و هێزەکەیان هێندە زۆر دەبێ کە دەگاتە حەوت سوپا. مەڵبەندی سەرکردایەتی ئەم هێزانە لە دیاربەکر دەبێ، بەڵام قوەتەکانی ئەم هێزانە لە ئورفە و سیرت و وان و ئەلعەزیز و نزیکی ئەدەنەدا (سوپای شەشەم) بلاو بوونەتەوە.

پێدەچێت ئەم قایکارییە بەم مەبەستە بوو بێ کە رێگە لە شۆڕش بگرن و نەیەڵن بەرەو باشور تەشەنە بکات و بێن بە لەمپەر لەبەردەم ئەنجامدانی مانۆڕێکی کوردێن سوریا، (پێشتر شێخ عەبدولرەحیم،ی برای شێخ سەعیدی پالو، هەوڵێکی کاریگەری لەو بابەتەی دابوو، بەڵام کوردەکان کە ژمارەیان کەم بوو بوو بەرگەی تورکەکان ناگرن و شێخ عەبدولرەحیم کوژرا.)[10]

**هێرشی سەرەکی تورکان بۆ سەر شۆڕشگێڕانی کورد، بە هاوکاری بەرپلاوی هێزی فرۆکەوانی، لە ئەرزەنجانەوە دەستی پێکرد، هێرشی ئاسمانی وەکو لە نامەیەکی سەید رەزا و کیمژە ئاسمانەوانێکی تورک دا بە نەوی سەبیحە گوکچەن دەردەکەوێ یەکجار بەرپلاو بووە، ئەم کیمژە تورکە بەو بۆنەیەوە دیپلۆمی فەخری پێ بەخشرابوو (چونکە لە ناوچەی دەرسیم دا و بۆ تەیرەباران کردنی پەناگای شۆڕشگێڕانان، سلی لەوە نەکردووە کەبەسەر دژوارترین خەرمەندانی کوساران دا بفرێ).**

لەم کریارە عەسکەرەیەدا بۆ یەکەمجار ..ێ پۆشی جەنگی دژ بە کوردان بەکار هات.

## ٨
## گفتوگۆ

ئەوسا سەید رەزا سەر لەنوێ پەیوەندی بە جەنەراڵ ئالپ دوغانەوە دەکات و تێی دەگەیەنێ کە «ئەگەر ریز لە مافی نەتەوەیی کورد بگیرێ و بکوژانی کورەکەی بدرێنە دادگا، ئەوا ئامادەیە هەموو نەفەر و سەربازە دیلەکان و چەک و تەقەمەنی و تفاقە دەست بەسەرا گیراوەکان بداتەوە بە دەوڵەت»

لێ جەنەراڵ ئالپ دۆغان، داوای تەسلیم کردنی بێ قەید و شەرتی ٨٠٠٠ هەزار تفەنگی ماوزەر دەکات و نیدی شەڕ دەست پێدەکاتەوە.[11]

## ٩
## دەسەڵاتی عەلی شێر وکوشتنی ئەو

لەباری سوپاییەوە ئەقلی هەرە گەورەی راپەڕین عەلی شێر ناوێک بوو کە نەخشەی عەسکەری شەڕی دادەڕشت. ئەمیش وەکو سەید رەزا لە تیرەی حەسنان بوو، لە گوندی عومرانی نزیکی کۆچکری لە دایک بوو بو و لە قوتابخانەی ناوەندی سیواس خوێندبووی.

لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید و پاش ئەوەی بەدانان و نووسینی شیعر ناو و

شۆڕشی پەیدا کرد، بوو بە سکرتێری مستەفا بەگی سەرۆکی تیرەی کۆچکری، پاش کوشتنی ئەو (مستەفا بەگ) بەدەستی والی دەرسیم بوو، بە مامۆستای کوڕەکانی ئەو.

عەلی شێر لەم ڕێگەیەوە توانی دەورێکی گەورە لە یەکخستنی تیرە و تایفەکانی ناوچە و دەڤەری کۆچکری ببینێ.

دوای پاشەکشەی هێزی روسیا لە ١٩١٧ لە کوردستانی تورکیا، دەسەڵاتدارانی رژێمی تورکیا بۆ ئەوەی خەڵکی دەرسیم، ئەهارۆژێن وایان بەمەسەلەحەت زانی کە چاوپۆشی لە کریارێن عەسی شێر لە ناوچەی ئاوەچیک بکەن.

لێ عەلی شێر لە خەباتی نەتەوەیی خۆیدا بەردەوام ببوو، لە ساڵی ١٩٢٠ پەیوەندی دەرسیمی بە ویانەی نەتەوەیی بەرزێتی کوردستانەوە راگەیاند و داوای لە ڕێبەرانی کوردی قستەنتەنیە کرد کە چەند لقێکی یانەی نێوبراو لە دەرسیم بکەنەوە.[١٢]

لە ساڵی ١٩٢١ دا کەوتە نامەنووسین و تەلەگراف ناردن بۆ دەوڵەت و داوای دەکرد بریارەکانی پەیمانی سیڤەر جێبەجێ بکات و چەندین کۆنفرانسی بە زمانی کوردی لە بارەی نەتەوەییەوە ئەنجام دا.

دوای چەند هەیئەک بەهۆی بەشداری کردنی لە شۆڕشی کۆچکری دا حوکمی ئیعدام درا، لێ توانی لە دەستی دەسەڵاتداران هەڵێت.

لە ساڵی ١٩٣٧ دا عەلی شێر هەر بەسەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی کریارێن سوپاییەوە ئەوەستا، لە رای یەکخستنی کورد، لە دەوری سەید رەزا زۆر بابەتی نیشتمانپەروەرانەی نووسی و گەلێک شیعری نیشتمانی داناو بلاو کردەوە.

لە هەیڤی ٦/١٩٣٧ سەید رەزا داوای لە عەلی شێر کرد کە بەمەبەستی ڕێگە گرتن لە خوێن رشتنی پتر، بڕوات بۆ ئێران یان عێراق و تا کارێکی وەها بکات کە فەرەنسە یان بەریتانیا بکەونە بەینەوە.[١٣]

لێ شەوی بەر لە رۆیشتنی بەهاندانی جەنەراڵ ئەلپ دۆغان، لە بارەگاکەی خۆیدا لە ئەشکەوتی ئەگرات دا، بەدەستی «رێبەر»ی برازای سەید رەزا کە بێ لایەنی خۆی راگەیاند بوو، بەڵام ژێرلو ژێر بوو بوو بە نۆکەری تورکان، کوژرا.

مەرگی عەلی شێر خەسارەتێکی گەورە و دڵتەزێن بوو بۆ شۆڕش.

# کۆتایی شەڕ

لە کۆتایی هەیڤی ١٩٣٧/٦ دا هەموو خەڵکی ئەنقەرە لەوە دڵنیا بوون کە شۆڕشی دەرسیم بە تەسلیم بوونی «دواء دەستەی شۆڕشگێڕان لە ١٩٣٧/٦/٢٤ دا تەواو بوو.

چ هەواڵێک لەمەڕ چۆنیەتی کرییارەکانەوە لە دەست دا نییە، بەڵام لە ناوەندە سیاسییەکانی رۆژاوادا وا باوە کە هێزی فڕۆکەوانی و جەندرمەی تورکیا «خەسارەتی گەورەیان» لێکەوتووە.

بە رێکەوت هەندێ لە سیاسەتوانانی ئینگلیزی دانیشتووی ئەنقەرە، لە گفتوگۆیەک دا دەگەڵ یەکێک لە فەرمانبەرانی وەزارەتی کاروباری گشتی کە لە دەرسیم دێتەوە، بۆیان دەردەکەوێ کەشۆڕش و شەڕ هەر بەردەوامە و جەنەراڵ ئەلپ دوغان «بە تەما نییە ئەمساڵ هەموو ناوچەکانی شۆڕش بگرێ و گرتنـ. هەموو ناوچەکان، لە ساڵی داهاتوودا ئەنجام دەدەرێ.[١٤]

دوای مەرگی عەلی شێر قورسایی شۆڕش بەرەو ناوچەکانی تیرەی بەختیاری دادەکشێت.

بەڵام کاری سەرکوتکاری یەکجار توند و بێرەحمانەیە، تورکان بنشەکانی ناوچەکە دەسووتێنن، زەمینەی کوشتنی شاهینی سەرۆکی تیرەی بەختیار فەراهەم دەکەن. لە دۆڵی نیکسوردا، هەزاران ژن و منداڵ کە پەنایان بۆ ئەشکەوتەکان بردبوو، لە ئەنجامی کردنەوەی ئاگر و دوکەڵ لەبەردەم زارکی ئەشکەوتەکاندا دەمرن و ئەوێندەر دەبێ بە گۆڕیان.

یەکێک لە کوڕانی سەید رەزا بەنێوی حەسەن رەشیک، پارچە تۆپی بەر دەکەوێ و بریندار دەبێت، دایکی لە «العزیز» بۆ دەرمانکردنی بە ئەفسەرێکی تورکی دەسپێرێ. ئەواتیش لە بری دەرمان کردن ئەشکەنجەی دەدەن وپاشان دەیکوژن.

توند و تیژی سەرکوتکارییەکان لە سەرەتادا دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی وەکو «کوریچا»کان کە بێ لایەن بوون ویان تەنانەت خەڵکی وەکو کوراکانەکان کە بوو بوون بە جاشی دەوڵەت، لە دەوری سەید رەزا خڕ ببنەوە، لێ ئەم خێڵانەش زۆر بە بێرەحمی قەتڵ و عام دەکرێن. تورکەکان، دیلەکان بەردەست رێژی رەشاشان دەدەن و ژن و زارۆکان دەنێو کادانان دا دەسووتێنن.

فەرمانـدەی تورک کـە بە «بارەگـای» سـەید رەزا دەزانێ، بەر بۆردومـانێکی تـوند و تۆپبارانی بۆ ڕەزای تۆپخانەی دەدا.

ئەمو، سەید رەزا دەیەوێ بکاتە ئاوەچک، بەڵام ئەو هەوڵەی لە قزلجەوە بۆ نیشـکانی بازنەی گەمارۆکەی دەدا، زۆر قورس لەسەری دەکەوێ،هەزاران کەس لە کەسوکاری خۆی لەوانە ژنە بچوکەکەی و یەکێک لە کوڕەکانی و سێ لە ئەوەکانی ـ دەست دەدات.

## ١١

## گرتنی سەید رەزا

پاش ئەوە، تورکان لە کەش و هەوایەکی تا رادەیەک گوماناوی دا دەستیان دەگاتە سەید رەزا. بە پێی گـوتەی کـوردان، والی ئەرزەنجـان لە سـەرەتاکـانی ئەیلولی ١٩٣٧ دا رایدەگەیەنێ کە دەوڵەت لێبڕاوە داواکانی کورد جێبەجێ بکات و خەسارەتی کوردان بیژێرن، ئاگربەس رادەگەیەنرێ.

سەید رەزا باوەڕ بەم بەڵێنانەی تورک دەکات و بەمەبەستی گفتوگۆ دەگەڵ والی دا بۆ ئەرزەنجان دەڕوات و لەوێندەر و لە ١٩٣٧/٩/٥ دا دەگیرێ.

سەید رەزا لە کاتێ هاتنە دەرەوەی لە کۆشکی پارێزگا ئەوەندە فرسەت دێنێ کە چەند وشەیەک لەمەڕ تاوانباری «ئەم دەوڵەتە درۆزن و بێ شەرەفە» بڵێ: لە ئەلعەزیزەدا فایلی سەید رەزا چی دەکرێ.

لە کـاتی لێکۆڵینەوە و تەحقـیق دا، تورکـەکـان هەوڵدەدەن سۆڤیـەتەکـان تێوەگلێنن و داوای لێ دەکەن ئیعـتراف بەوە بکات کە سۆڤیـەتەکان ئەفـسەران و چەکـیان بۆ دەرسیم ناردووە.

لێ سەید رەزا دووپاتی دەکاتەوە کە «ئەو خێزانەی ئەو لە باوەشیدا پەروەردە وگەورە بووە، هەرگـیـز ئەلقـە لەگـوێ و ملەکـەچی بێگانان نەبووە، سـەدان سـاڵ بە گـیـانی نیشـتـمانپەروەرانە لە بەر خاتری بەرژەوەندی باڵای میللەتی خۆیدا خەباتی کردووە. لێ مەخابن بێ ئاکام و ئەنجام.»

سەید رەزا پاش چوار رۆژان دادگایی لە ١١/١٤ دا دەگەڵ دە کەسی دیکە لە سەرانی کورد حوکمی ئیعدام دەدرێ و لە ١١/١٨ دا لە سێدارە دەدرێ و لە پای قەنارەدا دەڵێ:

«من تەمەنم هەفتاو پێنج ساڵە، دەچمە ریزی شەهیداتی تری کوردستانەوە، دەرسیم

**شکستی هێنا، بەڵام کورد و کوردستان دەمێنن، لاواتی کوردستان تۆڵەمان دەستێنن، نەفرەت لە خاینانی ستەمکار»[١٥]**

سەید حسەینی سەرۆکی خێڵی کوریچا، و عەلی ئاغای سەرۆکی خێڵی یوسفان و سێ کەسی دیکە لە سەرانی خێڵەکان. دەگەڵ سەید رەزادا لە سێدارە دەدرێن.

حوکمی ئیعدامی چوار کەسی دی لە سەرانی خێڵەکان «بە هۆی گەورەیی تەمەنیان»ەوە بۆ سی ساڵ زیندان کەم دەکرێتەوە. سێ کەسی دی لە تاوانباران بە حەپسی جیاواز مەحکوم دەبن، چوار کەسیش تەبری دەبن.

لە ١٩/١١/ ١٩٣٧ لە مزگەوتی کوردێن دیمەشق دا، تازیە و پرسە بۆ ئەو قوربانی و شەهیدانە دادەنرێ.

هەڵبەتە مەحاڵە بتوانرێ لستەیەکی دروست لە مەڕ شۆڕشی دەرسیم و هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکە بخرێتە بەردەست. عیسمەت ئینونوی سەرەک وەزیران لە مەجلیسێکی نەتەوەیی دا رای دەگەیەنێ کە هێزەکانی دەوڵەت، یەک ئەفسەر و ٢٨ سەربازیان لە دەست داوە و پەنجا زامداریان هەبووە، لە کاتێک دا کوردەکان ٢٦٥ کوژراو و ٣٠ بریندارییان هەبووە و ٨٤٩ کەسیش خۆیان تەسلیم کردووە.

لێ پەیامنێری رۆژنامەی Temps (تایمز؟) لە ئەنقەرە دەڵێ. «سێدارەکانی دەرسیم گوڵیان کردبوو (!) وەحشوی شۆڕشڤانانی کوردیان پێوە هاتبووە خوارێ»[١٦] بە پێی قسەی هەندەک ژێدەرێن کوردی زیانی کورد دەگەیە نزیکەی ٤٠٠٠٠ کەس.

جارێکی دی بێدەنگی باڵی بەسەر کوردستانی تورکیادا کێشا. جەنگاوەر وخەباتکارێن کورد لە ماوەی ئەم بیست ساڵ سەرکوتکارییە درندانەیەدا، ئەوپەڕی دلێری و فیداکاریان نواند. لە ١٩٢٠-١٩٣٧ ئەگەر هەڵاتنی ئیحسان نوری لێدەر بکەین. تەنانەت تاقە جارێک تووشی تەسلیم بوون و ملکەچ بوون نابن. هەموو سەرانی کورد یان بە سێدارەوە یان لە مەیدانی شەڕدا گیانیان سپاردووە.

**خەباتکاران و سەرانی کوردستانی تورکیا کە جگە لە خۆیان پشتیان بە چ شتێک و چ کەسێک نەبەستووە، لە هەموو ریسواییەکانی گەورە پیاواتی کوردی قەستەنتەنییە بێ بەری بوون.**

هەرچەندە دەوڵەتی تورکیا هەموو رێگەیەکی نادروستی دەگرتە بەر بۆ شێواندن و **شاردنەوەی پێتری ئەم دلاوەری و قارەمانیانە. بێ سوود بوو، چونکە تەنیا دلێری و قارەمانی ئەو کوردانە بەس بوو بۆ پاراستنی هەتا هەتایی مەشخەڵی کوردایەتی.**

**سەرچاوەو پەراوێزان:**

١- گۆڤاری الفبس عەرەبی دیمەشق، ژمارە ١٩٣٤/٨/١٩ کەلە کتێبی «کورد و هەقەی رامبۆ ل ٢٤ وەری گرتوە.

٢- گوتاری پەیامنێری Temps لە ئەنکەرا ١٩٣٧/٨/١٨.

٣- راپۆری پروفیسۆر بیلی ٣/ ١٩٤٤ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلتەرە ٤٠٢١٩ ٣٧١

٤- هەمان سەرچاوە.

٥- دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا. بەزمانی تورکی لە حەلەب- ساڵی ١٩٥٢ بلاو کراوەتەوە، دکتۆر نوری دەرسیمی لە دەوروبەری ساڵی ١٩٧٥ دا لە سوریا کۆچی دوایی کرد، دکتۆر نوری لە ساڵی ١٩١٩ وە لە زۆربەی بزاڤە نەتەوەییەکانی کوردا، بەتایبەتی لەشۆڕشی دەرسیم دا شان بەشانی سەید رەزا، بەشداری کردووە.

٦- هەمان سەرچاوە ل ٢٩١

٧- لە نامەکەی ١٩٣٧/٧/٣١ی سەید رەزادا، شوێنی نووسینی نامەکە بە دەستەواژەی «دەرسیم، کوردستان» دیاریکراوە. ئەم نامەیە بەتایپ و بە زمانی فەرەنسی نووسراوە و بۆ «وەزارەتی کاروباری دەرەوە» ئاراستە کراوە بۆ ئەوەی نێری دەوڵەتی مەبەست هێنرابێ، ئەو نوسخەی دووەمە و بە ئیمزای «سەید رەزا»یە، لە گوێنە سەید رەزا عەینی ئەم نامەیەی بۆ ژمارەیەک لە وەزارەتخانەی کاروباری دەرەوەی وڵاتانی ئەورووپایی ناردبێ، ئەو نامەیەی کە بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان نێردراوە تا ١٩٣٧/٩/٢١ نەگەیشتوەتە جێ، بە گوێرەی نووسراوی فەرمانبەرێکی وەزارەتخانەی ناوبراو، نامەکە لە زەرفەکەیدا نەبووە، بەمجۆرە نەزانراوە چ کاتێک گەیشتوەتە لەندەن، دەوڵەتی ئینگلستان، لە وەڵامدا نامەیەکی بۆ دەوڵەتی تورکیا دەنێرێ و دڵنیای دەکات کە وەڵامی ئەو نامەیەی نەداوەتەوە. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٢٠٨٦٤ ٣٧١.

٨- دکتۆر نوری دەرسیمی، ل ٢٧٠.

٩- هەمان سەرچاوە ل ٢٧٢

١٠- حەسەن ئەرفەع، کوردەکان، ل ٤٢ بە گوتەی دکتۆر نوری دەرسیمی، کۆمەڵە پێشمەرگەیەک، بەسەرکردایەتی مەسیح ناوێک (کوری محەمەدەمین بەگ کە پەنای وەبەر سوریا بردبوو،) تا ١٢ کیلۆمەتری دیاربەکر پێشڕەویان کرد.

١١- لوتان ١٩٣٣/٨/١٨.

١٢- دکتۆر نوری دەرسیمی ل ٢٧٤، دکتۆر دەرسیمی لێرەشدا مێژووەکە بە وردی دەستنیشان ناکات.

١٣- مێژووی ئیحتیمالییە.

١٤- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣٧/٧/١٦ی سەفیری بەریتانیا، وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ٢٠٨٦٤ ٣٧١

١٥- دکتۆر نوری دەرسیمی ل ٢٩٠.

١٦- لوتان ١٩٣٧/٨/١٨.

## فەسڵی یەکەم:

## یەکەمین شۆڕشێن بارزانی و سەرهەڵدانی حیزبان (١٩٤٣- ١٩٤٥)

«هەر نەتەوەیەکی زیندوو کە بۆ ماوەیەکی زۆر بکەوێتە بن دەستی داگیرکەرێکی بێگانە، ناچارە هەموو هێزێن خۆ، هەموو خەباتێن خۆ، دژی ئەم دژمنە بێگانەیە بەکار بێنێ. ژنەگی ناوەوەی ئیفلیج دەبێ، و توانای هەوڵی ڕزگاری کۆمەڵایەتی لێ دەبڕێت.»
کارل مارکس.

پاش شکستی شۆڕشی دەرسیم کە لە دوای هەرەسی شۆڕشی «کۆماری ئارارت» هات، ئیدی کوردستانی تورکیا لە کاروانی بزاڤی نەتەوەیی کورد دابڕا، هەموو ڕێبەرانی سیاسی و ئایینی کوردستانی تورکیا کوژران یان لە سێدارە دران و یان تیرباران کران و هەموو کادر ونیشکەرانی، (مەبەست لەو کادرانەیە کە لە هەر بزاڤێکی ئازادیخوازی نەتەوەییدا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن، لە نێو چوو بوون، خوێنەوار و ڕۆشنبیران لە ژێر ئازار و ئەشکەنجە دابوون:لە سێدارە دەدران یان فرێ دەدرانە نێو دەریاچەکانەوە.»[1]

دوای یەک چارەکە سەدە، واتە زەمەنی پێویست بۆ پێشگەیشتنی نەوەیەکی نوێ لە کادران، ئەوجا کوردستانی تورکیا لەم خەوی نیمچە مەرگە بێدار دەبێتەوە.

لەم میانەدا، دەتوانرێ بگوترێ کە لە تهران و عێراق دا حیزبێن سیاسی کورد لە ژێر کاریگەری ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆی ئایدۆلۆژیای مارکسیستی دا سەرهەڵدەدەن، خەبات لە ڕای ئازادی کوردستان درێژە دەکێشێت.

بەڵام لە هەمان کاتدا پیاوێک لەسەر شانۆی سیاسەتی کوردستان دەرکەوت کە قەدەر وای هێنا سی ساڵی تەواو دەستی بەسەریدا بڕوات و ببێتە مایەی هەڕەشە لە بەرمەنەندن و مانەوەی ئەم حیزبانەی کە هاتبوونە ئاراوە.

سلێمانی مەڵبەندی سەرەکی کوردایەتیە، لێرەدا و لە قۆناغی پێش یەکەم جەنگی جیهان دا، زۆر گروپی نەتەوەیی دێنە ئاراوە، کە چوونە بنج و بناوان و دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەیان زۆر ئەستەمە، بەتایبەتی هەندێکیان کە لە چەند کەسێک تێناپەڕن و زۆر جار یەک کەس لە هەمان کاتدا ئەندامی چەند ڕێکخراوێکی جیاوازە.

**برایەتی:**

لە ساڵی ١٩٣٧ دا دوو ڕێکخراو، نەتەوەپەروەرانی کوردیان لە خۆ گرتبوو. کۆمەڵەی «برایەتی» کە شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود دایمەزراندبوو، لەسەر هەمان شێوە و شێوازی کۆمەڵە و یانە کوردییەکانی قەستەنتەنییە دامەز[illegible]، بەتایبەتی لە ڕووی وەرگرتنی ئەندامی بورژوای بە تەمەن و خانەدانانەوە، محەمەد سەدیق شاوەیس (بابی نوری شاوەیس)، ئیسماعیل حەقی شاوەیس (مامی ئەو) و مەلا ئەسعەدی مەلای سلێمانی. [illegible]م ڕۆشنبیرە شارییانە لە ڕاستیدا دەورێکی گرنگ دەبینن، بۆیە برای یەکێک لە سەرانی کورد، کە لە سلێمانی دا دەست بەسەر و دوور خراوە بوو، لە کۆبوونێن نهێنی ئەوان دا بەشداری دەکات.[٢] ئەم کەسە مەلا مستەفای بارزانییە.[١]

مەلا مستەفا کە ڕۆژگار وای کردبوو بۆ ماوەی سی ساڵان بەسەر شانۆی سیاسەتی کوردستاندا زاڵ بێ، پاش ئەوەی مەشقی سوپایی لە نک شێخ ئەحمەدی برای و لە چیاکانی کوردستاندا تەواو دەکات، لە ڕێگەی بورژوایانی کوردێن «پایتەختی فیکری» کوردستانی عێراقەوە، ئاشنای سیاسەت و سیاسەتکاری دەبێ.

**ڕێکخراوی «دارکەر» Darker**

«برایەتی» ڕێکخراوی تایبەتی سەران و پیاوماقوڵانی کورد بوو، جێی لاوانی هەواداری حیزبی کۆمۆنیستی عێراق و ریفۆرم خوازانی (گرووپی بەغدای)[٣] تێدا نەدەبووەوە، حیزبی کۆمۆنیستی عێراق لە ساڵی ١٩٣٤ دا دامەزرابوو.

لەساڵی ١٩٣٨ دا نەوجەوانانی سلێمانی کە لەڕووی تەمەن و بیرەوە لە ڕێکخراوێکی دیاری کراو لەلایەن برایەتیەوە ناسراو بە «ئازادی کورد» یەکیان گرتبوو، ڕێکخراوی سێیەمان بەناوی ڕێکخراوی «دارکەر» دامەزراندبوو. ئەم ڕێکخراوە لاسایی کردنەوەی ڕێکخراوی کاربۆنارۆی ئیتالیا بوو. (Carbonaro): زوخاڵکەر (ڕەژوکەران) بەمانای رەژوکەر دێت. ئەمە تاقمێکی شۆڕشگێر بوو کە لە دەورەبەری ساڵی ١٨١١ دا دامەزراو، ئامانجی بریتی بوو لە یەکخستنی ئیتالیا و دامەزراندنی حکومەتی کۆماری، ئەم تاقمە بۆیە پێیان دەگوترا، ڕەژووکەر چونکە کۆبوونەوەکانی خۆیان لە نێو ڕەژووکەرەکاندا دەکرد و زمان و زاراوە تایبەتیەکانی ئەوانیان بەکار دێنا.)

دامەزرێنەرانی ئەم ڕێکخراوە بریتی بوون لە نوری شاوەیس، کە لە ئایندەدا بوو بە

ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانی سەر بە بارزانی، یونس رەوفی شاعیر، کە خودانی سروودی نەتەوەیی کورد (ئەی رەقیب)ە و پاشان چووە ریزی حیزبی کۆمونیستی عێراقەوە، عەبدوڵڵا تۆفیق جەوهەر. چونکە ئەندامی کۆمەڵەی برایەتیش بوو، پاشان لە رێکخراوی دارکەر دەرکرا.

(دارکەر) تەنێ گەنجی خوێنەواری بە ئەندام وەردەگرت کە دەکرێ بە تایبەتی نێوی ئەمانە لەم رووەوە ببرێن. روستەم جەباری، کە ئەوقاتێکی خەڵکی هەولێر بوو، مستەفا عوزێری فەرمانبەری دەولەتی بوو، خەڵکی هەولێر بوو کەپاشان بوو بە قازی و پارێزگار، ئەم رێکخراوە رێکخراوێکی چەپی تەواو بوو.

بەپێرەوو بەرنامەکەی شەقلێکی نەتەوەیی بێ غەل و غەشی هەبوو. خەبتێن لە رێی ئوتونومی کوردستانی عێراق و سەربەخۆیی هەموو کوردستان، هەروەها مۆرکێکی هەبوو کە پتر رەنگدانەوەی کاریگەری و دەسەلاتی حیزبی کومونیستی عێراق بوو، لێ ئایدیولوژیای ئەم رێکخراوە زۆر روون نەبوو. «ئێمە دژی فاشیزم و هیتلەر و لایەنگری دیموکراسی و ئەیاری ئیمپریالیزم، بەتایبەتی ئەیاری ئینگلیزەکان بووین»[4]

ئەمە قۆناغێک بوو کە حیزبی کۆمونیستی عێراق لە ئەنجامی ناروونی ئایدولوژی خۆی و لە ناکامی ئالۆزکاوی ئایدولوژی ئەو گروپانەی کە لە ژێر کاریگەری ئەودابوون، بەسەرچەند باڵ و لاباڵ و گروپ دا دابەش بوو بوو!

بەڵێ ئیدی «دارکەر» لە دەرێی سلێمانی دا بلاو دەبێتەوە و لەساڵی ۱۹٤۰ دا شانەی نهێنی لە هەولێر و خانەقین و بەغدا و موسڵ دا دادەمەزرێن.

## ۱

## دامەزراندنی هیوا

لەساڵی ۱۹٤۱ داو دوای شۆرشی رەشید عالی گەیلانی (لە هەیڤێن چار و پێنج) و پاش پەیوەندی کردنی رەفیق حیلمی بە «دارکەر»ەوە بەرپرسانی رێکخراوە جیاوازەکانی کورد لە کۆنفرانسێک دا لێدەبرێن، رێکخراوەکانی خۆیان لەیەک حیزب دا بەناوی «هیوا» یەک بخەن. ئەم رێکخراوە تازەیە هەموو تێکۆشەرە نەتەوەییەکانی کورد لە دەوری یەک خر دەکاتەوە. رۆشنبیران، خوێندکاران، قوتابیان، کرێکاران «کۆمپانیای نەوتی کەرکوک و سکەی قیتار) جوتیاران و ئەفسەران، کە رۆڵێکی یەجکار گرینگ دەبینێ.

بارەگای حیزب لە دەرێی کوردستان، واتە لە بەغدایە، و حیزب لەشارە گەورەکانی

کوردستان (کەرکوک و هەولێر و سلێمانی و) لقی هەن، گۆڤارێک بە نێوی ئازادی بڵاو دەکاتەوە. کە بابەتی نزیک لە بابەتەکانی حیزبی کومونیستی عێراق بڵاو دەکاتەوە. باڵی چەپی «هیوا» بە ئاشکرا کومونیستە.

رۆڵی بنەرەتی «هیوا» پاشان دەبێ بەوەی کە یارمەتی و هاوکاریی مەلا مستەفا بارزانی بکات. کە لەساڵی ۱۹٤۳ دا لە سلێمانییەوە را دەکات. بەڵام ئەم حیزبە تازەیە لە دامەزراندنی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان»ی کوردستانی ئێرانیشدا رۆڵێکی گرینگ دەبینێ.

مەلا مستەفا بارزانی دوای ئەوەی چەند مانگێک «دەگەڵ شێخ ئەحمەدی برای و خێزانەکەیان» دا لە تاراوگەی ناسریە بەسەر دەبات. سەرەنجام و لە ساڵی ۱۹۳٦ دا بۆ سلێمانی گوێزرا بووەوە، ئێستاش پتر لە شەش ساڵ بوو لەم شارەدا بێ تاقەت و نارەحەت چاوەنۆڕی دەلیڤەیەکی دەکرد.

ئەو موچەیەی کە دەوڵەتی بەغدا بەو پەڕی چاو تەنگییەوە بۆی بڕی بووەوە، بەهۆی ساڵانی جەنگەوە وا بێ بایەخ بوو لە نرخی ئەبودا بوو، بەهاو نرخی خواردەمەنی دەقات زیادی کردبوو، بە گوێرەی راپۆرتێک مەلا مستەفا هەر زوو «هێندە ئاتاج بوو» «کەوتە تەنگانەیەکی بێ پارەیی وەهاوە کە دوور نەبوو لە پێناوی ژیاندا پەنا وەبەر تاوانکاری بەرێ»(٥)

هەر هەموو ئەو کەسانەی کە بازوانییان دەبینی لایان عەیان بوو کە چاوەڕوانی دەلیڤەیەکە کە لە شار هەڵبێ. بەڵام «ترسی ئەوەی نە وەک بگیرێ، هەروەها خەمی شێخ ئەحمەدی برای»(٦) بۆ ماوەیەک دەست و پێیان بەستەوە.

## ٢

## راکردنی بارزانی (۱۹٤۳/۷/۱۳)

مەلا مستەفا بارزانی چل ساڵان بوو، لە پیاوێکی چالاک وچەلەنگی بە تەبیعەت و خووی ئەو وەکو چاوەنۆڕ نەدەکرا. باقی تەمەنی خۆی لە وەزع و حاڵێک دا بەسەر بەرێ کەلە مەرگی زیندوو دەچوو.

لەباری سیاسیشەوە هەڵ و مەرج و وەزع و حاڵ لەوەی چاتر نەدەبوو، لە دوای کودەتا ناکامەکەی رەشید عالی پەیوەندی نێوان ئینگلیز و بیرێن گشتی عێراق هەر خراپ بوو، تا سەرکەوتنەکانی ساڵی ۱۹٤۳ زۆربەی هەرە زۆری رۆشنبیران باوەڕیان بەسەرکەوتنی

هێزێن «تەوەرە» بوو.[٧] ئینگلیزەکان لە پەنای «مەسەلەی کوردەوە» کوردەکانیان هان دەدا بێنە سوپای بەریتانیاوە.[٨]

هەڵبەتە حوکم و دەسەلاتی دەوڵەتی عێراقیش لە باکووری کوردستاندا لە باری پراکتیکیەوە سفر بوو،

جەنەراڵ بارزانی ئاینده لە ١٩٤٣/٧/١٣ بە یارمەتی شێخ لەتیف کە بەخۆی دە رۆژ لەوە دوا لە شار هەلات، لە سلێمانی وەدەر کەوت و بۆ ئەوەی تووشی هێزی ئاسایشی نێوخۆیی عێراق نەبێ، خۆی بەئێراندا کرد و سەرەنجام گەیشتەوە دەڤەری بارزان.

## ٣
## گفتوگۆ

بارزانی خۆی گەیاندە ناوچەیەک کە زۆر شارەزای بوو، هەمان ئەو ناوچە و دەڤەرەی کە لە سالانی ١٩٣١،١٩٣٢، ١٩٣٤ شەری عێراقیەکانی تێدا کردبوو، واتە ناوچەی نێوان روکوچک و شەمدینانی سەر سنووری تورکیا.

وەکو لە راپۆرتێکی سیاسی بەریتانیادا[٩] دووپات کراوەتەوە،لەسەرەتادا رەفتاری «جێی ترس» نەبوو. بارزانی دەرگای دانوستاندن دەگەڵ دەسەلاتداران دا دەکاتەوە و داوای ئەنجامدانی ریفورم و چاکسازی دەکات و هەوڵیش دەدات لە گەڵیاندا پێک بێت.

لەم زەمانەدا وەوشی ئەم بەشەی کوردستان زۆر مەترسیدارە، گوندەکان چۆڵ و هۆڵن و کەسیان تێدا نییە، هەندێک لەو گوندانە وێرانەن، لە سەرتاسەری ناوچەکەدا شوێنەوارێکی کشتوکاڵ نیە، برسێتی و پەریشانی لە رادەبەدەرە.

گەندەڵی کارمەندانی دەوڵەت لە دەست دەرچوو بوو، پارێزگارانی هەولێر و موسڵ هەرگیز پێیان نەنابووە ناوچەکە.

وەزعی رێگاو بانان کە باشتر وایە مالاتە رێیان پێ بگوترێ زۆر خراو بوو، زۆربەی بینا گشتیەکان (قوتابخانەو خەستەخانە و...) وێران بوو بوون.[١٠]

رەوشی پەروەردە و فێربوون و تەندروستی لە کوردستاندا تەنانەت لەو ناوچانەش دا کە ج پەیوەندییەکان بە سیاسەتەوە نەبوو، یەکجار دڵتەزێن بوو، بەپێی گوتەی کوردێک کەنەفی میسر کرابوو، لەسالی ١٩٤٦ دا لە هەر هەموو ناوچەکانی کوردستانی عێراق دا (تەنیا شەست قوتابخانە هەبووە و لەو شەستە تەنیا دوو قوتابخانەیان ناوەندی بوون،

سی قوتابخانەیەک لەمانە دەرسی ئۆناغی سەرەتایان تێدا دەگوتراوە و ئەوانی دی زارۆکستان بوون»[١١]

روون نییە کە داواکانی بارزانی لەم گفتوگۆیانەدا چ بووە، لێ ئەو راپۆرانەی کەبۆ بەغدا دەنێردران، هەمان چارەنووسی ئەو قەوالانەیان دەبوو کە بۆ ئەرشـ ـی دام و دەزگای کاغەز دەنێرران، لەسەر یەکتر کەڵەکە دەکران بێ وەی کەسێک لێیان بپرسێتەوە.

٤

## پچڕانی پەیوەندییان

لە ئەیلولی ١٩٤٣ دا سەعید بیرخی [٢] کە یەکێک دەبێ لە «یاغیانی» تورکیا، دێتە عێراق و مەلا مستەفا بارزانی بەهاتنی ئەو پیاوە بەهێز دەبێ، دوای ماوەیەکی کەم «رووداوێکی ئاڵۆز»[١٢] دەقەومێ، بێ ئەوەی کەس بزانێ کێ یەکەم تەقەی کردووە. بارزانی یان جەندرمە.

لەوە بە دواوە رەوتی رووداوەکان خێرا دەبێت، بارزانی جەندرمەکانی ناوچەی نێوان بارزان و سنووری تورکیا، ناچار دەکات کە مەخفەرەکانیان چۆڵ بکەن. پاشان لە سەرەتای هەیڤی دەی ساڵی ١٩٤٢ دا لە نزیکی مێرگە سوور، لە قوەتێکی جەندرمەی سەدو پەنجا نەفەری دەدات و ناچاری دەکات پاشەکشە بکات و زیانێکی تا رادەیەک قورسی لێدەدا.

لە کۆتایی هەیڤی دەی ساڵی ١٩٤٣ دا عێراق تیپێکی تێکەڵ (لە پیادە و جەندرمە و زرێ و هێزی فڕۆکەوانی دەنێرێتە شەڕی بارزانیەکان، بارزانی هەنووکە ٢٠٠ خەباتکاری دەگەڵ دایە.

لە ١٩٤٣/١١/٩ یەکەمین شەڕ و پێکادان لەوبەری مێرگە سوور و بە ئامادەبونی جەنەراڵ برۆمیلۆی سەرۆکی «شاندی عەسکەری بەریتانیا لەعێراق» دا روو دەدات.

شەڕ تا ١٩٤٣/١١/١١ لە هێنان Hainan بەردەوام دەبێت. هێزێن عێراقی دەشکێن و شەست کوژراو و بریندار دەدەن و جەنەراڵ برۆمیلۆ موحازرەیەک لەسەر «بێ مەشقی هێزێن عێراقی» دەدات.

## ٥
## بارزانی و ئینگلیزەکان [٣]

لێ بارزانی لەسەر پەیوەندی کرنی خۆی بەردەوام دەبێت و پاش مردنی سەعید بیروخی، کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٣ دا بە دەستی تورکەکان دەکوژرێ، پێشنیاز دەکات کە تەسلیم ببێ، بەمەرجێ سەفیری بەریتانیا زامنی چۆنیەتی تەسلیم بوونی ئەو بێ.

لە راستیدا هەوڵ دەدات، ئینگلیزەکان لە رووداو و مەسەلەکانەوە بگلێنێ.

لەم قۆناغەدا ئینگلیز تەنێ بەرژەوەندییە ستراتیژیەکانی خۆی پەلاوە گرنگ دەبێت، مادامێکی خەتی سوپایی بەریتانیا دەگەڵ ئێران دا نەکەوتۆتە مەترسیەوە، ئیدی دەوڵەتی لەندەن ناخوازێ خۆی لە کێشەی نێوان کورد و عێراق هەڵقورتێنێ، ئەوەتا وەزارەتی دەرێی ئینگلیستان بە زمانێکی تا رادەیەک توند بە کورنوالیسی سەفیری خۆی لە عێراقدا، رادەگەیەنێ «ئەگەر قەرار بێ شەڕی مەلا مستەفا بکرێ، ئەوا دەبێ دەوڵەتی عێراق بەخۆی بچێتە ژێر ئەو بارە، ئەگەر دەوڵەتی عێراق نەتوانێ رووبەرووی ئەو وەزع وحاڵە بێتەوە و دەرقەت نەیەت، ئیدی هیچ ماقوڵ نیە ئێمە لەبەر خاتری پاراستنی ئەو خۆمان گیرۆدەی کریارێن عەسکەری بکەین.»(١٣)

کورنوالیس چەندین جاری یەک لەدوای یەک دەوڵەتی عێراق ئاگادار دەکاتەوە، لەم بارەیەوە هێندە توندرەوی دەکات، تا جارێک لە دیدارێکی دا دەگەڵ سەرەک وەزیراندا پێی دەڵێ « هەر هەمور ئەم کێشانە ئەنجامی بێ توانایی و بێ دەسەڵاتی دەوڵەتی عێراقە» کە شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفای بە «موچەیەکی کەم» و «بێ چ ئومێدێک بە ئاینده» لە سلێمانی دا هێشتنەوە.(١٤)

کورنوالیس سەرەک وەزیرانی عێراقی ئاگادار کرد کە هەمور دەڤەری بارزان و کۆمەڵێک ناوچەی دیکەی باکوری کوردستان لە «حاڵی قات و قڕی وگرانی» دان و دەوڵەتی عێراق، ئەگەرچی زۆر جار لەمە ئاگادار کراوەتەوە، لەم بارەیەوە هیچی نەکردووە.(١٥)

لێ لە هەیڤی دوانزەی ١٩٤٣ دا ئینگلیزەکان ترس لەسەر کەوتنەکانی بارزانی پەیدا دەکەن و بۆ پاراستنی نەفسەرێن پەیوەندی خۆ و ئوردوگای «قوەتی ناوچەیی» ئاشووریەکان چەند یەکەیەکی زرێ بۆ دیانای Diana نزیکی رەواندز دەنێرن. پێشتر داوایان لە عێراقیەکان کردبوو کە هێزەکانیان لە ناوچەکە بکشێننەوە.

وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا داوا لە کورنوالیس دەکات کە بارزانی لەوە حالی بکات کە «کارەکانی خەریکە بەرە بەرە تەنگ بە هەوڵە جەنگیەکانی دەوڵەتی خاوەن شکۆ پاشای ئینگلستان هەڵدەچنێ»[١٦] لێ بارزانی خۆی لە پەلاماردانی دیانا دەپارێزێ.

لە ١٩٤٣/١٢/٦ دا «هیوا» بەیاننامەی «بارەگای گشتی» ـلی کورد بۆ «خەڵکی ئابرومەندی عێراق» و دژی سیاسەتی دەوڵەتی عێراق، وەکو دێسـتاتوریەتێک کە لە «سایەی ئاتلانتیک بەرخوردار بووەو هاتۆتە بەرە» بلاو دەکاتەوە.[١٧]

ئێـوە، بڕ ئی بارزانی لەوە دەرچووە کـە تەنێ شـۆڕشـێکی چەکـدرانەی سـادە بێ، لە روانگەی سـیاسیـەوە رەونەقـێکی وەهای پەیدا کـردووە کـە بووەتە مـایەی نیگەرانی دەسەلاتدارانی ناوچەکە لە نیوەی هەیڤی دوانزەی ساڵی ١٩٤٣ دا کورنوالیـس سەر لەنوێ دەگەڵ سـەرەک وەزیر «نوری سـەعیـد» و جێگری تەختی پاشایەتیـدا دیدار دەکات و ئاگاداریان دەکاتەوە کە «بەدکارانی کورد» خەریکە سوود لە شۆڕشی بارزانی وەردەگرن، هەروەها لەوەشیان ئاگادار دەکاتەوە کە بزاڤی سەربەخۆخوازی کورد لە تەشەنە کردندایە و بەرەو ئەوە دەچێ هەموو کوردستان بگرێتەوە و ئەمەش «مەترسیەکی جدییە».

کورنوالیس لە راستیدا ترسی لەمەیە کە بزووتنەوەی بارزانی «گەندەڵی» وەزع و حاڵی لە سەرلـەری کوردستاندا بە دوودایێ و ئەو گەندەڵیـە بۆ «چەکدارانی لیوی» سرایەت بکات و پارلستنی ناوچە ئەوتییەکان زەحمەت و ئەستەم بێ.

## ٦

## نامەی نێوان بارزانی - کورنوالیس

کورنوالیس، نامەیەک بۆ بارزانی دەنووسێت و بە زمانێکی توند دڵنیای دەکات کە بەم «کارانەی هەوڵە جەنگییەکانی ئینگلیز دەخاتە خەتەرەوە» و داوای لێدەکات کە تەسلیم بێ.[١٨]

نامەکانی بارزانی بۆ سەفیری بەریتانیا نیشانی دەدەن کە بارزانی هەموو ئومێدی لەسەر موداخەلەی بەریتانیا بووە، بەلام چ ئاکام و ئامانجێکی نەبووە.

ئەم تاقە قەواڵەیە ( کە بۆ یەکەمجارە لەم کتێبەدا سوودی لێوەردەگیرێ) پەیوەندییێن نێوان بارزانی و بەریتانیا لە ساڵانی ١٩٤٣-١٩٤٤ دا، بەتایبەتی لەو سەروبەندەی «هیوا» پشتیوانی سەرەکی بارزانی بوو و زۆر دژی ئیمپریالیزم و دژی ئینگلیز بوو، لە رووبەکی تازەیەوە نیشان دەدات.

له ۱۹٤۳/۱۲/۲۳ دا بارزانی دوای وەرگرتنی نامەیەکی کورنوالیس، لە نامەیەک دا «بەبۆنەی سەری ساڵی دیانانەوە پیرۆزبایی لێدەکات، لە خواوەند دەپارێتەوە «کە بەسەرکەوتنی سوپای بەریتانیای گەورە (بەسەر لەشکری ئەڵمانی دا) کە ئاوات و ئارەزووی هەموو خەڵکێکی باشە، سەرمان بخات و لە خێروبەرەکەتی جەژنی راستەقینە بێ بەش نەبین.»

بەڵام لەم نامە و نامەکارییەدا، نامەیەک کە لە هەمووی سەیرترە بێ چەند و چۆن نامەیەکە کە بارزانی لە رۆژی ساڵی نوێدا بۆ سەفیری بەریتانیای دەنێرێ و لەو نامەیەدا خاترجەمی دەکات کە هەر ئەمرێکت هەبێ، من وەکو منداڵێک کە گوێڕایەڵی بابی میهرەبان و دڵسۆزی بێ، گوێڕایەڵی دەبم»

بارزانی بە دووپات کردنەوەیەکی، بێگومان رۆژهەلاتییانە لەسەری دەڕوات کە ئەو «ئەوپەڕی متمانەی بە خاوەن شکۆی ئێوە هەیە» وەهەستی دۆستایەتی ئێمە سەبارەت بە دەوڵەتی میهرەبانی بەریتانیا سنوور و کەوشەنی نییە.»

بارزانی دوای تاوانبار کردنی دەوڵەتی عێراق بەمەی کە ئەوی ناچار کردووە « بەرگری لەخۆی بکات» دووپاتی دەکاتەوە کە بەڵێنی عەفواتی دەوڵەت «فێڵێکی زاڵمانەیە» و هیچی دی. داوا لە کورنوالیس دەکات ئەفسەرێک - میجەر ستینگ- بۆ تاقیب لەمەڕ روشەکە بۆ ناوچەکە بنێرێ و بە زمانێکی پڕ لە تکاکاری و بچوکی وەها کە قابیلی تەرجەمە نییە، قەوڵ دەدات کە لە راو قسەی ئەو دەرنەچێت، بارزانی دەنووسێت: «بەهەر حاڵ ئێمە ئەمرێ دەوڵەتی خاوەنشکۆی ئێوە بە شانازییەوە لەسەر سەروچاومان دادەنێین» وەرگێڕی سەفارەت ئەم رستەیەی بەمجۆرە تەرجەمە کردووە: «ئێمە شانازی بەمەوە دەکەین کە بەرانبەر بە فەرمانێ خاوەن شکۆ، بەگوێڕایەڵییەوە سەردانەوێنین»[18]

له ۱۹٤۳/۱۲/۲۷ دا بارزانی لە وەڵامی هۆشدارنامەیەکی کورنوالیس دا سەرلەنوێ داوای لێدەکاتەوە کە ئینگلیزەکان بەشداری لە ئەنجامدانی تاقیق و تاقیبی «سکاڵاکانی» ئەو بکەن و داوا لە سەفیر دەکات دەستور بە دەوڵەتی عێراق بدات کە ئەو عەفوو بکەن و لایەنگرانی ئازاد بکەن. بە کورتی حوکمڕانی و چاودێری ناوچەی بارزان بەو بسپێدرێتەوە.

کورنوالیس داوا لە کاربەدەستانی عێراق دەکات کە بایەخ بە مەسەلەی کورد بدەن و پەیوەندی بە سەرانی کوردەوە بکەن و تەنانەت پێشنیاز دەکات کە شێخ ئەحمەدی بارزان و شێخ مەحمود وەکو سیناتۆر لە ئەنجومەنی سەنادا دابنرێن.[19]

## ٧
## ناوبڕیوانی ماجید مستەفا

نوری سەعید لە ئەنجامدا تەسلیمی گوشاری ئینگلیزەکان دەبێت و لە ١٩٤٣/١٢/٢٥ لە تەعدیلێکی وەزاریدا ماجید مستەفا کە لە پیاو ماقوڵانی سلێمانی دەبێت، وەکو وەزیری راوێژکار لە کابینەی تازەدا دادەنێ.

کەم کەس هێندەی ماجید مستەفا بەر دادوەری جۆراوجۆر و ناکۆک کەوتون، خەباتکارانی «هیوا» حەزیان لە چارەی نەدەکرد و بە کرێ گرتەی ئینگلیز و بە «خاین»یان دەزانی.[٢٠]

ئەو پێشنیازانەی کە ماجید مستەفا دەیانخاتە بەردەستی دەوڵەت، لەلایەکەوە سەرەک وەزیران پەسندی دەکات و لەلایەکی دیکەوە ئەندامانی کابینە دژی دەوەستن و ئەمە بۆ خۆی دەبێتە مایەی قەیران دەنێو کابینەدا.

شتێکی ئەوتۆ لەمەڕ کرۆک و جەوهەری ئەم پێشنیازانە لەبەر دەست دا نییە، چونکە ئەم پێشنیازانە بە پێی ئەو کەسەی کە ئاراستەی کراوە، دەگۆڕێن.

ماجید مستەفا بە پێی بەڵگە و بۆچوونی سیاسی و تاکتیکی، دژی ئەوەیە کە پەناوبەر زۆر وزۆداری ببردرێ، بە بۆچوونی ئەو بە حوکمی تەبیعەتی ناوچەکە و کەمی هێز و بوونی کۆمەڵێکی باش لە شۆرشگێڕان و یەکبوونی رێبەرانی شۆڕش، هەر هەوڵێک بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕش بە توندی و زۆدارەکی، شکست دێنێ.

دەربارەی چارەنوسی سەرانی بارزانی ماجید مستەفا پێشنیازی کرد کە شێخ ئەحمەد بۆ بارزان بگەڕێنرێتەوە و مەلا مستەفا لە گوندێکی «دووری ناوچەکانی شۆڕش ئاکنجی بکرێ» ماجید مستەفا لە کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی وەزیران دا، بەمجۆرە پاساو بۆ «عەفوکرنی» شێخ ئەحمەد و محەممەد سەدیق دێنێتەوە، بەرای ئەو گەڕانەوەی دوو برا لەو سێ برایە بۆ ناوچەکە دەبێتە «مایەی دڕدۆنگی و ناکۆکی لە نێوانیاندا وسەرکردایەتی شۆڕش لاواز دەبێت» چونکە وەکو ئەو دەڵێ «هەرسێ برا بەردەوام لەسەر رێبەرایەتی بزووتنەوەکە، لە شەڕدان» و گەڕانەوەی دوو دوورخراوە «لایەنگرەکانیان سارد دەکاتەوە و لە ئامانجە هاوبەشەکەیان دوور دەخاتەوە.»[٢١]

ماجید مستەفا، لەگەڵ ئەمانەشدا داوا لە دەوڵەت دەکات بۆ چاککردنەوەی رێگاو بان و خەتی تەلەفۆنی ئاکرێ و ئامێدی تا بەلەی نزیکی بارزان وبۆ دامەزراندنی مەخفەر و

پاسخانەی «مکوم» و هەروەها بۆ دابەشکردنی ئازوقـە بە خۆرایی یان بە نرخی هەرزان بەسەر خەڵکدا، خەڵکانی هەندێ بە ئیحتویاری بە گەڵ بخەن.

سەرەنجام، وەزیری راوێژکار (ماجید مستەفا) بۆ کەمکردنەوەی دەسەلاتی شێخ ئەحمەد خوازیاری سەقامگیری «دام و دەزگایەکی بەراستی ناوخۆیی» دەبێت و لەبەردەم دەستەی وەزیران دا دووپاتی دەکاتەوە کـە «ئەم کـارانە ئەگـەر نەبنە مـایەی بەدەسـتـهێنانی سەرکەوتن، ئەوا کاری سەرکوتکردنی ئایندەی شۆڕش ئاسان دەکەن»

لە ١٩٤٤/١/١٠ دا دیدارێک دەنێوان ماجید مستەفا و مەلا مستەفا و سەرانی دیکەی کوردا، لە نزیکی مێرگەسوور چێدەبێ، سێ روایەت لەمەڕ پێشنیازەکانی ئەم وەزیرە کوردە هەن، راپۆری خۆی بۆ ئەنجومەنی وزیران، راپۆری کورنوالیس بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، وریوایەتی کوردەکان.[٢٢]

یەکێک لە پێشنیازەکانی ماجید مستەفا کە کاریگەری گەورەی لەسەر بزووتنەوەی کورد هەبوو، بریتی بوو لە دامەزراندنی ژمارەیەک لە ئەفسەرێن کورد وەکو ئەندامێن پەیوەندی و بەمەبەستی بەردەوامی بەخشین بەکاری ئارامسازی ناوچەکانی سنوری چاودێری و سەرپەرشتکاری خۆی.

دەوڵەتی عێراقی ئەم دەستکەوتانە بە هەندناگرێ و بەگرینگیان نازانێ، لێ تا رادەیەکی زۆر گرنگن، «شۆڕشڤانان» لەو «عەفواتەی کە دەدرێ سوود وەردەگرن، ئەگەرچی مەخفەری جەندرمە لە ناوچەکە دادەمەزرێن، بەلام سوپا و لەشکر لە مێرگەسوور نامێنێ.

## ٨

## راگەیاندنی دەربڕینی گوێڕایەڵی بارزانی لە بەغدادا،

بارزانی لە ١٩٤٤/٢/٢٢ دا دەگەڵ ژمارەیەک لە سەرانی عەشایەردا کە یەکێک لەوانە فەتاح ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی هەرکی دەبێت، لە بەغدادا گوێڕایەڵی خۆیان بۆ دەوڵەت راگەیاند و بۆ ماوەی چەندین رۆژ پێشوازییەکی شاهانەیان لێکرا.

بارزانی لەو ماوەیەدا کە لە بەغدا دەبێت، دیدارێک دەگەڵ سەفیری بەریتانیا دا دەکات، لەم دیدارەدا سەفیری بەریتانیا ئاگاداری دەکاتەوە کە ئەکات لە ئایندەدا چ سەرەڕۆییەک بکات و هەوڵی داهێو باوەڕی پێ بێنێ کە دەوڵەت رێبازی خۆی دەگۆڕێ و بەڕێوەبردنی باکور چاک دەبێت.

دیداری سەرانی کورد لە بەغدا، پتر لە دیدارێکی رەسمی دەچێت تا لە «راگەیاندنی

گوێرایەڵی» بەلای کورنوالیسی گەورە سەفیری بەریتانیاوە. ئەو هەڵومەرجەی کە شۆڕشی بارزانی تێیدا چێ بووە «بە ئاشکرا ئەنجامی لاوازی دەوڵەتە»

لێ ئەم پێشوازییە گەرم و گوڕە بەدڵی عەرەبە نەتەوەییەکان نابێ و تووڕەیان دەکات و بارزانی ناچار دەبێ ماوەی مانەوەکەی لە بەغدا کەم بکاتەوە. لە هەمان کاتدا بە هاندانی کۆشکی پاشایەتی لە ئەنجومەندا گلەیی لە سیاسەتی ماجید مستەفا دەکرێ.

## ٩

## ژلوان بوونەوە

زوو بە زوو وەزع و حاڵەکە خرا دەبێتەوە و لە نیوەی مانگی نیسانی ١٩٤٤ دا کورنوالیس بەنیگەرانییەوە رای دەگەیەنێ کە لە چەند مانگی رابردوودا، کارێکی ئەوتۆ سەبارەت بە بەردوامبوونی ئارامسازی کوردستان ئەنجام نەدراوە و بەر لەچوونی جێگری پاشایەتی (عەبدول ئیلاه) بۆ کوردستان کە قەرار دەبێ لە نزیکی ئامێدی و رەواندز دا دەگەڵ سەرانی عەشایەر دا دیدار بکات «گفتوگۆی دووروودرێژەی دەگەڵ دا دەکات.

لە هەمان کاتدا واتە لە ١٩٤٣/٤/٢٤ دا (دەبێ مەبەستی ساڵی ١٩٤٤ بێ. - وەرگێری کوردی-) نامەیەکی تازەی بارزانی پێدەکات کە بارزانی لەنامەکەدا گلەیی و سکاڵای ئەوە دەکات کە بەڵێنەکانی دەوڵەت سەبارەت بە چاککردنی وەزع و حاڵی کوردستان جێبەجێ نەکراون و قوەتی تازە ئەفسی عێراقی بۆ مەخفەر و بنکە سوپاییەکان هاتوون.

هەروەها بارزانی چەند نامەیەکی دیکەی لەو بابەتە بۆ نۆزفیسەری سیاسی، (حاکمی سیاسی) موسڵ و ماجید مستەفا دەنێرێ و ئاگاداریان دەکاتەوە کە « هەر کاتێ دەوڵەتی بەریتانیا رێ بدات» ئەوا خۆی و خەڵکەکەی ئامادەن بە دەستی خۆیان مافی خۆیان وەرگرن»

سەفیری بەریتانا داوا لە جێگری تەخت دەکات کە لەکۆبوونەوەی سەرانی کورد لە رەواندز سوود وەربگرێ بۆ دیداری مەلا مستەفا ، بەڵام «خراپی وەزع و حاڵ» بەرنامەی سەردانی ئامێدی هەڵدەوەشێنێتەوە و ماوەی کۆبوونەوەکەی رەواندز، کە بارزانی بەهۆی بارانی توند و ئاگادار نەبوونی لە کاتی کۆبوونەوەکە، نەیتوانی بوو بەشداری تێدا بکات، کورت کردەوە.

١٠

## نوری سەعید و کوردان

لە نیوەی هەیڤی ٥/١٩٤٤ دا نوری سەعید سەفەرێک بۆ کوردستان دەکات، هاورێ دەگەڵ ماجید مستەفا دا سەری یانەکانی ئەفسەران دەدات، بۆ موسڵ و کەرکوک و هەولێر دەروات و قسان بۆ جماعەتی ئەفسەران دەکات و لە قسەکانی دا زۆر بەلای کوردا دای دەشکێنێ و ستایشی نیشتمانپەروەریان دەکات ورایدەگەیەنێ کە ئامادەیە هەندێ لە داواکارییەکانیان بە تایبەتی دامەزراندنی «لیوا»یەکی کوردی جێبەجێ بکات.. و

لە راستیدا سەرەک وەزیر، کە لە دایکەوە کوردە، [٤] هەوڵی دەدا سوود لەو حاڵەتە وەربگرێ کە وەکو بەرگریکاری کورد، خەڵکی ئەتەوەیی میانەرەولە بارزانی جیا بکاتەوە.

دوای ئەوە گفتوگۆیەکی هەندێ توند دەکەوێتە نێوان ئەوو ماجید مستەفاوە، کە پەردە لە سەر نیاز و مەبەستی راستەقینەی سەرەک وەزیر لادەبات.(٢٦)

نوری سەعید داوا لە ماجید مستەفا دەکات لە کوردستاندا بمێنێتەوە و «چەکەکانی بارزانی وەربگرێ» ماجید مستەفا لە وەلاما دەڵێ «مادامێکی خەڵکی بە چاوی خۆیان نەبینن کە دەوڵەت کارێکی بۆ کردون و بەدەنگیانەوە چووە» کاری وەها مەحاڵە.

ئەوجا ئەم گفتوگۆیە سەیرە دەنێوان سەرەک وزیر و وزیری کار وباری کوردستاندا روو دەدات.

نوری سەعید: «ئەمە پەیوەندی بەم مەسەلەیەوە نییە، خۆ ئەمکارە ئێستا و لەم شوێنەدا جێبەجێ ناکرێ»

ماجید مستەفا: «نەخێر، من قەبوڵم نییە، ئەگەر بمانەوێ زەمینەیەکی سایکۆلۆژی لەبار فەراهەم بکەین، ئەم کارە پێویستە، پێت وایە من چۆن دەتوانم ئەم چەکانە کۆ بکەمەوە لە کاتێکدا ئێوە تازە سی چل ئەفسەری کوردتان، تەنێ لەبەر ئەوەی کوردن، لەسەر کار لابردووە؟»

نوری سەعید: «من بە تەما نیم سوپا زویر بکەم و لەبەر خاتری خۆشی مەلا مستەفا، دەست لەکاروباری ناوخۆی سوپا وەربدەم»

بەلام لێرەدا ماجید مستەفا لەسەرەک وەزیر دەپرسێت: «ئێوە تا ئێستا چ کارێکتان بۆ کوردان کردووە؟ نا فەرموون کە تاخۆ تا ئێوە تاقە کارێزێکی پازدە دیناری دروست کراوە؟ چەند کورد لە خوێندنی بالا وەرگیراون؟ چەند کورد بە ئەرکی فێرکاری نێردراون؟ زۆر

شتی دی...»

لێ ماجید مستەفا مل دەداتە خەت و بەمەبەستی گفتوگۆ دەربارەی وەرگرتنی چەکەکان لە بارزانی، دەچێت بۆ دیداری ئەو.

لە نیوەی مانگی ٥/١٩٤٤ دا[٢٧] دیدارێکی تازە لە نێوان بارزانی و ماجید مستەفا دا، بە ئامادەبوونی پارێزگاری موسڵ و مێجەر کینج ی راوێژکاری سیاسی ناوچەکانی باکور چێ دەبێت.

لەم دیدارەدا بارزانی ئایشارێتەوە کە چاودێری جم و جۆڵی مەخفەر و ئوردوگاکانی عێراقییەکانی لە بلە و مێرگەسوور کردووە و ئەمەشی لە ترسی ئەوە کردووە نە وەک، بیانەوێ وەکو سالی ١٩٣١ گەمارۆی بدەن، دووپاتی دەکاتەوە کە تا ئەم ئوردوگا و مەخفەرانە لە ئارا دابن» ئەو ج متمانەیەکی بە دەوڵەت نابێ.»

پارێزگاری موسڵ پێ لەسەر وەرگرتنەوەی ١١ رەشاش و ١٧٢ تفەنگ و ٢٥٠ سەربازی فیرار دادەگرێ.

بارزانی بەردەوام دێتەوە سەر بابەتی عەفوات و دووپاتی دەکاتەوە کە فیرارەکان وابەستەی ئەو نین.

خوڵاسە، ئەم گفتوگۆیە کە شەش سەعاتان دەخایەنێ لە گفتوگۆی کەرولالان دەچێت.!

ئەم رووداوەی کە کینج دەیگێڕێتەوە، چۆنیەتی پەیوەنییە تایبەتییەکانی نێوان بارزانی و ئینگلیزەکان دەسەلمێنێ، لەم گفتوگۆیەدا مێجەر کێنج بارزانی دەباتە لایەکەوە و پێی دەڵێ کە گەمە بە ئاگر دەکات.!

کەبارزانی داوای بۆچوون و رای ئەو لەم بارەیەوە دەکات، کینج پێشنیازی ئەوەی بۆ دەکات کە دد کەس لە فیرارەکان لەگەڵ دە دەوانزە تفەنگ دا بنێرێتەوە و چیتر ئەم هەموو نامە بێ مانایە نەنێرێ.[٢٨]

## ١١

## ئاگر بڕ (٦/١٩٤٤/ - ٦/١٩٤٥)

لە ٣/٦/١٩٤٤ حکومەتەکەی نوری سەعید بە هۆی قەیرانی کوردستانەوە دەروخێت، دیارە ئەمە دەبێتە مایەی نیگەرانی ئینگلیزەکان و دەکەونە خۆ،بۆ ئەوەی بە هەر نرخێ بووە رێگە لە سەرهەڵدانی راپەرین و شۆڕش لە کوردستاندا بگرن.

کورنوالیس لە دیدارێکدا دەگەڵ وزیری تازەی وڵاتدا پێشنیازی ئەوە دەکات کە بەرنامەی چاکسازی و ریفۆرم لە کوردستاندا جێبەجێ بکرێ تا بارزانی وەکو وەدەم رلست و داکۆکی کار لە مافی کوردان) نەکەوێتە بەرچاوان و ئەوە دوورپات دەکاتەوە کە «دەوڵەتی عێراق نابێ، بێ تەگبیری ئەو بڕیارێک بدات کە ببێتە مایەی سەرهەڵدانی کرپارێن عەسکەرییە»[29]

لە کۆتایی مانگی ٧/ ١٩٤٤ دا مێجەر کینج جارێکی دی بارزانی دەبینێ و هەست بە گۆڕانی مامەڵەی ئەو دەکات، بارزانی (توند) بووە، بارزانی تازە کێشەی مەحمود ئاغای زێباری خولستووە و دژمنی دێرینەی خۆی کردووە بە دۆست و دەسەڵاتی خۆی گەیاندوەتە سنورێن ئێران و بەتەمایە داوای یارمەتی لە هۆز و تایفەکانی کوردستانی ئێران بکات.

وەزع و حاڵەکە بە جۆرێکە کە مێجەر کینج پێشنیاز دەکات کاربەدەستانی دەوڵەتی لە ناوچەی زێبار بگوازرێنەوە و سەفارەت «وێڕای ئەوەی کە حاڵی حازر خۆ دور گرتن لە ئاڵۆزییەکانی کوردستان بە سوودی ئێمەیە»[30] بەو پێشنیازە قایل دەبێ و پەسندی دەکات.

دوای ئەم وەزع و حاڵە و بۆ ماوەی چەند مانگێک قۆناغێکی «نیمچە ئاشتی کاتی» و بە شێوەیەکی نا رەسمی باڵ بەسەر کوردستاندا دەکێشێت. هێزێن دەوڵەتی لە باکوری کوردستان دەکێشرێنەوە و ناوچەکە بە کردەوە دەبێ بە خاوەنی ئوتۆنۆمی و بارزانی خۆی بە سەرۆکی کوردستان دەزانێ و بۆ حەل و فەسلی کێشە عەشایەرییەکان تا دهۆک دەڕوات.

لە نیسانی ١٩٤٥ دا سەفیرێکی تازە بە ناوی ستون هەورد بیرد، لە جێی کورنوالیس دادەنرێ.

کورنوالیس لەنامەیەکی دوعاخوازی دا کە بۆ بارزانی دەنوسێت: دڵنیای دەکات کە دەوڵەتی عێراق قانونی عەفوات دەخاتە بەردەم ئەنجومەن و ئەو واتا بارزانی «گەلێک دۆستی هەن کە بەشێوەیەکی هێمنانە و بەرە بەرە یارمەتی دەدەن و هیچ نارەحەت نەبێ.»[31]

ئەنجومەن لە ١٩٤٥/٤/١٠ دا بە زۆرینەی دەنگ یاسای بوردن پەسند دەکات، بەڵام کاریگەری ئەم یاسایە سنووردارە، چونکە هەر هەمور ئەو عەسکەری و پۆلیس و کاربەدەستانەی کە لە شۆڕشی بارزانی دا بەشداریان کردووە قەراری عەفوات نایانگرێتەوە.

ڕۆیشتنی کورنوالیس و کۆتایی نزیکی ململانێ لە ئەوروپادا، هاوتای کۆتایی «پەیوەندییێ تایبەتی» نێوان ئینگلیز و بارزانییە.

سەفیری تازەی بەریتانیا، بۆ دڵنیایی دەوڵەتی عێراقی کە پێدەچێت نیگەرانی ڕەفتاری بەریتانیا، دەرهەق بە کوردان بێت، یادداشتنامەیەک بە دەوڵەتی نێوبرلو (عێراق) دەدات و ڕوونی دەکاتەوە کە ڕێبازی بەریتانیای مەزن دەرهەق بە کوردەکان هەر هەمان ڕێبازە کە دەرهەق بە هەموو بەشەکانی دیکەی کۆمەڵگەی عێراقی پەیڕەوی دەکات و گرتویەتێ بەر.

«بەرپرسانی ئینگلیز هەرگیز گوێ بەو کوردانە نادەن کە خۆیان بە ڕێبەری خەڵکی دەزانن، هەر بەو چاوە سەیری کوردەکان دەکەن کە هاوولاتی عێراقین، نەک بەو چاوەی کە کەمینەیەکی تایبەتین».

بەم جۆرە و بەم زیرەکییە عێراقییەکان تێ دەگەیەنێ کە وەختی دەست بەکاربوون هاتووە[٣٢].

## ١٢
## شەڕی ١٩٤٥

هۆی ڕاستەوخۆی هەڵگیرسانی شەڕی ١٩٤٥ لە ڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ دوا ڕۆژەکانی مانگی ئازار: شارداری (متصرف) هەولێر لە ١٩٤٥/٣/٣٠ بڕیاری دەوڵەتی سەبارەت بە نۆژەنکردنەوەی مەخفەرەکانی ناوچەی بارزانی، بە بارزانی ڕاگەیاندبوو.

بارزانی یەکسەر ناڕەزایی خۆی لەم بارەیەوە ڕاگەیاند، لێ دەوڵەت گوێی بەم ناڕەزاییە نەدا.

ئەو بۆیەرەی کە بووە مایەی پچڕانی پێوەندییەکان، لە ڕۆژانی ٦ و ٨/٧ دا لە بارزان ڕووی دا، خەڵکەکە دەهاروژێنێ و بناغەی ئەو قوتابخانە و مەخفەرەی کە تازە لێدرابوون و خەریکی بینا کردنیان بوون، پڕ دەکەنەوە و چەکدارانی بارزانی کرێکارانی ئیدارەی «کاروباری گشتی» لە ناوچەکە وەدەردەنێن.

بۆ سبەینێ واتە ٨/٨ ئەسعەدئاغای خۆشەوی، سەرای بارزان » واتە بارەگای نوێنەری دەوڵەتی ناوەندی» دەگرێ. [ ٥ ]

لە هەمان کاتدا بارزانی وەلامێکی «توندە»ی دوا هۆشدار نامەی کولۆنیل مید Mend دەداتەوە و داوای کشانەوەی هەموو هێزێن ئاسایشی ناوخۆ لە دەڤەرەکە دەکات.

## ١٣
## جیاوازی بۆچوونی ئینگلیز و عێراق

له ١٩٤٥/٨/٨ دا، ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق بڕیار دەدا (تا زووە) ناوچەی بارزان به هێزێن سوپایی بگرێ و «تاوانباران بگرێ».

جەنەراڵ رەنتون Rentonی سەرۆکی دەستەی سوپایی بەریتانیا ئامۆژگاری دەولەت دەکات کە هیچ کارێکی بەپەلە نەکات و با سەرەتا رێگاو بانەکان نۆژەن بکاتەو و بەرنامەی دروست بۆ هێرشێن ئایندە دابڕێژێ، ئەم هێرشانەش بەرای ئەو نابێ بەر لە ١٥/ ئەیلول دەست پێ بکەن.

لێ عێراقیەکان سوورن لەسەر ئەوەی کە بە زەبری هێرشی جەبهەیی لە زەرفی ٢-٣ هەفتەدا بارزان بگرن، ئامۆژگاریەکانی جەنەراڵ رەنتۆن بە هەند ناگرن.

بەلای جەنەراڵ رەنتونەوە بونیادی سوپای عێراق «بەرادەیەک پێ سەرو بەر ودوور لە هەموو یاساو رێساکانی سوپاییە» و « مەشقی زۆربەی سەرباز وەزیفەکان (مجند) هێندە خراپە کە رازی نابێ ئەفسەرەکانی دەگەڵ قوەتەکانی عێراقدا بۆ مەیدانی شەڕەکان، بڕۆن.

لە ٨/١٦ دا جێگری سەفارەتی بەریتانیا بەسەرەک وەزیر دەڵێ کە بەریتانیای مەزن حەز ناکات هاوولاتیانی بەریتانی لەم شەڕەدا بەشداری بکات.

## ١٤
## یەکەمین هێرشی سوپای عێراق

لێ عێراقیەکان ئامۆژگاری و تەگبیری ئینگلیزەکان بەهەند ناگرن و پاش بۆردومانی بلە لە رۆژانی ١٣ و ٨/١٥ دا، سێ تیپ بۆ سەر ناوچەی بارزان دەنێرن.

لەم سەروبەندەدا بارزانی لە ناوچەی برادۆست دا ٧٥٠ جەنگاوەر و لە دەڤەری ئامێدی دا دوو دەستە خەباتکاری دەگەڵ دەبن، ئەم قوەتانە هەمان ئەو تفەنگە سوکانەیان پێ دەبێ کە لە ساڵی ١٩٤٣ دا لە عێراقیەکانیان گرتبوون.

یەکەمین شەڕ لە نزیکی سیدەکان روو دەدات، ئەم شەڕە بۆ سوپای عێراق کە نزیکەی سەد کەسی لێدەکوژرێ، سوکە کارەساتێک دەبێ لەو گۆڕەی!

لەم کاتەدا سەرەک وەزیرانی عێراق داوای بەشداری هێزی فڕۆکەوانی بەریتانیا دەکات. لێ جێگری سەفارەتی بەریتانیا ئەم داوایە رەفز دەکاتەوە و هۆشیارنامەکەی ٨/٥ی بیر دەخاتەوە.[٣٣]

١٥

## شكستەكانی دیكەی سوپای عێراق

لەسەرەتای ئەیلول دا، عێراقییەكان كە لەشكرێكی ١٤٠٠٠ نەفەری لە ئاكرێ و ڕەواندز خر دەكەنەوە، دەست بە هێرش بۆ سەر بارزان دەكەن. تا - تی یەكەمی ئەم هێرشە مێرگەسووزە، بەڵام شكستی گەورەی بەسەردادێت:

ڕەتڵی یەكەم، كە لە ڕەواندزەوە پێشڕەوی دەكات لە نزیكی مەزنەدا تووشی شەڕی قورس دەبێت، و زیانی تا ڕادەیەك (قورس)ی لێدەكەوێ و كوژراوی زۆر دەدات.

ڕەتڵی دووەم، كە لە ئاكرێوە پێشڕەوی دەكات، پاش چەند شەڕێكی قورس دینارتە دەگرێ. لــێ لە ٩/٨ دا كوردەكان دژە هێرشیان بەسەرۆكایەتی خودی بارزانی دەكەنە سەر و بە ناچاری پاشەكشە دەكەن، سوپای عێراق لەم شەڕەدا هەڵدێ و ١٦٠ كوژراو و بریندار و سێ تۆپی جەوەڵی لە مەیدانی شەڕدا بە جێ دەهێڵێ.

ئەم سەركەوتنەی دوایی بە ڕادەیەك پایە و دەسەڵاتی بارزانی زیاد دەكات، كە ژمارەی پێشمەرگەكانی دەگاتە ٢٠٠٠ كەس.

كەش وهەوای ئەنجومەنە دەوڵەتییەكان، غەمینە، سەركردەی باڵای سوپای عێراق، بە ڕەڤانی وسەركەوتنی «چاوەنوڕنەكراوی شۆڕشڤانان»ی بێ قووت ناچێ و ڕایدەگەیەنێ كە شۆڕشڤانان یارمەتی دەرەكی وەردەگرن، هەڵبەتە بێ چ بەڵگە و قەواڵەیەك، ئەمەش ئاماژەیە بۆ سۆڤیەتەكان.

لێ جەنەراڵ ڕەنتۆن لە گفتوگۆیەك دا دەگەڵ سەرەك وەزیر (٩/١١) ڕەخنە لە نیدارەی شەڕەكان دەگرێ و بۆی دەسەلمێنێ كە فەرماندە عێراقییەكان «لەم لەشكركێشیەدا» خەتاو هەڵەی یەكجار گەورە و كوشندەیان كردووە.

١٦

## تەسلیم بوونی مەحمود ئاغای زیباری بە دژمن

لەپڕ وەزع باش دەبێت!

لە ١٤/ئەیلول دا مەحمود ئاغای زیباری، خەزوور و پشتیوانی بارزانی خۆی بە حكومەت تەسلیم دەكات.

یادداشتنامەیەكی سەفارەتی بەریتانیا لە بەغدا، هۆی ئەم (وەرچەرخانە) ڕوون

دەکاتەوە، ئەم سیاسەتوانە بەریتانیە (نووسەری یادداشتنامەکە) دەنووسێت: «هەوڵەکانی وەزیری ناوخۆ بۆ جیاکردنەوەی زێبارییەکان و پشتیوانی کردنی هەموو تیرەکانی دی، زۆر سەرکەوتوون» و لەسەری دەڕوات «ئەو (وەزیری ناوخۆ) لە دابەشکردنی چەک و پارەدا دریغی ناکات»(٣٤)

هەڵبەتە یەکگرتنی «دەوڵەت و کوردەکان» وشارەزابوونی سوپای حکومەت لەو ناوچانەی کە دەوڵەت سەرۆکەکانی کڕی بوون، توانایەکی زۆر زیاتر بە سوپا و توانای سوپایی عێراقی بەخشی و، بارزانی نەیدەتوانی بەرگە بگرێ و نەشکێ.

## ١٧

## دوا شەڕ

هێزێن دەوڵەتی لە ١٩٤٥/١٠/١ دا چیای پیریس دەگرن و لە ١٠/٧ دا بارزان دەگرن.

لێ عێراقیەکان نابێ بەوەوە بنازن کە بارزانیان بە زەبری چەک شکاندوە، چونکە وەکو جەنەراڵ رەنتون دووپاتی دەکاتەوە «سەلامەتی خەتی پەیوەندیێن هێزێن عێراق بەندە بە ئەمەکداری و پابەندی عەشایەرانی سەر بە دەوڵەت»

لێ بارزانی وەزعی باش نیە، چونکە تورکەکان سنوری باکوریان لێ داخست.

بەڵانەکێ هەفتەیەک لەوە دوا، خەبەرێکی رەسمی بڵاوی دەکاتەوە کە توانیویەتی دەگەڵ (چەند کەسێک) لە لایەنگرانی خۆی بۆ ئێران بڕوات!

## ١٨

## رەنگدانەوە و دەنگدانەوەی جیهانی ئەم کارە

هاتنی ٢٠٠-٤٠٠ کوردی ئێرانی، کە لە دەوروبەری ١٩٤٥/٨/٢٠ دا بۆ یارمەتی بارزانی لە سنوور پەڕیبوونەوە و بە رەفتاری و مقاوەمەتی چاوەنۆر نەکراوی بارزانی، کردییە کارێک کە ئەم رەفتارە لە ئاستی هەموو جیهاندا، کە چاوەڕوان نەدەکرا، لە ناوچە جیاجیاکانی بارزان تێ بپەڕێ، دەنگ بداتەوە.

دوای هەفتەیەک سەفیری سۆڤیەت ئەم ئیدیعایەی کە گوایە ئەو کوردە ئێرانیانەی بەشداری شۆڕشی بارزانیان کردووە، (پەیوەندی و دۆستایەتی نزیکیان) بە دەسەڵاتدارانی داگیرکەری یەکیتی سۆڤیەتەوە هەیە، بە درۆ دەخاتەوە.

دوای ١٠ ـ ١٢ ڕۆژی دی ئەمجـارە نوێنەری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دێت کە سەبارەت بە ڕەوشی باکووری عێراق ئەوپەڕی نیگەران بێ.

سەرۆکی ئیدارەی ڕۆژهەڵاتی نزیکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە گفتوگۆیەک دا دەگەڵ دیبلۆماسیەکی بەریتانی دا لە واشنتۆن باسی ئەو ئاژاوەیە دەکات کە سۆڤییەتەکان لە باکووری ئێراند (پەرەی پێ دەدەن) وترسی ئەوەی هەیە کە تەدەخولی سوپایی بەریتانیا لە باکووری عێراقدا «ئەگەری حەل وفەسلی ماقوولی کێشە چارەسەر نەکراوەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیک» بخاتە مەترسیەوە.[٣٥]

ئەمەریکاییەکانیش وەکو عێراقییەکان کەمترین گومانیان لەوە نیە کە کوردەکان یارمەتی «دەرەکی» دەدرێن و داخی ئەوە دەخۆن کە مەنع کردنی نا. ڕۆزفلت (کوڕ) ی یاریدەدەری ملحەقی سوپایی ئەمەریکا لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە کە بچێ بۆ کوردستان، پتر ئەم خانە گومانیە دەسەلمێنێ.

بەڵام کاربەدەستانی بەریتانی لە بەغدا، دڵنیان کە سۆڤیەتەکان کەمترین دەستیان لە کوردستاندا نەبووە، و کاتێ سێر ریدەر بوڵاردی سەفیری بەریتانیا لە تاران، ئەو زانیارییەی کە سەرۆکی سەرکردایەتی سوپای ئێران، دەربارەی دیداری قازی محەممەد لە گەڵ کەسێک دا بە ناوی غاز عەلیوف، دەیداتێ، ڕەوانە دەکات، کاربەدەستانی ئینگلیزی ناکنجی بەغدا، بە شێوەیەکی مەنتیقی هەڵیدەسەنگێنن و بەلایانەوە ئاسایی دەبێ (قازی محەممەد لە مەهاباددا کەسێک بە ناوی غاز عەلیۆف دەبینێ، ئەم کەسە داوا لە قازی دەکات کە یارمەتی عەسکەری بۆ بارزانی بنێرێ).

بە بۆچوونی ئەوان دیداری کاربەدەستانی سۆڤیەتی دەگەڵ قازی محەممەد دا «سوڵتانی بێ تەخت و تاجی مەهاباد و ڕێبەری کۆمەڵەی کورد» کارێکی ئاساییە.

کاربەدەستانی ئینگلیزی دانیشتووی بەغدا، باوەڕیان وایە کە ئەمەریکییەکان خەڵکێکی خۆشباوەڕن و زوو حوکم دەدەن و زۆریان کەیف بە هەواڵ و زانیاری عەنتیکە و سەرسوڕهێنەر دێت.[٣٦]

## ١٩

## بارزانی و حیزبی هیوا

مەلا مستەفا کە دابویە چیاکانی بارزان، بۆ دابینکردنی ئازووقە و چەک و تەقەمەنی و پارە و مەعلومات و خەبەر و هەواڵان، پشتی بە خەباتکارانی نەتەوەیی هیوا

بەستبوو.

بەلام پەیوەندی و دۆستایەتی نێوان ئەم دوو لایەنە زۆر زۆر ئالۆز بوو، مەلا مستەفا بە پەیڕەوی لە شێخ عەبدولسەلامی برا گەورەی، پەیوەندی و میانەیەکی شەخسی زۆر گەرم و دۆستانەی دەگەڵ نوێنەرانی بەریتانیادا هەبوو، بۆگەیشتن بە ویستەکانی چاوی ئومێدی لە بەریتانیا بوو.

بەلام تێکۆشەرانی هیوا زیاتر لە هەمووان بە خراپە باسی ئیمپریالیزمی بەریتانیایان دەکرد، ئەگەر بە تەمای هاوکاری دەرەکی بوایە، ئەوا پەنایان بۆ مۆسکۆ دەبرد یان ئەو هاوکاریانەیان لە نوێنەرانی سۆڤیەت داوا دەکرد کە وەکو هاوسێی دیوار بە دیوار، واتە لە کوردستانی ئێران دا سەرگەرمی خزمەت بوون.

بەلام دەربارەی ئەو پەیوەندییانەی کە لە گینە لەم سەروبەندەدا دەگەڵ سۆڤیەتەکاندا هەیانبوو، چ زانیاریەک بە دەستەوە نییە، ئینگلیزەکان بە پێچەوانەی ئەمەریکاییەکانەوە هەمیشە نەقش و ڕۆڵی ڕاستەوخۆی شورەوییەکانیان بە کەم دەگرت و پێیان وابوو کە تەنیا «چەند سەرە ڕۆیەک بوون کە دەیانویست لە ڕێگەی نامە و نامەکاریەوە دەگەڵ سۆڤیەتەکانی ئاکنجی ئێران، پەیوەندی دروست بکەن»[٣٧]

بەهەر حاڵ ئەوەی چەند و چون هەڵناگرێ ئەمەیە کە بارزانی هەمیشە لە پەیوەندی و میانەی خۆیدا دەگەڵ حیزبی هیوا دا بە پارێز بووە و تەنانەت لە سەرەتادا، لەگەڵ ئەوەدا نەبوو کە نوێنەری ئەم حیزبە لە بارزان دا هەبێ، ئەم کارەی بە «زوو» دەزانی.[٣٨]

لە ساڵی ١٩٤٤ دا بارزانی ڕازی دەبێت کە نوێنەری ئەم حیزبە تازە نەتەوەییە لە بارزان دا هەبێ، ئەمانە بریتی بوون لە ئەفسەرێک بەناوی عیزەت عەبدولعەزیز (کە لە ئەفسەرانی پەیوەندی)ش بوو کە ماجید مستەفا بۆ بە دواداچوون و پەیگیری کاری (ئارامسازی) کوردستان دایناوبوو) عەقید ئەمین ڕەواندزی، ڕائید عەبدولعەزیز گەیلانی (کوڕی سەید عوبەیدوللا و ئەوەی شێخ عەبدولقادر) و میرحاج لە ئاکرێ و فوئاد عارف (خوشکەزای ماجید مستەفا) لە پشدەر و مستەفا خۆشناو و ماجید عەلی.

ئایا وەکو تێکۆشەرانی چەپڕەوی ئەم حیزبە مەزندەیان دەبرد، ئینگلیزەکان هەوڵیان دەدا، دزە بکەنە نێو ئەم ڕێکخراوە نەتەوەییە کوردییەوە؟[٣٩]

بێگومان یەکێک لە ئەرکە بنەڕەتیەکانی هیوا ئەمە بوو کە سۆزی نەتەوەیی دەوڵەمەندان و پیاوماقوڵانی کورد بجوڵێنێ و پارەی پێویستیان بۆ بارزانی لێ خڕ بکەنەوە.

ئەگەر چی زۆر خەباتکاری نەوجەوانی هیوا، بارزانییان لە شێوەی «شێخێکی کۆنەپەرست»[40] دادەبینی کە پێویستە تا پەیدابوونی جێنشینێکی باشتر، پشتیوانی لێ بکرێ، بارزانیش لەوە نیگەران بوو کە خانەدان و ناودارانی تەقلیدی کورد، بەو چاوە سەیریان دەکرد کە شۆڕشگێڕێکی خەتەر و بە مەترسییە.

بە هۆی پەیوەندی و میانەی بارزانی دەگەڵ شێخ لەتیفی (کوڕی شێخ مەحمود) دا کە لە سەردەشتی سنووری ئێران دا جێگیر بووبوو و دەسەڵاتێکی سەربەخۆی بۆخۆی دامەزراندبوو پەیوەندی نێوان بارزانی و هیوا دەپچڕێ.

لە کۆبوونەوەیەکی رێبەرانی هیوادا لە بەغدا، فوئاد عارف هێرش دەکاتە سەر شێخ لەتیف و بەوەی تاوانبار دەکات کە (پەیوەندی بە سۆڤیەتەکانەوە هەیە)

دوای ماوەیەک دووان لە دەوڵەمەندانی کورد، کە لە (داهێنکەرانی دارایی) رێکخراو بوون، واتە عەلی کەمال و تۆفیق وەهبی کە (پاش روخانی حکومەتی نوری سەعید لە ١٩٤٥ دا، لە حکومەتەکەی حەمدی پاچەچیدا بوو بە وەزیری ئابووری) پێتاک کۆکەرەوەکان دەر دەکەن و پێیان دەڵێن: «بڕۆن داوا لە دۆستانی بارزانی بکەن» مەبەست لە سۆڤیەتەکانە.[41]

لە هەمان کاتدا، رەفیق حیلمی کە نەتەوەییەکی سوسیال مەیل بوو لە ژێر گوشاری باڵی راستی بزووتنەوەکەدا، کە بە کۆمۆنیستیان دەزانی، ناچار دەبێ دەست لە حیزبی هیوا بکێشێتەوە و واز بێنێ.

## ٢٠

## پارچە بوونی هیوا

لێ باڵی چەپی ئەم بزووتنەوە نەتەوەییەش وەکو باڵی راستی بەر پارچەبوون و لێک دابڕان کەوت و لە هاوینی ١٩٤٥ دا، بەلای کەمەوە بوو بە چوار گرووپی جیاواز.

– «شۆڕش» ٣٠٠-٣٥٠ ئەندام بوون[42] کە لە راستیدا بریتی بوو لە «حیزبی کۆمونیستی کوردستانی عێراق» و بە زۆری بە ناوی گۆڤارەکەیەوە «شۆڕش» ناو دەبرا، رێبەرانی ئەم گرووپە بریتی بوون لە : عەلی عەبدوڵلا، نوری شاوەیس، جەمال حەیدەری، (کە لە ساڵی ١٩٦٣ دا بە دەستی بەعسیان کوژرا) و ساڵح حەیدەری.

– «رزگاری» کە ٥٠٠٠_ ٦٠٠٠ ئەندامی هەبوو، لە راستیدا رێکخراوی بەرەی گەل بوو[43] و هەوێنی ئایندەی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بوو، سەرانی ئەم

ڕێکخراوە، جگە لەوانەی ناومان بردن، ئەمانە بوون: دکتۆر جەعفەر عەبدولکەریم (برای حەبیب کەریمی سکرتێری نایندەی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لەدوای سالی ١٩٦٤) دکتۆر سەدیق ئەتروشی و تەها محێدین (جێگری سەرکۆماری عێراق لە سالی ١٩٧٥وە)

- «ئازادی» ڕێ ی ڕاست.

بوونی هیوا لەبەرەی نەتەوەیی کوردا، بەتایبەتی پەیوەندی و میانەی دەگەڵ ماجید مستەفادا، یەکێک بوو لەو هۆیانەی کە بووە مایەی پارچە پارچە بوونی هیوا، ئەمە جگە لە هۆیەکی دیکە، کە ئەویش پەیوەندی و میانەی هیوا بوو دەگەڵ حیزبی کۆمونیستی عێراق دا.

## ٢١

## حیزبی کۆمۆنیستی عێراق و مەسەلەی کورد

حیزبی کومونیست لەو زەمانەدا ڕەونەقێکی تایبەتی لە نێو کەمینە نەتەوەییەکانی عێراقدا هەبوو، بەپێی هەندێ ژێدەر و سەرچاوان، ژمارەی ئەندامانی کورد لە حیزبی کومونیستی عێراقدا بە ٣٥-٤٠٪ی هەموو ئەندامانی حیزب مەزەندە دەکەن.(٤٤) دیارە ئەم ڕێژەیە، لە چاو ڕێژەی کوردا کە ٢٥ تا ٣٠٪ی خەڵکی عێراق پێک دەهێنن ڕێژەیەکی زۆرە و بایەخی زۆری خۆی هەیە.

هەڵبەتە ژمارەیەک لە ئەندامانی هیوا، لە لایەنگرانی کومونیستەکان بوون و لە هەر دوو گرووپی شۆڕش و ڕزگاری دا کاریان دەکرد.

هەڵوێستی حیزبی کومونیست لەمەڕ مەسەلەی کورد مامەڵە و هەڵوێستێکی دوو فاقییە، لە لایەکەوە تا ڕادەیەک پشتیوانی لە ماف و داخوازییەکانی گەلی کورد دەکرد و کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی کومونیستی عێراق لە ئەیلولی ١٩٤٥ دا، لەو کاتانەدا کە بارزانی هێشتا لە بەرانبەر هێزەکانی عێراقدا بەرەڤانی و مقاوەمەتی دەکرد، لە بلاوکراوەیەک دا بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی، کریارێن عەسکەری دژی کوردان مەحکوم دەکات و گوناهی ئەم وەزع و حالەی دەخستە ئەستۆی ئینگلیزان و داوای دەکرد شەڕ ڕابگیرێ و زیندانیانی کورد ئازاد بکرێن و کۆتایی بە حکومەتی عورفی لە باکوردا بهێنرێ وتاقیب و لێکۆڵینەوە لەمەڕ هۆکارەکانی ئەم ڕووداوە بکرێ.(٤٥)

لەلایەکی ترەوە لەم بلاوکراوەیەدا، چ باسێکی ئوتونومی یان سەربەخۆیی کوردستان

نەکراوە.

لە راستیدا حیزبی کومونیستی عێراق، تەنانەت هێرشی کردە سەر «شۆرش» و «رزگـای» گـوایە بانگەشـە بۆ پارچە پارچە بوون دەکـەن و بە جـوداخـوازی مـەحکوم دەکردن.(٤٦) حیزبی کومونیستی عێراق لە زنجیرە گوتارێک کەلە القاعدە بڵاوی کردەوە هەڵوێست لەمەڕ مەسەلەی کورد وەردەگرێ.(٤٧)

حیزبی کومونیستی عێراق «تێزەی کۆمونیستانی کورد»، بەو حەساوەی کە هەر میللەتێک دەبێ حیزبی کومونیستی تایبەتی خۆی هەبێ، رەت دەکاتەوە و پشتیوانی لە تێزی (تەمرح) کلاسیکی ناوخۆی بزاڤی کۆمۆنیستی دەکات، بەم مانایەی کە خەباتی هاوبەش لە چوارچێوەی یەک حیزبی کۆمۆنیست دا دژی چەوساندنەوەی گەلان و دژی ئیمپریالیزم لە ئەنجامدا دەبێتە مایەی ئازادی هەر هەمووان، بە عەرەب و بە کوردەوە.

کۆمۆنیستانی کوردی لایەنگری سیاسەتی «بەرەی نەتەوەیی» دەست بە پەرچە هێرش دەکەن. لە راستیدا ئەمە شتێک بوو کە بزاڤی کۆمۆنیستی جیهانی و بزووتنەوەی کوردی رۆژ بە رۆژ پتر پارچە پارچە دەکرد.

ئەم مەسەلەیە لە ساڵی ١٩٤٦ دا بەوە کۆتایی دێت کە پارتی دیموکراتی کوردستان دادەمەزرێ وکۆمۆنیستە کوردەکانی ناو حیزبی کۆمۆنیستی عێراق پەیوەندی پێوە دەکەن.

لێ کاتێ بارزانی لە هەیڤی دەی ساڵی ١٩٤٥ دا لە سنووری ئێران پەڕییەوە، ئاژاوەو ئاڵۆزی نێو بزووتنەوەی کورد هێشتا لە هەرەتی قووەتی خۆیدا بوو، دوور نیە هەر ئەمە کردبێتە کارێک کە (جەنەراڵ بارزانی) نایندە، زۆر کەیفی بە یەکەمین پەیوەندی خۆی دەگەڵ سیاسەتی حیزبان دا نەهاتبێ.

[٦]٢٢

## چوونی بارزانی بۆ ئێران، هەوڵێن پەیوەندییێن ئەو بە سۆڤیەتەکانەوە.

بارزانی بەر لەوەی بۆ ئێران بچێ، شاندێکی سێ کەسی بۆ ئێران ناردبوو، تا پرسێک بە قازی محەممەد بکەن کە ئایا دەتوانێ بە خۆی و دەهەزار کەس لە عەشیرەتەکەیەوە لە سنوور بپەڕێتەوە.

قازی محەممەد پێی وابوو کە هێشتا وەختی هاتنی ئەوان نیە، بەڵام بارزانی بەر لەوەرگرتنەوەی وەڵام گەیی بووە ئێران.(٤٨)

دوای چەند رۆژێک بارزانی یەکەم پەیوەندی خۆی دەگەڵ سۆڤیەتەکان کرد، هەڵبەتە نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کە سۆڤیەتەکان هەمیشە بەو چاوە سەیریان دەکرد کە «داردەستی» ئینگلیزەکانە.

بارزانی دەگەڵ میر حاج و هەمزە عەبدوڵڵا چووە دیداری جەنەراڵ لیوبیڤ Liobov و پێی گوت کە «دەمێ لە ئێران وەدەربکەوین»

هەمزە عەبدوڵڵا و بارزانی کە لەلای جەنەراڵی روسی بە شێوەزاری کرمانجی پێکەوە قسەیان دەکرد بیریان لە تەگبیرێک کردەوە پێشنیازیان کرد کە چەکدارەکان لە ئێران وەدەر بکەون، خێزانەکان بۆ ماوەی زستانەکە لە ئێران وەمێنن.

دوای دەرۆژان جەنەراڵ لیوبیڤ هات و پێی راگەیاندن کە ئەو چارەسەرە پەسەند کراوە، ئەوسا بارزانی بەخۆ و چل پیاوی چەکدارەوە لە ناوچەیەکی دوورەدەستی بەفرگرتوودا ون بوو.(٤٩)

**سەرچاوە و پەراوێزان:**

١- لە ساڵی ١٩٣٠ دا پتر لە ١٠٠ رۆشنبیر و خوێنەواری کوردی بە زیندوویەتی لە گونی نران و فڕێ درانە دەریاچەی وانەوە: دکتۆر شێرکۆ. مەسەلەی کورد.

٢- نووری شاوەیس، هەڤپەیڤین دەگەڵ نووسەر لە ناوپەردان شوباتی ١٩٧٥.

٣- پروانە و.لاکر «کومونیزم و ناسیونالیزم لە رۆژهەڵاتی ناڤین» ل ١٧٧

٤- نووری شاوەیس، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥- راپۆری ماجید مستەفا بە ئەنجومەنی وەزیران لە ١٩٤٤/١/١٨. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ٣٨٠٠٤ ٣٧١.

٦- بە گوتەی بریفکانی لە حەقیقەتەکاندا، ل ١٦-٢١ کە لەو، جویدەوە نەقلی کردووە شێخ ئەحمەد مانگانە ٢٥ دینار و مەلا مستەفا مانگانە ١٢ دیناری وەردەگرت.

٧- لاکر، ل ١٧٩

٨- بە گوتەی ال. رامبۆ (تۆماس بوا) شەش سەد کورد لە هێزەکانی بەریتانیا وەرگیران: کورد و هەق. ل ٧١.

٩- راپۆری کورنوالیس لە ١٩٤٧/١٠/١٦ دەربارەی رووداوەکانی پاش راکردنی بارزانی، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٢٠ ٣٧١٣٥.

١٠- راپۆری ماجید مستەفا بۆ ئەنجومەنی وەزیران، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١- کەمال خەیات «کوردەکان خوازیاری ئوتونومی‌ان، پێشڵەچوونی میسر، ١٩٤٦/٥/٢٠، لە لاپەرەی ٧٠ی رامبۆوە وەرگیراوە.

١٢- راپۆرتی کورنوالیس، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٣- نامەی ١٩٤٣/١٢/٢٤ی وەزارەتی دەرەوە بۆ کورنوالیس، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١٣. ٢٥ ٢٧١

١٤- ٩/ ١٠/ ١٩٤٣ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٢. ٢٥ ٢٧١.

١٥- هەمان سەرچاوە.

١٦- نامەی ١٩٤٣/١٢/١٣ی وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ کورنوالیس، هەمان سەرچاوە.

١٧- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٣. ٣٥ ٢٧١

١٨- نامەی ١٩٤٢/١٢/٢١ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ١٣. ٣٥ ٢٧١

١٨- دووبارە نامەی ١٩٤٢/١٢/٢٥ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٢٨. ٠ ٣٧١٤.

١٩- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٣. ٣٥ ٢٧١.

٢٠- نوری شاوەیس، هەڤپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢١- راپۆرتی ماجید مستەفا بۆ ئەنجومەنی وەزیران، سەرچاوەی پێشوو.

٢٢- بە گوتەی ئەردەڵان نووسەری نهێنییەکانی بارزانی، ل ٧. پێشەیان. مەرگ بوو، ل ٣٢، چیاروک، ماساە بارزان ل ١٥٧. کە لەو جەریدەوە لە ٦٧٧-٦٧٨ی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، نەقڵی کردووە، مەلامستەفا بارزانی داوای ئەم مافانەی بۆ کورد دەکرد.

؟ دامەزراندنی هەرێمێکی کوردی کە لیوای کەرکوک و هەولێر و سلێمانی و هەموو بادینان و دهۆک و ئامێدی و ئاکرێ، زاخۆ و ژەنگار و ناوچەی خانەقین بگرێتەوە.

- دامەزراندنی وەزیرێکی کورد بۆ بەڕێوەبردنی ئەم هەرێمە.

- ئەوپەڕی ئوتونومی رۆشنبیری و ئابووری و کشتوکاڵی بە کوردستان بدرێت.

- نەقڵ کردنی هەموو فەرمانبەرە ناپەسندەکان و هەموو ئەوانەی کە پایە و دەسەڵاتی خۆیان بە خراپی بەکاری دێنن.

- زمانی کوردی ببێ بە زمانی رەسمی.

٢٣- راپۆرتی ١٩٤٤/٢/٢٩. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٢٨. ٠ ٣٧١٤.

٢٤- چیاروک ل ١٦٥، لە و. جەریدەوە، ل ٦٧٨ وەرگیراوە.

٢٥- وەزارەتی کاروباری ئینگلستان ٢٨. ٠ ٣٧١٤.

٢٦- ئەم گفتوگۆیانە لە ١٩٤٤/٣/١٤ لە موسڵ و بەئامادەبوونی میجەرکینج-ی ئینگلیزی ئەنجام دران. نێردراو نوسخەیەکی لە نێوەرۆکی ئەم گفتوگۆیە ئامادە کردووە، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٢٨. ٠ ٣٧١٤.

٢٧- لە رێکەوتێکی نادیاردا، لە نێوان ١٥و١٩٤٤/٥/٢٢ دا.

٢٨- نووسراوی ١٩٤٤/٥/٢٢ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٢٨. ٠ ٣٧١٤.

٢٩- ١٩٤٤/٦/١٦ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٨٠٠ ٣٧١٤٠.

٣٠- نووسراوی سەفیری بەریتانیا لە بەغدایە لە ١٩٤٤/٧/٣٠ بۆ وەزارەتی دەرەوە. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٣٨٠٠ ٣٧١٤٠.

٣١- نامەی عەرەبی ١٩٤٥/٣/٢٠ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٤٥٣٤٠.
کورنوالیس، کەلە « قەدیمیەکانی» ئاکنجی عێراق بوو، پێشتر بەتایبەتی دەگەڵ شێخ مەحمود دا دان وستانی کردبوو (بڕوانە فەسڵی ١٢) و دەگەڵ سەرانی کورددا بەینی خۆش بوو.

٣٢- « یادداشتی ١٩٤٥/٦/١٤ی سەفیری (ستون هیوبرد) »، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٤٥٣٤٠.

٣٢- نووسراوی سەفیری بەریتانیا بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٤٥٣٤٠.

٣٣- نووسراوی ١٩٤٥/٩/١٧ی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٤٥٣٤٠.

٣٤- نووسراوی ١٩٤٥/٩/١٧ی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٤٥٣٤١.

٣٥- ١٩٤٥/٩/٩، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٤٥٣٤١

٣٦- نووسراوی رۆژی ١٦٤٥/٩/٢٦ی مێجەر ـکس ماریوت (ئەفسەری ئاسایش) بەغدا.

٣٧- راپۆری رۆژی ١٩٤٥/٤/٢١ی سەفیری بەریتانیا «ئیستون هیوبر برد» لە بەغدایە.

٣٨- هەڤپەیڤینی نوری شاوەیس دەگەڵ نووسەردا لە ناوپردان، شوباتی ١٩٧٥.

٣٩- هەمان سەرچاوە.

٤٠- زەید عوسمان کە لە ساڵی ١٩٧٤ دا یەکێک بوو لەنوێنەرە وسمییەکانی بارزانی لە ئەوروپا، رەخنە لە بارزانی دەگرێت کە « خێڵەکییەکی دژە رۆشنبیر» بوو.. هەمان سەرچاوە.

٤١- هەمان سەرچاوە.

٤٢- بەگوتەی عەلی عەبدوڵلا لە هەڤپەیڤینێکدا دەگەڵ نووسەردا لە «دەربەندە» لە شوباتی ١٩٧٥.

٤٣- بڕوانە (کومونیزم و ناسیونالیزم لە رۆژهەڵاتی ناڤیندا) نووسینی لاکر.

٤٤- هەمان سەرچاوە ل ٢٢٥.

٤٥- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٤٥٣٤١.

٤٦- لاکر، هەمان سەرچاوە ل ٢٢٦.

٤٧- هەمان سەرچاوە.

٤٨- هەمزە عەبدوڵلا، هەڤپەیڤینێک دەگەڵ نووسەردا، بەغدا، ١٩٧٣.

٤٩- هەمان سەرچاوە.

## تێبینی: ئەم زانیاریانە لە رێزدار ساڵح مەحمود بارزانی وەرگیراون:

[١] بارزانی لە هەر شوێنێ نەفی بووبێ، تێکەڵی زۆر کەسان بووە، ئەوی لەزانا و دانایان، لەشێخان و سیاسیان، لە ئەدیب و شاعیران، بەلام تێکەڵاوی و هاتوچۆی دەگەڵ یانەی (برایەتی) شێخ لەتیف دا

نەبووە.

[٢] محەممەد سەعید بێرۆخی دەگەڵ جەنەراڵ بارزانی دا پێشمەرگە بوو، بە ئیجازە دەچێتەوە و جەندرمەی تورک پێی دەزانن و شەهیدی دەکەن: ئەوە بوو حەجی بێرۆخی لە جیاتی ئەو داترا و بۆ بەرپەرسی گەردییەکانی لەسەر خۆی: ئەمە حەقیقەتی رووداوەکەیە، نەک ئەوەی لە نیوەرۆکی کتێبەکەدا گوتراو.

[٣] کە بارزانی لەسلێمانییەوە گەیشتەوە دەڤەری بارزان، زۆری هەوڵ دا بەئاشتی داخوازییە نەتەوەییەکانی جێبەجێ بکرێن. زۆری چاوەڕوان کرد و حکومەت وەڵامی نەدایەوە. ناچار مەرکەز و مەخفەرەکانی ناوچەکەی گرت، لەوانە: مەخفەری شانەدەر، خەیرزۆک، بیرا کەپرا، زێت، چەمی، سیلکێ، میروز، ئەرگوش، شنگیل، کانی بوت، شیروان، رێزان، شێتنە، بیدارون، کانیە رەش و....

[٤] نووری سەعید لە داک و بابەوە کوردە.

[٥] سەعید قەزاز فەرمانی دابووە بەرپرسانی قەزای مێرگەسوور کە هەرکاتێ وەلی بەگ هاتە قشلە بیکوژن، کە وەلی بەگ بە ئیش و کاری خەڵکەکە چووە قشلە، پۆلیس لە نێو قشلەدا شەهیدیان کرد. مرۆڤێ ویێ قشلەکەیان داگیر کرد. پاشان ئەسعەد خۆشەوی بە ئیش وکار دەچێتە قشلە، پۆلیس لێ دەبن وەکو وەلی بەگ بیکوژن، لێ ئەو لێیان دێتە دەست و مرۆڤێن وی قشلەیان گرت و پۆلیسەکانیان چەک کرد. بەمجۆرە شەهید بوونی وەلی بەگ بوویە چرۆسکا شەڕ هەڵگرتن.

[٦] کەبارزانی لە وەعد و بەڵێنەکانی عێراق نائومێد بوو، پەیکێکی نادرە ئێران و دوو بەرپرسی رووس هاتنە نک بارزانی و پاش چوونەوەیان بە ماوەیەک بارزانی چوویە سەرز و لەماڵی فەتاح ئاغای هەرکی لایدا... جەنەراڵ سیامەندۆف دێتە نک بارزانی، ئیدی رێک دەکەون و بارزانی بە ئاگاداری رووسیا دەچێتە ئێران، کەچووە ئێرانیش لە گوندی ئێرگێ چاوی بە جەنەراڵی رووسی دەکەوێ. ئیدی کە بارزانی چووە کوردستانی ئێران، حیزبی دیموکرات و میللەی کوردستان بە هەزار و ئاغا و شێخ و مەلایانەوە هاوکاری و پێشوازی گەرمی بارزانیان کرد و چ درێغییکیان نەکرد. ئەمە حەقیقەتێکە دەبێ وەکو وەفادارییەک بۆ مێژوو بگوترێ. کە بارزانی چووە کوردستانی ئێران، هێزێن ئەمەریکا و بەریتانیا و رووسیا هەر سێک لەوێندەر بوون. بەریتانیا و عێراق داوایان لە رووسیا کرد ئەو یاخیانەی ئێمە هاتوونە نک هەنگۆ، دەبێ تەسلیمیان بکەنەوە. رووسیا وەڵامی دانەوە کە بارزانی چووەتە ناو کوردەکان و ئێمە ئاگامان لێی نیە. پاشان بارزانی بە ئاگاداری رووسان بۆ ماوەیەک چووە ناوچەی سەردەشت و لەناو مەنگوران دا مایەوە و پاشان هاتە شنۆییە و هەوەڵ جار ماڵا بارزانی ل شنۆیی بووی.

ئەوجا بارزانییەکان بەسەر ئەم دەڤەر و گوندانەدا دابەش کران: ئەرگەوەر، مەرگەوەر، سوندوس، لاجان، شارویران، بۆکان.

## فەسڵی دووەم

## سۆفیەتەکان لە کوردستانی ئێران و کۆماری مەهاباد

### ١

### مەهابادا

چ فاکتەر و هۆکارێکی ئاشکرا لە ئارادا نەبوو ئەم پێگەیە بە مەهاباد ببەخشێ کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ببێ بە بنکەو مەڵبەندێکی هەرە سەرەکی کوردایەتی یان لەم بوارەدا شان بەشانی سلێمانی بوەستێ، بە هەر حاڵ ئەمە ئەو ڕۆڵ و دەورە بوو کە لە ماوەی دووەم جەنگی جیهان و هەندێ دواتریش دا ئەو شارە بینی.

ساباڵخ (ساوج بلاخ: کانی و سەرچاوەی سارد) کە کەوتوەتە سەر سنووری کوردستانی سوونیی مەزهەبی ئێران «لە باکور» و کوردستانی شیعە مەزهەب «لەباشور» لە سەردەمی شانشینی ڕەزاشادا ناوی مەهابادی لێنرا، لە ساڵی ١٩٤٥ دا شارۆچکەیەکی ١٥٠٠٠ هەزار نەفەری بوو، لە رووی ئیدارییەوە سەر بە ڕەزاییە «ورمێ» بوو. تا ئەو زەمانە هەرگیز دەوری سیاسی یان بازرگانی گرنگی بەخۆیەوە نەدیتبوو.

ئەو ڕێبوارانەی کە لە سەدەی نۆزدەدا لەسەر ڕێی خۆیانەوە بەرەو ڕەزاییە، سنە و یان کرمانشانی گەورە شاری کوردستانی شیعە مەزهەب بە - مەهاباد دا تێپەڕ بوون، وایان وەسف کردووە کە شارۆچکەیەکی (حەوالێی) نزیکەی ٥٠٠٠ هەزار کەسییە.

ڕەنگە ئەمڕۆ دانیشتوانی تۆزێک زیاتر بووبن، بەڵام کە چاوت بەم شارۆچکە بێنەواو بێ خاوەن و ناساغڵەمە کە ژمارەی مساغ و نەخۆش و نەتوستانی یەکجار زۆرە- دەکەوێ زۆر زەحمەتە باوەڕ بکەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان توانیبێتی ببێ بە پایتەختی کۆمارێک و بوو بێتە مایەی نیگەرانی هێزە گەورەکان.

**بەرچەنەنامەی ماڵباتی قازی محەمەد**

### ٢

### ماڵباتی قازی محەمەد

لەم شارۆچکەیە و دەوروبەریدا. ماڵباتی قازی محەمەد کە پایەی شێخایەتی و قازیایەتیان هەبوو، حورمەت و ڕێزێکی زۆریان دەنێو جەماوەری خەڵکیدا هەبوو، باپیرە

گەورەی قازی محەمەد (شێخ المشایخ) لە ساڵی ۱۸۳۰ دا سەرانی تیرە و تایفەکانی لە گوندی کوچک خەباتی نزیکی دیواندەرە کۆ کردنەوە تا «بەرەیەکی یەکگرتوو» دژی ئینگلیز ولە پێناوی دابینکردنی ئازادی کوردستاندا پێک بهێن.

قازی فەتاحی (۱۸۳۲-۱۹۱٦) مامی باوکی قازی محەمەد لە ساڵی ۱۹۱٦ دا بەرگری لە شارۆچکەی مەهاباد کردووە، دژی هێزێن تورک و روس وەستاوە، رۆڵێکی گرنگی بینیوە و سەرەنجام دەگەڵ یەکێک لە کورەکانیدا بە دەستی روسەکان کوژران.

قازی عەلی، بابی قازی محەمەد (لە ساڵی ۱۹۳٤ دا مردووە) بە زانایی بە نێو بانگ بووە، سیف القوزاتی برای (لە ساڵی ۱۹٤٤ مردووە) لە ساڵی ۱۹۳۰ دا لە مەهاباد رێکخراوێکی نەتەوەیی و نهێنی بەنێوی «بزووتنەوەی محەمەدە» دامەزراند. کە پەیوەندی بە بزاڤی شێخ محەمەدی خەیابانیەوە هەبوو، هەر لەم سەروبەندەدا پارچە شیعرێکی دەربارەی «شۆڕشی تەورێز» لە گۆڤاری ئازادستاندا بلاو کردەوە (ئابی ۱۹۲۰).

ئەندامانی بنەماڵەی قازی محەمەد خوێنەوار و ئاینی و نەتەوە پەروەر بوون، لە مۆڵکدارە گەورەکانیش بوون و لە ناوچەی بۆکان دا چەندین گوندیان هەبوو.

## ۳

## نێوان ئینگلیز و روسەکان

داگیرکردنی ئێران لەلایەن هێزێن بەریتانی و سۆڤیاتی لە ۱۹٤۱/۸/۲۵ دا «دەرفەتی» مێژوویی مەهاباد بوو.

هێزێن سۆڤیاتی کە لە ۱۹٤۱/۸/۲۵ دا لە سنوور هاتن بەم دیودا، بۆ سبەینێ خوی وماکۆیان گرت و لە قۆڵی باشورەوە تا بانە وسنە پێشڕەویان کرد. بانە و سنە یان بە شێوەیەکی کاتی گرت و پاشان بە خەتی شنۆ و میاندواودا (کە بە چەند کیلۆمەتری باکوری مەهابادا رەت دەبوو) پاشەکشەیان کرد.

ئینگلیزەکان پاش ئەوەی قوەتێکی چەتربازیان لەنێو کۆمپانیای نەوتی خوزستان داگرت و دامەزراند، ئیدی باشوری کوردستانیان تا کرمانشانی سەر شارێگەی بەغدا، خانەقین - تاران و سنەیان گرت. هەڵبەتە سنەیان وەختێ گرت کە هێزەکانی سۆڤیەت چۆڵیان کرد.

ناوچەی نێوان هێزەکانی ئینگلیز و روس، واتە مەهاباد و بانە و سەردەشت و سەقز و دیواندەرە لە راستی دا ناوچەیەکی بێ خاوەن بوو، لە ژێر دەسەلات و فەرمانی ج کەسێکدا نەبوو.

ئەم «ناوچە بێ خاوەنە»ش بوو بوو بە دوو ناوچەی دەسەڵاتەوە، روسەکان لە باکورەوە لە دەوروبەری مەهاباد و ئینگلیزەکان لە باشورەوە....[2]

## ٤

## ئینگلیزەکان و کوردەکان و سۆڤیەتەکان

هەندێ لە ئەفسەرانی ئینگلیز پێدەچو حەز بکەن هەمان دەسیسە و ئەخشەی سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمی، پێشنیانی خۆیان بەکار بەرن و دووبارەی بکەنەوە، لێ کۆمیتەی هاوبەشی سەرانی سەرکردایەتی سوپای بەریتانیا و کاربەدەستانی ناوخۆی **دەوڵەتی بەریتانیا، بە دوو یادداشتنامە، ئاگاداریان کردنەوە کە ئامانجی دەوڵەتی بەریتانیا «پشتیوانییە لە دەوڵەتی ناوەندی تێران» و لەسەر کردنەوەی کورد و کار کردن بۆ قازانجی کورد لە گۆڕێ دا نییە، چونکە بزووتنەوەی کوردان « خۆی لە خۆیدا بزووتنەوەیەکی پاشکەوتووە، کە ناتوانین کۆنتڕۆڵی بکەین» و خۆ هەڵقورتاندن لە مەسەلەی کورد چ ئەنجامێکی نابێ جگە لە «گیروده کردنی هێزێن بەریتانی بە زنجیرە ململانێیەکی بێ پایانی عەشایەری و شەخسیەوە» ئەم دوو یادداشتنامەیە ئەوەشیان دووپات کردۆتەوە کە کاری وا چەند بە قازانجی کوردێن ئێران و تورکیا و هێزێن داگیرکاری سۆڤیەت دەشکێتەوە.[3]**

بەلای ئینگلیزەکانەوە هۆکاری گرتنی ئێران زیاتر ستراتیژی بوو، دەبووایە لە کۆتایی جەنگ دا تەواو ببێ. جا بۆیە هێزێن بەریتانی دەبوایە بە پێی توانا هەوڵ بدەن باشترین پەیوەندیان دەگەڵ کوردان دا هەبێ و بۆ پاراستنی وەزعەکە هەموو هەوڵێکی خۆ بخەنە کار تا ئەو تفاق و کەرەستە و پێداویستیانەی کە لە شارێگەی بەغدا، خانەقین، کرمانشان- هەمەدان- تارانەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت دەنێردران، بێ کۆسپ و تەگەرە بڕۆن و بگەنە مەنزڵ

ئینگلیزەکان هەر زوو بۆیان دەرکەوت کە یەکێتی سۆڤیات نیازی گۆڕیوە و کە شەڕ تەواو ببێ، دەوڵەتی نێوبراو بە ئاسانی باکوری ئێران چۆڵ ناکات، و ئازەربایجان «بە ویستی خۆی» دەبێت بە کۆمارێکی تازەی سۆڤیەت.

دەوڵەتی بەریتانیا، بەرەچاوکردنی ئەم نیاز و خەیاڵەی یەکێتی سۆڤیەت لەو زەمانەدا یان لە کۆتایی ساڵی ١٩٤١ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٢ دا قەناعەتی وابوو کە حاڵی حازر ناکرێ ئەو بیانووەی روسیا کە (بۆ پاراستنی سنوورەکانی باشوری خۆی، ناوچەکانی

باکوری ئێرانی گرتووە) ببردرێ، بۆیە چاکتر وایە بێدەنگی لێبکات و دڵخۆشی خۆی بەوە بداتەوە کە «ئەگەر شەڕەکە بەینەوە ئەوا قەرزباری روسەکانین. حاڵبوکی ئەگەر هەرچییەک بێتە پێشێ، قەرزباری ئێرانیەکان نین».

ئەم بۆچون و هەڵوێستانەی بەریتانیا بووە مایەی ئەوە کە قازی محەممەدی سەرکۆماری ئایندەی مەهاباد بکەوێتە باوەشی سۆڤیەتەکانەوە.

## ٥

## قازی محەممەد و سۆڤیتەکان

یەکەمین جار لە ١٩٤١/٩/٢٥ دا واتا رێک دوای مانگێک لە گرتنی ئێران لەلایەن هێزێن بەریتانیا و سۆڤیەتەوە دوو ئەفسەری ئینگلیزی و ئەمریکایی لە مەهاباد دا دیداریان دەگەڵ قازی محەممەد دا کرد، لەم دیدارەدا قازی محەممەد «نەخشەی یەکێتی کوردستان»ی بۆ دوو ئەفسەری ناوبراو شەرح کرد و لێی پرسین چۆن دەتوانێ پەیوەندی بە «سەرکردایەتی گشتی هێزێن بەریتانیا»وە بکات.

ئەفسەرە ئینگلیزەکە لەم دیدارەدا مامەڵەیەکی «دروستی» دەگەڵ مەسەلەکەدا کرد و قازی محەممەدی هان ئەدا کە دووی ئەم مەسەلەیە بکەوێ.

لە دوای ئەم نائومێدیەوە بوو کە قازی محەممەد دەگەڵ سۆڤیەتەکاندا کەوتە گفتوگۆی سیاسیەوە.[٥]

بۆ جاری دووەم و ئەمجارەیان زۆر بە جیدی قازی محەممەد و ژمارەیەک لە گەورە پیاوان و ناودارانی کورد بۆ باکۆ بانگهێشت کران.

## ٦

## یەکەم سەفەری گەورە پیاوو ناودارانی کورد بۆ باکۆ (١٩٤١/١١)

بە گوێرەی هەندێک ریوایەتان، روسەکان پاش ئەوەی بیستیان ئینگلیزەکان لە بۆکاندا کۆبونەوەیەکیان دەگەڵ پیاو ماقوڵانی کوردا کردووە، دەست بە کاربوون و لە رێگەی دوو ئەفسەری سۆڤیەتی بەناوی میر ئەسلانۆف و عەلیوف، گوایە ژمارەیەک لە نێوداران و پیاوماقوڵانی کوردیان رفاندوو، لە ئوتومبیلانیان ناون و بۆ تەوریز و لەوێندەرەوە بۆ باکۆیان بردن.[٦] **(ئەمە نمایشێک بوو، بۆ چاوبەستەکێ، دەنارفاندن لە گۆرێ نەبووە. وەرگێری کوردی)**

بە پێی ریوایەتێکی دیکە، نزیکەی سی کەس لە پیاوەماقوڵان و گەورە پیاوانی کورد، لە مەهاباد دا کۆ بوو بوونەوە، بەڵام لەم کۆبونەوەیەدا دیداری ئینگلیزان لە گۆڕێ نەبووە، ئەم ژمارەیە کۆبوونەوە تا دەربارەی کێشەی حەمە رەشید «خان» وئێرانیەکان قسان بکەن.

بەڵێ مەسەلەکە هەرچیەک بووبێ. گومان لەوە دا نیە ئەم کارەی روسەکان، زادەی حیساباتی وردی خۆیان بوو، نەخشەی وردی بۆ دانرابوو، لە نێو دەعوەت کراوەکاندا هەموو ناودارانی گەورەی کوردستانی سونتی مەزهبی ئێران بەرچاو دەکەون، قازی محەمەد لە مەهاباد، میر ئەسعەد و حاجی بابا شێخ لە بۆکان، رەشید بەگ و زیرو بەگ لە کوردانی هەرکی، محەمەد قاسملو (بابی سکرتێری گشتی ئاییندەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) لە دەوروبەری رەزاییە و محەمەد سەدیقی کوڕی تەهای شەمزینان.

ئەم کوردانە، نزیکەی دە رۆژێک واتە لە ١١/٢٥ تا ١٩٤١/١٢/٥ لە باکو دا مانەوە، لەم ماوەیەدا چوونە تەماشای گەلێک چالاکی و چەلەنگێن رۆشنبیری و سەردانی زۆر کارخانە و مەزرای نمونەیی و دام و دەزگا و کۆمپانیای نەوت و سەربازخانەیان کرد.[٧] وەکو چۆن یەکێک لە سیاسەتوانانی ئینگلیز بە تانە وتەشەرەوە دەنووسێت «روسەکان دەبێ بۆ ئەم کارە شانازی بە خۆوە بکەن» چونکە دوو هەفتە لەمە پێش هەشت کەسیان لە بورژوایانی تەوریز بۆ سەفەرێکی وەکو ئەم سەفەرە دەعوەت کردبوو.

زۆر ریوایەت لەمەڕ گفتوگۆ سیاسیەکانی باکۆ هەن و ژمارەی ئەو ریوایەتانە شان لە شانی ژمارەی بەشدارانی گفتوگۆیەکان دەدەن، بەڵام هەر هەموو ئەم ریوایەتانە لە یەک خاڵ دا یەک دەگرنەوە. سۆڤیەتەکان (لە رێگەی باقرۆفی، سەرۆکی کۆماری ئازەربایجانەوە) مەسەلەی کوردیان بە شێوەیەکی زۆر گشتی زۆر بە پارێزەوە خستە روو.

بە گوتەی میر ئەسعەد، کە یەکێک بووە لە دەعوەتکراوەکان، باقروف پێی گوتن کە یەکێتی سۆڤیەت رای باشە سەبارەت بە سەربەخۆیی میللەتانی بچوک» بەڵام « ئەم قۆناغە بۆ سەربەخۆیی کوردستان لەبار نییە، کوردەکان دەبێ سەبر بکەن»

ئەوجا چەند کەسێک راپەڕین و گوتیان و «هەر ئێستا» سەربەخۆیی کوردستانمان دەوێ، و باقروف پێکەنی!.[٨]

بە پێی ریوایەتێکی دی، باقرۆف بە کوردەکان دەڵێ ئارام بن و دڵنیای کردن کە رۆژێک دێ «ئاواتەکانیان دێتە دی»[٩]

شێوەی پێشوازی شاندی ئازەربایجانی و شاندی کوردی زۆر جیاواز بوو، باقرۆف لە

دیداری ئازەربایجانیەکاندا، پاش ئەوەی باسی ئەو پەیوەندییە نەژادییەی نێوان هەردوو ئازەربایجان دەکات پاش ئەوەی دووپاتی دەکاتەوە کە «هاوبەشی مەینەتیەکانی ئەواتە» دەڵێ «لە رووی رۆشنبیری و سایکولۆژییەوە هیچ سنوورێک لە نێوان هەر دوو ئازەربایجاندا نیە و ئەو رۆژەش دێت کە هەر دوو ئازەربایجان بێن بە یەک».[١٠]

## ٧

## رەنگدانەوە و دەنگدانەوەی سەفەری باکو لەجیهاندا

دەنگدانەوەی سەفەری پیاو ماقوڵانی کورد بۆ باکۆ، کە سەفیری یەکێتی سۆڤیەت لە تاراندا، بە سەفەرێکی رۆشنبیری ناوی بردبوو، زۆر لە سنووری کوردستان هێوەتر رۆیی: لەگەرمەی دووەم جەنگی جیهانیدا لەو دەمەیدا کە بۆ هاوپەیانان زۆر سەخت و بەگرێ وگۆڵە، کریپسی سەفیری بەریتانیا لە مۆسکۆ و لە ١٩٤١/١٢/٢٠ دا داوای روونکردنەوە لە مولوتوف دەکات.

سێ رۆژان پاش ئەوە سێر ریدر بولاردی سەفیری بەریتانیا لە تاران، کە سەفەری مۆسکۆ دەکات، ئەویش لەم رووەوە داوای روونکردنەوە لەمولوتوف دەکات. مولوتوف لە ١٩٤١/١٢/٢٩ دا یادداشتنامەیەک لەم بارەیەوە دەدات بە سەفیری بەریتانیا وبۆی روون دەکاتەوە کە کوردەکان بە خۆیان بۆ باکۆ چوون، ئەم سەفەرە چ گفتوگۆیەکی سیاسی لە پشتەوە نەبووە.

کەمی مابوو ئەم رووداوە ببێتە مایەی ئاژاوەیەکی سیاسی، سێر ئانتونی ئەدەن یادداشتنامەیەک کە دەزگای خزمەتگوزاری وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیز بۆ بەکارهێنانی «ناوخۆ» ئامادەی کردبوو، بۆ مولوتوف نارد، لەم یادداشتنامەیەدا ئەوە گوتراوە کە «کێشەی گەورە ئەمەیە کە سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەت لە ناوچە ئێرانییەکانی بندەستی سۆڤیەت دا، رێکخراوێک سەرکاری دەکات کە سەفیری سۆڤیەتی لەتاراندا دەسەلاتێکی ئەوتۆی بەسەریەوە نیە»[١١]

## ٨

## ترسی تورکەکان

لە راستیدا تورکەکان باعیسی ئەم هەڵاوبکرە و بەردەیە و تەدەخولی سیاسی یەکێتی سۆڤیەت بوون: تورکەکان لە ١٩٤١ /١٢/٢ بەملاوە سەبارەت بە رەفتاری ئەو هێزانەی ئێرانیان گرتبوو، (بێ ئەوەی ئەو هێزانە بە وردی دەست نیشان بکات) ناڕەزایی دابووە

ئینگلیزەکان و گوتبویان کە ئەم هێزانە «کوردەکان هاندەدەن بۆ ئەوەی وڵاتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن» و دوویاتیان دەکردەوە کە پەیوەندی نێوان تورکیا و ئێران بە «کردەوە پچڕاوە» کوردەکان لە ناو خاکی تورکیادا دەستیان بە هێرش کردوە.

بەڵام وەکو سیاسەتوانێکی ئینگلیزی دەڵێ ئەوەی تورکەکانی نیگەران دەکرد، کوردەکان نەبوون، بەڵکو ئەو کارانە بوون کە سۆڤیەتەکان لە کوردستاندا، دەیانکرد ئەوانیش وەکو ئێرانیەکان دەترسان راستەوخۆ داوا لە روسەکان بکەن.

## ٩

## دەنگدانەوەی سەفەرەکەی باکو لە ناوچەکەدا.

ئینگلیزەکان کە دیتیان روسەکان لە مەیدانی بانگەشەو پروپاگەندەدا سەرکەوتنی یەکجارەکیان بەدەست هێناوە، ئیدی لەوە ژیوان بوونەوە کە کاربەدەستێکی سیاسی خۆیان بۆ مەهاباد بنێرن. لەمە بە دواوە ئەم ناوچەیەیان بە ناوچەی دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان حەساو کرد.

شارۆچکەی مەهاباد کە هەرگیز لەلایەن هێزێن سۆڤیەتی و ئینگلیزەوە نەگیرابوو بە کردەوەش لە حوکمداری و سەرپەرشتی رژێمی ئێرانی دوور بوو، لەنکاودا پێگە و وەزع وحاڵێکی وەهای گرتەخۆ کە زۆر لەبار بوو بۆ سەرهەڵدانی راپەرین و بزووتنەوەیەکی دەگمەن و بێ وێنە لە مێژووی بزاڤی کوردایەتی دا.

## ١٠

## رق بەرقێلی ناوخۆ

لەکۆتایی ساڵی ١٩٤١ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٢ دا مەهاباد هێشتا زۆر دوور بوو لە ژیانی قارەمانێتی خۆی. دانیشتوانی مەهاباد باجی ئەو رقەبەرایەتییەیان دەدا کە لەنێوان قازی محەممەد و میر ئەسعەدی دیبوکری دا سەری هەڵدابوو.

ئێران لەلایەن هێزێن بەریتانی و سۆڤیەتیەوە گیرا، شیرازەی حوکم ودەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی پچڕا، دوای چەند هەفتەیەک لەم هەراو هەنگامەیە قازی محەممەد کە پیاوێکی بە دەسەڵات و ئیحتیوباری کۆمەلایەتی بوو، بە رەزامەندی ناراستەوخۆی دەوڵەتی تاران، راگرتنی وەزع و حاڵی شاری وەئەستۆ گرت.

بەلام لە شوباتی ساڵی ١٩٤٢ میر ئەسعەد و ژمارەیەک لە پیاوانی مەهاباد کە ترسی

ئەوەیان هەبوو بە ئاگری شەڕی ئێران عێزێن دەوڵەتی و حەمەرەشید خان و ئەندەخولی سۆڤیەتەکانەوە بسوتێنن، هەڵبەتە سات بە سات وەزع بەرەو خراپتر دەچوو، چونکە ئەم کێشە لە گوێنەش لە ناوچەی ئەوانەوە نزیک بوو ترسی ئەم جۆرە تەدەخولەش هەبوو و لە سەقز پەیوەندییان بە سوپاسالار شابەختی یەوە کرد و ئامادەیی ...ان دەربڕی کە بەناوی دەوڵەتی ئێرانەوە کاروباری ناوچەکەوە ئەستۆ بکرن و بەرێک و پێکی بەرێوەی بەرن.

میر ئەسعەد کە بۆ تاران دەعوەت کرابوو لە کۆتایی مانگدا بۆ مەهاباد گەڕایەوە، ئەوەی دەیویست ... دەستی هێنابوو، کرا بوو بە فەرمانداری مەهاباد، بەترومبێلێک و شۆفێرێکەوە هاتبوەوە، کەلەو سەروبەندەدا کەسایەتی و ئیحتویارێکی بەو دەبەخشی، هەروەها بڕێ پارەی باشیشی وەرگرتبوو کە دەسەڵاتی راستی بەو دەدا.

قازی محەممەد بە دامەزراندنی میر ئەسعەد (بە فەرمانداری مەهاباد) رازی نەبوو، بۆیە هەر زوو بۆ تاران رۆیی، میر ئەسعەد نەیتوانی حوکم و دەسەڵاتی خۆی بەسەر مەهاباد دا بسەپێنێ و لە ئابی ۱۹٤۲ دا ناچار ئیستیقالەنامەی نووسی، پاشاگەردانی و هەراو هەنگامە سەرانسەری کوردستانی ئێرانی تا رۆژاوای دەریاچەی رەزاییەی گرتبووە و گەیی بووە لوتکە.

## ۱۱

## دەوری «ئاوبڕیوانی» سۆڤیەتەکان لە کوردستان دا سالی ۱۹٤۲

تۆمەتباری کردنی روسەکان بەوەی کە مایەی ئەو فیتنەو هەراوهەنگامەو ئاژاوانە بوون کە لە سالی ۱۹٤۲ دا هەمو کوردستانی ئێرانی گرتبووە، لە هاندان و دەست بەدەر نیە، ئەمە کارێک بوو کەهەندێ لە سیاسەتوانانی رۆژاوایی دەیانکرد.

چونکە دیتنی ئەرشیفی یەکێتی سۆڤیەت قەدەغەیە، بۆیە نووسینەوەی مێژووی ئەم قۆناغەش زەحمەت و لە توانا بەدەرە، بەڵام وا دێتە بەرچاو کە روسەکان لەم قۆناغەدا، کە هێشتا لەبەرەی قەفقازەوە هەرەشەی گەورەیان لەسەر بوو، سیاسەتێکی روون و ئاشکرایان لە کوردستاندا نەبووبێ، زۆر کەس ئەوە فەرامۆش دەکەن کە لە ئابی ۱۹٤۲ دا هێلەر لە یەکێک لە بێشەکانی ئوکرانیا و لە دووری ۱۵۰۰ کیلۆمەتری ئەلمانیاوە لەسەر کورسییەک دانیشتووە و توانیویەتی بیر لەمە بکاتەوە کە «لە ئایندەیەکی نزیک دا دەتوانێ شۆڕشگێڕانی ئێران و عێراق دژی ئینگلیزان هان بدات» و بە شادمانییەوە حەیالی ئەوە لێ بدات کە لە «ئاخر و ئوخری سالی ۱۹٤۳دا دەتوانێ چادری

عەسکەرییەکانی لە تاران و بەغدا، تا کەنداوی فارس هەڵبدا».

ئەم «خەیاڵانە» بە هاتنی هێزی زرێیی ئەڵمان کە ۱۲۰۰ کیلۆمەتر لە قوڵی ڕۆژهەڵاتەوە، هاتبوونە پێشەوە و لە خۆسازدانا بوون بۆ گرتنی بەشی ئاسیایی یەکێتی سۆڤیەت، بەهێزتر دەبوون.[۱۲]

لە هەلومەرجێکی ناڵەباری ئاوەهادا ناچێتە ئەقڵەوە کە دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتی لە ئێراندا، کە نیگەرانی و دوو دڵییان دیار و ئاشکرا بوو، بێن بە خۆیان ئاژاوە و هەراو هەنگامە لە قوڵی باشوری خۆیاندا بنێنەوە.

دوو ڕووداو هەن کە هەڵوێستی بە پارێزی ڕوسەکان سەبارەت بە چالاکی نەتەوەیی کوردان لەم ساڵەدا ۱۹٤۲ دا بە جوانی بەرجەستە دەکات. لەمانگی ۱/۱۹٤۲ دا دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت کۆمیتەی «حیزبی ئازادیخوازە» کە کورد و ئاشوری و ئەرمەنیانی یەکدەخست، دوای ئەوەی ئەندامانی ئەم حیزبە بە گژ جەندرمەی ئێران داچوون، ڕوسەکان هەڵیانوەشاندەوە و مەفرەزەی سوپای سوور ـ خستە ناو شار.[۱۳]

## ۱۲
## ئاژاوەی ڕەزاییە (٤-١٩٤٢/٥)

دوای بڕیاری چەک کردنی کوردەکان و بەکارهێنانی جەندرمەی شیعە مەزەبی ناوچەیی (واتە ئەو ئازەریانەی کە بە زمانی تورکی قسە دەکەن) لە ڕەزاییەدا ئاژاوە و پەشێوی ئازەتر و توندتر لە جاران سەرهەڵدەدات.

لە جاران پتر شت ڕوو دەدات. لە ۱۹٤۲/٤/۲۸ عەشایەری کوردی دەوروبەر، پەلاماری شار دەدەن، خەتی تەلەفونات دەپچڕن و شار گەمارۆ دەدەن، پارێزگار بۆ تەورێز هەڵدێ.

ڕۆژی ۱۹٤۲/٤/۳۰ کونسولی سۆڤیەت لە تەورێز و سەرۆکی سەرکردایەتی هێزێن سۆڤیەتی لە ناوچەکەدا، بە فڕۆکە بۆ ڕەزاییە دێن، و لەگەڵ سەرانی کورد دا دیدار دەکەن. سەرانی کورد عەرزوحاڵ و سکالانامەیەکیان دەدەنێ و لەو عەرز و حاڵەدا بەتایبەتی داوای ئەوە کراوە کە مۆڵەتیان بدرێتێ ئازادانە چەک هەڵگرن و هەر هەموو ئەو جەندرمە ئێرانیانەی کە لەناوچەی نێوان خوی و مەهاباد دا جێگیر بوون لەم ناوچەیە نەمێنن. لە ئاستی سیاسیدا سەرانی کورد خوازیاری ئەوەن کە «ئازاد بن لە بەڕێوە بردنی کاروباری خۆیاندا» و لە هەر هەموو دام و دەزگا دەوڵەتییەکانی ڕەزاییە ولە قوتابخانەکانی شاردا

نوێنەریان هەبێ و لە قوتابخانەکاندا بە زمانی کوردی بخوێنرێ و بیست زیندانی کورد ئازاد بکرێن.

روسەکان کە دەبینن ژمارەی چەکدارانی کورد خۆی لە ۱۰۰۰۰ هەزار جەنگاوەر دەدا، بە ئاشکرا خەمی ئەرەیان لێ دیت کە چۆن قوەتێک بۆ بەبەرچ دانەوەی ئەم هێزە گەورەیە بنێرن، و ئیتر بە پێی پێویستی وەخت رەفتار دەکەن.

رۆژی ۷/٥/ ۱۹٤۲ سەرۆکی سەرکردایەتی سوپای روس (لە ناوچە داگیرکراوەکەدا) دەگەڵ وەزیری جەنگی ئێران و فەهیمی پارێزگاری تازەی ئازەربایجاندا دێتەوە بۆ رەزاییە... کوردەکان هێشتا لە قەراغ شاردان، لێ لە ئەنجامی زنجیرە گفتوگۆیەکدا، سەرانی کورد بە گەرانەوەی هێزێن ئێرانی قایل دەبن و ئەم هێزانە لە ۱۹٤۲/٦/۷دا بە سەلامەتی و بێ چ قەوماوێک دەچنەوە ناو رەزاییە.

## ۱۳

## کۆنفرانسی شنۆ (ئەیلولی ۱۹٤۲)

لە ۱۹٤۲/۹/٤ دا هەموو سەرانی کوردی ناوچەی باشوری رۆژاوای ئازەربایجان و باکوری کوردستانی ئێران بۆ ماوەی چەندین رۆژ لە شنۆ کۆ دەبنەوە، بە گوێرەی راپۆرێن پڕ مەترسێن کو دەگاتە دەستی سیاسەتوانانی ئینگلیزی ئاکنجی تەوریز، روسەکان ئەم کۆبونەوەیەیان ساز داوە و لە کۆبوونەوەکەدا داوایان لە کوردەکان کردووە ( کە دۆستی ئەمەکداری یەکێتی سۆڤیەت بن) و «بەرەیەکی یەکگرتووی کورد» پێک بهێنن.[14]

بەلام لە راستیدا سۆڤیەتەکان لە پشت ئەم کۆبونەوەیە نەبوون، هۆی ئەم کۆبوونەوەیە زەماوەندی کوری قەرەنی ئاغا بوو، کە یەکێک بوو لەسەر گەورەکانی ناوچەکە، هەرچەندە پەی بردن بەو نەقش و رۆلەی کە سۆڤیەتەکان لەم کارەدا بوویانە، لە تواناادا نییە، بەلام پێدەچێت کە کوردەکان لەم کارەدا خترکەیەکی سۆڤیەتەکانیان دابێ.

دوو مەسەلەی بنەرەتی یەخانگیری سەرانی کورد بوو، لەلایەکەوە نەبوونی یەکێتییەکی تەواو لەلایەکی دییەوە دابینکردنی پشتیوانی ولاتێکی گەورە.

**هەڤرکی و دووبەرەکی و ساردی نێوان سەرانی کورد هەرگیز تا ئەم رادەیە توند و تیژ نەبوو، لەنێو سەرانی عەشیرەتەکاندا سیانیان لەسەر پێ بوون بۆ رووبەرووبوونەوەی یەکتری، میر ئەسعەدی دیبوکری، عەبدوللا بایزیدی مەنگوری، قەرەنی ئاغای مامەش.**

رێبەرانی سیاسی تر لەوان، واتا قازی محەمەد و حەمەرەشید، هەستیان بە زەرورەتی

یەکبوونی بزووتنەوەی کوردایەتی دەکرد، بەتایبەتی قازی محەمەد وردە وردە ترسی ئەوەی لێ دەنیشت کە ئەگەر کوردەکان زوو فریا نەکەون و ریزەکانی خۆیان یەک نەخەن، ئەوا لەکۆتایی جەنگ دا هێزە گەورەکان لەوە گرفتارتر و ماندووتر دەبن کە بیر لە چارەنووسی کورد بکەنەوە. هەنگینێ بە ئاسانی دەبن بە نێچیری دەوڵەتی ناوەندی.

## ١٤

## مانۆرەکانی قازی محەمەد

رەفتاری قازی محەمەد دەرهەق بەو دوو هێزە گەورەیەی کە لە کوردستاندان واتە بەریتانیا و سۆڤیەت(١٥) تا رادەیەک ئاڵۆزە قازی محەمەد لە راستیدا بە تەمای ئەوە بوو پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە بکات. بەتایبەتی لە نیوەی مانگی دەدا کە میوانداری ئیروانسی مارشاڵی بەریتانیا لە عێراق و ئورکوتی کونسولی بەریتانیا لە تەوریزی کرد.

ئینگلیزەکان زۆر دوو دڵ و بەپارێزن، پێیان وایە کە لەوەیە قازی محەمەد پەیوەندی بە سۆڤیەتەکانەوە هەبێ، ئەم دووانە تەنانەت «داوێک»ی بۆ دەنەنەوە، ستایشی بەرگری کردنی روسەکان لە ستالینگراد دەکەن، قازی محەمەد بە پێچەوانەوە ستایشی ئینگلیزەکان و شێوەی رەفتاریان لەگەڵ کوردێ عێراقدا دەکات، لەسەری دەڕوات کە «تەنێ بە پشتیوانی و هاوکاری بەریتانیای مەزن بووە کە کوردەکان توانیویانە بیر لە باشکردنی وەزعی خۆیان و سوود وەرگرتن لە ئازادی بکەنەوە.» ئورکوت بە گێرانەوەی سەربوری چیانشینانی ئەسکاتلەندی کە بە پشتیوانی هێزی بێگانە - واتە فەرەنسا- بەگژ پاشای ئینگلیز داچوون و سەرەنجام کارەکەیان شکستی تەواوی هێنا، بە گومانی خۆی زیرەکی کرد.

ئینگلیزەکان دڵنیا بوون کە قازی محەمەد بەم مەبەستە خۆی لە ئینگلیز نزیک دەکاتەوە تا روسەکان نیگەران بکات و ناچاریان بکات کە پشتیوانی لە نەخشەکانی بکەن، قازی کە شاد و بەکەیف لە باکۆ گەڕابوەوە، زۆری پێ ناچێ کە نائومێدی خۆی لە رەفتاری روسەکان دەردەخات و دەیەوێ سەرلەنوێ پەیوەندی وان بە کوردەوە بیراز بکاتەوە.

ئینگلیزەکان بە شێوەیەکی نارلستەوخۆ هەست دەکەن کە کورد لە کۆبوونەوەکەی شنۆدا، ویستوویانە سوود لە روسەکان وەربگرن، واتا وایان لێ بکەن کە بیانەوێ و نەیانەوێ پشتیوانی لە بزووتنەوەی یەکخستنی کورد و ئوتۆنۆمی کوردستان بکەن.

لە کاتێکدا مەقۆ مەقۆی پەیدابوونی بزاڤێکی شۆڕشگێرانەی کورد، کە لە پێناوی

ئوتونومی کوردستاندا دەخەبتی، بلاو دەبێتەوە و زیاد دەکات، سۆڤیەتەکان لە ئێرانیەکان بە گومانن و ڕێگەیان نادەن کە هێزێکی گرینگ بۆ ئەم دەڤەرە ئاسکە بنێرن. لە هەمان کاتدا ناشیانەوێ خۆیان ئەرکی پۆلیس ببینن، لەبەر ئەمە داوا لە سەرانی کوردەکان دەکەن کە ئارامی و بەڕێوە بردنی ناوچەکە بگرنە ئەستۆ.[16]

**خۆلاسە، پێناچێت کە سۆڤیەتەکان زەمینەیان بۆ سەربەخۆیی کوردستان خۆش کردبێ، بەلام ترسیان لەوەیە کە ئینگلیزەکان شتی وەها بکەن و بە پێچەوانەوە.**

ئێستە ڕەوزع و حالی کوردستان هەندێ سەیر دەنوێنێ، یاریدەدەری کونسولێکی سۆڤیەتی دوای سەفەرێک لە ناوچەی مەریوان دا بە یاریدەدەری کونسولی ئینگلیزی دەڵێ کە **«لەم ناوچەیەدا بە عەمەلی چەند وردە کۆمارێکی کوردی هەیە» و هێزێن تهرانی بۆ ڕۆیشتن لە شوێنیکەوە بۆ شوێنێکی دی لە ناو خاکی خۆیدا «دەبێ چل پەلجا کیلۆمەتر لە ڕێ لابدات و دوور بکەوێتەوە»**

لەباری بژێوییەوە وەزع خراپە، لە کرمانشادا گرانی و قاتی بە رادەیەک بو کە کونسولیەتی ئینگلیز بەرنامەیەک بۆ دابەشکردنی خواردنی خۆڕایی دادەنێ و ڕۆژانە دووسەد نەفەر نان دەدات.

لە سەرەتای سالی ١٩٤٣دا هەزار حالەتی تیفوس لە شاردا هەبو، نەخۆشخانەی شار دەبو دابخرێ، ڕۆژانە ١٥ کەس لە هەژاری و برسێتیدا دەمرن.[17]

شار، ئەمڕۆ بە سێەی دەسپێرێ، یەدەکی ئازوقەی بەشی یەک ڕۆژ زیاتر ناکات.

وەزعی تەورێز زۆر لەمە باشتر نیەیە، هەموو یەدەکی گەنم و ئاردی شار بەشی یازدە ڕۆژی خەلکەکەی دەکات.

## ١٥

## دامەزراندنی کۆمەلە

لەم هەلومەرجەدا، ژمارەیەک لە خەلکی مەهاباد کۆمەلەی ژیانەوەی کوردستان دادەمەزرێنن، لەوانە رەحمانی زەبیحی، کە پاشان دەبێت بە سکرتێری گشتی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەلە، محەمەدی شەرەفی کە بازرگان بوو، قاسم قادری، مامۆستا بوو، ئەحمەدی عیلمی فەرمانبەر بوو، قادری مودەریسی، حوسەینی فروهەر فەرمانبەری ئاردوانی بوو، عەزیزی زەندی کەسایەتیەکی زانا بوو کە دانووی دەگەل قازی محەمەد دا نەدەکولا، چونکە خۆی لەم مەیدانەدا لە قازی محەمەد بە شایستەتر و لە پێشتر دەزانی.

محەمەدی یاهو، کاسبکار بوو.

بەڵێ ئەمانە خەڵکانێکی نەتەوەیی بوون و لە چین و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵگەی مەهابادەوە، لە وردە بورژواوە بیگرە تا مالیاتی زۆر هەژار و بینەوا، هەڵقولا بوون وسەریان هەڵدابوو، رەحمان زەبیحی کوڕی پیاوێکی کاسبکاری زۆر هەژار بوو، کە خۆی و هەموو ماڵ و منداڵەکەی لە یەک ژووردا دەژیان، زەبیحی بەناچاری لە پۆلی سێیەمی ناوەندی وازی لە خوێندن هێنا، چونکە بە هۆش و زیرەک بوو هەر زوو ناوناوبانگی کەوتە سەر زاران و بوو بە مامۆستای منداڵی ماڵە دەوڵەمەندانی ناوچەکە. ئەو هەژار فێری زمانی کوردی دەکات، کە پاشان لەگەڵ هێمن دا بوون بە دوو شاعیری گەورەی هاوچەرخی کورد.

هەر هەمان زەبیحی یەکێک بوو لە هەوەڵین نەتەوەییەکانی مەهاباد کە چەشنە پەیوەندییەکی دەگەڵ بزاڤی کوردایەتی لە سلێمانی دا بەرقەرار کرد.

دەوری کوردێن نەتەوەیی عێراقی لە دامەزراندنی «کۆمەڵە» دا یەکێکە لە «نهێنیە» بچوکەکانی مێژووی بزوتنەوەی کورد. کوردێن ئێرانی هێندە خۆیان بە کوردێنی خۆوە بادەدەن کە رەنگە بە پێچەوانەی هەموو راستیە مێژووییەکانەوە بێ، ئیدیعا دەکەن قەرزباری کوردی عێراق نین.

بەڵام لە راستیدا هەموو شتێک ئەوە دەردەخات کە ئەم بزاڤە سەرەتا بە دامەزراندنی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد لەلایەن مەحمود جەودەت لە سلێمانی، دەستی پێکرد کە پاشان گروپی ئەفسەرانی ناسیونالیستی هیوا، لەوانە میرحاج درێژەیان بە چالاکیەکانی دا.

ئایا میرحاج لە یەکەمین کۆبوونەوەی کۆمەڵەدا کە لە ١٩٤٤/٩/١٦ دا لە باغێکی دەرەوەی مەهاباد دا ئەنجامدرا، بەشداری کرد؟ ئایا ئەو پێشنیازی کرد کە حیزبێکی تازەی نهێنی و بە شانەی نهێنی و جیا لە یەکدی دابمەزرێ؟ ئایا بە رەزامەندی ئەو بوو کە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بڕیاریان دا کە ئەندامانی تازە بەر لەوەی بێنە ریزی حیزبەوە سوێند بخۆن؟(١٨)

ئایاکۆمەڵە لقێک بوو لەهیوا؟ کوردێن ئەمڕۆی عێراق لەم باوەڕەدان. بەهەر حاڵ هیواو کۆمەڵە پەیوەندی نزیکیان بە یەکەوە بوو، لە مانگی ١٩٤٤/٣ دا محەمەدی شەرەفی بۆ دیداری ئەفسەرانی نەتەوەیی هیوا (ئەمین رەواندزی، عەبدولعەزیز شەمزینی، عیزەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو) دەچێ بۆ کەرکوک و چەند مانگێک لەوە بە دواوە هەمزە

عەبدوڵلا لە ڕێبەرانی چەپی هیوا بووە چەند سەفەرێک بۆ مەهاباد دەکات، لە دوای ئەویش قەدری بەگی نەوەی جەمیل پاشای دیاربەکری لە سووریاوە و مەلا وەهاب لە تورکیاوە بۆ مەهاباد دێن.

کۆمەڵە هەر زوو بەزوو سنووری جوگرافی و کۆمەلایەتی چالاکییەکانی خۆی فراوان دەکات، ئەم ڕێکخراوە کەلە بنەڕەت دا ڕێکخراوێکی شاری بوو، و لە سنووری مەهاباد بوو، لە ڕاستیدا دە نێو سەرانی عەشایەردا، لە ناوچەی خوی و بۆکان و سەقزدا، دەکەوێتە ئەندام و ...رتن، سنووری باشووری بلاو بوونەوەی کۆمەڵە سنوورێکی نەبینراوە کە کوردستانی سوونی مەزهەبی ئێران لە کوردستانی شیعە مەزهەبی ئەم وڵاتە جیا دەکاتەوە.

بە دەگمەن دوو ڕێکخراو دەبینرێ کە بە ئەندازەی هەردوو حیزبی هیوا و کۆمەڵە لێکدی جیاواز بن، هیوا، لە خەڵکی ڕۆشنبیری شاریی مارکسی خولیا، پێک هاتبوو، بەڵام کۆمەڵە بە زۆری لە دەوڵەمەند و پیاو ماقوڵ و خەڵکی عەشایەر پێک هاتبوو کە زۆر مەحافەزەکار بوون و جیهانبینییەکی فیکری تایبەتی و روونیان نەبوو.

جیا هیوا کۆمەڵە لە بنج و بناواندا یەک ڕێکخراو بوون یان نا، ئاسایی بوو کە هەریەکێک لەم دوو لقەی بزاڤی کوردایەتی بە شێوازی تایبەتی خۆیان پەرە بسەنن.

لە ئاخر و ئوخری ساڵی ١٩٤٤ دا لە هەر دوو کوردستانی عێراق و ئێراندا وەزعێکی تا رادەیەک نا ئاسایی لە گۆڕێ بوو، لە مەهابادا خەڵکی لە ١٩٤٣ دا پەلاماری شارەوانیان دابوو، حەوت پۆلیسی ئازەریان کوشتبوو و ئەوانی دی هەڵاتبوون ودوا شوێنەواری دەسەلاتی دەوڵەتی ناوەندییان لەنێوبردبوو، لە ناوچەی بارزانیش مەلا مستەفا لە نزیکەوە موراقەبەی پێگەکانی پێشەوەی سوپای عێراقی دەکرد، بەڵێ ئەم دوو شوێنە دوو تاقیگەی بچووک بوون کە لەوێندەر ناسیونالیستانی کورد بە ئازادییەوە شێوە جۆراوجۆرەکانی ئوتونومی یان سەربەخۆییان دەجەرباند.

ئەوسا کەس خۆی بە زیاتر نەدەزانی، نوێنەرانی هەموو ناوچە جوگرافیایی و ڕێبازە سیاسیەکانی کوردستان دەهاتن و ئەم ئەزموونەیان دەبینی کە ئەنجام دەدران وهەر کەسە و تەگبیر و پێشنیازی خۆی دەکرد.

لەم قۆناغەدا واتا لە مانگی ١٠ / ١٩٤٤دا[١٩] قازی محەممەد پەیوەندی بەرپرزەکانی کۆمەڵەوە دەکات، دوو ساڵ بوو ئەم حیزبە دامەزراندبوو بەڵام بەڕێوەبەرانی حیزب، بەتایبەتی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی، ئەو قەناعەتەیان لا دروست نەبوو بوو کە داوای بە

ئەندام بوونی قازی محەمەد بکەن. کەسایەتی دیاری قازی محەمەد لە مەهاباد وترسی «دیکتاتۆریەت» ئەم کارەیان دواخستبوو[٢٠] و سەیر ئەوەیە کە قازی محەمەد ئەرگیز بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە هەڵنەبژێردرا، بەڵام ترسەکەی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بەراست دەچوو، قازی محەمەد بەلەز زاڵ بوو بەسەر ڕێکخراوەکەدا و بە جۆری هەڵبدەسوڕان لە تۆ وایە ئەو سەرۆکیەتی.

لە سەرەتای هەیڤی دەی ١٩٤٤دا قازی محەمەد بۆ تاران چوو بوو، سەرەک وەزیری ئێران دەگەڵ سەرانی دیکەی کوردا بۆ تارانی «دەعوەت کردبوو»[٢١]

قازی محەمەد لەو ماوەیەی کە لە تاران دەبێ دەگەڵ سەرلەشکر حەسەنی ئەرفەعی سەرۆکی سەرکردایەتی سوپای ئێران دا گفتوگۆی کردبوو، بە گوتەی ئەرفەع، سەدری قازیی برای قازی محەمەد کە ئەندامی ئەنجومەنی ئێران بوو، سەیفی قازی ئامۆزای قازی محەمەد، خۆیان بە میانەڕەوو «ئاشتی خواز» نیشان داوە و بە هومێد بوونە کە دەوڵەتی ئێران وەزع و حاڵی تایبەتی ئەوان لەبەرچاو بگرێ، و گوتویانە کە «ئامادەن لە پێناوی خۆشگوزەرانی خەڵکی ئێران دا هاوکاری دەگەڵ دا بکەن»

قازی محەمەد زۆر «ڕاشکاو» بوو، باسی دەرد و ئازاری دێرینی گەلی کورد و خراپی بەڕێوەبردنی ناوچە کوردنشینەکانی لە لایەن فەرمانبەرانی بێ توانا وە کردبوو و ئاواتی خواستبوو کە دەوڵەت لە ئێستە بە دواوە فەرمانبەرانی کورد لە ناوچە کوردنشینەکاندا دابنێ،[٢٢] سەرلەشکر ئەرفەع، قازی محەمەد بە پیاوێکی «سەخت» تێ دەگات لێ داخوازییەکانی قازی محەمەد هێشتا هەر ئاساین و تاقە قسەیەک لەمەڕ ئۆتۆنۆمیەوە نییە چ جای جیابوونەوە.

## ١٦

## دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان

بەڵام ڕێتمی ڕەوتی ڕووداوەکان خێرا دەبن، لە ١٦/٨/١٩٤٥ دا لە کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵەدا، قازی محەمەد پێشنیازی کرد ئەم بزووتنەوە نهێنییە بکرێ بە حیزبێکی ئاشکرا بە ناوی «حیزبی دیموکراتی کوردستان» و بکەوێتە چەلەنگی ئاشکرا.[٢٣]

دەوری سۆڤیاتەکان لە دروست کردنی ئەم حیزبە تازەیەدا کە لەسەر شێوەی «دیموکراتیک»ی شێوازی سۆڤیەتی ڕێک خرابوو، چ بوو؟ کەس نازانێ، هەروەها چ کەسێک زانیاری ورد و تەواوی لەمەڕ ئەو هەلومەرج و بارودۆخە نییە کە بوونە مایەی

دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان، تەنانەت مێژوونووسانی سەرەکی کۆماری مەهابادیش، کەسانی وەکو ویلیام ئیگلتن وئارچیبالد رۆزفولتی (کوڕ) مێژووی دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان. بە چەند هەفتەیەک دوای مێژووی ناوبراو. واتە پاش دووەم سەفەری قازی محەمەد بۆ باکۆ لە ۱۱/ ۱۹٤٥ دادەنێ.

شایەدانی ئەم قۆناغە کەمتر خۆ لە باسی دوا ساتەکانی ژیانی کۆمەڵە دەدەن و بەتایبەتی باسی دەوری پیاوانی ئینگلیز دەنێو کۆمەڵەدا کە (بریتی بوون لە کوردێن عێراقی : سەید عەبدوڵڵا گەیلانی و عەبدولعەزیز شەمزینی کوڕی و مەحمەد سەدیقی کوڕی تەها ناسراو بە پوشو.) دیارە ئەمە بوو بوە مایەی ناکۆکی و دوو بەرەکی.[٢٤]

بە هەر حاڵ حیزبی دیموکراتی کوردستان بەلەز بەرنامەی خۆی لە «بەیاننامەیەک» دا بە ئیمزای سەد کەسێک لە کەسایەتییەکانی کورد و بەم داخوزایانەوە بڵاو دەکاتەوە.

- ئوتونومی بۆ کوردستان لە چوارچێوەی وڵاتی ئێران دا.
- بەکارهێنانی زمانی کوردی وەکو زمانی رەسمی
- دامەزراندنی فەرمانبەر، لە خەڵکی ناوچەکە
- دانانی یەک یاسا بۆ موڵکداران و جوتیاران[٢٥]
- هاریکاریکردن دەگەڵ بزووتنەوەی ئازربایجاندا.
- چاککردنی وەزعی ئابوری و کۆمەڵایەتی کوردستان، بەتایبەتی لە باری بەکارهێنانی سەرچاوە سورشتییەکان، ریفۆرمی کشتوکاڵی و پەرەپێدانی ساغلەمی و پەروەردە و فێر کردن.

ئەم بەرنامەیە کە لە بناغەدا بەرنامەیەکی نەتەوەییە، چ نیشانەیەکی شۆڕشگێری تێدا نییە و رەنگدانەوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی حیزبە تازەکەیە.

## ١٧
## سەفەری دووەم بۆ باکۆ (ئەیلولی ١٩٤٥)

قازی محەمەد پاش چوونی بۆ تەوریز و بەشداری کردن لە رێ و رەسمی دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان (۱۹٤٥/۹/۳) کەلە حیزبی تودەوە دروست بوو بوو، هەر لەم مانگی ئەیلولەدا لەگەڵ چەند کەسایەتیەکی کوردا، لەوانە سەیفی قازیی ئامۆزای و مەنافی کەریمی، سەفەری دووەمی باکۆ دەکات.

هەلومەرجی ئەم سەفەرە لە هەلومەرجی سەفەری یەکەم جیاوازە. لە ئەیلولی ١٩٤٥ دا دووەم جەنگی جیهان تازە کۆتایی هاتبوو، پەیوەندییێن «هاوپەیمانانی» جاران لە خراپی دابوو.

بەتایبەتی لە ئێراندا روون بوو کە یەکێتی سۆڤیەت لە خەیاڵی ئەوەدا نییە کە بە پێی پەیمانی سێ قۆڵی ساڵی ١٩٤٢، کەداینابوو گەرانەوەی هێزێن هاوپەیمانان ئەوپەڕی تا شەش هەیڤان پاش کۆتایی شەڕ درێژە بکێشێت، هێزەکانی خۆی لە ئێران بکشێنێتەوە.

لە سەفەری دووەمی قازی محەممەد بۆ باکۆ، هەموو شتێک بە روونی دەخرێتە روو، ئەمجارەیان سەفەرەکە سەفەرێکی «رۆشنبیری» نییە، بەڵکو سەفەرێکی سیاسیە، نوێنەرانی کورد تەنانەت یاداشتنامەیەکیان ئامادە کردبوو و ئەوەی لە سۆڤیەتیان چاوەڕێ دەکرد، بە وردی نووسیبوویان، پشتیوانی کردنی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد، هاوکاری دارایی و چەک.

بە گوێرەی گوتەی ویلیام ئیگلتۆنی نووسەری کتێبی کۆماری ساڵی ١٩٤٦ی کوردستان، باقروف لە سەرەتادا بەسەرسامی دەڵی کە کورد پەلەی چیانە لە دامەزرانی دەوڵەتی جیا، بەرای ئەو ئازادی کوردستان پەیوەستە «بەسەرکەوتنی خەباتی جەماوەری خەڵکەوە» نەک هەر لە ئێران دا بەڵکو لە تورکیا و لە عێراقیشدا، و کوردی ئێرانی تا وەدیهاتنی یەکێتیی هەموو «مللەتی» کورد،خۆشحاڵ بن بەوەی کە بەشێک بن لە ئازەربایجانی ئۆتونومیدار،[٢٦] لە راستیدا ئەمە دەقاو دەق هەمان سیاسەتە کە پاشان باقروف گرتییە بەر.

بەلام قازی محەممەد و نوێنەرەکانی دیکەی کورد، قەبوڵیان نەبوو کە کوردستان سەر بە ئازەربایجان و لە سایەی حوکمی ئەودابێ، بۆیە گوتەکەی باقروفیان رەفز کرد و وا دیارە ئەم رەفزکردنەش جێی خۆی گرت. چونکە باقروف لە کاتێکا مشتی بە مێزەکەی بەردەمیا دەکێشا پێی گوتن «مادامێکی یەکێتی سۆڤیەت هەبێ کورد بە ئاواتی سەربەخۆیی دەگەن.»[٢٧]

دوای ئەم وەرچەرخانە تەواوە، باقروف بەڵێنی چەک بە کوردەکان دەدات (زرێپۆش وتۆپ و رەشاش) و هەروەها بەڵێنیان دەداتێ کە چەند شوێنێک لە قوتابخانە سوپاییەکانی باکۆ بۆ خوێندکارانی کورد تەرخان بکات.

باقروف باسی هەندێ کۆمەکی دارایش دێنێتە گۆڕێ، و بەڵێن دەدا کە کەرەستەی

چاپیان بۆ بڵاوکردنەوەی رۆژنامە و کتێبی کوردی بۆ دابین بکات و ئەم وەعدە دەباتە سەر.

قەرار بوو نوێنەرانی کورد ماوەیەکی زیاتر لە یەکێتی سۆڤیەتدا بمێننەوە، تەنانەت لە بەرنامەدا بوو کە سەفەرێکی تەفلیسیش بکەن، بەڵام بەهۆی رووداوێکی چاوەنۆڕ نەکراوەوە سەفەرەکەیان تەواو نەکرد. بارزانی کە باقروف بە جاسوسی ئینگلیزی دەزانی لە سەر سنوور بوو ئامادەبوو بێتە ناو ئێرانەوە، باقروف نوێنەرانی کوردی بۆ ئێران ناردنەوە تا کارێکی وەها بکەن رەوشەکە نەقڵیشێتەوە.[٢٨]

## ١٨
## راگەیاندنی کۆمار (١٩٤٦/١/٢٢)

لە ئازربایجاندا ریتمی رەوتی رووداوەکان بە گورتر دەبێ: لە ١٩٤٥/١١/٢٠ دا جەعفەر پیشەوەری ئوتونومی ئازربایجان رادەگەیەنێ و لە ١٩٤٦/١٢/١٥ دا وەکو «سەرۆکی دەوڵەتی ئوتونومیدار» ئەنجومەنی نیشتمانی دەکاتەوە، پێشتر داوای لە قازی محەمەد کردبوو کە پێنج نوێنەری حیزبی دیموکرات بۆ ئەنجومەنی ناوبراو بنێرێ.

دوای چەند رۆژێک واتە لە ١٩٤٥/١٢/١٧ دا، دوای خۆپیشاندانێکی جەماوەری گەورە بەرەو دادگای مەهاباد کە دوا پاشماوەی دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی بوو، ئاڵای کوردستان، کە بریتییە لە سێ پارچەی ئاسۆیی سەوز و سپی و سوور (سوور وسپی و سەوز تەواوە) کەهەتاوێکی زەردی دەورەدراو بە دوو گوڵەگەنم لە ناوەندیدایە، لەسەر بینا دەوڵەتیەکانی مەهاباد و شنۆ و نەغەدە هەڵدەکرێ.

بەڵام لە راستیدا هێشتا داوەکانی پەیوەندی لەگەڵ تاراندا نەپچراون و قازی محەمەد لە هەڤپەیڤینێک دا دەگەڵ رۆژنامەی (شەهبازی چاپی تاران) دا ئاماژە بۆ بەرنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەکات و دەڵێ حیزبی ناوبراو کومونیست نیە، بەڵام لەناو سیستەمی نەتەوەکانی یەکێتی سۆڤیەتدا «ئەو دیموکراسییەتە راستەقینە و ئەو رێکخراوە دەبینێ کە ئەو ئارەزووی دامەزراندنی هەیە» قازی محەمەد پەیوەندی خۆی بە کوردێن دەرێی ئێرانەوە بە درۆ دەخاتەوە و دووپاتی دەکاتەوە کە باوەری بە دەستووری ئێران هەیە و رایدەگەیەنێ کە ئەو «ئەنجومەنی باڵا»یەی ناوچەی مەهاباد بەرێوە دەبات، پەیوەندی بە دەوڵەتی مەرکەزییەوە هەیە و لە کۆتایی دا دەڵێ: «خیانەتکاران بە مەبەستی شاردنەوەی نیازی شومی خۆیان و بۆ ئەوەی ئێمە ویران بکەین، بەزۆر بانگەشەی ئەوە دەکەن کە کوردستان خوازیاری سەربەخۆییە، دەوڵەت ئەوەندە سەر دەکاتە سەر ئازەربایجان و کوردستان و

ئەوەندە بە جوداخوازیان تاوانبار دەکات کەسەرەنجام»[٢٩]

لە ئاخرو ئوخری مانگی ١٢/ ١٩٤٥دا قازی محەمەد لە رێگەی عەبدولرحمانی زەبیحیەوە پەیوەندی دەکات بە کونسولی بەریتانیاوە لە تەوریز، مەبەستی ئەم پەیوەندییە ئەوە بوو کە رای کونسولی بەریتانیا وەربگیرێ لەمەڕ ئەگەری بەرقەرار کردنی پەیوەندی رەسمی دەولەتی بەریتانیا دەگەڵ کوردستاندا، پاش راگەیاندنی ئایندەی ئوتونومی بەلام ئینگلیزەکان دیسان ساردیان نیشان دا، وەلامی کونسول «ناڵۆز و دڵ ساردکەرەوە» بوو.[٣٠]

هیچ دیار نییە کە قازی محەمەد لەلایەن روسەکانیشەوە دڵنیا کرابێ، بەلام لە دوا دیداریدا دەگەڵ نوێنەرانی سۆڤیەتی دا لە تەوریز بڕیاری دا کە «ئوتونومی کۆماری کوردستان» رابگەیەنێ و لە ١٩٤٦/١/٢٢ دا لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا لە مەیدانی چوار چرای مەهاباد و بە ئامادەبوونی مەلا مستەفا بارزانی کە لە ریزی پشت قازی محەمەدەوە وەستابوو، ئوتونومی کۆماری کوردستانی راگەیاند.

پاش چەند رۆژێک رۆژنامەی کوردستان (ژمارە ١١ی شوباتی ١٩٤٥) ناوی وەزیرانی «دەولەتی نەتەوەیی کوردستان»ی بەمجۆرە بلاو کردەوە. سەرەک وەزیران: حاجی بابە شێخ،

وەزیری جەنگ: سەیفی قازی.

وەزیری پەروەردە: مەنافی کەریمی.

ناوخۆ: محەمەد ئەمین موعینی (بازرگان)

ساغلەمی: محەمەد ئەیوبیان (دەرمانفرۆش)

راوێژکاری: عەبدولرەحمان ئیلخانی زادە (مولکدار)

رێگا: ئیسماعیل ئیلخانی زادە (مولکدار)

ئابوری: ئەحمەد ئیلاهی

پۆستە: کەریم ئەحمەدی

بازرگانی: مستەفا داودی «بازرگان»

دادوەری: مەلا حوسێن مەجدی

کشتوکاڵ: مەحمود والی زادە «بازرگان»

راگەیاندن: سەدیق حەیدەری

لەم حکومــەتەدا کــە زۆربەی ئەندامــانی لە بازرگــانان و مــولکداران پێک هاتووە، دەوڵەمەندان پایە و پێگەی بالاتریان هەیە.

## ١٩

## سوپای مەهاباد و .بارزانییەکان.

قازی محەممەد کە پەی بەلاوازی «کۆمارە» ساواکەی خۆی بردبوو، خێرا کەوتە هەوڵدان بۆ دامەزرا[illegible]ی هێزی بەرگری.

شــێخ ئەحــمــەد، دوای مــاوەیەک بەخــۆ و ٦٠٠ جەنگاوەرەوە لە دەوروبەری نەغــەدە گیرسایەوە و تا کۆتایی کۆماری مەهاباد هەر لەوێندەر مایەوە. کچی یەکێک لە سەرانی عەشیرەتی قەرەپاپاخی (کە کورد نین بەلام جلکی کوردی لەبەر دەکەن) [١] خولست [illegible] **ئەم زانیــارییــە هەڵەیە و راست نییــە- وەرگــێــڕی کوردی،** و کــەم و زۆر تێکەڵی ژیانی سیاسی کۆمار نەبوو.

مەلا مــســتــەفا بارزانی کە لە مــەهاباد گــیرسابووەوە، چەکدارەکــانی خــۆی کــە بە پێی هەندێک مەزەندە ١٢٠٠-٢٠٠٠ جەنگاوەر بوون خســتە خزمەتی کۆمارەوە، کە بەخۆی بوو بە یەکێک لە چوار جەنەراڵەکەی (١٩٤٦/٣). [٢]

بەلام قــازی مــحــەمــەد کــە نەیدەویست بە تەواوەتی پابەندی نیــازچاکی بارزانی یان خەڵکانی سەر بە عــەشــیرەتەکانی ناوچەکە بێ، **سوپای مــەهابادی واتە یەکەمین سوپای رێک وپێکی لەمێژووی بزاڤی نەتەوەیی کوردا، دامەزراند.**

ژمارەی ئەندامانی ئەم سوپایە هەر زوو گەییە ١٢٠٠ سەرباز و چل دەرەجەدار و ٧٠ ئەفسەر، کە لە شاری مەهاباد و دەوروبەری مەهاباد بە سەربازی گیرابوون.

هەرچەندە باقــرۆف لە ئەیلولی ١٩٤٥ داو لە باکــۆ وادە و بەڵێنی گــەورەی بە قــازی محەممەد دابوو، بەلام هاوکاری و کۆمەکی رژێمی سۆڤیەت زۆر کەم بوو، ئەم کۆمەکە بە هەر هەمــووی بریتی بوو لە ١٠٠٠٠ تفــەنــگ و دەمــانچــە و رەشــاشی چیکۆسلۆڤــاکی و نزیکەی بیســت لۆری.[٣١]

سۆڤیەتەکان لە ئازاری ١٩٤٦ دا سەروان سەلاحەدین کازمۆف یان بۆ مەهاباد نارد، ئەم پیاوە کە لە نێو کوردەکان بە «کاک ئاغا» ناسرابوو، لە سوپای کوردستاندا گەیی بووە پلەی عەقید، لە گەڵ ئەو ئەفســەرە کوردانەی کە لەگەڵ مەلا مستەفا دا بۆ ئێران هاتبوون، کەوتە سەرپەرشتی و مەشقداادان و راهێنان و رێکخستنی ئەم سوپا نۆباوە، قازی محەممەد

هەرچی کرد و کۆشا، یارمەتی و هاوکاری سۆڤیەت لەوە تێنەپەڕی و وێڕای ئەو هەواڵانەی کە ڕۆژنامەوانی ڕۆژاوا لەم بارەیەوە بلاویان دەکردەوە، چ هەواڵێک لەو تۆپ وتانکانەوە نەبوو کە قەرار بوو بێن.[٣٢]

## ٢٠

## قەیرانی نێوان ئازەربایجان و کوردستان

ئەوەی سەیرە ئەمەیە کە نەک تاران بەڵکو تەورێز یەکەمین قەیران لە مەهاباد دا دروست دەکـ ـ.

زۆری پێناچێت کە پێنج نوێنەرەکەی کورد لە « ئەنجومەنی نیشتمانی» تەورێزدا بە هەندێ هەنجەت ناگەڕێنەوە بۆ تەورێز، بەم جۆرە نیشانی دەدەن کە مەهاباد سەر بە تەورێز نییە.

لە شوباتی ١٩٤٥ دا جەعفەر پیشەوەری، داوا لە قازی محەممەد دەکات بۆ تەورێز بچێت تاروونی بکاتەوە بۆچی لە کاتێکا دە ئازەربایجان تازە ئوتونومی ڕاگەیاندووە، ئەو دەوڵەتێکی سەربەخۆی دامەزراندووە. قازی محەممەد بە پیشەوەری دەڵێ، بەرلەوەی ئەم کارە بکات قسەی دەگەڵ بریاکۆف دا (لە ئەفسەرانی سیاسی سۆڤیەت بوو لە تەورێز) کردووە و بریاکۆف بەخۆی لە دوورەوە بەشداری لە ئاهەنگی ڕاگەیاندنی کۆماردا کردووە.[٣٣] **بەلام پێکەوە هەڵکردنی ئەم دوو حکومەتە زەحمەت بوو، چونکە هەردوولایان داوکاری یەک سەر زەمین و خاک بوون.**

خەڵکی گوندەکانی کوردستانی ئێران، وەکو کوردستانی عێراق و تورکیا کەم و زۆر یەک دەست ویەک نەژاد بوون. بەلام لە نێو شارو بازێڕەکاندا وەزع بە جۆرێکی دی بوو، شایەکانی ئێران بە هەنجەت و جیهانبینی سیاسی و کۆمەلایەتییەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەلاتی کوردانی سوونە مەزەب کە سەر بە سوڵتانانی عوسمانی بوون، بە بەردەوامی پشتیوانیان لە خەڵکی شیعە مەزەب دەکرد، بە جۆرێ کە بەشی هەرە زۆری جەماوەر ودانیشتوانی شارانی خوی (٣٥٠٠٠) کەس وشاپور (١٢٠٠٠) کەس و میاندواو (٨٠٠٠) کەس و ڕەزاییە (٥٥٠٠٠) کەس. بریتی بوون لە خەڵکی غەیرە کورد، بە تایبەتی ئازەرییەکان (واتە شیعەیانی تورکزمان)، ئەمە جگە لە خەڵکانی دیان و جولەکە. بۆ وێنە لە خودی شاری ڕەزاییەدا کوردەکان بە ئاشکرا کەمینە بوون ولە گەڕەکێکی شاردا دەژیان و ژمارەیان بە حاڵ لە ژمارەی جوودەکانی شار زۆرتر بوو.

لەبەر ئەمە دەوڵەتی جەعفەر پیشەوەری داوای شارەکان و دەشتە بە پیت و بەرەکەتەکانی دەوروبەری شارەکانی دەکرد و جگە لە بناری چیاکانی سنورتی تورکیا و عێراق و ناوچەکانی تەنیشت مەهاباد، باقی شوێنەکانی بە کوردستان نەدەزانی.

بە پێچەوانەوە کوردەکان پێیان وابوو کە هەر هەموو ناوچەکانی ڕۆژاوای دەریاچەی رەزاییە (ئازەربایجانی ڕۆژاوا) بەشێکن لە کوردستان.

رەزاییە، کە نوێنەرێکی بە ناوی غەنی خوسرەوی لە کۆماری مەهابادا هەبوو، هەرگیز نەبوو بە بە بەشێک لە خاکی کوردستان. لە روانگەی سیاسیەوە رەوشەکە هەندێ مایەی سەرسامی بوو، لە نێو ئەو لاوە کوردانەدا کەپێشتر لە «رێکخراوی لاوانەی حیزبی تودەدا کاریان کردبوو وپاشان بوو بوون بە بەشێک لە «رێکخراوی لاوانی دیموکراتی ئازەربایجان» ئەوانەیان کە نەتەوەیی تر بوون لەوانی دی هاتنە ریزی «رێکخراوی لاوانی دیموکراتی کوردستانەوە». ئەمە لە ئاستی حیزبیش دا رووی دابوو، بەمجۆرە لەم شارەدا دوو رێکخراوی لاوان و دوو حیزبی دیموکرات هەبوو!

پێکادان لە نێوان ئەم رێکخـراوانەدا زۆر لە گـوێن و نزیک بوو، کـوردەکـان و ئازەربایجانیەکان بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە پەنایان بۆ سۆڤیەتەکان برد، لە دیدارێک دا دەگەڵ هاشموڤی کونسولی یەکێتی سۆڤیەت دا، مارشال زیرۆ بەهادری کە یەکێک بوو لە سەرانی عەشیرەتی هەرکی بە شێوازی تایبەتی خۆی سەلماندی کە «بێگانانی رەزاییە» کەمترین مافیان بەم شارەوە نیە. کورسییەکی هەڵگرت و لە ناوەندی ئەو ژوورەی دانا کە کۆبونەوەکەی تێدا سازدرابوو، لەسەری دانیشت و پاشان لە کونسولەکەی سۆڤیەتی پرسی: «ئەم ژوورە هی تۆیە. ئایا دەتوانم بێم و لەناوەراستیدا دانیشم و بڵێم ئەم ژوورە هی منە! نا، کەواتە دیارە نابێت».

بە پێچەوانەی ئەوەوە کە چاوەنۆر دەکرا، پیاوماقوڵان و سەرانی ئازەری حەزیان نەدەکرد بە «کۆماری ئازەربایجانەوە پەیوەست بن. ئەمانە کە لە کرداری «پێشکەوتنخوازانەی» رێبەرانی تەوریز ترسا بوون، بە پێچەوانەوە حەزیان دەکرد سەر بە مەهاباد بن. کە موحافەزەکاری رێبەرانی مەهاباد، دڵنیایی و ئاسوودەییەکی زیاتری دەدانێ، ئەم داخوازییەیان لە دیدارێکی قازی محەمەد کە بۆ دیداری پێشەوەری دەرۆیی، خستە روو، بەلام قازی محەمەد بە هەنجەتی «ددان پەشە» بێدەنگ بوو و چ قسەیەکی نەکرد.

ئەم کێشەیەی رەزاییە لە زگ بوو کێشەیەکی وەکو کێشەی کەرکوکی لێ بکەوێتەوە، لە

عێراقیشدا پاش ٢٥ ساڵ لەوە دوا کێشەیەکی وەها هاتە پێشێ، کە هێشتاش هەر بەو دەقەوە ماوەتەوە. لە هەڵیقەتدا یەکێک لە هۆیەکانی ناخۆشی نێوان جەنەراڵ بارزانی و دەوڵەتی بەغدا پاش ئیمزای رێکەوتننامەی ١٩٧٠ هەمان مەسەلەی کەرکوک بوو.

دوای چەند پێکادانێک لەم رووەوە، تەنانەت قازی محەمەد بە خۆی بۆ دامرکاندنەوەی ناخۆشی نێوان کورد و ئازەرییەکان و بەرقەرار کردنی ئارامی چوو بۆ میاندواو، سۆڤیەتەکان هەردوو دەوڵەتی کوردستان و ئازەربایجانیان ناچار کرد کە دان وستان بکەن و هەردوو دەوڵەت لە ١٩٤٦/٤/٢٣ دا پەیمانی دۆستایەتی و یەکێتییەکی بیست ساڵەیان ئیمزا کرد.

ئەم پەیمانە بریتی بوو لەم خاڵانە:

- دامەزراندنی نوێنەری سیاسی هەردوولا لە تک یەکدی.
- دامەزراندنی فەرمانبەرێن کورد لەو ناوچانەی ئازەربایجان کە ژمارەی کوردیان تێدا زۆرینەیە و بە پێچەوانەوە دامەزراندنی ئەرمانبەری ئازەری لەو ناوچانەی کوردستاندا کە زۆربەی خەڵکەکەی ئازەرین.
- مۆرکردنی قرێری بازرگانی.
- هاوکاری سوپایی لەحاڵەتی پێویست دا.
- هەر جۆرە دانوستانێک دەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی ئێران دا دەبێ بە رەزامەندی و ئیمزای هەردوو کۆماری کوردستان و ئازەربایجان بێ.
- پاراستن و دابینکردنی مافی رۆشنبیری و زمانەوانی ئەو میللەتانەی کە لەخاکی هەردوو دەوڵەتی ئیمزاکەری پەیمانەکەدا دەژین.
- هاوکاری نێوان هەردوو لایەنی پەیمانەکە بۆ سەرکوتکردنی ئەو پیلانانەی دژی هەر یەکێک لەوان دەکرێ.[٣٤]

کاردانەوە هەر زوو دەستی پێکرد.

دەوڵەتی بەریتانیا لە لەندەنەوە رایگەیاند کە ئەم پەیمانەی نێوان ئەو دوو لایەنەی کە ئەم دانیان پێدا نانێ، رەت دەکاتەوە.[٣٥]

تاران سەرسامە! هەڵبەتە ئەم کاردانەوەیە لەلایەن دەوڵەتێکەوە کە لەنکاودا دەبینێ دوو شاری خۆی وەکو دوو دەوڵەتی سەربەخۆ رەفتار دەکەن، کاردانەوەیەکی ئاساییە.

پاشان تاران لەگەڵ جەعفەر پیشەوەری دا کە بەسەرۆکایەتی شاندێکی گەورە دێتە

تاران، دەست بە دان وستان دەکات. دوو نوێنەری سەلاحیەتداری تەواوی کوردیش لەم شاندەدان. ئەم گفتوگۆیە کە شازادە موزەفەر فیروزی یاریدەدەری سەرەک وەزیران سەرۆکی شاندی حکومەتی ناوەندی بوو، هەر زوو لە باری سوپاییەوە کۆسپی دێتە ڕێ و لە ١٩٤٦/٥/١٣ بە موڵەقی دەمێنێتەوە. پیشەوەری، قەوام ـ ٠ـەنەی سەرەک وەزیرانی ئێران بەوە تاوانبار دەکات کە گوایە دەیەوێ ڕژێمی ئازەربایجان ـ جاری «تەسلیم بوونی بێ قەید و مەرج» بکات. بەڵام هەردووک لا خۆ لە بڕینی دان وستانەکە دەدزنەوە.!

دوای ـ ـگێک لە ١٩٤٦ /٦/١٢ دا، شازادە موزەفەر فیروز لەگەڵ یاریدەدەری وەزارەتی جەنگدا، سەرلەشکر هیدایەت و سەرلەشکر موحەممەد موقەدەم دا دەچێت بۆ تەورێز. لە ٦/١٥ دا ڕێککەوتنامەیەک مۆر دەکرێ، جەعفەر پیشەوەری لەو ڕوانگەیەوە کە ئازەربایجان دەیەوێ لە چوارچێوەی وڵاتی ئێران بمێنێتەوە، قایل دەبێت کە دەوڵەتی مەرکەزی پارێزگاری ئازربایجان، کە دەبێ لە نێو (ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی ئازربایجاندا بێتە هەڵبژاردن، دابمەزرێنێ: دکتۆر سەلام ئەللا جاوید «وەزیری جارانی ناوخۆ» لە دەوڵەتی دیموکراتدا) دا لەم پۆستە دادەمەزرێ. بەمجۆرە ئابڕوی تاران دەپارێزرێ، وەزیرانی جاران دەکرێن بە «بەڕێوەبەری گشتی»، بەڵام ئەم ڕێکەوتنامەیە کە چ شتێک لە ڕەوشی باوی ئازەربایجان ناگۆڕێ، لەلایەن کاربەدەستانی سوپای ئێرانەوە قەبوڵ ناکرێ.

ئەم کارە بەلای ڕێبەرانی مەهابادەوە خراپترین کار بوو، ڕێبەرانی تەورێز و تاران بێ ڕاوێژ بەوان و بێ گوێدان بە «کۆماری»مەهاباد، ڕێک کەوتبوون، دکتۆر جاوید سەیفی قازی بە فەرمانداری مەهاباد دامەزراندبوو، و خودی قازی محەممەد لە «سەرۆکی دەوڵەتی نەتەوەیی»یەوە کرا بوو بە ڕێبەرێکی سادەی حیزب، واتە کرابوو بە «پێشەوای حیزبی دیموکراتی کوردستان».

کوردەکان، گوێیان بەم ڕێکەوتنامەیە نەدا، بە جۆرێ ڕەفتاریان دەکرد وەک بڵێی چ ڕێکەوتنێک رووی نەدابێ.

خولاسە، تەم و مژ باڵی بەسەر هەموو شتێک کێشابوو.

## ٢١
## ئاگر بڕ (٥-١٩٤٦/٩)

لە ١٩٤٦/٤/٢٤ دا بارزانیەکان، قوەتێکی سوپایی هەشت سەد سەربازییان لە ناراوای چەند کیلۆمەتری باکوری سەقزدا غافلگیر کرد و زەرەرێکی گەورەیان لێدا، ٢١

کەسیان لێکوشتن، ١٧ کەسیان زامدار کرد و چل کەسیان بە دیلی گرت.

پاش ئەم سەرکەوتنەی کوردان، سەرلەشکر رەزم ئارای سەرپەرشتیاری گشتی سوپای ئێران، لە سەقزدا دەگەڵ شاندێکی نوێنەرانی هاوبەشی کورد و ئازەربایجانی دا دەستی بە گفتوگۆ کرد.

لە ٥/٣ دا سەرلەشکر رەزم ئارا قرێری ئاگربڕی دەگەڵ کورد و ئازەربایجانییەکاندا ئیمزا کرد و بە پێی ئەو قرێرە کوردەکان بۆ چەند کیلۆمەتری باکوری جادەی سەقز – سەردەشت، کشانەوە.

کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران لە ١٩٤٦/٥/١٠ دا، گرژییەکانی سووک کرد و لە راستیدا ئەم کارە وەکو ئیمزا کردنی حوکمی مەرگی کۆماری مەهاباد بوو. دوای ئەم «قرێری ئاگربڕە ناوچەییە» قۆناغێکی ئارامی لە کوردستاندا هاتە ئاراوە کە تا ئەیلولی ساڵی ١٩٤٦ درێژەی کێشا.

دوای ئاگربڕی مانگی پێنج، چەند کەسێکی بێگانە، لەوانە ژمارەیەک ئەمەریکایی و یەک فەرەنسی چوون بۆ مەهاباد و هەر هەموویان کەوتنە ژێر کاریگەری کەسایەتی بە وەرەی قازی محەمەدەوە و بۆیان دەرکەوت کە بۆچی **«بۆ هەموو کوردستان بووە بە نمونەی ناسیونالیزمی کورد»**[٣٦]

## ٢٢

## سەرکۆمار قازی محەمەد

**قازی محەممەد کە لە هەیلی پێنجی ساڵی ١٩٠٠دا لە دایک بوو بوو، هەنووکە تەمەنی چل و شەش ساڵ بوو، بە پشتیوانی شۆرەت و پایەی خانەوادەیی خۆی و بە زەبری زیرەکی و زرنگی و دەوڵەمەندی فیکری خۆی، زۆر بە چاکی دنیای بچووکی مەهاباد و کوردستانی دەوروبەری مەهابادی کۆنترۆڵ کردبوو.**

قازی محەمەد جگە لە زمانی کوردی وفارسی و تورکی و عەرەبی، کەمێک بە ئینگلیزیش قسەی دەکرد، بەلام چاک لە ئینگلیزی حاڵی دەبوو، خۆی خۆی فێری خوێندنەوەی زمانی ئەڵمانی و فەرەنسی و هەندێک روسی کردبوو، کتێبخانەکەی پڕ بوو لە کتێب و بەرهەمێن ئەدەبی و مێژویی بەو زمانانە، تەنانەت هەندێ نمایشنامەی مێژویی و نیشتمانیشی نوسیبوون، لەوانە نمایشنامەی سەلاحەدین کەباسی خەباتی کورد دژی سەلیبییەکان دەکات، هەروەها نمایشنامەی «دایکی نیشتمان» کەباسی

چارەنووسی کوردان، لە دوای پەیمانی ...ی تـوڕلی سـەعـد ئابادی تێوان ئێران و عێراق و تورکیا (١٩٣٧) دەکات. ئەم دوو شانۆنامەیە لە مەهابادا پیشاندران.

قـازی مـحـەمـەد کە پیـاوێکی زۆر بە دین و سـادە و بێ فیـزو دەعی بوو نە جگەرەی دەکێشا و نە مەشروبی دەخواردەوە. وێنەکەی خۆی کە لە پشت مێزی کارکردنەکەی و بە دیوارەکـەوە لە سـەروی نەخـشـەیەکی جـوگرافـیـایی دنیـاوە هەڵواسـرابوو، رەنگدانەوەی دەقاودەقی خۆی بوون، لەم وێنەیەدا پیاوێکی لاوازی رەنگ زەردی سیـمـا زاهیدانەی قژ کورتی ... ... دەبینرێ، کە شتێکی تێدایە کە زۆر کار لەبینەر دەکات ئەویش پرشنگی نیگاپەتی. **بێگومان قازی محەمەد «پیاوێک بوو بە بیروباوەڕ، بە شەهامەت و ئامادەی فیداکاری بوو، بەلام لە پاڵ ئەم تایبەتمەندییانەوە، پیاوێکی ئاقڵ و بە فکر و میانەڕەوش بوو»**[٣٧] هەمـوو ئەو کەسـانەی کـە لـە نزیکەوە دیـتوویانە و تەنانەت ئەو کـەسـانەش کە ویستوویانە لەمەڕ دەسـەلاتی سـۆڤـیـەتەکان بەسـەر کۆماری مەهابادا زیادەڕەویی بکەن، دەڵێن کە قازی محەمەد نەتەوەییەکی سەرسەخت و بەهەڵوێست بوو، ئەو لە هەمان کاتدا کە پشتیوانی سۆڤیەتەکانی قەبوڵ کردبوو، بەلام هەر وەک نەتەوەپەروەرێکی سەرسەخت و بێ غەڵ و غەش مایەوە و نەگۆڕا، هەر لەبەر ئەمەش بوو هەموو هاوشاریانی خۆی، جگە لەچەند کەسێکی کەم، بەدووی خۆی دەخست.»[٣٨]

قـازی مـحـەمـەد وێڕای ئاوات و ئارەزووی «پان کـوردی» خـۆی ( چونکە بە ئاشکرا دەیویست مەهاباد لە بری سلێمانی و دیەشق بکات بە مەڵبەندی بزووتنەوەی کوردایەتی) لە داخـوازییـەکـانی خـۆیدا تا رادە...ک مـیـانەڕەو بوو، ئەوەتا لە ١٩٤٦/٦/١ دا لە گـفـتوگۆیەکی دوورودرێژیدا دەگـەڵ ئاژانسـی «فرانس پرس»ی فـەرەنسی دا دەڵێ» ئەگەر فەرمان بدەم ئەو چوار هەزار جەنگاوەرەی کە هەمن هەڵبەتە جگە لە هێزی یەدەک بە ٣-٤ رۆژ دەچنە ناو کرماشانی گرنگترین شاری کوردنشین و مەڵبەندی کۆمپانیای نەوتەوە. بەلام من بۆ رێگە گرتن لە براکوژی و خوێن رشتن هەموو هەوڵ و توانایەکی خۆم دەخەمە کار. کوردەکان لەم رووەوە هەرگیز دەست پێشکەر نابن.»[٣٩]

لە وەلامی پەیامنێری ئاژانسی دەنگ وباسی فـرانس پریسی فـەرەنسـی دا کـە داوای لێکرد باسی وەزعی ئێسـتـای کـوردسـتـان بەرانبـەر بە دەوڵەتی مەرکەزی بکات. قـازی محەمەد جەختی لەسەر سێ خاڵ کرد:

١- ئەگەر دەوڵەتی ناوەندی بیەوێ ئاسای بەراستی دیموکراتی لە هەموو ولاتدا جێبەجێ بکات و دان بەم یاسایانەی ئێستای کوردستاندا، بنێ، واتە خوێندن بە زمانی کوردی

و ئوتونومی دام و دەزگای بەڕێوەبردن وسوپای ناوچەیی بەرسمیەت بناسێ و ئیعترافی پێ بکات. ئەوا کوردەکان رازی دەبن. ئێمە بەم چارەسەرە شاد دەبین وئامادەین سەرلەنوێ پەیوەندی خۆمان دەگەڵ تاران دا ئاسایی بکەینەوە.

٢- دەوڵەتی ناوەندی جارێ ناتوانێ ئەم یاسایانە جێبەجێ بکات.

٣- ئێمە دەمانەوێ تا زووە هەڵبژاردنی ئەنجومەن ئەنجام بدرێ، بەم مەرجەی کە بەو پەڕی ئازادی و بەدەر لە گوشاری سوپای ئێران ئەنجام بدرێ.

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کە ئایا ناترسێت پێکدادانی نێوان دەوڵەتی ناوەندی و کوردستان، تەدەخولی بێگانانی لێ بکەوێتەوە؟» قازی محەمەد دەڵێ «رەوشی کوردستان زۆر جیاوازترە لە رەوشی ئازەربایجان. خاکی ئێمە هەرگیز لەلایەن هێزێن سۆڤیەتەوە نەگیراوە و لە زەمانی لاچوونی رەزاشای پەهلەوی بەم لاوە نە جەندرمە و نە سوپا لە کوردستاندا نە بوونە، لەو سەردەمەوە تا ئەو ئێمە بە کردەوە سەربەخۆ بووین.

«ئێمە هەرگیز تەدەخولی بێگانە لە هەر لایەکەوەبێ، قەبوڵ ناکەین. مەسەلەی کوردستان مەسەلەیەکی ناوخۆییە کە دەبێ لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی ناوەندی دا حەل و فەسل بکرێ»

قازی محەمەد لەم گفتوگۆیەدا ئەوە وەبیر دەخاتەوە کە مێژوی گەلی کورد، زۆر جار خەباتی ئەم گەلەی لە پێناوی ئازادیدا بەخۆوە دیتوە، جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکات کە لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم، لە کاتی بەستنی پەیمانی ڤێرسای دا، پرۆژەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە ئارادابوو، بەڵام ئەم پرۆژەیە جێبەجێ نەکرا.

قازی محەمەد لە کۆتایی گفتوگۆکەدا دەڵێ: ئەگەر ئێمە ئەوڕۆ هێندە لەسەر ئوتونومی سنوورداری وڵاتی خۆ سوورین، ئەمە گوناهەکەی لە ئەستۆی دەوڵەتی ناوەندیدایە کە چ کارێکی بۆ پێشکەوتنی ئێمە ئەنجام نەداوە، ئێمە نامانەوێ لاسایی ئەمەریکاییەکان یان روسەکان بکەینەوە، بەڵام ئەمەش قەبوڵ ناکەین کە لە هەلومەرجێن حەیواناتی وڵاتانی شارستانیدا زنەگی بکەین.»[٤٠]

قازی محەمەد هەرگیز بەم روونی وراشکاوییە لەمەڕ بیروبۆچوونی خۆی نەناخفیوە، ئەم سەربەخۆیی فکری و ئەم ویستەی کە سەر بە فەرمانی کەس نەبێ، رەنگە روونکردنەوەیەک بێ بۆ ئەوەی کە بۆچی رۆژاواییان دەستیان بەرویەوە ناو بەچاوی «هاورێی» یەکێتی سۆڤیەتەوە سەیریان کرد، حاڵبوکی سۆڤیەتەکان وێرای هەموو

هەوڵێکیان نەیانتوانی بەگەڵ خۆیانی بخەن وەکو خۆیانی لێ بکەن.

رەحیمی قازی دەڵێ: «لەباری فیکریەوە قازی محەمەد نە مارکسی بوو، نە سوسالیست ونە لیبرالی بوو، قازی محەمەد رێبەری هوشیاری بزاڤێکی رزگاری خوازی نەتەوەیی و رێبەری نەتەوەیی کوردی بە هۆش وگۆش بوو» رەحیمی قازی لەسەری دەڕوات «بەلاّم دیدو بۆچونەکانی رۆژ بە رۆژ لە دید و بۆچونی مارکسیانە نزیک و نزیکتر دەبووەوە وتا دواساتی ژیانی خۆی متمانەیەکی قوڵی بە یەکێتی سۆڤیەت هەبوو»[41]

## ٢٣

## مەهاباد لە سەردەمی (کۆماری) دا

کۆماری مەهاباد ووالەت و سیمایەکی «شادو بەکەیفی» هەبوو کە سەرنجی هەموو ئەو کەسانەی رادەکێشا، کە لە ماوەی ئەم ئاگربڕە درێژەدا، لە هاوینی ١٩٤٦ دا سەریان دابوو، بە پێچەوانەی ئازەربایجانی دراوسێیەوە، چ شوێنەوارێکی رژێمی پۆلیسی لە مەهابادا بەدی نەدەکرا. لە ماوەی تەمەنی یازدە مانگەی «کۆمار»دا تەنیا باسی یەک حاڵەتی کوشتن دەکەن کە ئەویش ئەنجامی سەهوو هەڵەی کاربەدەستان بووە.

دەوڵەتی مەهاباد دەستی نەدایە چ کارێکی شۆڕشگێرانەی وەک خۆماڵیکردنی بانقەکان و ریفۆرمی زەوی و زار و دابەش کردنی زەوی و ئەو شتانەی کە لە تایبەتمەندییەکانی رژێمی تەورێز بوون. خەڵکی مەهاباد دەیانتوانی بە ئازادی هاتوچۆ بکەن. ئەگەرچی لە ١٠/٥/١٩٤٦ بەملاوە رادیۆی هەبوو، بەلاّم بوردی ئەم رادیۆیە هێندە کەم بوو کە لە سنوورەکانی کۆمار هێوەتر نەدەڕۆیی و خەڵکی دەیانتوانی بە ئازادی و بە ئاشکرا گوێ لە رادیۆی ولاتانی بێگانە بگرن.

لایەنی پەروەردە و فێرکردن یەکێک بوو لەو مەیدانانەی کە قازی محەمەد بایەخێکی فرەی پێ دەدا(قازی محەمەد بەخۆی لە ١٩٢٦-١٩٣١) سەرۆکی پەروەرد و فێرکردنی مەهاباد بوو.)[42] هەر لە سەرەتای راگەیاندنی کۆمارەوە خوێندن بە زمانی کوردی دەستی پێکرد. لە سەرەتادا مامۆستاکان بابەتی کتێبە دەرسیەکانیان وشە بە وشە لە فارسیەوە دەکرد بە کوردی. کتێبە کوردییەکان لەو بابەتانەوە ئامادە کرابوون کە لە عێراقەوە نێردرابوون، بەلاّم بە کردەوە سوودیان لێوەرنەگیرا، چونکە تا ئەم کتێبانە چاپ بوون و لە چاپ دەرچوون کۆمار روخا.

هەر لەم سەروبەندەدا شەست لاوی کورد کە خوێندنی سەرەتاییان تەواو کردبوو لە

مانگی چواری ساڵی ١٩٤٦ دا بۆ فێرگە سوپایی و دەزگا تایبەتی و پسپۆڕییەکانی باکۆ نێردران. چەند کەسێک لەمانە هەر لە باکۆدا مانەوە.

قازی محەممەد توانی بەو چاپخانەیەی کە روسەکان پێیان دابوو ژمارەیەک رۆژنامە و گۆڤاران چاپ و بڵاو بکاتەوە. کوردستان رۆژنامەی «رەسمی کۆمارەبوو. لە یەکەم بەرەبەری ژمارەکانی ئەم رۆژنامەیەدا کە تەقریبەن هەموو رۆژ دەردەچوو، ئەم دەستەواژەیە نووسرابوو: «بەناوی یەزدانی گەورە و بێ هاوتا»[٤٣]

هەندێ لە بڵاوکراوەکانی تری کۆمار، بریتی بوون لەم گۆڤارانە، نیشتمان کە عەبدولرەحمان زەبیحی سەرنوسەری بوو، هەڵاڵە کە گۆڤاری ئافرەتان بوو، و گۆڤاری ئەدەبیی هاوار کە شیعری دوو شاعیری میللی، واتە هێمن (محەممەدەمین شێخ ئەلئیسلامی) و هەژار ( عەبدولرەحمان شەرەفکەندی) بڵاو دەکردەوە.

## ٢٤
## دوا گفتوگۆ

ئەو دان و ستانەی کە لە مانگی شەش دا وەستابوو، لە مانگی هەشت دا لە تاران دەستی پێکردەوە. قازی محەممەد بە زەمانەتی سەفارەتخانەی یەکێتی سۆڤیەت چوو بۆ تاران.

لە کەین و بەینی ئەم دان وستانەدا کە دەگەڵ قەوام ئەلسەڵتەنەی سەرەک وەزیراندا ئەنجام درا، قازی محەممەد پارێزگاری کوردستانێکی کرد کە لە سنوورەکانی یەکێتی سۆڤیەتەوە تا سنووری نێوان سنەو کرماشان بگرێتەوە کە خۆی قازی یەکەم پارێزگاری دەبوو[٤٤] بە پێی هەندێک ریوایەتان قەوام ئەلسەڵتەنە بەم پێشنیارە قایل بوو، بە مەرجێ کە دکتۆر جاویدی پارێزگاری ئازەربایجانیش قایل بێ[٤٥] بە پێی هەندێ ریوایەتی دی قەوام ئەلسەڵتەنە بێ چەند و چوون ئەم پێشنیازەی قەبوڵ کرد، بەڵام روسەکان بەمە رازی نەبوون[٤٦]، بە هەر حاڵ ئەنجام هەر یەک ئەنجامە. قازی محەممەد بێ ئەوەی توانیبێتی چ مافێک بۆ کۆمارەکەی خۆی فەراهەم بکات. بۆ مەهاباد گەڕایەوە.

لە ١٩٤٦/٨/٢٠ دا شاندێکی ئازەربایجان بە سەرۆکایەتی شەبستەری سەرۆکی ئەنجومەنی نەتەوەیی ( کە پاشان ناویان گۆڕی بۆ ئەنجومەنی «نیشتمانی» چوو بۆ تاران. شاندی ئازربایجانی چەند هەفتەیەک لە تاران مایەوە و ترای هەوڵی شەخسی سادچیکۆفی سەفیری سۆڤیەت لە ئێران، نەیتوانی مەرجەکانی خۆی لەمەڕ چەسپاندنی

وەزعی سوپای خەڵکی ئازربایجان بە شا بسەلمێنێ.

ئارچیبالد رۆزڤلتی (کوڕ) یاریدەدەری پاشکۆی سوپایی سەفارەتی ئەمەریکا لە تاران، کە لە ئەپلولی ١٩٤٦ دا سەری مەهابادی دا، شاری لە حاڵێکی زۆر ئاسایی دا بینی، پاش فراڤینی رەسمی دەگەڵ ئەندامانی دەوڵەتی کوردستاندا، گفتوگۆیەکی دوورو درێژ وتێرو تسەلی دەگەڵ پێشەوا قازی محەمەد کرد. لەم گفتوگۆیەدا قازی محەمەد بۆی دەرخست کە کوردستان ولاتێکی ئازادە و کۆماری مەهاباد «بوکەڵەی» دەستی سۆڤیەتەکان نییە، لەسەری رۆیی: «ئەگەر وابوایە، ئەدی سەربازێن سۆڤیەتی لە کوێندەرن؟»(٤٧)

لێ لە راستیدا کار بەرەو کۆتایی دەچوو.

لە مانگی ١٠/١٩٤٦ دا دکتۆر جاویدی پارێزگاری ئازربایجان دەربارەی گۆڕینەوەی ویلایەتی خەمسە بە سەردەشت و تەکاب، دان و ستانێک دەگەڵ قەوام ئەلسەڵتەنە دا دەکات. (ویلایەتی خەمسە کەوتۆتە سنووری رۆژهەڵاتی ئازەربایجانەوە و لەلایەن سوپای گەلی ئازربایجانەوە داگیر کرابوو.) سەرەک وەزیری ئێران بەم پێشنیازە «!» قایلە، بەڵام شاو سوپا دژن. کاتێ قازی محەمەد بە قەواڵەیەکی نیمزا کراو بە نیمزای قەوام ئەلسەڵتەنە لەم بارەیەوە دەچێت بۆ سەقز تا سەرلەشکر هومایونی بدینێ. سەرلەشکر هومایونی دەستی پێوە دەنێ و لە کۆڵ د خۆی دەکاتەوە.

## ٢٥

## روخانی کۆماری مەهاباد (١٧/١٢/١٩٤٦)

ئەو سەردەم و قۆناغە سەیرە پڕ ئاشتی و ئارامییەی کە لە مانگی پێنجەوە باڵی بەسەر کۆماری مەهاباد دا کێشابوو، بەلەز روو لە کۆتایی بوو. لە ناوەراستی هەیڤی ١١/١٩٤٦ دا شا، پاش راوێژ و تەگبیر دەگەڵ قەوام ئەلسەڵتەنەی سەرەک وەزیران و حەسەن ئەرفەعی سوپاسالار و وێرای ترسی سەرەک وەزیران لەوەی کە روسەکان پشتیوانی لە پێشەوەری بکەن، شا بڕیاری دا لەشکر بنێرێتە سەر ئازەربایجان.

لە ٢٣/١١/١٩٤٦ دا لەشکری سێ بێ ئەوەی تووشی چ مقاوەمەتێک بێ، چووە نێو زنجانی مەرکەزی ویلایەتی خەمسەوە. شا بۆ رێکخستنی هێرشی یەکجارەکی بۆ سەر «کۆمارەکانی» ئازەربایجان و کوردستان «مەهاباد» بۆ خۆی چوو بۆ زنجان. لەشکری سێ ئازەربایجان و لەشکری چواری کوردستان و نزیکەی سێ هەزار چەکداری مەدەنی، واتە بە

هەمووی ۲۰۰۰۰ کەسێک دژی «جودایی خوازان» کەوتنە کار.

ئەم هێزانە بە کردەوە رووبەرووی بەرگرییەکی ئەوتۆ نەبوونەوە. لە باکووردا، رژێمی پیشەوەری بە بێ تەقە روخا، زۆربەی رێبەرانی لە ۱۲/۱۱ دا بۆ یەکێتی سۆڤیەت رایانکرد، لە کاتێک دا جەماوەر راپەڕی بوون و هەر «دیموکرات»یکیان دەبینی دەیانکوشت، یەکێک لەو کوژراوانە محەمەد بیریای وەزیری پەروەردە بوو، کە جەنازەکەیان خستە دووی جیپێک و بە کوچە و شەقامەکانی تەورێزدا رایانکێشا.

بە هەرحاڵ لە رۆژانی پاش روخانی کۆماری تەورێزدا ژمارەی کوژراوان گەییە ٥٠٠ کەسێک و لە ۱۹٤٦/۱۲/۱۳ دا و دوای پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ یەکەمین قوەتی سوپایی ئێران لەگەڵ سەرتیپ هاشمی دا چووە ناو تەورێزەوە.

لە باشووردا، واتە لە کوردستان دا، هەندێ کەس لە سوپای گەلی ئازربایجان چوار رۆژان، لە ۱۷-۱۱/۱۲/۱۹٤٦، لە گردۆلکەکانی دەوروبەری شارۆچکەی شاهین دژ، لە ناوەندی رێگەی نێوان تەکاب و میاندواودا بەرگرییان کرد، بەڵام سەرەنجام بەر لە گەیشتنی هێزێن بارزانی، هێزەکانی ئێران بەرگرییەکەیان دامرکاندەوە و شەڕ برایەوە. پاش ئەوە نیدی بە کردەوە چ شەڕێک روی نەدا. بارزانیەکان بۆ مەهاباد گەڕانەوە و میاندواو لە ۱۹٤٦/۱۲/۱۳ دا تەسلیم بوو.

لە ۱۲/٥/دا قازی محەمەد لە «ئەنجومەنی جەنگدا» و بە بەشداری دە کەس لە رێبەرانی سیاسی و سوپایی و بە ئامادەبوونی سەدری قازی ی برای کە نوێنەری ئەنجومەن بوو، بە درێژایی ئەم ماوەیە رۆڵی ناوبژیوانی لە نێوان تاران و مەهاباد دا دیتبوو، توانی بۆچوونی خۆی بە ئامادەبووان بسەلمێنێ و رۆژی دوایی بەیاننامەیەک لەمەڕ زەرورەتی بەگری چەکدارانە دژی هێرشی هێزەکانی ئێران لە مزگەوتی عەباس ئاغادا خوێندرایەوە.[٤٩]

لە ۱۹٤٦/۱۲/۱٥ دا ئەسەدۆف (نوێنەری بازرگانی سۆڤیەتی) لە مەهاباد نووسینگەی کاری خۆی بە جێهێشت وچوو بۆ کونسولیەی سۆڤیەت لە رەزاییە، لە هەمان کاتدا هەوڵی دابوو کاری وڵاتەکەی سەبارەت بە «دەست بەردان»ی تەواو لە کۆمار، بەوە پینە بکات کە یەکێتی سۆڤیەت لە ئەنجامی شەڕدا «لە توانا کەوتووە.»[٥٠]

سەرانی مەهاباد، کە بە چاوی خۆیان رووخانی کۆماری تەورێزیان بینی، بۆیان دەرکەوت کە یەکێتی سۆڤیەت دەستی لێ هەڵگرتوون، بڕیاری تەسلیم بوونیان دا.

**له ١٩٤٦/١٢/١٦ دا قازی محەمەد و سەیفی قازی و حاجی بابا شێخ و چەند کەسێکی دی لەسەرانی مەهاباد چوون بۆ میاندواو تا خۆیان تەسلیمی سەرلەشکر همایونی بکەن، پاش گفتوگۆیەکی تا رادەیەک گەرم دەگەڵ سەرلەشکر همایونی دا، قازی محەمەد مۆڵەتی وەرگرت بۆ مەهاباد بگەڕێتەوە، لەوێندەر بۆ دواجار مەلا مستەفا بارزانی بینی. بارزانی «تکای» لێکرد کە دەگەڵ ئەودا بڕوات، لێ قازی محەمەد کە لێبڕا بوو لە پێناوی پاراستنی خەڵکدا لە مەهاباد بمێنێتەوە، بە گوێی بارزانی نەکرد.**

له ١٩٤٦/١٢/١٧ دا بە رەسمی شاری تەسلیم بە کاربەدەستانی ئێرانی کرد. دوای چەند رۆژێک هەموو سەرانی کۆمار کە نزیکەی سی کەس بوون. گیران.

## ٢٦

## دادگایی کرنی قازی محەمەد

لە سەرەتاکانی مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧دا قازی محەمەد و سەدری برای و سەیفی پسمامی لە دادگایەکی سوپایی دا بە سەرۆکایەتی عەقید پارسی تەبار و دادوەری عەقید فەیوزی، سەرۆکی سەرکردایەتی سوپا سەرلەشکر همایونی دادگایی کران.

دادگا نهێنی بوو، وێڕای ئەوەی کە هاوسەری قازی محەمەد هەوڵی دا بە دانی ١٨ هەزار تومان (بەرانبەر بە ٣٦ هەزار دۆلار) دڵی سەرلەشکر همایونی نەرم بکات و قازی و یاوەرەکانی ببەخشێت. دادگا لە رۆژی ١٩٤٧/١/٢٣دا واتە رێک یەک ساڵ و یەک رۆژ دوای راگەیاندنی کۆمار حوکمی مەرگی بەسەر ئەم سێ کەسەدا بڕی.

بەلام لەم کاتانەدا قەوام ئەلسەڵتەنەی سەرەک وەزیر سەرگەرمی ئەنجامدانی گفتوگۆیەکی حەساس بوو دەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا جێبەجێ کردنی حوکمی دادگا پێنج مانگ دواخرا، بە گوتەی هەندێک ژێدەران «دادگایەکی تایبەتی» لە رۆژانی ٢٨-١٩٤٧/٣/٣٠دا بەو حوکمەدا چووەوە کە لە «دادگای مەهاباد»ەوە دەرکرابوو، پاش هەنگێ حوکمەکە بەلەز جێبەجێ کرا. سەرلەشکر همایونی هەنگێنێ لە رەزاییە بوو، لەوێندەرەوە رێبەری و سەرپەرشتی شەڕەکانی دەکرد دژی بارزانییەکان، کە پەیامی ئەنجامدانی حوکمی مەرگەکەکەی پێ گەیی، ئەو لە رادیۆوە دەستووری خنکاندنی هەر سێ قازییەکەی دا ئەم سێیانە لە سپێدەی ١٩٤٧/٣/٣١ لە مەیدانی چوارچرادا، هەمان ئەو مەیدانەی کە قازی محەمەد لە رۆژی ١٩٤٦/١/٢٢ دا و بە جلی عەسکەری سۆڤیەتییەوە مژدەی دامەزراندنی کۆماری تێدا راگەیاندبوو، لە سێدارە دران.

جەنازەی ئەم سێ کەسە هەر بۆ وەی ببێ بە عیبرەت بۆ ئەوانی دی، بە درێژایی رۆژ بەدارەوە هێلرانەوە.

**لە ماوەی چەند رۆژێک دا هەموو شوێنەوارێکی کۆماری کوردیان لە مەهاباد سڕییەوە، ئەو کەسانەی کە لە شۆڕش دا بەشداریهان کردبوو، بەلەز هەموو ئەوالەو بەڵگەنامە خەتەرەکانی وەکوو وێنەو رۆژنامەو ئالاو.... یان لە نێوبرد، دەولەت خوێندنی زمانی کوردی قەدەغە کرد و سەربازان هەر هەموو کتێبە کوردییەکانیان لە مەیدانی مەهاباددا کە چوو بووە وە قاوغە کۆنەکەی جارانی، سوتاند.**

## ٢٧

## هۆکارێن روخانی کۆمار

**«ئەمە شکستی کورد لە بەرانبەر سوپای ئێراندا نەبوو، بەڵکو ئەمە یەکێتی سۆڤیەت بوو کە لە هەمبەر ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیای مەزن دا شکا.»** ئەم بۆچونەی کە بارزانی لە ١٩٤٦/١٢/١١[٥٢]دا لە بۆکان دەری بڕی نیشانەی رۆشنبینی و زیرەکی ئەوە، بەتایبەتی لەم رەوە کە رێبەرانی کۆماری مەهاباد سەبارەت بە هۆکارە نێو دەولەتییەکان زۆر نە شارەزایی و بێ ئاگاییان نیشان دا.

**قازی محەمەد و سەرانی تری مەهاباد دەبوایە هەر لە نیشانە خەتەرەکانەوە ئەوەیان دەرک بکردایە کە «کۆمارەکەیان» لە مەترسیدایە، یەکەمین و بەرجەستەترین ئەم نیشانانە چۆڵکردنی ئێران لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە لە ١٩٤٦/٥/١٠ دا لە دوای سەر هەڵدانی ئەیرانێکی نێــــونەتەوەیی بوو،[٥٣] دووەمین نیشانە، دەرکردنی وەزیرانی «تودە» بوو لەدەولەت لە ١٩٤٦/١٠/١٩ دا. سێیەمین نیشانە، قسەکانی رۆژی ١٩٤٦/١١/٢٧ی جۆرج ئالنی سەفیری ئەمەریکا بوو لە تاران دا کە دووپاتی کردەوە، دەولەتی ئەمەریکا پارێزگاری لە «سەرانسەری خاک و سەروەری ئێران» دەکات.[٥٤]**

جا کۆماری مەهاباد بۆ ئەوەی بیتوانایە لە دەرێی سایەی سیاسی و سوپایی سۆڤیەت دا بژی، دەبوایە رێبەرەکانی خەڵکانێکی بە ورە و بە توانا بوایەن، کە قازی محەمەد و چەند کەسێکی کەمیان نەبێ، ئەوانی دی هیچ ویست و وورە و توانایەکیان نەبوو.

**کۆماری مەهاباد وێرای بچوکی خاکەکەی و کورتی عەمری خۆی، جێیەکی گرنگی لە مێژووی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردا هەیە، ئەمە یەکەمین بزووتنەوەی کوردی بوو کە «رۆشنبیرێک» سەرۆکایەتی دەکرد و نیشانی دا کە کوردەکان ئەگەر دەرفەتیان هەبێ تەنیا**

وتالاتچی، نین، که پاش زێدەڕۆییەکەی سمکۆ بە بالایان دابڕا، بەلکو دەتوانن بناغەی حکومەتێک بەمانای حکومەت دا بڕێژن.

بەلام کۆماری مەهاباد لە هەمان کاتدا نیشانەی ئەم ناکامی و شکستەشە کە کوردەکان بە درێژایی سی سالی لەوە دواش نەیانتوانی بە سەریدا زال بن. ئایا بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی خالیسە دەتوانێ بە بێ ئایدولۆژیایەکی دیار و تایبەتی شۆڕشێکی ئازادیبەخش بەڕێوە ببات؟

## ٢٨

## چارەنووسی هەڤالانی بارزانی

بارزانی، کە هێزەکانی چەکدار و ئامادە بوون و بەدەقی خۆیانەوە مابوونەوە، لە ١٩٤٦/١٢/٢٠ دا، چوو بۆ مەهاباد و چاوی بەسەرلەشکر هومایونی کەوت و پێی گوت کە ئامادەیە بۆ عێراق بگەڕێتەوە بەمەرجێ سەفارەتی بەریتانیا زەمانەتی سەلامەتی بکەن (بارزانی کە لە مەهاباد وەدەرکەوت ٣ هەزار تفەنگ و ١٢٠ رەشاش و دوو تۆپی لە جبەخانەی کۆمار دەرهێنابوو و لەگەل خۆی بردبووی.

مەلا مستەفا بارزانی، نامەیەکی وەفاداری بە زمانی عەرەبی نووسی و دەگەل میرحاج و عیزەت عەبدولعەزیز و نوری تەهادا بۆ گفتوگۆ لەمەڕ چارەنووسی خۆی و هەڤالەکانی لەگەل دەسەلاتدارانی ئێرانی و سیاسەتوانانی سەفارەتی بەریتانیادا بۆ تاران رۆیی.

بارزانی کە لە میوانخانەی ئەفسەران بەرانبەر بە نووسینگەی سوپاسالاری سوپای ئێران جێی بۆ دانرابوو، یەک هەیڤی تەواو لە تاراندا مایەوە و بەر لە گەڕانەوەی بۆ مەهاباد لە ١٩٤٧/١/٢٩ دا دیداری دەگەل شار سیاسەتوانانی بەریتانیایی و ئەمەریکایی دا کرد.

بارزانی کە نەیتوانی بوو زەمانەتی پێویست لە ئینگلیزەکان بەدەست بێنێ، رازی بوو بوو بەو پێشنیازە ئێرانییەی کە نزیکەی ١٠٠٠٠ کەسێک لە ئەندامانی عەشیرەتەکەی لە ناوچەی ئەلوەندی نزیک هەمەداندا نیشتەجێ بن.

بەلام شێخ ئەحمەد کە لە نەغەدە بوو بەم ئەخشەیە رازی نەبوو لە دیدارێکی سەرلەشکر هومایونی دا لە ١٩٤٧/٢/١٩ دا مەلامستەفا و شێخ ئەحمەد هومایونیان تێگەیاند کە لێبڕاون تەسلیم بە عێراق ببنەوە.

سوپای ئێران بۆ ماوەی مانگێک لە ٣/١١/تا ١٩٤٧/٤/١٢ کەوتە تاقیب و شەڕی

هێزی بارزانی لەناوچە شاخاوییەکانی رۆژاوای شنۆ، لە نزیکی سنووری ئێران و عێراق و تورکیا.

هەڤالانی بارزانی لە باری عەسکەرییەوە وەکو جەنگاوەری بەدەست و جەربەزە خۆیان نواند. لە ناوەڕاستی ئازاردا سوپای ئێران ١٢ کوژراو و هەفتا ئەسیری دا، دوای یەک هەفتەی دیکە دیسان ٢٠ کوژراو و نزیکەی پانزە دیلی دا.(٥٥)

بەڵام هەڤالانی ئەجەنگاوەری بارزانی- کە چەند هەزار ژن و منداڵێک دەبوون و پیاوەکانیان لە ژێر گوشاری سەرمای توندی زستانێکی تووش و ئاناسایی و بژردومانی ئاسمانی دابوون- لێیبڕان دەگەڵ شێخ ئەحمەد دا خۆیان تەسلیم بە حکومەتی عێراق بکەنەوە.

شێخ ئەحمەد پاش وەرگرتنی زەمانەت، لەگەڵ بەشی هەرە زۆری عەشیرەتەکەیدا تەسلیم بوو.

دوای چەند رۆژێک واتە لە ١٩٤٦/٤/١٣ (دەبێ ١٩٤٧ بێ) بارزانی بە خۆ و قوەتێکی چەند سەد ئەفەرییەوە لە سنووری عێراق پەڕییەوە و بۆ بارزان چوو.

## ٢٩

## رێپیوانە دوورودرێژەکەی بارزانی بەرەو تاراوگەی یەکێتی سۆڤیەت

رەنگە بارزانی لە دڵی خۆیدا بە تەما بووبێ کە دەوڵەتی عێراق لە ئەنجامدا لێی خۆش بێ، بەڵام هەر زوو ئەم ئومێدە سەردرایەوە. وێڕای هەوڵدانی نوێنەرانی کورد لە (ئەنجومەنی عێراق) ئەو چوار ئەفسەرەی کە لەگەڵ شێخ ئەحمەددا خۆیان تەسلیم کردبوودە واتە مستەفا خۆشناو، خەیروڵڵا، مەحمەد مەحمود وعیزەت عەبدولعەزیز گیران و لە سێدارە دران (١٩٤٧/٦/١٩)

نیدی تەنێ یەک رێ مابووەوە، ئەویش رێگەی تاراوگە، واتە یەکێتی سۆڤیەت بوو، چونکە ئێران و تورکیا لە بەر هۆی ئاشکرا، حەزیان لەوە نەبوو کە وەکو پەنابەر بیگرنە خۆیان.

پێدەچێت بارزانی هەر لە سەرەتای چوونی بۆ ئێران لە ساڵی ١٩٤٥ دا، ئەمەی بۆخۆی دانابێ کە ئەگەر نەیتوانی لە ئێران بمێنێتەوە، ئەوا پەنا وەبەر یەکێتی سۆڤیەت بەرێ، لە راستیدا پاش ئەوەی چووە ئێران و یەکەم پەیوەندی دەگەڵ جەنەراڵ لیوبوف دا کرد، هەمزە عەبدوڵڵا بەناوی ئەوەوە نامەیەکی بۆ ستالین نووسی و داوای لێکرد کە رێی

بدەن بە مەبەستی بەرگری لە کۆمار، لە ئێران دا بمێنێتەوە و لە حاڵی روخانی کۆماردا پەنا بەرێتە یەکێتی سۆڤیەت.[٥٦]

پاش تێپەڕبوونی ساڵێک، بارزانی سەرەنجام ناچار بوو داواکەی خۆی لە سۆڤیەت دووبارە بکاتەوە لە ١٩٤٧/٥/٢٧ دا عێراقییەکان ئێرانییەکانیان ئاگادار کردەوە کە بارزانی لە باکوری بارزانەوە لە سنووری تورکیا پەڕیوەتەوە بەرەو ئێران دێت.[٥٧]

بەمجۆرە مەلا مستەفا بارزانی لەگەڵ ٥٠٠ پیاوی جەنگاوەردا ڕێپێوانە دوورودرێژەکەی خۆی بەرەو ئاراس و سەر ئەنجام بەرەو یەکێتی سۆڤیەت دەست پێکرد و ٣٥٠ کیلۆمەتر ڕێگەی بە چواردە ڕۆژان بڕی.

بارزانی و هەڤاڵەکانی بە زیرەکی و خۆدزینەوە لە شەڕی هێزەکانی ئێران و لە حاڵێک دا کە بەپێیان سنووری تورکیا و ئێرانیان دەبڕی، توانیان وردە وردە بگەنە ناوچەی ئارارات، هەر کاتێ کە لە نزیکەوە دەکەوتنە ژێر گوشاری هێزی ئێرلن، خۆیان بە خاکی تورکیادا دەکرد و پاشان بە دزییەوە، لە شوێنێکی دیکەوە سەریان دەردێنا. (شا کە لەم سەروبەندەدا لە ئەردەبیل بوو بە خۆی دەستووری دا کە هەموو هەوڵێک بۆ دەستگیری بارزانییەکان بخرێتە کارو هەر ئەفسەرێک لەم ڕووەوە دریغی بکات بدرێتە دادگای سوپایی.)

بارزانی و هەڤاڵەکانی لە ١٩٤٧/٦/٩ دا دوا شکستیان لە باکوری خویدا، بەسەر سوپای ئێراندا هێنا، یەک هەفتە دواتر لە ئاراس پەڕینەوە و بۆ ماوەی یازدە ساڵان لە یەکێتی سۆڤیەت و «دوور لە چاوان» مانەوە.

## سەرچاوە و پەراوێزان

١. نامە گێڕینەوە دەگەڵ رەحیمی قازی ١٩٧٦/٣/١٩، باکۆ

٢. ئینگلیزەکان ڕێگەیان بە هێزەکانی ئێران دا کە لە دیواندەرەو سەقز دەسەڵاتی دەوڵەتی مەرکەزی دابنەنەوە، لە حاڵێک دا کە یەکێک لە سەرانی کورد (حەمە رەشید) کە هاوڵاتی عێراقی بوو تا ساڵی ١٩٤٤ حکومەتێکی نیمچە سەربەخۆی دامەزراندبوو.

٣. نووسراوی ڕۆژی ٢٧ /١٩٤١/٩ی جەنەراڵ ڤیول، جەنەراڵ کینان و ژەنەراڵ سەلیم، و نووسراوی ڕۆژی ١٩٤١/١٢/٢٥ی سەرکردایەتی هاوبەش. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان. ٣٧١٢٧٢٤٤.

٤. نووسراوی ڕۆژی ١٩٤٢٤/١/١٧ی وەزارەتی دەرەوە، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٣١٣٨٨.

٥. پەیامی تەلەگرافی ١٩٤٤/١٠/٢٢. نورکرت، کونسولی بەریتانیا لە تەورێز، لەسەر بنەمای گوتەکانی خانمی ئەرویجی- مس داهل- کە شوی بە پیاوێکی خەڵکی مەهاباد کردبوو، دووری

تەرجومانی لە ئەستۆ گرتبوو (خانم حەبیبی).

٦. بە گوتەی (کوک)ی کونسولی بەریتانیا لە تەوریز ١٩٤١/١١/٣٠، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٣١٤٢٩ .

٧. پزیشکێک و رۆژنامەنووسێک و موسیقازانێک، دەگەڵ ئەم گروپەدا بوون، نووسراوی کوک، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨. راپۆری رۆژی ١٩٤٢/٥/١٣ی سەرهەنگ فلچر کە راوێژکاری سیاسی بوو لە کرمانشان، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٣٧١٣١٩١.

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١- نووسراوی رۆژی ١٩٤١/١٢/٢٠ی ئانتونی ئایدنی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بەریتانیا، ٣٧١٣١٣٨٨.

١٢- نووسراوی ئەشیاندا و ئالبرت ئەشپیر « هەڵپەیڤین دەگەڵ هیتلەردا لە وینیسا» ئاوەرلستی ١٩٤٢/٨، ل ٦٢ و ٦٣.

١٣- تەلەگرافی رۆژی ١٩٤٢/١/١٤ی ریدر پولاردی سەفیری بەریتانیا لە تاران، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٣١٣٨٨. و نووسراوی رۆژی ١٩٤٢/١/٢٨ی (کوک)ی کونسولی بەریتانیا لە تەوریز. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ٣٧١٣١٤٢٩.

١٥- لە ناوەندی نیسانی ١٩٤٢ دا بی، ای، کونیل هوم، لەتەوریزدا دەکرێ بە کونسولی ئەمریکا، ئەم پیاوە پسپۆری کاروباری سۆڤیەت و وڵاتانی بالتیکە، بە ئاشکرا «سەگی پاسەوانە» و دەبێ چاودێری کارەکانی روس بکات، بەڵام خەیاڵی خاوەو لە مەسەلەکە دوور وبێ خەبەرە.

١٦- پەیامی تەلەگرافی نورکرت دەربارەی ئەو دیدارەی کەلە نێوان رۆژانی ١٣و ١٥/ ١٩٤٢/١٠ دا کردوویەتی، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١٣١٢٩١.

١٧- پەیامی تەلەگرافی کونسولی بەریتانیا لە کرماشان.

١٨- بۆ زانیاری پتر لەسەر مێژوویی کۆماری مەهاباد. بڕوانە کتێبە نایابەکەی ویلیام ئیگلتون، (کۆماری کورد ١٩٤٦، لەندەن، ١٩٦٣. ویلیام ئیگلتون کەلە ساڵانی ١٩٥٤- ١٩٥٥ بەڕێوەبەری بنکەی رۆشنبیری ئەمەریکا بوو لە کەرکوک وپاشان لەساڵانی ١٩٥٩-١٩٦١ کونسولی ئەمەریکا بوو لە تەوریز دیارە، پایەیەکی وەهای هەبووە کە دیدار لەگەڵ زۆر کەسدا بکات کە لە نزیکەوە ئاگایان لە رووداوەکانی ساڵانی ١٩٤٥-١٩٤٦-١٩٤٧ بووە و دیتویانە کتێبەکەی کە تەنیا کتێبە لەم بارەیەوە لە رۆژاوادا بڵاو بووەتەوە، زۆ چاک و بە بەڵگەیەو بێ چەندو چون یەکێکە لەو کتێبە زۆر باشانەی کە دەربارەی مەسەلەی کورد نووسراون.

١٩- هەمان سەرچاوە.

٢٠- ئەمە بە هەر حاڵ شتێکە کە ویلیام ئیگلتون و ئارچیبالد رۆزڤلت دەڵێن: میدل ئیست جرناڵ، ١٩٤٧/٧.

رۆزڤلت کە لە هەیڤی ١٩٤٤/٧ - ١٩٤٥/٩ یاریدەدەری پاشکۆی عەسکەری بوو لە عێراق و پاشان لە ئێران بوو. یەکێکە لەو ئەوروپاییە زۆر کەمانەی کە لە سەردەمی کۆماری مەهابادا سەردانی ئەم شارەی

کردووه. ئەو گوتارەی کە دەربارەی ئەم دیدارە لەگۆڤاری میدل ئیست جرنالّ دا بلاوی کردەوە زۆر بەکەلکە.

٢١- وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان، ١٧٢ . ٣٧١٤.

٢٢- حەسەنی ئەرفەع، کوردەکان ل ٧٥.

٢٣- مێژووی «رەسمی» بەگوتەی نووسەرانی مێژووی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.

٢٤- نامەی نووسەر بۆ رەحیمی قازی، باکۆ هەیلی ١٩٧٦/٣

٢٥- بە گوتەی ا. روزفلت، سەیر لەمەدایە کە دەقی ئەم «بەند»ە کە تاقە بەندێکە ئاماژە بۆ سیاسەتی کۆمەلایەتی حیزبی دیموکرات دەکات لەسەرچاوە جیاوازەکاندا بە شێوەی جیاواز تۆمار کراوە.

لە کتێبەکەی ئیگلتون دا بەم شێوەیە تۆمار کراوە: «دەرامەتی کوردستان دەبێ بۆ خودی ناوچەکە خەرج بکرێ» لە گوتارەکەی روندودا بەناوی لەسەر زەمینی ئیسلامدا (١٩٤٦ ژمارە ٣٤) دەلێ دامەزرێنەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان «خوازیاری چاوخشاندنەوەن بە پەیوەندیێن نێوان مولکداران وجوتیارانە» دا، کەچی دکتور قاسملو لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی کوردستانی ئێران (١٩٧٦) دەلێت: «دەبێت هاوئاهەنگی و رێکەوتنێک لە نێوان جوتیاران و مولکداران دا بکرێت بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی دوو لایەنەی نێوانیان.»

٢٦- و. ئیگلتون، هەمان سەرچاوە، حەسەن ئەرفەع کوردەکان، ل ٧٨.

٢٧- و. ئیگلتون ل ٤٥.

٢٨- هەمان سەرچاوە ل ٤٦ ئەم ریوایەتەی ئیگلتون لەگەلّ روایەتەکەی هەمزە عەبدوللادا یەک ناگرێتەوە (بەشی سێیەم، فەسلی یەکەم) بەروالەت وێنای ئەمەیە کە چ کەسێک هاتنی بارزانی بۆ ئێرانیی خۆش نەبووە.

٢٩- شەهباز ١٩٤٥/١٢/٣١ لە پییر روندو وە وەرگیراوە، بروانە لەسەر زەمینی ئیسلامدا، ١٩٤٦، ژمارە ٣٤، ل ١١٨

٣٠- ویلیام ئیگلتون، ل ٦١

٣١- هەمان سەرچاوە ل ٧٨

٣٢- ویلیام لیۆ وسترمن، کاروباری دەرەوە ١٩٤٦/٧، باسی داتنی بیست زرێپۆشی روسی لەسەر بازگەی روسی میاندواوەوە بە هێزەکانی مەهاباد دەکات (گوتارێکی دیکە لەمەر ئەم بابەتە لە نیویورک تایمز).

٣٣- ویلیام ئیگلتون، هەمان سەرچاوە ل ٧٤.

٣٤- «بزاڤی نەتەوەیی کورد لە ١٩٤٦» دا نووسینی پییر روندو، لەسەر زەمینی ئیسلامدا، ١٩٤٧، ل ١٢٩ کە لە پەیامی رۆژی ١٩٤٦/٥/٤ی رێبەر لە تارانەوە کە لە وێدا کورتەیەک لە گوتاری رادیۆی تەوریز نەقلّ دەکات، هەروەها بروانە و. ویلیام ئیگلتون. ل ١٣٠.

٣٥- روندو، هەمان سەرچاوە ل ١٣٠.

٣٦- ئا، روزڤلت، میدل ئیست جورنالّ ١٩٤٧

٣٧- هەمان سەرچاوە.

٣٨- ویلیام ئیگلتون ل ٥٨.

٣٩- بە گوتەی ئیگلتون، قازی محەممەد نەخشەیەکی بۆ هێرش کردن لە باشوورەوە دانا بوو، کە قەرار بوو دوای چەند ڕۆژێک، واتە لە ناوەڕاستی هەیڤی ١٩٤٦/٦ ا. جێبەجێ بکرێ، قازی محەممەد، مەنافی کەریمی بۆ دەرکردنی فەرمانی هێرشەکەدا بۆ شەرگە ناردبوو، بەڵام بە هەوڵی هاشمزفی کونسولی سۆڤیەتی لەرمزاییە، ئەم بەرنامەیە هەڵوەشایەوە. ئیگلتون ل ٩٧

٤٠- پەیامی تەلەگرافی ئاژانسی فەرەنسا، کە لە ڕامبوە وەری گرتووە ل ١٠٦-١٠٧.

٤١- ڕەحیمی قازی نامە بۆ نووسەر، ١٩٧٦/٣

٤٢- هەمان سەرچاوە.

٤٣- ڕامبۆ کوردەکان هەق. ل ١٠٤

٤٤- ئا. ڕوزڤلت، میدل ئیست جەرناڵ ١٩٤٧

٤٥- هەمان سەرچاوە.

٤٦- و. ئیگلتون ل ١٠٦

٤٧- نامە بۆ نووسەر ١٩٧٦/٤

٤٨- حەسەن ئەرفەع، کوردەکان ل ٩٦

٤٩- و. ئیگلتون ل ١١٢

٥٠- هەژار، هەڤپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، بەغدا ١٩٧٣

٥١- ڕەحیمی قازی، نامە بۆ نووسەر، ١٩٧٦/٣.

٥٢- و. ئیگلتون ل ١٤٦.

٥٣- بۆ زانیاری لەمەڕ ئەم ڕووداوە بڕوانە «جەنگی ئازەربایجان» نووسینی ڕابرت ڕوسو، لە میدل ئیست جورناڵ، زستانی ١٩٥٦ وەبزاڤی کومونیستی دە ئێراندا» نووسینی جورج لنس زوفسکی، میدل ئیست جورناڵ، ١٩٤٧/١.

٥٤- ر. ڕوسو، میدل ئیست جورناڵ، ١٩٥٦ ل ٢٩

٥٥- و. ئیگلتون ل ١١٥

٥٦- هەڤپەیڤین دەگەڵ هەمزە عەبدوڵلا بەغدا ١٩٧٣.

٥٧- و. ئیگلتون ل ١٢٨.

**تێبینی: ئەم زانیاریانە لە ڕێزدار ساڵح مەحمود بارزانی وەرگیراون:**

[١] ئەو زانیارییە لەمەڕ ژنهێنانی شێخ ئەحمەدی بارزانی لە خێڵی قەرەپاپاغ دروست نییە، بەڵکو ئەوەی ژنی لەو خێڵە هێناوە سەید ئەحمەدی سەید تەهای ئەهرییە و ئەوی ژنەکەی مەنیجەخانە و خوشکی دکتۆر پەهمەنی قەرەپاپاغە.

[٢] پاش چوونی بارزانی بۆ مەهاباد و دامەزراندنی کۆماری مەهاباد ماڵی لە شنۆوە چوو بە مەهاباد.

## فەسڵی سێیەم

## حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە دوای ڕوخانی کۆمار مەهابادەوە تا شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ی عێراق

پاش ڕوخانی کۆماری مەهاباد و خەنەقاندنی قازییەکان و گرتنی ژمارەیەک لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیوکراتی کوردستان و ڕاکردنی ئەندامانی دیکەی حیزب بۆ عێراق، بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بە کردەوە هەرەسی هێناو دامرکایەوە.

### ١

### کۆمیتەی کومونیستی کوردستان و حیزبی دیموکرات

لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٤٨وە هەندێ هەوڵ و تەقەلا بە مەبەستی تازەکردنەوەی ڕێکخستن دەبینین، لەلایەن ک.ک.ک (کۆمەڵەی کومونیستی کوردستان) بە ڕێبەری ڕەحیم سوڵتانیان[1] و بە تایبەتی لەلایەن حیزبی دیوکراتی کوردستان -ی میراتگر و درێژەدەری ڕێگەی حیزبی دیوکراتی قازی محەممەد، هەندێک هەوڵی عەمەلی لەم بوارەدا دەدرێ، حیزبی دیوکراتی کوردستان لە ساڵی ١٩٤٨ دا لە ڕاستیدا لقێکی حیزبی تودە بوو لە کوردستاندا، ئەندامانی حیزبی دیوکراتی کوردستانی (مەهاباد) دانیشتووی تاران خۆبەخۆ دەبوون بە ئەندامی حیزبی تودە و بە پێچەوانەشەوە.

بەڵام وەزع باش نییە و ئەندامانی حیزبی تازە، ئەزموونی خەباتی نهێنییان نییە، ئەمن زوو بە زوو ڕێبەرانی حیزب، یەک لەوانە عەزیز یوسفی دەبێ، دەگرن ویوسفی لە ١٩٤٨وە تا ساڵی ١٩٥٢ دە زندانێ دابوو.

### ٢

### حیزبی دیموکراتی کوردستان لە سەردەمی موسەدیق دا

لە ساڵی ١٩٥١دا موسەدیق دەسەڵاتی گرتە دەست، حیزبی دیوکراتی کوردستان سوودی لە کەش و هەوای تا ڕادەیەک ئازادی ئەو سەردەمەی ئێران وەرگرت و بە ڕێبەری عەزیز یوسفی و غەنی بلوریان هەنێک بوژایەوە و ڕەونەقی پەیدا کردەوە.[2]

زۆری پێناچێ کە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٢دا، ویڕای گوشاری ئەمن و پولیس، سادق وەزیری خەڵکی مەهاباد و ئەندامی حیزبی دیوکرات بۆ ئەنجومەنی هەڵدەبژێردرێ و

دەبێ بە تونێنەر.

بەڵام شا بەخۆی هەڵبژاردنی ئەو پیاوەی رەفز کردو ئیمام جومعەی تارانیان کە پیاوێکی شیعە مەزهەب و خەڵکی مەهاباد هەر نەیان دەناسی، لەبری ئەو هەڵبژارد.

پاشان و لە ساڵی ۱۹٥۳دا هەراو هەنگامە ناوچەی مەهاباد دەگرێتەوە و لە ناوچەی بۆکاندا جوتیاران دژی فیوداڵ و موڵکداران رادەپەڕن.

لە مانگێن ٥و۱۹٥۳/٦ دا خۆپیشاندان لە مەهاباد روو دەدەن، پۆلیس و خەڵکەکە لێیان دەبێ بە شەڕ و لاوێکی خەباتکاری کورد دەکوژرێ، ژمارەیەکیش دەگیرێن.

لە ۱۹٥۳/۸/۱٦ دا خۆپیشاندانێکی گەورە بۆ پشتیوانی مسەدەق لە مەهاباددا بەریا دەبێت. هێمنی شاعیر لە دوای روخانی کۆمارەوە تا ئەنگێ بۆ یەکەم جار پارچە شیعرێک بۆ خۆپیشاندەران دەخوێنێتەوە.

بۆ یادی ئەم خۆپیشاندانە و بۆ یادی دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەلایەن قازی محەممەدەوە لە ۱٦/ ئابی/ ۱۹٤٥دا، ناوی شەقامی پەهلەوی دەگۆڕن بە شازدەی ئاب.

بەڵام گۆڕانکاری سیاسی و لە نکاو یەک بە دوی یەکدا دێت.شا پاش رۆیشتن بۆ رۆما و لە دوای دژە کودەتایەکی دەستکردی ئەمەریکا لە ۱۹٥۳/۸/۱۹ دا سەرلەنوێ جڵەوی دەسەلات دەگرێتەوە دەست.!

سوپا شەوانە گەمارۆی شاری مەهاباد دەدات و خەباتکارانی حیزبی دیموکراتی کوردستان هەمدیس بە ناچاری ون دەبن و خۆ دەشارنەوە.

## ۳

## جیابوونەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە حیزبی تودە

خەباتگێرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە تەمابوون حیزبی تودە شۆڕشێکی چەکدارانە بەریا بکات، چونکە هیچ کاتێک رێکخستنی ئەم حیزبە بەم رادەیە بەهێز نەبوو، نزیکەی ۷۰۰ ئەفسەری سوپایی ئەندامی حیزبی تودە بوون و بە کردەوە خۆیان گەیاند بووە هەموو شوێنێک، یەکێک لە سەرانی سەرکردایەتی سوپا و هەروەها ئەفسەرێکی دی کە ،دەسەلاتێکی زۆری درابۆیە بۆ سەر کوتکردنی حیزبی تودە، بۆ ئاباداانی مەڵبەندی گەورەی کۆمپانیا نەوتییەکانی وڵات نێردرابوو، لە ئەندامانی حیزبی تودە بوون! خەڵکی

حیزبی توده تەنانەت گەیی بوونە نووسینگەی تایبەتی پاشایەتیش.

بەڵام هەڵسووڕێنەرانی حیزبی توده کە لە ئەیلولی ۱۹۵۳دا رایانگەیاندبوو کە بەو زووانە راپەڕین بەرپا دەبێت، لە ئەنجامدا لە خەباتی چەکدارانە ژێوان بوونەوە.

مێژووی ناکۆکی نێوان حیزبی دیموکراتی کوردستان و حیزبی توده کەلە ئەنجامداو لە ساڵی ۱۹۵۵ بەیەکجارەکی لێکدی جیابوونەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سەردەمە، ئەمەش سەردەمێک بوو کە پۆلیسی ئێران رێکخستنی عەسکەری حیزبی تودەی سەرکوتکرد، پاش ئەوەی پۆلیس توانی بخزێتە ریزەکانی حیزبی تودەوە، حیزبی دیموکراتی کوردستان لێبڕا کە هەموو پەیوەندییەکی رێکخراوەیی خۆی دەگەڵ حیزبی تودەدا بپچڕێنێ.

## ٤

## کۆمیتەکانی مەهاباد و سنە

لە م قۆناغە نا هەموار و پرمەترسییەدا، نەدەکرا یەک رێکخراو بۆ هەموو کوردستانی ئێران هەبێ، بەڵکو چەند لیژنە و کۆمیتەیەکی ناوچەیی هەبوون کە لە مەهاباد دا لەلایەن عەزیز یوسفی و غەنی بلوریان و عەبدولرەحمان قاسملو و رەحیم سولتانیان و کەریم ئاوەیس و عەبدوڵلا ئیسحاقی (ئەحمەد تۆفیق)[٣] و لە سنەدا لەلایەن شەریعەتی و کەسانی دیکەوە بەڕێوە دەبران.

غەنی بلوریان توانی لە ساڵانی ١٩٥٤-١٩٥٥ دا چەند ژمارەیەکی خولی تازەی رۆژنامەی کوردستان کە لە تەوریز چاپ دەبوو، بڵاو بکاتەوە. بەڵام چونکە پۆلیس چاپخانەی نهێنی رۆژنامەکەی کەشف کرد و پێنجەمین ژمارەی کوردستانی ( ساڵی ١٩٥٥) کە تایبەت بوو بە ساڵیادی دامەزراندنی حیزب گرت، ناچار بوو بڵاوکردنەوەی رۆژنامەکە رابگرێ.

## ٥

## کۆمیتەی ناوەندی ساڵی ١٩٥٤

لە ساڵی ١٩٥٤دا هەردوو کۆمیتەی مەهاباد و سنە تێکەڵ دەبن و کۆمیتەیەکی ناوەندی لە هەردوو کۆمیتەی نێوبراو دروست دەکەن.

لە هەیڤی ١٩٥٥/٥ دا کۆمیتەی ناوەندی یەکەمین «کۆنفرانس»ی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەبەستێ و نزیکەی بیست کەسێک لە ئەندامە چالاکەکانی حیزب لە دووری

چەند کیلۆمەتری مەهابادا لە دەوری یەک کۆ دەکاتەوە.

لەم قۆناغەدا زۆربەی خەباتگێرانی چالاکی حیزب بە نهێنی لە گوندەکاندا دەژیان، ژمارەی ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە چەندین شانەیان لە شارانی گەورەی وەکو سنە و کرمانشان هەبوو، دەگەییە چەند هەزار کەسێک.

حیزبی دیموکراتی کوردستان وێرای گوشار و سەرکوت، بە چاکی جێی خۆی کردبووە و لە باری رێکخستنەوە کۆک بوو، لەم قۆناغەدا پەیوەندی نزیکی دەگەڵ حیزبە چەپەکانی عێراقدا، واتە دەگەڵ حیزبی کومونیست و حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراقدا هەبوو، ئەم پەیوەندییە بە رادەیەک بوو کە هەردوو حیزبی نێوبراو لە ململانێییە ئایدیۆلۆژیەکانی خۆیاندا، حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێرانیان دەکردە حەکەم.

## ٦

## پرۆگرامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (١٩٥٦)

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ساڵی ١٩٥٦ دا یەکەمین پرۆگرامی خۆی، بڵێ یەکەمین «رەشنووس»ەی پرۆگرامی خۆی لە دوای بەرنامەی حیزبی دیوکراتی قازی محەمەد بڵاو دەکاتەوە.

دیارە زمانی پرۆگرامەکە گۆڕاوە.

نووسەرانی ئەم قەواڵەیە دروشمی «خەبات دژی ئیمپریالیزم و لە پێناوی حوکمڕانی گەل»دا سەرەتا بە دووردرێژی ئەو «ستەمە نەتەوەییە» تاوتوێ دەکەن کە لە کوردی ئێران دەکرێ.

«منداڵی کورد هەر لە منداڵی را ناچارە زمانێک فێر بێ کە زمانی زکماکی خۆی نییە، واتە زمانی فارسی. هەموو شتێکی کوردی قەدەغەیە، کاربەدەستانی گەورە هەموو لە تارانەوە دێن، کوردستان ناوچەیەکی عەسکەرییە، سوپا و پۆلیس لە وێندەر دەسەڵاتی بێ سنووریان دراوەتێ.»

نووسەرانی بەرنامەکە لەسەر شیکردنەوەی خۆیان بەردەوام دەبن و دەگەنە ئەم ئەنجامگیرییەی کە «نەتەوەی کورد لە ژێر زوڵمی سێ لایەنەی ئیمپریالیزم و دەوڵەتی فیوداڵ بورژوای ناوەندی و موڵکدارانی گەورەی کوردایە.»

رێبەرانی حیزبی دیوکراتی کوردستان رایدەگەیەنن کە «حیسابی گەلانی ئێران جیایە لە

حیسابی حکومەتی ناوەندی» و رایدەگەیەنن کە هەم دژی شۆڤینزمی ئێرانین کە دان بە بوونی کورد دا نانێن و هەم دژی ئەو کوردە ناسیونالیستانەن کە هەوڵ دەدەن رقی خۆیان لە دەوڵەتی مەرکەزی، بەسەر گەلانی ئێران دا برێژن، پێشنیازی خەباتی هاوبەش دەکەن دژی دامودەزگای پاشایەتی- فاشیستی «شا» و لە پێناوی دامەزراندنی «کۆمارێکی دیموکراتی» کە کوردستانی ئێران لە چوارچێوەی ئەو کۆمارەدا «حکومەتی نەتەوەیی» و «ئەنجومەنی نەتەوەیی» خۆی هەبێ و ئەندامانی بە ئاشکرا و راستەوخۆ بێنە هەڵبژاردن و ئافرەتانیش مافی را دانیان دەبێ، زمانی کوردی دەبێ بە زمانی رەسمی کوردستان، بەڵام مافی زمانەوانی کەمینەکانی دیکەش دەپارێزرێ.

حیزبی دیموکراتی کوردستان لە بەرنامەکەیدا یەکسانی ئافرەت و پیاو دوپات دەکاتەوە، یەکسانی لە «مافی چوون یەک، هەقدەستی چون یەک» یەکسانی لە ئازادییە بنەرەتییەکاندا (ئازادی دەربرین، ئازادی چاپەمەنی، ئازادی ئایینی) هەروەها حیزب پێشنیازی حکومەتی «عەلمانی» دەکات کە سوپا و پۆلیسی تێدا نەمێنێ و «میلیشیا»ی گەل و «سوپای نەتەوەیی» جێی بگرێتەوە.

نووسەراتی بەرنامەکەی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە زنجیرە پێشنیازێکی فرە لایەن کۆتایی بە گوتەکانی خۆیان دێنن لەوانە لەباری پیشەسازییەوە (خۆماڵی کرنی ژێدەرێن ژێر زەمین و جەنگەڵەکان) و لەباری کشتوکاڵییەوە (دابەشکردنی زەوی و زاری فیودالانی گەورە و «دژمنانی حکومەتی میللی»بەسەر جوتیارانی هەژاردا) و لەباری نیشتەجێ کردنەوە (ئاکنجی کردنی دەوارنشینان و کۆچەران) و لەباری رۆشنبیری و فەرهەنگییەوە (خوێندنی نیجباری تا تەمەنی چواردە ساڵی و دامەزراندنی شانۆیەک و نیزگەیەکی رادیۆ زانستگەیەک و دام و دەزگای هەمەجۆری زانستی «سەرانسەری» و هەروەها «حکومەتی نەتەوەیی» (کوردستان) بە پێی دەرفەت یارمەتی کوردی وڵاتانی دراوسێ و خەبات لە پێناوی ئازادی هەموو کودرستان، بدات.

شتێکی بەڵگە نەویستە کە تەنێ لە ساڵی ۱۹۷۳ دا و پاش هەراو هەنگامە و کێشمانە کێش و گۆڕانکارییەکی زۆر ئەوجا حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران سەرەنجام بە (رەسمی) پشتیوانی لە (خەباتی چەکداری) دژی رژێمی شا دەکات، بەڵام حیزبی دیموکراتی ساڵانی ۱۹۵۵-۱۹۵۸ بە ئاشکرا بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی- شۆڕشگێڕیە و ئەم دوو تایبەتمەندییەش خۆی لە خۆیدا بڤەیە و بەسە بۆ ئەوەی دەزگای سەرکوتکاری

بکەوێتە گیانی و بەسەریدا داباری.

## سەرچاوە و پەراوێزان

١. کوڕی مستەفا سوڵتانیانە.

٢. غەنی بلوریان برای وەهاب بلوریانە، یەکێک بوو لە پێنج نوێنەرەکەی مەهاباد لە ئەنجومەنی تەوریز، بڕوانە و. نیگڵتون ل ٤٢ و ٦٠.

عەزیزی یوسفی مامۆستا بوو.

٣. ئەحمەد تۆفیق پاش ساڵی ١٩٦٠ دەگاتە پلەی سکرتێری گشتی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

## فەسلی چوارەم

## حیزبی دیموکراتی کوردستانی عیراق لە دامەزراندنیەوە (١٩٤٦)
## تا شۆڕشی سالی ١٩٥٨

پێشوازی پارێز نامێزی قازی محەمەد لە مەلا مستەفا بارزانی و دەهەزار کوردی هاورێی بارزانی، هەندێک سارد بوو. قازی محەمەد هەولی دابوو لە بارزانی بگەیەنێ کە هاتنی ئەو هەموو خەلکە بۆ کوردستانی ئێران کە خۆی لە قات و قڕی و برسێتی دایە، زۆر ئاریشەی لە چارەسەر نەهاتووی لێ دەکەوێتەوە.

بەلام بارزانی کەهێزێن عێراقی لە نزیکەوە تاقیبیان دەکرد و بە دوایدا دەهاتن، بێ ئەوەی چاوەنوڕی وەلامی قازی محەمەد بکات یا خود گوێی بداتێ لە مانگی ١٠/١٩٤٥ دا لە سنووری ئێران دەپەڕێتەوە. هەڤالەکانی لە گوندەکانی دەوروبەری شنۆ و مەهاباد بلاو دەبنەوە، و تووشی وەزع و حالێکی نالەبار دەبن و گرانی و تیفوس و گرانەتێ حەشریان پێ دەکات.

کوردەکانی ئێرانیش وەکو کوردێن عێراقی لە باسی پەیوەندییەکانی قازی محەمەد و بارزانی دا هەندێ پەردە پۆشیان دەکەن. ئەم پەیوەندییانە بە رەسمی چاک و بگرە زۆر چاک بوون. بارزانی تا کۆتایی هەر وەفاداری قازی محەمەد بوو حوکم و دەسەلاتی ئەوی بە هێز کرد. بەلام وێڕای هەموو ئەمانەش، ئەو دووپیاوە کە هەر یەکەیان باوەڕی بە «پەیامی مێژوویی» خۆی هەبوو قوربانی «پاوانخوازی» خۆی بوو. بەلام بابەتی ناکۆکی و ناتەبایش لە نێوانیاندا کەم نەبوو.

لە شوباتی ١٩٤٦دا واتە مانگێک دوای راگەیاندنی کۆمار لە لایەن قازی محەمەدەوە (٢٢/١/١٩٤٦) نۆ کوردی عێراقی، لەوانە بارزانی و هەمزە عەبدوللا «کۆمیتەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان بۆ سەپەرشتی و فریاکەوتنی بارزانیانی دانیشتوانی ئێران» دامەزراند.

هەلبەتە ئامانجە مرۆڤدۆستەکانی ئەم رێکخراوە تازەیە ئاشکرا بوو، بەلام دامەزرێنەرانی رێکخراوەکە دەیانویست بەتایبەتی کە تازە هاتبوونە ئێران «ناسنامەی عێراقیەتی» خۆیان بپارێزن.!

قازی محەممەد لە سەرەتادا یارمەتی ئەم کۆمیتە تازەیەی دا، بارەگایەک و تایپێکی دانێ، بەلام دوای ماوەیەک بە بارزانی و هەمزە عەبدوللای گوت: هەر یەک حیزب هەیە ئێوە دەتوانن لە نێو حیزبی ئێمەدا کار بکەن، بەلام نەک بە جیا»[1]

ماوەیەکی کەم دوای ئەم ئاگادار کردنەوەیە، هەمزە عەبدوللا بە نامەیەکی بارزانییەوە هات بۆ عێراق. لەم نامەیەدا بارزانی داوای ئەمەی کرد بوو کە ڕێگەیەک فەراهەم بکرێ تا هەمزە عەبدوللا بەمەبەستی گفتوگۆ دەگەل دەوڵەتی عێراق دا دەربارەی گەڕانەوەی بارزانی، پەیوەندی بە بابا عەلی کوڕی شێخ مەحموودەوە بکات. بارزانی داوای لە خەباتگێرانی کوردی عێراق دەکرد کە یارمەتی هەمزە عەبدوللا بدەن بۆ دامەزراندنی «حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق.» [1]

1

## گەڕانەوەی بارزانی بۆ عێراق

دەبێ پەیوەندی قازی محەممەد و بارزانی زۆر خراپ بووبێ تا بارزانی بیر لە گەڕانەوە بۆ عێراق بکاتەوە، لە کاتێکدا کە «دادگای جەنگی» بەغدا لە مانگی ١٢/١٩٤٥ حوکمی ئیعدامی غیابی بۆ ئەو و شێخ ئەحمەد و سێ کوردی دی دەرکردبوو.

بێگومان ئەمە تاکتیک بوو، پەیوەندی نێوان قازی محەممەد و بارزانی هیچ کاتێک زۆر «باش» نەبوو. بارزانی نەیدەویست بۆ عێراق بگەڕێتەوە، بەلام وای بۆ دەچوو کە «ئەگەر قازی محەممەد بزانێ کە خەیاڵێکی وەهای هەیە پەیوەندییەکانی لە گەڵیا چاک دەکات. هەرواش دەرچوو»[2]

بە هەر حاڵ تەکتیک بوو یان نا، ئەم دەست پێشکەرییەی بارزانی بووە مایەی نارەزایی ڕێکخستنی حیزبی دیموکراتی کوردستانی (ئێران) لقی سلێمانی. بەتایبەتی ئیبراهیم ئەحمەد کە بە هیچ جۆرێ حەزی بە گەڕانەوەی بارزانی نەبوو، کە (کۆماری مەهابادی لاواز دەکرد) ونامەی بۆ قازی محەممەد نارد و داوای لێکرد کارێک بۆ چاککردنی وەزع و حاڵی بارزانیانی دانیشتووی ئێران بکات (کاری وەکو دابەشکردنی ئازوقە و خواردەمەنی)[3]

بلاوبوونەوەی هەواڵی بەرز بوونەوەی بارزانی بۆ پلەی جەنەراڵی سوپای کۆمار لە ژمارەی سەرەتاکانی ئازاری ڕۆژنامەی کوردستاندا نیشانەی ئەوە بوو کە مەسەلەکە چارەسەر بووە.

## ٢

## دامەزراندنی حیزبێکی کوردی لە عێراق دا

دووەمین بەشی کارەکەی هەمزە عەبدوڵلا، ناکام و کاریگەری گرنگی لە ئایندەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد هەبوو. بارزانی بەوەی کە داوای دامەزراندنی (حیزبی دیموکراتی کوردستان)ی تایبەت بە عێراقی کرد، لە راستیدا تەسدیقی ئەو دابەشکردنە دەستکردەی کوردستانی کرد کە بە هێڵێک لە نێوان ئێران و عێراقدا ئەنجامدرابوو (کە لە جیاتی سنوورەکانی جارانی ئێران و عوسمانی بوو) کۆتایی بە یەکێتی ئەو بزوتنەوەیە هێنا کەلەگەڵ گەشەکردنی لقی سلێمانیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دا لە حاڵی پەرەسەندن دابوو.

لە سەرەتادا ئەم پێشنیازە لەلایەن برایم ئەحمەدەوە قەبوڵ نەکرا، چەندین ساڵ لەوە دوا مێژوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق رکابەری ئەم دوو پیاوەی بە خۆوە دیت، ئەویش رکابەرییەک کە مەسەلە شەخسیەکان دەوری زۆر گرنگیان تێدا بینی، زیاتریش لەم رووەوە کە هەمزە عەبدوڵلا مێری خوشکی برایم ئەحمەد بوو و برایم ئەحمەد مێری برازای هەمزە عەبدوڵلا بوو!

برایم ئەحمەد دەڵێ بە بێ «ئیمزنی» قازی محەمەد ناتوانێ رێکخراوەکەی هەڵوەشێنێتەوە، و باوەری وایە کە «نابێ ئەو خەباتگێرە کوردانەی کە بە شێوەی جیاو لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا خەبات دەکەن، دابەش بکرێنە سەر کۆمەڵێک لق» چونکە کاری وەها (کۆماری مەهاباد لاواز دەکات)[٤]

دەبێ ئیعتراف بەوە بکرێ کە ئەو هەنجەت و ئەو بەڵگانەی سی ساڵ لەوە دواتر لەلایەن دامەزرێنەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق بۆ پاساوی ئەم کارەیان دەهێنرایەوە تا رادەیەک غەریب دەبنواند: بە بۆچوونی ئەم کەسانە هەلومەرجی ئێران (زۆر جیاواز) بوو لە هەلومەرجی عێراق: لە کوردستانی ئێران دا کۆمارێکی کوردی هەبوو (کە لە ئوتونومی زیاتری هەبوو) حالبوکی لە عێراق دا «ئێمە دەبووایە لە پێناوی مافێن زۆر سەرەتایی بخەبتین»[٥]

دامەزرێنەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق باسی (زەحمەتی پەیوەندی کردن) بە مەهابادیشەوە دەکەن و دەڵێن دەستووری کارکردنیان، یان بەرنامەکانیان بە زەحمەت دەگەییە دەست.

دوا هەنجەتیش ئەمە بوو کە دروشمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (خودموختاری بۆ کوردستان) دەگەڵ وەزعی کوردستانی عێراقدا نەگونجێنرابوو.[٦]

هاندەری واقیعی بارزانی و نزیکانی بارزانی هەرچییەک بووبێ، گومان لەوەدا نییە کە ئەم کـارە مشـتـومڕ و باس و خـواسـێکی توندی لە ناو «شـۆڕش»دا واتە لەناو حـیـزبی کۆمونیـستی کوردستانی عێراقدا، کەبەخۆی لە حیزبی هیواوە سەری هەڵدابوو، نایەوە. هەمزە عـەبدوڵڵا چوو بۆ بەغـدا تـا ڕێبـەرانی حـیـزب بدینێ، لە ئەنجـامی کـۆنگرەیەکدا، کەمینەیەکی شۆڕش لەگەڵ جەمال و سالح حەیدەری و نافیع یونس دا، پێشنـیـازەکەی بارزانی پەسند ناکەن و دەچنە ناو حـیـزبی کـومـونیـسـتی عـێراقەوە و (لەوێندەر برایانی حەیدەری و نافیع یونس بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزب دەردەچن[٧] لە هەمان کاتدا زۆرینە را بۆ هەڵوەشاندنەوەی حیزب و چوونە ناو حیزبی دیموکراتی کوردستان دەدەن.

لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٤٦دا هەمزە عەبدوڵڵا بە «پێشنیازەکانی» بارزانییەوە لەمەڕ ڕێکخـستن و دامـەزراندنی حـیـزبی تـازە، بۆ عـێراق دێتـەوە، بارزانی بەسـەرۆکی حـیـزبی دیموکراتی کوردستان هەڵدەبژێردرێ و شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود، و زیاد محەممەد بە جێگری یەکەم و دووەمی سەرۆک هەڵدەبژێردرێن.

## ٣

## یەکەمین کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق (١٩٤٦/٨/١٦)

لە ١٩٤٦/٨/١٦دا نوێنەرانی هەمـوو ڕێکخـراوە کـوردییـەکـان دوای قـەبوڵکردنی پێشنیازەکانی بارزانی، بۆ بەستنی یەکەمین کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق بە نهـێنی لە بەغـدا کـۆ دەبنەوە. بارزانی بۆ خـۆی لە مـەهابادەوە هەمـزە عـەبدوڵڵا بە نوێنەرایەتی خۆی بۆ کۆنگرە ناردووە.

برایم ئەحـمـەد دەیەوێ لە کـۆنگرەدا بەشـداری بکات، بەڵام ڕێی نادەن بچـێـتـە کۆبوونەوەکانی کۆنگرەوە، چونکە نەیویستبوو، پەیوەندی بەم حیزبە تازەیەوە بکات! (برایم ئەحـمەد لە ئازاری ساڵی ١٩٤٧داو پاش ڕوخانی کۆماری مەهاباد پەیوەندی بەم حیزبەوە کرد.)

لە ئاستی ڕێکخراوەییدا، هەمزە عـەبدوڵڵا بە سکرتێری گشـتی حـیزبی دیموکـراتی کوردستانی عێراق هەڵدەبژێردرێ، حیزب لەسەر شێوازی حیزبی کومونیستی یەکێتی سۆڤیەت هاتبووە دامەزراندن. کۆمیتەیەکی ناوەندی هەبوو کە ئەفسەرانی ناسیونالیستی

وەک میرحاج و عیزەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و نوری ئەحمەد تەها ئەندام بوون تێیدا، هەروەها مەکتەبی سیاسی هەبوو کە دەسەڵاتی راستەقینە لە دەستی ئەو دابوو، لە مەکتەبی سیاسیدا ناوی هەمزە عەبدوڵلا و دکتۆر جەعفەر عەبدولکەریمان بەر گوێ دەکەون.

بەرنامەی ئەم حیزبە تازەیە بەرنامەی حیزبێکی پێشکەوتووخواز بوو، وێرای خواستێن نەتەوەیی خالیسە، (ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق، خواستی کۆمەڵایەتیش بەرچاو دەکەون. ریفۆرمی زەوی و زار، چاککردنی هەلومەرجی زنەگی چینی کرێکار، ریفۆرمی ئابوری و کۆمەڵایەتی (خۆماڵی کردنی ژێدەرێن سروشتی، جیا کردنەوەی ئایین لە حکومەت) خوڵاسە حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق هەر لە سەرەتای لە دایک بوونییەوە حیزبێکی دژە ئیمپریالیزم و دژە کونەپەرستی بوو، لە دامەزراندنی «بەرەی نیشتمانیدا »دا دەگەڵ حیزبی گەلی عەزیز شەریف و حیزبی دیموکراتی نیشتمانی و حیزبی کۆمۆنیستی عێراقدا بەشداری دەکات.

رێکخستنێکی شۆرشگێری و ژێر زەمینیش هەبوو، کە ئەندامەکانی کەم بوون: بە گوتەی هەنێ کەس ژمارەیان ٥٠٠ سەد و بە گوتەی هەندێکی دی ژمارەیان ٢ هەزار نەفەر بوون.[٨]

حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق هەر زوو دەکەوێتە دەرکردنی رۆژنامەی رزگاری بە زمانی عەرەبی.

دیاریکردنی جێ دەستی بارزانی لەتۆمار کردنی بەرنامەی حیزبی دیموکراتی کورستانی عێراقدا کارێکی زەحمەتە، بەڵام ناچێتە ئەقلیشەوە ئەوێک کە هەمیشە و تەنانەت لەو ساتانەدا کە زۆر پێویستی بەرۆشنبیرانی هیوا هەبوو، خۆی لێ دوور دەگرتن، لەناو حیزبەکەیدا مایەی تەئید بووبێ.

بەڵام بە هەر حاڵ ئەوەی کە حاشای لێناکرێ ئەمەیە کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق، هێشتا هەر ساوا بوو کە «هەتیو» کەوت، لە هەیلی چواری ساڵی ١٩٤٧ دا بارزانی چوو بۆ یەکێتی سۆڤیەت، حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق تا ساڵی ١٩٥٥ نەیتوانی هیچ پەیوەندییەک بەوەوە بکات.

## حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق بە بێ بارزانی (١٩٤٧-١٩٥٨)

**حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق کە زادەی دەست پێشخەری بارزانی و ئایدۆلۆژیای رۆشنبیرانی مارکسی «شۆرش» بوو لە هەلومەرجی گوشاری دوولایەنەی سەرکوت و جەنگی ساردا گەشە دەکات.**

لە سالی ١٩٤٦وە، واتە لەوکاتەوە کە دامەزرێنەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق لەبەغدا کۆبوونەوە، ئیدی زەبرو زەنگ و سەرکوتکارییەکی ترسناک نیشتبووە سەر عێراق، ئەو حیزبە چەپانەی کەلە حکومەتە لیبرال ئامێزەکەی تۆفیق سویدی دا مۆلەتی کارکردنیان وەرگرتبوو، لە لایەن حکومەتی دوای ئەو، واتە لەلایەن حکومەتی ئەرشەد العومەرییەوە قەدەغە کران. رێبەرەکانیان گیران، لە خۆپیشاندانێکی جەماوەری دا لە بەغدا وکەرکوک پۆلیس تەقەی لە خەلکەکە کرد و ژمارەیەک کوژران و بریندار بوون.

لەمانگی ١٩٤٧/١دا نوری سەعید گەرایەوە سەرحوکم، پۆلیس یوسف سەلمان یوسفی سکرتێری گشتی حیزبی کۆمونیستی عێراق و زۆربەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی ناوبراویان لەناغافل دا گرت. ئەم ژمارەیە دادگایی کران و حوکمی خنکاندن و حەپسی درێژخایەنیان بەسەردا درا.[٩]

کوردەکانیش بەشیان لەم سەرکوتکارییە دەبێت لە ١٩٤٧/٦/١٩ دا ئەو چوار ئەفسەرەی کە لەگەل بارزانی دا چوو بوون بۆ ئێران، واتە عەقید عیزت عەبدولعەزیز و راند مستەفا خۆشناو، رەیس خەیرۆللا عەبدولکەریم و مەلازم محەمەد مەحمود لە بەغدا لە سێدارە دەدرێن.!

خێزان وخانەوادەی هەڤالانی بارزانی کە پاش روخانی کۆماری مەهاباد بۆ عێراق گەرابوونەوە و ژمارەیان نزیکەی ٥ هەزار ژن و مندال و پیر بوون، لە ئوردوگایەکی نزیکی دیانەدا حەپس دەکەن، ئەو پیاوە تەندروستانەی (لەش ساغانە) کە لەگەل بارزانی دا بۆ یەکێتی سۆڤیەت نەچوو بوون کە نزیکەی هەزار کەسێک دەبوون لە کەرکوک و سلێمانی زیندانی دەکرێن. شێخ ئەحمەدیش زیندانی دەکرێ.!

بەلام لەسالی ١٩٤٨ دا پێکادانی زۆر جیدی لە نێوان چەپی عێراق وکاربەدەستانی حکومەت دا روو دەدات، دەولەتی تازە بە رێبەری سالح جەبر، سەرگەرمی گفتوگۆیە دەربارەی بەستنی پەیمانێکی تازە بە نێوی پەیمانی پورتسمۆس، یەکێک لە خالە دیارەکانی

ئەم پەیمانە بریتـیـیـە لە دامـەزراندنی ئەنجـومـەنی بەگـری هاوبەش لە نێـوان عـێـراق و بەریتانیادا.

بە درێژایی هەیڤی ١٩٤٨/١ زنجیرەیەک خۆپیشاندانی توند لە بەغدا روو دەدات، کە زۆر جار شـێـوەی شـۆڕش دەگـرنەخۆ، دوا ئەڵقـەی ئەم خۆپیشـاندانانە، خـۆ پیشـاندانی ١٩٤٨/١/٢٧ بوو کە بە بێرەحمی دامرکێنرایەوە. سی کـەس کوژران و ٣ سـەد کـەس بریندار بوون، هەر ئەو رۆژە بۆ شەوەکەی حکومەت نیسـتیقالەی داو حکومەتەکەی دوای ئەو پەیمانی پۆرتسموسی ئیمزا نەکرد.

لە کاتی جەنگی ئیسـرائیل و عەرەبدا، حکومەتی عورفی رادەگەیەنرێ و سەرکوتکاری برەو دەسـەنێ، هەندێـک لەسـەرانی حـیـزبی دیموکـراتی کـوردسـتـانی عـێـراق بە تۆمـەتی «شیوعیەت» دەگیرێن، یەکێک لەوانە ئیبراهیم ئەحمەد دەبێ کە حوکمی دوو ساڵ حەپس دەدرێ، ژمارەیەک پەنا دەبەنە دەرێی ولات و ژمارەیەکی دی خۆ دەشارنەوە.

بە درێژایی ئەم ماوەیە حـیـزبی دیموکـراتی کـوردسـتـانی عـێـراق شـان بەشـانی حـیـزبی کومونیـستی عێراق و هەموو حیزبە پێشکەوتنخوازەکانی دی خەباتی کرد.

لە راستیدا حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق هێندە لە حیزبی کۆمۆنیستی عێراقەوە نزیک بوو کە بە قەولی ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری گشتی ئایندەی حـیـزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق «یەدەکی ئێوبراو بوو»[١٠]

٥

## بارزانی لە یەکێتی سۆڤیەتدا

مەلا مستەفا کە لەمێژ بوو سۆڤیەتەکان بە داردەست و جاسوسی ئینگلیزیان دەزانی هەر کەپێی نایە خاکی سۆڤـیـەتەوە، لەروانین و بۆچوونی رۆژاواییانەوە بوو بە «بوکەڵەی دەستی موسکۆ» سـایرۆس سـالز بورگ لە گوتارێک دا کە لە نیـویۆرک تایمز بلاوی کردۆتەوە کە گوزارشت لە بۆچوونی وەزارەتی دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەمەڕ چالاکی رووسـەکـان لەرۆژهەلاتی نزیک دەکـات، ئەوە شـەرح وشـرۆڤـە دەکـات کـە چۆن کـوردەکـان بیانەوێ و نەیانەوێ «تابووری پێنجەم» پێک دەهێنن، «دووپاتی دەکاتەوە» کە بارزانی پارمـەتی سـۆڤـیـەتەکـانی داوە کـە قـوتابخـانەیەکی تایـبـەت بە پەروەردە کـردنی «بەکـرێگیـراوانی (عـوامل) کـورد لە ئەنجـەوان دروست بکەن و ئەم بەکـرێگیـراوانە لەوێندەرەوە بۆ عێراق و تورکیا دەنێرن.»[١١]

سەیر ئەوەیە کە هەندێ خەڵکی کوردی «پەراگەندە»ی ئەورووپاش دەیانەوێ شاخ و باڵ لەم «ئەفسانە»ی جەنەراڵی سوورەوە بنەن. ئەگەر قسەی راگەیاندنی ناوەندی لێکۆڵینەوەی کوردی، کەلەلایەن کامەران بەدرخانەوە دەردەچێت قەبوڵ بکەین کە جەنەراڵ بارزانی بەردەوام و هەموو رۆژێک بۆ ماوەی سەعاتێک لە رادیۆی باکووە قسان دەکات و نەتەوەی کورد هان دەدا کە سەبر بکەن و بەڵێنیان دەداتێ کە سەرەنجام رۆژێ دێ کە خەونی یەکبوونی کورد بێتە دی و رۆژانی خۆش نزیکن»[١٢] هیچ دیار نییە کەمیر بەدرخان ئەم زانیاریانەی لەکوێوە هێناوە، چونکە ئەولەو سەروبەندەدا لە پاریس بوو... زۆر گۆشەگیر بوو بەهەر حاڵ ئەم زانیاریانە زیاتر لە درۆدەچن تا لە راستی.

بارزانی هەر کە گەییە یەکێتی سۆڤیەت لە راستیدا لەگەڵ گەورەترین کەسایەتی ناوچەکەدا، یانی لەگەڵ باقروفی سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای کۆماری سوسیالیستی سۆڤیەتی ئازەربایجاندا، کە ناوچەی رۆژاوای دەریاچەی رەزاییەی بە بەشێک لە کۆماری ئازەربایجان دەزانی لێیان بوو بە ناخۆشی

بارزانی نەیویست بوو ببێ بە ئالەتی دەست و بوکەلەی باقروف: بە لای ئەویشەوە وەکو قازی محەمەد ئەم ناوچەیە بەشێک بوو لە خاکی کوردستان و زۆری پێ نەچوو کە پەیوەندی نێوان ئەم دووە (باقروف و مەلا مستەفا) زۆر خراپ بوو.

دەگێڕنەوە لە میوانداریەکدا کە بارزانیش دەعوەت کرابوو، ئەو پێکەکەی خۆی هەڵنەگرت، گوتی «من ناخۆمەوە و هیچیش ناخۆم! لەکاتێکدا ٥سەد کورد (واتە هەڤاڵانی ئەو) خەریکە لە برساندا دەمرن و چۆن دەتانەوێ من شتێک بخۆم»! ئەم سەربوورە دروست بێ یان نا. خۆی لە خۆیدا نیشانەی ساردی پەیوەندی نێوان بارزانی وکاربەدەستانی ناوچەیی یەکێتی سۆڤیەتە.

دوای ماوەیەک بارزانییەکان بەسەر گوندەکاندا دابەش دەکەن. سەرەتا لەئەرمەنستان و پاشان لە ئوزبەکستان، وەکو پەنابەری ئاسایی رەفتاریان دەگەڵ دەکەن نەک وەکو پەنابەری سیاسی.

گوایە بارزانی بۆ خۆی هەمیشە لە باری مادی و داراییەوە لەوەزع و حاڵێکی تا رادەیەک باشدا بووە، بەڵام هیچ جۆرە دەورێکی سیاسی نەبوو، ئەگەر «رادیوی نهێنی» هەردوو حیزبی دێموکراتی ئازەربایجان و دێموکراتی کوردستان تا ساڵانی ١٩٥٤-١٩٥٥ هەندێ بەرنامەی بە کوردی بڵاو دەکردەوە، ئەوا گومانی تێدا نیە کە بارزانی لەم

بەرنامانەدا و لەرۆژنامەی ئازربایجاندا کە لاپەڕەیەکی بۆ (کوردستان) تەرخان کردبوو، قسەی نەکردووە.

تەنێ دوای مەرگی ستالین و دادگایی کردنی باقروف وەزع وحاڵی کوردێن پەناهەندەی یەکێتی سۆڤیەت باش دەبێت، بارزانی بە فڕۆکە دەچێت بۆ مۆ[illegible] و خۆی بە کۆمیتەی ناوەندی دا دەکات و لەوێندەر ماندەگرێ تا سەرەنجام لەلایەن خرۆشۆف ومالینکۆف و مولوتوفەوە پێشوازی دەکرێ.

لە هەوەسی ڕا زۆر بە ڕەقی ڕەفتاری دەگەڵ دەکرێ، بەڵام ئەو ناڕەزایی لەمەڕ ئەو ڕەفتارە دەربڕی کە دەگەڵ هەڤاڵەکانیدا دەکرا، و گوتی: «ئەو بۆیە داوای پەناهەندەیی لەیەکێتی سۆڤیەت کردووە، چونکە بە دۆستی گەلی کوردی زانیوە».[١٢]

داوای کرد کە هەموو لاوانی کورد بۆیان هەبێ بچنە قوتابخانەی پسپۆڕی و قوتابخانەی حیزب، بۆ خۆی و گروپێکی بچکۆلەی کادیران مۆڵەتی وەرگرت کە لە مۆسکۆ دانیشن. ئەم گروپە لە قوتابخانەکانی مۆسکۆدا دەستیان بە خوێندنی زمانی ڕوسی و زانستێن سیاسی و مارکسیزم کرد.

پاش چەند مانگێک جەلال تاڵەبانی کە بۆ بەشداری ڤیستیڤاڵی لاوانی جیهانی (١٩٥٥) چوو بوو بە وارشۆ، بە مۆسکۆدا ڕەت بوو لەوێندەر پەیوەندی بە بارزانییەوە کرد، ئەمە یەکەمین پەیوەندی بارزانی بوو لەگەڵ بزووتنەوەی کوردی عێراقدا لە دوای ساڵی ١٩٤٧وە.

بارزانی کەبە دەرکردنی شێخ لەتیفی شێخ مەحمودی، لە حیزبی دیموکراتی کوردستان زانی، بەتاڵەبانی گوت کەدەبێ پەیوەندی حیزب دەگەڵ ئەو جێگری سەرۆکەی کە بە خۆی لە ساڵی ١٩٤٦ دا دانابوو، تازە بکاتەوە و لەسەری ڕۆیی «ئێوە دەبێ پەیوەندی بەربڵاوتان دەگەڵ خەڵکی دا هەبێ، حیزب نابێ ڕێکخراوێکی تەنگ و دەرگا داخراوبێ»!

جەلال تاڵەبانی بە بۆنەی ڤیستیڤاڵی جیهانیی لاوانەوە لە ساڵی ١٩٥٧ دا جارێکی دی بۆ مۆسکۆ هات. ئەمە دووەمین ودوا پەیوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان بوو بە «سەرۆکی» خۆیەوە لە وەتای چوو بووە یەکێتی سۆڤیەت، لەو زەمانەدا هەموو لەوە ئومێدبڕ بوو بوون کە ڕۆژێ بێت جارێکی دی بارزانی لەعێراقدا ببیننەوە.

## بونیاتنانەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق

پاش تەنگانەو زەبرو زەنگ وگوشاری سالانی ١٩٤٧و ١٩٤٨و ١٩٤٩ حیزبی دیوکراتی کوردستانی عێراق بە کردەوە بێ ڕێبەر بوو، لە ئەیلولی ١٩٥٠ ژمارەیەک لەو کادرانەی کە هێشتا ئازاد بوون هەوڵێکیان بۆ تازەکردنەوەی ڕێکخستنی حیزب دا کە کۆنگرەی دووەمی حیزبی دیوکراتی کوردستانی عێراقی لێکەوتەوە (ئازاری ١٩٥١)

یەکێک لە کارە باشەکانی ئەم کۆنگرەیە سارێژکردنەوەی کۆنە زامان بوو[١٣] و یەکێکی دیکەش ئەوە بوو بە کودەتایەکی نێوخۆ حەمزە عەبدوللا لابرا‌و برایم ئەحمەد بەرز کرایەوە ریوو بە سکرتێری گشتی حیزب، برایم ئەحمەد دوو مانگان بەر لەکۆنگرە لە زیندان هاتبووە دەرێ.

سێیەمین کۆنگرەی حیزبی دیوکراتی کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٥٣ دا لە کەرکوک ساز دەکرێ، نوێنەراتی کۆنگرە بە دانانی ئیبراهیم ئەحمەد وەکو سکرتێری گشتی حیزب قایل دەبن و بەرنامەیەک پەسند دەکەن کە لەرادەبەدەو حیزب بەلای چەپدا دەبات، بەبۆچوونی هەندێک تەنانەت چەپتر لە حیزبی کومونیستش.[١٤] حیزبی دیوکراتی کوردستانی عێراق کە خۆی بە حیزبێکی مارکسی - لینینی دا دەنا، را بۆ خەباتی چەکداری دەدات و داوای حکومەت بۆ کوردستان لە چوارچێوەی ولاتێکی فیدرالی دا دەکات، لێ حیزب خەباتی چەکداری دژی کۆنەپەرستی و دژی ئیمپریالیستی لە ریزی پێشەوە دادەنێ.

نوری شاوەیس کەلە سەرانی حیزبی دیوکراتی کوردستانی عێراق بوو[١٥] لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ: «بریارمان دا بوو بەرژەوەندیێ نەتەوەیی فیدای بەرژەوەندییەکانی کۆمار بکەین، بۆ ئێمە جگە لە ئیمپریالیستان و سوسیالیستان چ شتێکی دی نەبوو، ئەوانەی کە لەو بەینەدا بوون خزمەتی بەرژەوەندی ئیمپریالیستیان دەکرد.»

بەلام ناکۆکی و ناتەبایی بۆچونەکانی ئیبراهیم ئەحمەد و حەمزە عەبدوللا هەر زوو تازە دەبنەوە و سەر هەڵدەدەنەوە لە ساڵی ١٩٥٥ دا حیزب دەبێ بە دوو بەشەوە، حیزبی دیوکرات بە مانای تایبەتی لە ژێر دەسەلاتی برایم ئەحمەد و «بەرەی پێشکەوتنخواز» بە ڕێبەری حەمزە عەبدوللا.

حیزبی دیوکراتی کوردستانی عێراق لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە لە ١٩٤٦ تاکو ئەو

نەیتوانیوە لەم دووڕیانە دەرباز بێ، ئایا دەبێ ئەولەوییەت بەمەسەلەی نەتەوەیی بدات یان بە مەسەلەی کۆمەڵایەتی؟ حیزب کە بەردەوام لەبەر هەڕەشەی داردەستانی حکومەتی دایە. لەم حالەدا دەبێ لە هەمبەر حیزبی کۆمونیستیش دا بەرگری لە خۆی بکات، چونکە لە ژێر دەسەلاتی مارکسیەکاندایە یان لە ژێر دەسەلاتی کەسانی مارکسی مەیلدایە، نازانێ چ شتێک ئەو لە حیزبی کۆمونیستی عێراق جیا دەکاتەوە.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق تا دوای دەسالیش لە دامەزراندنی هەرگیز ئایدولۆژ... ی تایبەتی نەبووە، لە ساڵی ١٩٥٥ دا ناسیونالیستان و پێشکەوتنخوازانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەیانەوێ دادوەرییەک لەمەڕ«هەق بوون یان هەق نەبوون» ئەوان بکەن و حیزبی ئێویراو «بەشێوەی سلێمان پێغەمبەر» حوکمێکی ئاقلانە لەم رووەوە دەدات، هەر دوو مەسەلەی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی دەبێ پێکەو حەل بکرێن ودەبێ هەر دووک رێکخستن یەک بگرن.

هەر لە هەمان قۆناغ دا یەکێک لەم دوو رێکخراوە پێشنیازی کۆبوونەوەیەکی هاوبەش لە نوێنەری حیزبێن کوردی عێراق وئێران و تورکیا دەکات، سی ساڵان دوای ئەوە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و عێراق سەرلەنوێ کار بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی لەو بابەتە دەکەن، کە سەرەنجام وەلا دەنرێ.

لە ساڵی ١٩٥٦دا هەر دوو باڵی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق سەرلە نوێ یەک دەگرنەوە و (حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان) پێک دەهێنن کە هەمزە عەبدوڵلا دەبێت بە سکرتێری گشتی و رۆژنامەیەک بە ناوی خەباتی کوردستان دەردەکات.

## ٧

## حیزبی کومونیستی عێراق و مەسەلەی کورد

حیزبی کومونیستی عێراق لە ئەیلولی ساڵی ١٩٥٦ داو لە دووەمین کۆنفرانسی خۆی دا سەرەنجام لەمەڕ مەسەلەی بنەڕەتی، واتا مەسەلەی کورد، لە قەواڵە نامەیەکی تیرو تەسەل دا هەڵوێستی خۆی روون دەکاتەوە و هەنگاوی زۆر گرنگ سەبارەت بە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد دەنێت.

لەم قەواڵە نامەیەدا حیزبی کۆمۆنیستی عێراق ئەم خاڵە دووپات دەکاتەوە کە «شوێنە عەرەب نشینەکانی عێراق، بەشێکی لە جیا بوونەوە نەهاتوون لە خاکی عەرەبی» بەڵام لە نێو ئەم سنوورانەی ئێستای وڵاتی عێراق دا کە ئیمپریالیزم دروستیکردون، بەشێک لە

خاکی کوردستانیش هەیە، هەنگێ لەسەری دەڕوات.

**گەلی کوردی عێراق بەشێکن لە نەتەوەی کورد، کە حاڵی حازر لە نێوان تورکیا و ئێران و عـێـراق دا دابەش بوون، نەتەوەی کـورد هەریەک نەتەوەیە، ئەم نەتەوەیە لە ڕاستـیـدا هەموو بنەما و تایبەتمەندییەکـانی یەک نەتەوەی تێدایە، ئەم نەتەوەیە پێک هاتووە لە کۆمەڵە مرۆڤێک کە بەدرێژایی مێژوو و بەپێی پێداویستیەکانی مێژوو «پێک هاتووە و شێوەی خۆی وەرگرتووە» و وێڕای تەقسیم بەندی ئیمپریالیستی، لە خاکێکی هاوبەشدا دەژین. یەک زمانی هاوبەش و هەموو ئەو ڕەگەز و فاکتەرە پێویستانەیان تێدایە کە سوود لە ئابوری نەتەوەیی و گشتی وەربگرن و ئازادی نەتەوەییان هەبێ.»**

حیزبی کومونیستی عێراق پاشان دەڵێ: خەباتی هاوبەش و شان بەشانی نەتەوەی عەرەب «دەرفەت بۆ کوردیش دەرەخسێنێ کە ڕێ بۆ وەدیهاتنی مافێن کورد خۆشبکات و چارەنووسی خۆی بگرێتە دەستی خۆی و مـافی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەسەرانسەری کوردستاندا بەدەست بێنێ»[١٦]

بەڵام وێڕای ئەمەش هەڵوێستی حیزبی کومونیستی عێراق هەر هەندێک تەم مژاوی و ئاڵۆز بوو، حیزبی کۆمونیستی عێراق لە ڕاستیدا لەم قەواڵە نامەیەدا چەندین جار دوبارەی دەکاتەوە. «حاڵی حازر و لەم هەلومەرجەی ئێستادا تەنیا یەک ڕێگەمان لەپێشە: ڕێگەی خەباتی هاوبەش دەگەڵ جەماوەری گەلی عەرەب دا دژ بە ئیمپریالیزم و هاوپەیمانانی ئیمپریالیزم، ڕێگەی خەباتی هاوبەش لەپاڵ بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی عەرەبدا. بەمەبەستی ئازاد کردنی جەماوەرێن خەڵکی عێراق بە عەرەب و بە کوردەوە»

حیزبی کۆمونیستی عێراق بەم شێوەیە کۆتایی بە قسەکانی دێنێ: «حیزبمان بەتایبەتی لقی کوردستانمان- سوورە لەسەر داواکردنی هەموو مافێن گەلی کورد و چالاکانە کار بۆ وەدەست هێنانی ئەم مافانە دەکات. حیزبمان لەهەمان کاتدا دژی بیرێن جوداخوازانە دەوەستێ و ڕیسوا و مەحکومی دەکات چونکە تەبیعەتێکی ناسیونالیستانەو تەنگبینانەی هەیە»

ئەم قەواڵەنامەیە، یەکجار گرنگە، هەرگیز لەعێراقدا هیچ حیزبێک بەو ڕاشکاوی و **ڕوونی و بنچینەیە سەبارەت بە مەسەلەی کورد هەڵوێستگیری نەکردبوو بەم ڕاشکاوی و ڕوونییە ئیعترافی بەمافی کوردی عێراق نەکردبوو، کە وەکو نەتەوەیەک هەموو مەرجێن مێژوویی وئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری تێدایە کە بوونی نەتەوەیی ئەو بسەلمێنێ.**

بەڵام دووپاتکردنەوەی «خەباتی هاوبەش» و نەبوونی راشکاوی سەبارەت بە ئەرک و مەسئولیەتی هەر یەکێک لەم دوو حیزبە لەناستی ئەم خەباتە هاوبەشەدا، بەتایبەتی مەسەلەی لەقاودان و ریسواکردن و مەحکوم کردنی «ناسیونالیزمی تەنگبین» هەوێنی ئەو ناکۆکیانەیە کە ساڵانێکی دوورودرێژ ئەم دوو حیزبە لێکدی جیا ..کاتەوە.

## ٨

## حیزبی دیموکراتی کوردستان و (لقی کوردستانی) حیزبی کۆمۆنیستی عێراق

لە هەیڤی ١٩٥٧/٦ داو لە دوای زنجیرە پەیوەندییەک لەنێوان کارگێرانی حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق و بەرپرسانی کوردی« لقی کوردستانی» حیزبی کۆمونیستی عێراق دا، لقی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق بەمەبەستی دابینکردنی یەکێتی ئۆرگانی هێزێن دیموکراتی کوردستانی عێراق، بریاری خۆ هەڵوەشانەوە و یەکگرتن لەگەڵ حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق دا دەدات.[١٧]

کاردانەوەی حیزبی کومونیستی عێراق توندە، حیزبی کۆمونیست سەرزەنشتی حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق دەکات لەبەر ئەوەی کە «خۆی بە حزبێکی عێراقی نازانێ» وەکەوتە سەر رێگەی جوداخوازی» و تەنانەت بزووتنەوەیەکە «لە سایەی رژیمی ئەمەریکاییەکاندایە»! حیزبی دیموکراتی کوردستان بەوە تاوانبار دەکات کە «سەربەخۆیی درۆ، کە لە ئەنجامدا دەبێ لە چوارچێوەی دا خەبات دژی ئیمپریالیزم بکرێ بۆ وەدەست هێنانی ئازادی تەفزیل دەکات بەسەر ئازادی راستەقینەدا لە عێراقێکی ئازاد و سەربەخۆدا»[١٨]

حیزبی کومونیستی عێراق پاش هەنگێ «لقێکی » نوێ لە کوردستاندا دروست دەکات.

## ٩

## حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق بەر لە شۆڕشی ١٩٥٨

لە ساڵی ١٩٥٨ دا پاش ئەوەی سوریا و میسر یەکێتیان کرد و کۆماری یەکگرتووی عەرەبی هاتە ئاراوە، سەران ورێبەرانی کورد بە ئەما بوون دژی رژێمی شانشینی عێراق دەست بە شۆڕش بکەن.ئیدی بۆ وەی هاوکاری ناسر وەدەست بێنن پەیوەندی پێوە دەکەن و رێگەیان دەدات هەندێ بەرنامان بە زمانی کوردی لە رادیۆ قاهیرەوە بلاو بکەنەوە.

لە ناوەڕاستی هەیڤی ئایاری ساڵی ١٩٥٨ دا حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان

نزیکەی پێنج سەد چەکداری هەبوو کە ئامادەی شەڕی پارتیزانی بوون لە کوردستاندا، کارگێڕانی حیزب لێدەبڕێن بۆ دیاری کردنی ڕۆژی دەست پێکردنی شۆڕش لە ۱۹۵۸/۷/۱٦ داو لە کەرکوک کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی بکەن.

بەڵام لە ۱۹۵۸/۷/۱٤ دا قاسم، ڕژێمی پاشایەتی دەڕوخێنێ، «قاسم نیوەی کارەکەی ئێمەی ئەنجام دابوو، بۆیە لە کۆبوونەوەکەی کەرکوکی خۆماندا بڕیارماندا کە پشتیوانی لێبکەین، و شاندێکمان بۆ دەف وی نارد.»[۱۹]

### سەرچاوەو پەراوێزان

۱. هەمزە عەبدوڵلا هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، بەغدا ۱۹۷۳.
۲. نوری شاوەیس، هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، ناوپردان، شوباتی ۱۹۷۵.
۳. ئیبراهیم ئەحمەد، هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، ناوپردان، ۱۹۷۳/۱۰.
٤. هەمان سەرچاوە.
٥. هەمزە عەبدوڵلا، هەمان سەرچاوە
٦. نوری شاوەیس، هەمان سەرچاوە
۷. هەمان سەرچاوە.
۸. هەمزە عەبدوڵلا هەمان سەرچاوە.
۹. و. لاکر، کومونیزم وناسیونالیزم لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین دا. ل ۱۹۲.
۱۰. ئیبراهیم ئەحمەد، هەمان سەرچاوە.
۱۱. نیویورک تایز ۱۹۵۰/٤/۳
۱۲. بڵاوکراوەی بنکەی تەحقیقاتی کوردی، ژمارە ۱۹۵۰/۱۰
۱۳. نوری شاوەیس، هەمان سەرچاوە.
۱٤. هەمان سەرچاوە
۱٥. هەمان سەرچاوە
۱٦. ئەم وبەندەە لە دەقی بەڵگەنامەکەی حیزبی کومونیستی عێراقدا بە جۆرێکە لە ژمارە ۱/۳۰ی گۆڤاری لاوانی گەل دا دوای سێ ساڵ بڵاو بوەتەوە، بەڵام لە گوتارەکەی جەمال حەیدەری دا کە لەگۆڤاری عێراق بڵاو بووەتەوە، ئەم بەندە هەر لابراوە (۱۹۵۹/٦/٤). ئەم دەقە فەرەنسییەی کە لەم کتێبەدا بڵاو بوەتەوە لەژمارە ۱۰ی گۆڤاری ڕۆژهەڵات ۱۹۵۹ ل ۱٥۱ وەرگیراوە. ئەم دەقە جیاوازی هەیە لەو دەقە ئورقستانەی کەعیسمەت شەریف وانلی لە کتێبەکەی خۆیدا کوردستانی عێراق لەبەرپەڕین ۱٤٦ و۱٤۷ دا بڵاوی کردۆتەوە.

١٧. عیسمەت شەریف وانلی، هەمان سەرچاوە ل ١٦٦

١٨. هەمان سەرچاوە.

١٩. نوری شاوەیس، هەمان سەرچاوە.

**تێبینی: ئەم زانیاریانە لە ڕێزدار ساڵح مەحمود بارزانی وەرگیراون:**

[١] بارزانی هەمزە عەبدوللای بۆ عێراق ناردەوە تا تەکبیری دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان بکات، نەک زەمینە بۆ گەڕانەوەی بارزانی خۆشبکات.

# فەسلی پێنجەم

## لە شۆڕشی عێراقی ساڵی ١٩٥٨ وە تا شەڕی قاسم

### ١

### قۆناغی ئومێد

«ئێستە كۆماری عێراقە، ئەوڕۆ ڕۆژی سەركەوتن و شانازی ئەنگۆیە، دژمنی خواو ئاغاكەی كوژراون و لە كۆڵاتەكاندا كەوتوون» بێژەری ڕادیوی بەغدا كەلە سەعات حەوتی بەیانی ڕۆژی ١٩٥٨/٧/١٤ دا[1] بە دەنگی بەرز ئەم قسانە لە ڕادیۆی بەغداوە پەخش دەكاتەوە، چەند سەعاتێک پێش ڕەوتی ڕووداوەكان كەوتووە، «نوری سەعید» «دژمنی خوا» نۆكەری ئینگلیز و سیاسەتوانی بێزراوی عێراق، ئەگەر ئەڵێین بێزراوی ڕۆژهەڵات چەند سەعاتێک لەوە دواتر دەمرێ، واتا پاش عبدالالەی ئاغای و جێنشینی پاشایەتی، بەلام لە هەموو لایەكەوە هەق بە بێژەری ڕادیۆكەیە، ڕاست دەڵێ، بۆ كوردەكان ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی عێراق و مردنی ئەندامانی ماڵباتی هاشمی كە جگە لە ستەم و سەركوت و بەدبەختی شتێكی تریان بۆ وان نەهێناوە، «ڕۆژی سەركەوتن»ە زۆر هیوا و ئومێدیان لەلا دەبوژێتەوە.

بۆ سەبەبێ كەسایەتیەكی كورد، واتا شێخ خالید نەقشبەندی خەڵكی بامەرنی لەگەڵ دوو كەسایەتی عەرەب دا، یەک شیعە و یەک سونی، دەبن بە ئەندامی (مجلس السیادە: ئەنجومەنی سەروەری)

لە ١٩٥٨/٧/٢٠ دا، واتە یەک هەفتەی دوای ڕاگەیاندنی كۆمار، حكومەت فەرمانی عەفواتی گشتی دەردەكات و هەموو زیندانیان ونەفیكراوان دەگرێتەوە وشێخ ئەحمەد وشێخ لەتیف وگۆرانی شاعیر بەر عافواتەكە دەكەون و بەردەبن.

بەلام لەمە گرنگتر مادەی سێی دەستووری عێراقی ١٩٥٨/٧/٢٧ كە دەڵێ: «كۆمەڵی عێراق لەسەر بناغەی هاوكاری هەموو هاوولاتیان و لەسەر بناغەی ڕێزگرتنی ماف و ئازادی ئەوان ڕۆنراوە، عەرەب و كورد لەم ولاتەدا هاوبەش و شەریكن، دەستووری عێراقی مافی ئەتەوەیی وان لە چوارچێوەی ولاتی عێراقدا دابین دەكات»[2]

ئەم یەكسانییەی هەردوو شەریكی عەرەب و كوردە لە چوارچێوەی ولاتی عێراقدا، كە بۆ

یەکەمجار لە رۆژی دامەزراندنی ولاتی عێراق بەم لاوە باس کراوە. لە ناڕمی رەسمی کۆماریدا کە بریتیە لە خەنجەرێکی کوردی و شمشێرێکی عەرەبی وبە شێوەیەکی یەکتر بڕ دانراون، وەکو رەمزێک بەرجەستە دەبێت.

۲

## بوژانەوە و رەونەق پەیدا کردنی چاپەمەنیێن کوردی

یەکێک لە دەستکەوتە فەورییەکانی شۆڕش کە بۆ کوردان یەکجار بە بایەخە، ئازادی چاپەمەنییە، هەڵبەتە کوردەکان لەسایەی رژێمی پێشوش دا دەیانتوانی ژمارەیەک گۆڤار و رۆژنامە دەربکەن، بەلام ئەم بلاوکراوانە هەموو ئەدەبی و لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئەدەبی و چیرۆک و شیعران بوون، کەم و زۆر بە لای باسی رووداوە سیاسیە هاوچەرخەکاندا نەدەچوون.

هەتاو کە مانگانە بوو لەساڵی ١٩٥٣ وە لە سلێمانی دەردەچوو وەکو گەلاوێژ، کە دوای شۆڕش، هیوا جێی گرتەوە و ژین کە گۆڤارێکی دوو هەفتانە بوو.

پاش شۆڕش، کوردێن سلێمانی جگە لەمانە، پێشکەوتن و شەفەقیان بلاو دەکردەوە، لەکەرکوک دا گوڤاری بەیان ورۆژا نوێ بلاو دەبوونەوە، حیزبی دیوکراتی کوردستانی عێراق لە نیسانی ١٩٥٩ بەم لاوە رۆژنامەی خەبات دەردەکات.

لە قۆناغی پڕ جۆش وخرۆشی دوای روخانی رژێمی پاشایەتی، چاپەمەنییە کوردییەکان بە رێزەوە سەرکەوتنی هاوبەش بەسەر «رژێمی رەشی پاشایەتی و نۆکەرانی ئیمپریالیزم و کۆیلەیەتی و کۆنەپەرستی)دا باس و بەرجەستە دەکەن و رێزی «برایەتی کورد و عەرەب» دەگرن.

هەر لەم روانگەیەوە کە هیوا لە ژمارەی هەیڤی ١٩٥٨/١١ دا لە گوتارێک دا بەنێوی «برایەتی و دۆستایەتی گەلانی عێراق» بە زمانێک کە بۆنی برا گەورەیی لێدێت، باسی ئەو بەرپرسیارێتیانە دەکات کە گەلانی زۆرینەی وەکو کورد و عەرەب دەرهەق بە کەمینەی ئاشوری و تورکمان و ئەرمەنی لەسەریانە. پەیامی ئەم گوتارە روونە: کوردەکان خۆشحاڵن بەوەی کە پەیمانێکیان دەگەڵ هاوسێ عەرەبەکانیان بەستووە و بە پێی ئەم پەیمانە یەکسانن لە بەرێوەبردنی کاروباری عێراق.

«ناودرۆک» یا نەفسانەی- برایەتی عەرەب و کورد مایەی رێز و حورمەتە، ناوچە کوردنشینەکانی عێراق دەبن بە قەلایەک بۆ بەرگری کردن لە عێراق.»[٣]

٣

## ناكۆكییەكانی رژێمی تازە

بەلاّم رژێمی تازە لە حەقیقەتدا لە «ناكۆكی» بەدەر نەبوو. لە نێو «ئەفسەرانی ئازاد» دا كە شۆڕشەكەیان رێكخستبوو خەڵكانی زۆر جیاواز هەبوون، وەكو جەنەراڵ عەبدولكەریم قاسم، كە پۆستی سەرۆك وەزیر و وەزیری بەرگری بۆ خۆی وەرگرتبوو و سەرهەنگ عەبدولسەلام عارف، كەپۆستی یاریدەدەری سەرەك وەزیر و وەزیری ناوخۆی وەرگرتبوو. جگە لە كۆمونیستەكان هەر هەموو حیزبە جیاوازەكانی عێراق لە دەوڵەتی تازەدا نوێنەری خۆیان هەبوو، بەعس، سەربەخۆیی، حیزبی دیموكراتی نیشتمانی كامل چادرچی، و حیزبی دیموكراتی یەكگرتووی كوردستانی عێراق و

ماددەی دووەمی دەستووری كاتی دەیگوت كە (وڵاتی عێراق بەشێكە لە نەتەوەی عەرەب و جیا ناكرێتەوە)

«ئەفسەرانی ئازاد»هەر كە جڵەوی حوكم دەگرنە دەست و ئەو مەسەلەیە دێتە ئاراوە كە ئایا پێویستە عێراق بچێتە ناو «كۆماری یەكگرتووی عەرەبی»یەوە كە چەند هەیڤێك پێشتر، واتە لە شوباتی ١٩٥٨ بە یەكێتی میسر و سوریا چێبوو، یان نا؟! ئیدی جیاوازی بیرو بۆچوونیان كەوتە ناو.

عارفی هەوادار ولایەنگری ناسر دەگەڵ بەعسیەكاندا، بەگەرمی لایەنگری ئەم یەكێتییەبە، عارف لە ١٩٥٨/٧/١٩ دا واتە پێنج رۆژ دوای روخانی رژێمی پاشایەتی، لە دیمەشق دا و لە بەردەم هەزاران كەس دا، رایگەیاند بوو و بەڵێنی دا كە یەكێتی كۆمارانی یەكگرتووی عەرەبی و عێراق لە داهاتوویەكی نزیك دا رادەگەیەنرێ. هەڵبەتە بێ ئەوەی لەم رووەوە تەگبیرێكی بەناسر كردبێ كە دەڵێ «ئەم عارفەش مینازارۆكان رەفتار دەكات!»

عارف كە دەیویست قاسم بخاتە گێژەنێكی ئەو كارەوەكە كردبووی. لە ئابی ١٩٥٨ دا دەكەوێتە گەڕان بەسەرانسەری عێراقداو خوتبە لەدووی خوتبە دەدات و بە جۆرێ خۆی دەنوێنێ لە تۆ وایە پیاوی هەرە بەهێزی رژێم و ناسری كۆماری ئەوەرەیە و قاسم لە جەنەراڵ «نەجیب»ێك زیاتر نیە. (جەنەراڵ نەجیب، رێبەری كودەتای میسر دژی حكومەتی فاروق بوو.)

لە مانگەكانی داهاتوودا، كوردەكان دەیانەوێ سیاسەتی خۆیان دەگەڵ رەوتی خەباتی بە

دەست هێنانی دەسەڵات لە عێراقدا، بکوژێن: سەرەتا دەگەڵ کومونیستەکاندا پشتیوانی لە قاسم دەکەن، پاشان بەرلەوەی بەخۆیان لەگەڵ قاسم دا تێک بگیرێن، لایەنی قاسم دەگرن و دژی کومونیستەکان دەوەستن.

لە تابی ١٩٥٨ دا لە کوردستاندا جۆش و خرۆشێک بە دی دەکرێ، تەنانەت هەندێ جار باس، باسی شۆڕشە، دوای ئەو هەموو ئومێدەی لە ئەنجامی شۆڕشەوە لە دڵی کوردان چێدەبێ، هەوڵێن بانگەشەیی و عەرەبچیاتی عارف، کوردەکان نیگەران دەکات، کوردەکان لە خۆیان دەپرسن: «لە حاڵی سەرگرتنی ئەم یەکێتیەدا» لەناو ئەم دەریای سی و شەش ملیۆن عەرەبەدا، کە کوردەکان دەبنە قەترە لە دەریا، چی بەسەر کۆمەڵگەی شەریکایەتی هەردوو شەریکی کورد وعەرەب دێت؟

کوردەکان بە یەکێتی عێراق دەگەڵ کۆماری یەکگرتووی عەرەبی دا رازی نابن و لەم رووەوە هاورەئی حیزبی کۆمونیستی عێراقن. حیزبی کۆمونیستی عێراقیش کە لە لایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە، پشتیوانی لێدەکرێ بەم یەکێتیە، کە بە مانای سڕینەوەی ئەو دەبێت لە مەیدانی سیاسەتدا زۆر نارازییە.

بەڵام لە ناوەڕاستی ئەیلولی ١٩٥٨ دا هەڤرکی دەکەوێتە نێوان قاسم و عارف و قاسم سەردەکەوێت و عارف کە لە ١٩٥٨/٩/١٣ هەموو پلەو پایەیەکی یاریدەدەری فەرماندەیی سوپای عێراقی لێ دەسەنرێتەوە و لە ١٩٥٨/١٠/١ دەگیرێ و لە ١٩٥٨/١٠/١٣ دا دەکرێ بە سەفیر و بۆ بۆن دەنێردرێ.

قاسم کە بەعسیانی نەتەوەیی لە خۆ دوور خستونەتەوە، ئێستا دەبێ پشت بە کومونیستانو هاوپەیانە کوردەکانیان ببەستێ. رێک لەم سەروبەندەدا جەنەراڵ بارزانی لە یەکێتی سۆڤیەتەوە دەگەڕێتەوە.

## ٤
## گەڕانەوەی جەنەراڵ بارزانی لە تاراوگە

جەنەراڵ بارزانی هەرکە بەسەرنگونی دام و دەزگای رژێمی پاشایەتی دەزانێ، بۆ پراگ دەچێت، لەوێندەر دەگەڵ میرحاج و ئەسعەد خۆشەوی دا لە ئوتێلی حیزب لا دەدات، نزیکەی هەیڤەک لە پراگ دەمێنێتەوە، بە پێی گوتەی هەندەک ژێدەران، روسەکان کە نەیان ویستووە عەوامی خەڵک بەبوونی بارزانی لە یەکێتی سۆڤیەت بزانن، ناردیان بۆ چیکۆ سلوڤاکیا تا لەوێندەرەوە دەربارەی گەڕانەوەی خۆی دەگەڵ کاربەدەستان و

دەسەڵاتداران دا بکەوێتە گفتوگۆ، بارزانی بروسکەیەک بۆ قاسم دەنێرێ، و داوای لێدەکات کە رێی بدات بۆ عێراق بگەڕێتەوە.

عارف، زۆر دژی گەڕانەوەی بارزانی بوو، تەنانەت ئامۆژگاری قاسمی کرد کە لە وەڵامی بروسکەکەیدا تەنێ ئەوەندەی پێ بڵێ، «برۆ، برۆ» حیزبی یەکگرتووی دیموکراتی کوردستان لە سەرەتاکانی ئەیلولی ۱۹٥۸ دا شاندێکی تایبەت لە برایم ئەحمەد، نوری ئەحمەد تەها، سەدیق بارزانی (یەکێک لە کوڕانی شێخ بابۆ) و عوبیدوڵلا بارزانی (کوڕی مەلا مستەفا) بۆ دیداری بارزانی بۆ پراگ نارد.

سەرەنجام بەغدا رێگەی گەڕانەوەی بارزانی دەدات و بارزانی پاش هەڵوەستە و لادانێک لە میسر، کە لەو ماوەیەدا ناسر دەبینێ، لە ٦/ ۱۰/ ۱۹٥۸ بە فڕۆکە بۆ بەغدا دەگەڕێتەوە و وەکو سەرۆکی دەوڵەتێک لەلایەن جەماوەرێکی گەورەی بەجۆش و خرۆشەوە پێشوازی دەکرێ.

بارزانی چەند رۆژی هەوەڵی گەڕانەوەی لە ئوتێلی سەمیر ئەمیس بەسەر دەبات، و پاشان قاسم کۆشکی کوڕی نوری سەعیدی وێدەدا و لەوێندەر ئاکنجی دەبێت.

لە مانگی چواری ۱۹٥۹ دا کەشتییەکی ئەفەر هەڵگری سۆڤییەتی بە نێوی گروزیا، هەڤالانی بارزانی لە تاراوگە دێنێتەوە، ئەمانە بریتی بوون لە ٤٦۰ پیاو ۱۸۰ ژنی سۆڤییەتی نەژاد، بەتایبەتی قەرغیزی و ۲۲٥ منداڵ.[۸]

## ٥

## بارزانی کێ بوو؟

بارزانی پاش یازدە ساڵان دەربەدەری وەکو قارەمانێکی نیمچە ئەفسانەیی کەلەگەڵ ئینگلیزان و دوو رژێمی پاشایەتی عێراق و ئێراندا جەنگیوە، دێتەوە بۆعێراق.

بەڵام جەنەراڵ بارزانی وێڕای مانەوەی دوورودرێژی لە یەکێتی سۆڤییەت هەر وەکو «رۆژهەڵاتییەکی» بە تونێکڵ دەمێنێتەوە و رێگە لە هەمو شیکردنەوەیەک دەبەستێتەوە.

جەنەراڵ بارزانی کەمێک پاش گەڕانەوەی بۆ عێراق، چوو بۆ بارزان بۆ دیداری شێخ ئەحمەد، ئەمە یەکەمین دیداریان بوو پاش یازدە ساڵان لە روخانی کۆماری مەهاباد و هێوە. پاش ئەوەی کە یەکدیبیان لە ئامێز گرت شێخ ئەحمەد گوتی: لەمێژە رۆیشتوویت، ئا؟ پاش بێدەنگییەکی ۲۰ دەقیقەیی شێخ ئەحمەد لێی پرسی:« لە سۆڤییەت بەراز راو دەکەن؟» [۱]

لە ناستی سیاسیدا زەحمەتە بزانرێ کە بارزانی لە کوێ بووە.

ئەوکەسانەش کە لە پراگ دیتبوویان، مات و سەرسامبوون، دیار بوو کە بارزانی (لە سۆڤیەت) مارکسیزمی خوێندبوو و موتالای کردبوو، کەسێکی «پێشکەوتنخواز» بوو. لە قسەو باسی دەگەڵ دۆستانی کوردیدا وشەو زاراوەی «بێگانە» سەر بە مارکسیزمی بەکار دێنا، بەڵام دیار نەبوو، کە توانیبێتی ئەو وانانەی کە لە دوا ساڵانی مانەوەی لە سۆڤیەت دا خوێندبوونی هەرسی کردبن. نوری ئەحمەد تەها کە بۆ دیداری وی چوو بووە بەغدا بە سەرعبەتەوە دەیگوت: «بارزانی مارکسیزم بە روسی باش دەزانێ، بەڵام نازانێ کە چۆن بە کوردی یان عەرەبی بەکاری بێنێ!»[9]

پێدەچێت بارزانی بە خۆی روونیمنیەکی ئەوتۆی لە سەر ئەو شتە نەبووبێ کە دەبوا بیکات. باسی «مافێن کوردی» دەکرد، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی. گومانی تێدا نیە کە بارزانی پەیوەندییەکی زۆر نزیکی دەگەڵ سۆڤییەتەکاندا هەبوو. بارزانی هەر لەسەرەتاوە لایەنگری قاسم و نەیاری عارف بوو، ئەمەش بێگومان بە قسەی سۆڤیەتەکان بوو و دەستی ئەوانیشی لە پشت بوو.

بەڵام بە چ مەبەستێک؟ ئەم خاڵە ئەوەندە روون نییە.

لەم قۆناغەدا واتە لەقۆناغی پاش گەڕانەوەی بۆ عێراق، پەیوەندی بارزانی دەگەڵ سۆڤیەتەکان و کۆمونیستەکان و هەمزە عەبدوڵلا دا زۆر نزیک دەبێت.: هەمزە عەبدوڵلا دەبیرخانەکەی بەڕێوە دەبات، جا لەم قۆناغەدا حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق لە ۱۰/۱۱/۱۹۵۸ دا بەمەبەستی گوشار بۆ ئەوەی لە دەستووری دایمدا شەریکایەتی کورد و عەرەب وەکو بەو جۆرەی لەماددەی سێی دەستووری کاتی دا هاتووە، تۆمار بکرێ. پەیمان لەگەڵ حیزبی کۆمونیستی عێراقدا دەبەستێ.[10]

## ٦

## پێشنیازی بارزانی سەبارەت بە کۆنگرەی سەرانسەری کوردستان.

دیسان هەر لەم قۆناغەدا واتە لە ئاخرونوخری هەیڤی ۱۱/۱۹۵۸ لە کۆبوونەوەیەک دا بە ئامادەبوونی هەمزە عەبدوڵلا و برایم ئەحمەد و نوێنەرێن حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بارزانی پێشنیازی ئەوە دەکات کە یەک حیزب بۆ سەرتاسەری کوردستان دابمەزرێنێ، دەڵێ «بەلای منەوە سنوور نییە» و بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەی خۆی بە یەکێک لەو ئێرانیانەی کە لە کۆبوونەوەکەدا دەبن دەڵێ کە ببێ بە سکرتێری گشتی ئەو

حیزبە تازەیە.

کە ئێرانی ئێوبراو دەڵێ « من ئێرانیم» بارزانی لە وەڵامدا دەڵێ: «تۆ کوردیت!»

بەڵام کوردە ئێرانییەکان خۆ لەم کارەی دوور دەگرن، بارزانی کە دەبینێ کۆمونیستەکانی عێراق و سۆڤیەتەکان و کوردەکانی ئێران دژی ئەم بەرنامەیەن کەخۆ بە خۆ ئەو دەکات بە رێبەری سەرتاسەری کوردستان، چاوپۆشی لە ئەنجامدانی بەرنامەکە دەکات. لە روانگەی هەڤرکانەوە، لایەنگرانی بارزانی لە ئەندازە بەدەر راست رەون و بەرنامەیەکی روون و دیاریان نییە.

دوای چەند هەفتەیەک، واتە لە ئاخرو ئوخری ساڵی ۱۹۵۸ دا دەوڵەتی تورکیا کوردێکی تورکیا کە بە کرێگیراوی حکومەتی تورکیا دەبێت، دەنێرێتە نک بارزانی و داوای چەک و پارەی لێدەکات، بەڵام بارزانی ئەم تەڵەیە پوچەڵ دەکاتەوە وپێی دەڵێ: «برۆ لە ئەمریکاییەکان، یان لەرووسەکان وەربگرە»[11]

لەسەرەتای ساڵی ۱۹۵۹ دا بارزانی پ :سەلات و نیحتریارێکەوە کە لە ئەنجامی هاوکاری و پشتیوانی یەکێتی سۆڤیەتەوە بە دەستی هێنا بوو، لە کاتێک دا کەبرایم ئەحمەدی ترۆ کربوو، دەگەڵ هەمزە عەبدوڵلا، خەسرەو تۆفیق، نوری شاویس، نەژاد عەزیز و حەمید عوسماندا کە هەموو (چەپ رەو بوون) حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان بەرێوە دەبات.[12]

جەنەراڵ بارزانی وێرای ئەو تایبەتمەندیانەی کە کەسانێکی بەگلەیی دەیاندایە پاڵ ئەسلی خێلەکیانەی ئەو، ئێستا بێ چەند و چوون لە کەسایەتیە «پێشکەوتنخوازەکانی» بەغدایە و بەڵگەی ئەم «پێشکەوتنخوازی»یەش ئەوەیە کە لە کودەتای موسڵ دا بە یارمەتی جەنگاوەرانی کورد رژێمی قاسم لە کەوتن دەرباز دەکات.

## ۷

## کودەتای موسڵ (۱۹۵۹/۳/۸)

لە شوباتی ۱۹۵۹دا، قاسم کابینەکەی تازە دەکاتەوە و نوێنەوانی راسترەوی عێراق، واتە لایەنگرانی یەکێتی دەگەڵ کۆماری یەکگرتووی عەرەبی لە کابینەکە وەدەرنابوو.

پاشان حەڵکی بۆیان دەردەکەوێ کە سەرهەنگ عارف لە ۱۹۵۹/۱۱/۵ لەپاش کەشفی پیلانێک، لەلایەن دادگایەکی نهێنیەوە دادگایەکی کراوە و حوکمی مەرگی دراوە.[13]

لایەنگرانی ناســـری هەر زوو کـــاردانەوە پیـــشـــان دەدەن، رۆژی ۱۹۵۹/۳/۷ خۆپیشاندانێک لە شەقامەکانی موسڵ ی دووەمین گەورەشاری وڵاتی دراوسێی سوریا، بەرپا دەبێت.

لە بەیانی رۆژی ۱۹۵۹/۳/۸ دا عەقید عەبدولوەهاب شەوافی فەرماندەی لەشکری پێنجەمی عێراق لە موسڵ، لە رادیۆی موسڵەوە بەیانێکی توند دەخوێنێتەوە وخۆی بەوەوە با دەدات کە «عێراقی لەشەڕی داروودەستەی قاسم نەجات دا» شەواف هەر هەموو ئەو کەسـایە ، چەپانەی گـرت کـە بۆ بەشـداری لە کـۆنگرەی «لایەنگرانی ئاشتی» (۵-۱۹۵۹/۳/۷) هاتبوونە مـوسڵ و ئالای کۆماری یەکگرتووی عەرەبی لە سەر بینایەی پارێزگادا هەڵواسی و عەرەبی بەدووی (شەمەر) لە دەوروبەری شارەوە دێنە هاوکاری و یارمەتی.

بەڵام حکومەت هەرزوو باروودۆخەکە کۆنتـرۆڵ دەکات، لەو شـەش فـرۆکـەیەی کـە پەیوەندییان بە کودەتاچییەکانەوە کردبوو تەنێ دوانیان بۆ بەغدا دەچنەوە، حالبۆکی هێزی فرۆکەوانی سەر بە دەوڵەت بارەگای عەقید شەواف بۆردومان دەکەن و شەمەرەکان بڵاوەی لێدەکەن.

ئەمـە جگە لەوەی عـەقـید شـەواف ئەویارمـەتی و پشـتیـوانییـەی پێ نەگـەیی کـە چاوەڕوانی بوو، سـەرتیپ تەبەق چەلی فـەرمـاندەی لەشکری دووەم لە کـەرکـوک بە پێچەوانەی چاوەڕوانی کودەتاچییەکانەوە، لە بری پەیوەندی بە کودەتاچییەکانەوە بکات بروسکەی پشتیوانی بۆ حکومەت دەنێرێ.

بارزانـی بێ سێ و دوو پەیوەنـدی بە قـــاسم ەوە دەکـــات و بەیـانی رۆژی ۳/۹ جەنگاوەرانی کوردی هەڤبەندی (هێزێن بەرگری میللی) ئەمە دام و دەزگایەک بو کە دوای کەشف بوونی پیلانی ۱۹۵۹/۱۱/٤ بە یەک رۆژ دامەزرابوو- دەچنە مـوسـڵەوە و ئەم دەرفەت و دەڵیڤەیە بۆ خۆ دەقۆزنەوە تا تۆڵەی خۆیان لەو مۆڵکدارە فیودالانە بکەنەوە کە پشـتیـوانیـان لە هەڵگەڕانەوەکەی شـەواف کردووە و هەروەها تۆڵە لەعەشایەری عەرەبی شەمەریش دەکەنەوە.

کودەتاکەی شەواف، بەکوژرانی رێبەرەکەی کە بریندار بوو لە خەستەخانە کەوتبوو، پوچەڵ دەبێتەوە. موسڵ بۆ ماوەی ٤٨ سەعات لەدەستی جەنگاوەرانی کورد دا دەبێت، کە بێ بەزەییانە سەرتاسەری شار گەڕەک بە گەڕەک بە زەبری تفەنگی ئۆتۆماتیکی و چەقۆ لە

گومان لێکراوان پاک دەکەنەوە. کوردەتاچییان کە شەڕی ماڵ بەماڵ دەکەن، لە کاتێک دا ژمارەیان بۆ ٤٠٠ کەسێک کەم بووەتەوە. سەرەنجام لە مزگەوتێک دا دەکەونە داوەو لەوێندەر و لەماوەیەکی کەمدا هەر هەموویان دەکوژرێن.(١٤)

لە هەمان کاتدا لە سەرانسەری دەڤەری موسڵ دا جۆرە «شۆڕشێکی جوتیاری» روو دەدات، دێهاتییانی کورد بە گژ گەورە موڵکداران دا دەچن و ماڵەکانیان دەسوتێنن و لەم بابەتە کارانە.

دەوری گرنگی کوردەکان لەسەرکوتکردنی کودەتای موسڵ، لەنێو خودی شارەکەدا کە خەسرەو تۆفیق رێبەری رێکخستنی حیزبی دیوکراتی یەکگرتووی کوردستانی لەوێندەر دەکرد و هەروەها لە دەرێی شاردا کە رێگەی پاشەکشەی شەمەرەکانیان بۆ سوریا گرتبوو، هەموو ئەم کارانە شایانی ئەوە بوون کە بیسەلمێنن کوردەکان پارێزەو و پشتیوانی قاسم بوون.

بە هەر حاڵ لەم رووداوەوە ئیدی (بلۆکی قاسم- حیزبی کومونیست- حیزبی دیوکراتی کوردستانی عێراق) پتەو دەبێت، خۆلاسە لەم قۆناغەدا بەینی قاسم و حیزبی دیوکراتی یەکگرتووی عێراق بە رادەیەک خۆش دەبێت کە مۆڵەتی حیزب دەدات لە ١٩٥٩/٤/٤ رۆژنامەیەکی دووەم بە نێوی خەبات دەربکات.

## ٨

## نەورۆزی ساڵی ١٩٥٩

پانزدە رۆژ پاش سەرکوتکردنی کودەتای موسڵ، کوردەکان لە سلێمانی دا ئاهەنگێکی یەکجار گەورە و شکۆدار بە بۆنەی نەورۆزەوە دەگێڕن.

شار بە وێنەی گەورەی جەنەراڵ قاسم و بارزانی و «قارەمانانی نەتەوەیی» وەک شێخ سەعید و شێخ مەحمود دەرازێننەوە.

کوردەکان رێپێوانێکی هەزاران کەسی گەورە بە هاوبەشی رێکخراوی لاوان و جوتیاران و یەکێتی کرێکاران، ساز دەکەن.

لەم کۆبوونەوانەدا، رێبەرانی حیزبەکان، وتاری گەرم و گوڕ و پڕ جۆش وخرۆشیان لە مەڕ ستایشی جەنەراڵ قاسم و کۆماری عێراق و یەکێتی کورد وعەرەب خوێندەوە و سڵاو و دورودیان بۆ نەتەوەی کوردی «هێشتا بن دەست و زوڵملێکراو نارد.»

ئەم ئاهەنگە گەورەیە بە نمایشی، نمایشنامەی ئەفسانەی ئێرانی، شوێنی کاوەی ئاسنگەر دژی زوحاک کۆتایی هات، ئەم نمایشنامەیە لەسەر کەژاوەی گەڕۆک نمایش کرا، لەم نمایشنامەیەدا ئاوە نیشانەی کورد و زوحاک نیشانەی ئیمپریالیزمی ئینگلیز و ئەمەریکا و «دەرەگەز پەرستی» ناسری بوو.!

## ٩

## بەیاننامەی حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق (١٩٥٩/٥)

حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق، لە ئاخرو ئۆخری بەهاری ١٩٥٩ دا، بە ڕێبەری بارزانی و بە مودیریەتی هەمزە عەبدوللا ئەوەندە لە وەرگرتنی تێزی ئەنتەرناسیونالیستی و ڕێبازی شیتەلکاریانەی حیزبی کۆمونیستی عێراق نزیک بوو بووەوە کە هەرگیز جارێکی دی ناگاتە ئەو نزیکییە، هەڵبەتە ئەو بەیاننامەیەی کە لەلایەن خودی حیزبەوە بلاو بوەوە بەڵگەی تەواوی ئەم کارەیە.

« حیزبی ئێمە هەمیشە حیزبی خەباتی هاوبەش دژی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و فیودالیزم بووە و دەبێت، حیزبمان بەرگری لە بەرژەوەندی خەڵکی عێراق، بەهەموو کەمە نەتەوەییەکانییەوە و بەرگری لە بەرژەوەندی چینێن ئەنتی ئیمپریالیست و ئەنتی فیودالیزم کردووە و دەکات.

«حیزبمان لە چوارچێوەی کوردستانی عێراق دا، لە پێناوی دابینکردنی مافی نەتەوەیی و مکوم کرنی یەکێتی دەنێو کورد و عەرەب کە دەست لە نێو دەست بەرەو بەدیهێنانی ئامانجە دیموکراتییەکان و پتەوکردنی کۆمار و بوژانەوەی ئابوری و کۆمەلایەتی کۆمار کار دەکات و پەیوەندێن عەرەب و کوردێن عێراق لەسەر بناغەی ئامانج و چارەنووسی ئەم دوو میللەتە و برایەتی ڕاستگۆیانە و یەکێتی ئازادانە لە پێناوی موکوم کردنی سەربەخۆیی و پشتیوانی دیموکراسییەت ڕۆنراوە.

جالەم روانگانەوە حیزبمان دژمنانی عەرەب و دژمنانی ئازادی و یەکێتی عەرەب، بە دژمنانی میللەتی کورد و ناسیونالیزمی کورد و دژمنانی خۆی دەزانێ.

«بیر تەسکانی ناسیونالیستی گۆشەگیری نێو کوردان، دژمنانی حیزبی ئێمەن، کۆنەپەرستانی ئەنتی دیموکراتی کورد، خراپترین دژمنانی خەڵکی کورد و حیزبی ئێمەن.» (١٥)

ئێستا کوردەکان سەبارەت بە مافێن نەتەوەیی خۆیان زۆر بە پارێزەوە قسە دەکەن،

خەبات، رۆژنامە رەسمییە تازەکەی حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان لە یەکەمین ژمارەی خۆیدا تەنێ داوای «مافی ئیداری و رۆشنبیری بۆ کوردستان» دەکات و لەو بازنەیە دەرناچێت.(١٦)

بەلام پچرانی پەیوەندی بارزانی وکۆمونیستەکان، زۆر دوور نییە، ئەم پەیوەندی پچرانە لە زەمانی یاخی بوونی فیودالە کوردەکانی ناوچەی رەواندز و لە هەلومەرجێکی زۆر نالۆز و تەم و مژاویدا روو دەدات.

## ١٠

## هەستانی فیودالە کوردەکانی ناوچەی رەواندز
## ١٩٥٥/٥ (دەبێ سالی ١٩٥٨ بێ)!

چەند هەفتەیەک دوای هەراو کودەتاکەی موسل، سەرانی کوردی ناوچەی رەواندزیش لەلای خۆیانەوە لە هەلومەرجێکی تا رادەیەک نالۆزدا دەهاروژێن و هەلدەستن: تاکو ئەمرۆکەش هۆکاری ئەم شۆرش و هەستانەی، کە شێخ رەشیدی لۆلان و زاواکەی مەحمود خەلیفە و مەحمود ئاغای زیباری و داود بەگی جاف، یانی دژمنانی تەقلیدی بارزانی لە دەوری یەک خڕ کردەوە، بە تەواوەتی نەزانراوە، لەم شۆرشەدا شێخ محەمەد سەدیقی کوڕی سەید تەهاش بەشداری کرد کە جاران بەینی دەگەل بارزانی دا باش بوو.

دوور نییە سەرانی کورد، کە پێشتر بەهۆی یاسای ریفۆرمی کشتوکالی ٣٠/ئەیلولی ١٩٥٨ لە دەولەت رەنجا بوون، تێگەرانی ئەوە بووبن کە کوردستان بەرە بەرە بەرەو ئەوە دەچوو کە بکەوێتە دەست نیمچە سوپاییانی کۆمونیست (هێزێن بەرگری میللی)، کە ماوەیەک لەوبوبەر لەرووداوەکانی موسل دا بەدرەفتاریان دەگەل ژمارەیەک لە گەورە مولکداران دا کرد.

ئەم شۆرشە «ئاژاوە» بە زوویی لەلایەن سوپای عێراق و بە بەشداری پارتیزانانی«یەکێتی جوتیاران» ولایەنگرانی بارزانی سەرکوتکراو، زۆربەی سەرانی شۆرش و چەکدارەکانیان بۆ تورکیا و ئێران هەلاتن، (چوار هەزار بۆ تورکیا ودوو هەزار بۆ ئێران) هەلاتن.

لەم سەروبەندەدا بەینی بارزانی و کۆمونیستەکان تێک دەچێت: بارزانی کە لە کوردستان دێتەوە دەلێ « کۆمونیستەکان دەیانویست بمکوژن!» ئایا بەراستی هەولی کوشتنی درابوو؟ یان بارزانی لەو رەفتارەی چەکدارانی کۆمونیست تورە بوو بوو کە لە دیهاتییانی کوردیان دەپرسی: «کوردیت یان کۆمونیست» ئەمە یەکێکە لە رووداوە نهێنی

ئامێزەکانی ژیانی بارزانی، کە کوردەکان لە خەمی روونکردنەوەیدا نین و باسی ناکەن.

بەلام دوای ماوەیەکی کەم لەوە بە دواوە بارزانی لە هەمزە عەبدوللا کە بەرگری لە کۆمۆنیستەکان دەکرد، توڕە بوو.

دوور نییە کە بارزانی لەو دەسەلاتە گەورەیەی کە هەمزە عەبدوللا لە ناو «ولقی کوردستانی» حیزبی کۆمونیستی عێراق پەیدای کردبوو، ترسا بێت، چونکە ئەم دەسەلاتە بە رادەیەک بوو کە « کادرانی حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان» ناچار بوون بە شێوەی نیمچە نهێنی بژین! لە سلێمانی و هەولێر و کەرکوک جەماوەری خەلکی، سەر بە حیزبی کۆمونیست بوون و پەیڕەوی رێنوێنیەکانی حیزبی کۆمونیستیان دەکرد.[١٧]

کۆنگرەی چوارەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق (جارێکی دی حیزبی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق، ناوی خۆی گۆڕی و بوو بە حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق) لەم سەروبەندو لەم هەلومەرجەدا کە نووسەرانی کورد باسی ناکەن، کرا، گرووپی هەمزە عەبدوللا بە زەبری هێز لادەبرێن وگرووپی نێردراوی بارزانی شوێنی دەگرێتەوە، برایم ئەحمەد سەر لەنوێ دەبێتەوە بە سکرتێری گشتی، و لە ناو مەکتەبی سیاسیشدا لەلایەن جەلال تالەبانیەوە کە « گورگی گەنجی رادیکالی» حیزبە، پشتیوانی لێدەکرێ وپاشان دەبێت بە زاوای برایم ئەحمەد، هەروەها عومەر مستەفا و نوری شاوەیس و عەلی عەبدوللا کە بێ چەند و چۆن گوێڕایەلی بارزانین.[١٨]

پاش ئەم رووداوە، هەندێ کەسی سەر بە بالی چەپی حیزبی دیموکراتی کوردستان، لە حیزب جیا دەبنەوە، دکتور مەحمود عوسمان یەکێک دەبێت لەوانە، بەلام لە سالی ١٩٦٢ دەگەڕێتەوە ناو حیزب و دەبێــت بە «گوێڕایەل» و هاوکاری نزیکی بارزانی.[١٩]

## ١١
## تێکچوونی بەینی بارزانی و قاسم

جەنەرال قاسم، سەرەنجام و لە ١٩٦٠/١/٦دا مۆلەتی کارکردنی یاسایی بە سێ حیزبیان دەدات، حیزبی دیموکراتی نیشتمانی، حیزبی تازەی دیموکراتی کوردستان، حیزبی کۆمونیست، بەلام نەک حیزبی کۆمونیستی راستەقینە، کە قاسم دوای هەراو هەنگامەکانی کەرکوک (١٩٥٩/١/١٤) لەگەلی تێکی دابوو، بەلکو ئەو بالەی کە جیا بوو بووە وە[٢٠] و حیزبی دیموکراتی کوردستان مولەت وەردەگرێ کە بلاوکراوەیەکی نوێ دەربکات: کوردستان.

لێ سەردەمی ئاشتیی قاسم وکوردان هەر لە هەمان سەروبەندا کۆتایی دێت، وەکو عیسمەت شەریف وانلی مێژوونووسی کورد دەڵێ: جەنەراڵ قاسم لە دیدارێکی «دۆستانە» دا لە سەرەتای هەیڤی ١/ ١٩٦٠ دا داوا دەکات «بەپەلە» ئەو مادەیەی کە دەڵێ یەکێک لە ئامانجەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان «بەدەست هێنانی ئوتونومییە لە چوارچێوەی عێراقدا» لابیرێ،[21] برایم ئەحمەد وکۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق قایل دەبن خاڵی ئوتونومی لەبەرنامەدا لابیرێ، بەڵام کۆنگرەی پێنجەمی حیزب کە لە ٥-١٠/٥/ ١٩٦٠ بەردەوام بوو، لەم بارەیەوە سەرزەنشتیان دەکات، مادەی شەشەمی بەرنامەی پەسەند کراوی ئەم کۆنگرەیە بریار دەدات کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق دەبێ «پتر هەوڵ بۆ مکوم کرنی پەیوەندی برایەتی نێوان میللەتانی کورد و عەرەب و کەمە نەتەوەییەکانی دی بدات» و « مافی نەتەوەیی گەلی کورد و دابینکردنی ئوتونومی لە چوارچێوەی عێراقی یەکگرتوودا و چەسپاندنی ئەم مافە لە دەستووری هەمیشەییدا بەرەوپێش بەرێ»

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا جۆرە ئاڵۆزییەک هەیە، هۆی ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ جۆری پەیوەندی بارزانی دەگەڵ حیزبی دیموکرات و پەیوەندی کوردەکان دەگەڵ قاسم وکۆمونیستەکان.

قاسم لە مانگی ٣/ ١٩٦٠دا رێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە دوای شۆرشی تەمووزی ١٩٥٨ هاتبوونە عێراق، بە کۆمونیست دەزانێ و لە عێراق وەدەریان دەنێ.

یەکێک لەوانە پەیام دەداتە بارزانی « قاسم گەمەی پێدەکات، پاش ئەوەی کۆمونیستەکان سەرکوت بکات، ئەوسا و لەوەختی خۆیدا ئەویش سەرکوت دەکات»

لێ بارزانی لەلای قاسم هیچیان بۆ ناکات و لێدەگەرێ کە کوردە ئێرانییەکان لەعێراق وەدەر بنێن.

حیزبی دیموکراتی کوردستان لە پێنجەمین کۆنگرەی خۆیدا لە مانگی ٨/ ١٩٦٠ لە کاتێکدا کە بارزانی بە کردەوە لە کۆمونیستەکان دوور کەوتوەتەوە، سروشتی «شۆرشگێری» حیزب وەکو نوێنەری «کرێکاران، جوتیاران، فەرمانبەران و پیشەوەران و رۆشنبیرانی شۆرشگێری کوردستان» دووپات دەکاتەوە و «لە خەباتی سیاسی و شیکردنەوەی کۆمەلایەتی خۆیدا سوود لە بنەما زانستییەکانی مارکسیزم - لینینزم»

وەردەگرێت،

بارزانی لە ١٩٦٠/١١/٣دا بۆ بەشداری لە ساڵیادی شۆڕشی روسیا، بۆ مۆسکۆ دەچێت، خروشوف لەم دیدارەدا زۆر بە رێزەوە رەفتاری دەگەڵ دەکات. بارزانی تا ناوەڕاستی مانگی ١٩٦١/١ بۆ بەغدا ناگەڕێتەوە و چ کەسێک ئاگاداری ئەوە نییە کە چ شتێک دە نێوان ئەو و رێبەرانی سۆڤیەتی دا بووە.

لە لەم سەروبەندەدا پەیوەندی بارزانی و قاسم زۆر بە خراپی بەرەوتێک چوون دەچێت.

## ١٢

## هۆکارەکانی بڕینی پەیوەندی دەگەڵ قاسم دا

قاسم لە قۆناغەکانی یەکەمی حوکمڕانی خۆیدا لە ١٩٥٨/٧/١٤- ١٩٥٩/٧/١٤) پشتی بە کۆمونیستەکان بەستبوو، کە زۆر بووتی دەسەلاتی کۆمونیستەکان دەبینێ هەست بە خەتەر دەکات، ئەوجا با دەداتەوە و پشت بە راستی عێراق دەبەستێ، پانی پشت بە باڵی راستی حیزبی دیموکراتی گەل وتەنانەت ناسیونالیستانی عەرەب دەبەستێ، ئەم دوو روویی وناڵۆزییەی کە لە تایبەتمەندییەکانی رژێمی قاسم دەرهەق بە مەسەلەی کوردە و لە دژایەتی مادەی ٢ و٣ ی دەستووری کاتی دا رەنگی داوەتەوە و بەرجەستە بووە، سەرەنجام لە ١٩٦٠/١١/١٩ دا دەکەوێتە روو: لەم رۆژەدا برایم ئەحمەدی سکرتێری گشتی حیزبی دیموکراتی کوردستان، لەبەر ئەوەی لەسەر گوتاری رۆژی ١٩٦٠/١١/١٩ ی رۆژنامەی خەباتدا، ئەم ناکۆکییەی دەست نیشان کردبوو، بۆ دادگا گاز دەکرێت.

دوای چەند مانگێک ئەم باس و مشتو مڕە لە «الثورة» ی ئۆرگانی حکومەتدا دەست پێدەکاتەوە، رۆژنامەی نێوبراو لەگوتارێکی دا بە نێوی «نەتەوەی عەرەب و مەسەلەی کەمە نەتەوەییەکان» دووپاتی دەکاتەوە کە چارەنووسی «کەمە نەتەوەیی کورد لەعێراق» دا بەندە بەچارەنووسی نەتەوەی عەرەبەوە «دەبێ ئەم کەمە نەتەوەییە رام بکرێ و رابکێشرێ.» (٢٣)

رژێمی قاسم گوشار لە رێبەرانی کورد دەکات: لە مانگی ١٩٦١/٣ دا برایم ئەحمەد بە کوشتنی یەکێک لەفیوداڵانی شەقڵاوە بەنێوی سەدیق میران عوسمان کە لەساڵی ١٩٦٠ دا لە ئەنجامی پێکادانی یاران و نەیارانی بارزانی دا کوژرابوو، تاوانبار دەکرێ.

عومەر مستەفا، کە ئەندامێکی دیکەی مەکتەبی سیاسی دەبێ، دەگیرێ و بۆ باشور نەفی دەکرێ.

قاسم شان بەشانی ئەم کارانە دەکەوێتە گیانی چاپەمەنی و بڵاوکێن کوردی، کوردستان، ئازادی، دەنگی کورد، هەتاو یەک لەدوای یەک رادەگیرێن. و خەباتی ئۆرگانی رەسمی حیزبیش لە ئازاری ١٩٦١ دا بە رەسمی رادەگیرێ.

هەروەها لە هەیڤی ١٩٦١/٣ دا جەنەراڵ بارزانی کە هەست دەکات لە بەغدایە هەڵناکات و ئیدی بۆ ئەو شوێنێکی ئەمین نیە، بۆ بارزان دەڕوات، تا شەش سانگان لەوە دوائش شەڕ دەست پێناکات، بەڵام دەتوانی بڵێی کە لە هەیڤی ١٩٦١/٣ دا بەینی بارزانی و قاسم بە کردەوە تێک چوو.

وەزع خراپە، لە هەیڤی ١٩٦١/٤ دا کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان، کۆمبونەکی دەکات سەبارەت بە وەی کە بڕیارێک بدات کە ئایا پێویستە حیزب بەخۆی شۆڕش رابگەیەنێ یان بەپێچەوانەوە تەنێ بەرگری لە خۆی بکات، تا قاسم دەست پێشکەری بکات و پەلاماری بارزان بە تایبەتی یان کوردستان بەگشتی بدات.[٢٤]

جەلال تالەبانی لایەنگری دەست بەجێی شەڕ بوو، بەڵام رای کەمینەی دەگەڵ بوو.

لە هاوینی ١٩٦١دا حیزبی دیموکراتی کوردستان، لە هەیڤێن شەش[٢٥] و حەوتدا دوو جار هەوڵی ئاشت بوونەوە دەدات، بەڵام قاسم هەردوو جارەکە دەست بە روویانەوە دەنێ و زۆر زیرەکانە و بەهێنانە کایەی مەسەلەی کوێتەوە خۆی لە بابەتەکە دەدزێتەوە.

حکومەت رێگە لە بەستنی کۆنگرەی ساڵانەی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەگرێ وتەنانەت لە گەرمەی ئاهەنگی سێیەمین ساڵیادی شۆڕشی تەمۆز لە بەغدا، شەڕی توند لە دەڤەری بارزان دە نێوان لایەنگرانی بارزانی ولایەنگرانی مەحمود ئاغای زێباری دا روو دەدات.

## ١٣

## هەڵسەنگاندن و ئەنجامگیری کارەکان

ئەم سێ ساڵی ئاشتییەی کە لەمێژووی کوردا بێ پێشینەیە، یەکجار گرنگە.

هەرچەندە لەباری سیاسیەوە ئاڵۆزی و پەشێوی زاڵ بوو، باس و مشت و مڕ لە سەر وەزعی کوردستان و مافی نەتەوەیی گەلی کورد زۆر توند بوو، لە گەڵ ئەمەشدا کوردێن عێراق وێرای تەبیعەتی تاکپەرەوەری حکومەت و دکتاتۆریەتی قاسم، کە رۆژ بەرۆژ توندتر دەبوو، لەم سێ ساڵەدا ئازادی دەربڕین و کۆبوونەوەو کۆمەلایەنیان هەبوو، چاپەمەنی و بڵاوکراوەی کوردی بوژانەوە و رەونەقێکی بێ وێنەیان بە خۆوە بینی.

بوونی ژمارەیەک لە ڕێبەرانی کوردی ئێران لە بەغدا، لەم قۆناغە کورتەی خۆشی نێوان قاسم وکورداندا، خۆی لە خۆیدا ڕەنگدانەوەی ئەوەیە کە عێراق چ دەورێکی لە بزاڤی نەتەوەیی کوردا هەبووە.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق کە دەرفەتی کارکردنی ئاشکرای بۆ ڕەخسا بوو، توانی خەڵکانێکی زۆر بە ئەندام وەربگرێ و ڕێکخستنێک بنیات بنێ کە سەرانی بەغدا هەر زوو، بەداخەوە زەبت و ڕەبتی ئەو ڕێکخستنەیان جەرباند.

بەلام ! ئەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ئەم سێ ساڵەی پاش شۆڕش ١٩٥٨/٧/١٤ هاوکاتە لەگەڵ دەرکەوتنی بارزانی دا وەکو ڕێبەری ڕاستەقینەی نەتەوەی کورد: پاش ساڵانی کارامە بوون و فێر بوون (ساڵانی ١٩٢٤-١٩٣١) یەکەمین نەفی لە عێراقدا (١٩٣٤-١٩٤٣)، ساڵانی ئەزموون (١٩٤٣-١٩٤٧) وسەرەنجام دووەمین نەفی و دوورکەوتنەوە - دوور کەوتنەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت (١٩٤٧- ١٩٥٨) مەلا مستەفا بارزانی کە تا ئەو زەمانە پارتیزانێک، ڕێبەری سوپایی گروپێک، ڕێبەرێکی عەسکەری بە بیروبۆچوونی ناسیونالیستی ئاشکرا، بەلام کەم و زۆر تەمومژاوی بوو، دەبێت بە سیاسەتوان.

**چلەوی چارەنووسی گەلی کوردی عێراق دەگرێتە دەست و دەسەلاتی خۆی بەسەر حیزبێک دا کە بە خۆی دەسەرۆک و دامەزرێنەری» بوو دەسەپێنێ،** سەرکێشان لە حیزب وەدەردەنێ و خۆی وەکو ڕێبەری نەتەوەیی هەموو کوردێن عێراق بە هەمروان، بە جەماوەری خەڵک، بە جەنەراڵ قاسم و بە سۆڤیەتەکان دەناسێنێ.

بارزانی پێی ناخۆش نەبوو کە ڕێبەری هەموو کوردان بێ، بەلام ئەمەی بۆ نەچووە سەرو، ئەمە یەکەمین ناکامی ئەو بوو، بەلام تەنێ ئەمە نەبوو.

عەیبێکی گەورەی جەنەراڵ بارزانی ئەوە بوو کە چ حەساوێکی بۆ حیزب نەدەکرد و حیزبی بە «هۆ و ئەوزار» دەزانی، بە پێی توانا و دەسەلات بیری دەکردەوە و پەیڕەوی «باس و موناقەشە»ی نەدەکرد و پەیڕەوی «دیموکراسیەتی» نەدەکرد. [ ٢ ]

جەنەراڵ بارزانی لە ساڵانی جۆش و خرۆشی شۆڕش دا هەرگیز بە ڕاستی دەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستاندا تێکەڵ نابێ و ناگونجێ. کاتێ کە لە سیاسەتی حیزب نارازی دەبێت، سکرتێری حیزب لا دەبا ت و کەسێکی دیکە لە جێی ئەو دادەنێ، پاشان ئەو لە کار لا دەبات و یەکەم دەگەڕێنێتەوە. بەلام لەبەر ئەم هۆیە، هەمیشە لەنگییەک لە

پەیوەندییەکانی نێوان ئەم حیزبە شۆڕشگێڕە و ڕێبەرەکەیدا دەبینرێ. هەر ئەمەش هەرێنی قەیرانی ساڵی ١٩٦٤ و داروخان و شکستی یەکجارەکی حیزب بوو لە ساڵی ١٩٧٥ دا.

### سەرچاوە و پەراوێزان


١. لۆموند ١٩٥٨/٧/١٥

٢. رۆژهەلات ١٩٥٨، ژمارە ٧، پ رونئو، «مەسەلەی کورد لەبەردەم برالێن عمرمیدا».

٣. دکتۆر شاکر خەسباک، کورد و مەسەلەی کورد ،بەغدا، شوباتی ١٩٥٩ کە لە رونئو لە رۆژهەلات ١٩٥٩ وە وەریگرتووە، ژمارە ١٠.

٤. ژینتامەی عارف نووسینی ئەریک رولو، لوموند، ١٩٦٣/١١/٢٠

٥. رۆژهەلات ١٩٥٨، ژمارە ٨ «باروودۆخ لەعێراقدا» نووسینی جورج کلن.

٦. بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، و. جویدە.

٧. بروانە سیاسەتی سۆڤیەت لە رۆژهەلاتی ناڤیندا لە ١٩٥٥-١٩٧٥ ل ١١٩. نووسینی هیلن کاردانکوس.

٨. بروانە پەراوێزی ژمارە ٣ ل ٣٤٨ی کوردستانی عێراق، نووسینی عیسمەت شەریف وانلی.

٩. بە گوتەی یەکێک لە بینەران.

١٠. بروانە کتێبەکەی عیسمەت شەریف وانلی، ل ١٦٧

١١. سەرچاوەی نهێنی.

١٢. حەمید عوسمانی سکرتێری گشتی جارانی حیزبی کومونیستی عێراق.

١٣. بۆ زانیاری لەمەڕ ئەم رووداوە، بروانە رۆژهەلات ١٩٥٩، ژمارە ١٢ «دادگایی عارف» نووسینی سیمون جارجی، هەروەها رۆژهەلات ژمارە ٨ « باروودۆخ لەعێراقدا» نووسینی جورج کلن.

١٤. رۆژهەلات ١٩٥٩، ژمارە ٩ «هەرای موسل»

١٥. لەلایەن یەکێتی گەلەوە ١٩٥٩/٥/٧ بلاو بووەتەوە. ر. کوستی وەریگێڕاوە و لە بەرپەڕی ١٥٩-١٦٠ گۆڤاری رۆژهەلات، ١٩٥٩ بلاوی کردۆتەوە.

١٦. بروانە گوتاری ئەرموان. لە رۆژهەلاتدا ١٩٥٩، بەپەڕی ١٥٥-١٥٧.

١٧. عیسمەت شەریف وانلی ل٩٦

١٨. عیسمەت شەریف وانلی، شوێن و رۆژی بەستنی کۆنگرەکە نا و نابات.

١٩. عیسمەت شەریف وانلی ل١١٧

٢٠. ئەم کەسانە سەرکردایەتی حیزبی کرمونیستی راستەقینەی عێراقیان دەکرد: سەلام عادل سکرتێری گشتی، عەزیز محەمەد (سکرتێری گشتی لە ساڵی ١٩٧٦)وە و زەکی خەیری، بەلام ئەو گروپە لادەرەی کە قاسم پشتیوانی لێدەکرد، لەلایەن داود سایغەوە رێبەری دەکرا.

٢١. عیسمەت شەریف وانلی ل ٨٨

٢٢. هەمان سەرچاوە، بەربەرێن ٩٠-٩١
٢٣. هەمان سەرچاوە ل ٩٤
٢٤. نامەیەکی جەلال تالەبانی بۆ عیسمەت شەریف وانلی ل ٩٩
٢٥. بڕوانە کتێبی عیسمەت شەریف وانلی، ل ٩٥-٩٦ و پەراوێزی ل ٣٤٩.
٢٦. هەمان سەرچاوە ل ٩٦-٩٧-٩٨.

**تێبینی: ئەم زانیاریانە لە رێزدار سالح مەحمود بارزانی وەرگیراون:**

[١] بارزانی کە چووە خزمەتی مورشیدی گەورە شێخ ئەحمەدی بارزانی زۆر بە گەرمی یەکتریان لە ئامێز گرت، حاڵ و ئەحوالی خۆی و هەموو هەڤاڵەکانی پرسی، کێ ماوە، کێ بە رەحمەتی خوا چووە؟.. پاشان شوکرای خوای دەهندە و دڵۆڤانی کرد کە هەموولێ جارێکی دی لەسایەی مەشایخان یەکیان گرتەوە و دیتەوە.

[٢] بارزانی، بوونی حیزبی بە لاوە گرنگ و مەبەست بووە و هەمیشە دەیگوت هیچ شۆرشێک بێ حیزبێکی سیاسی سەرناکەوێ.. خۆ بەلای کەمەوە بۆخۆی دامەزرێنەری لیژنەی ئازادی بووە، دامەزرێنەری و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بوونی حیزبی بەلاوە گرنگ بووە.

## فەسڵی شەشەم

## شەڕی قاسم

بەمجۆرە ئەو هیوا و ئاواتە گەورەیەی کە لە ئەنجامی شۆڕشی تەمووزی عێراق و ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی عێراقەوە پەیدا بوو، هەڵوەری، سێ ساڵ دوای بڵاوبوونەوەی دەستووری کاتی ۱۹۵۸/۷/۲۷ کورد و عەرەب نەیان توانی بوو قەواڵە و بەڵگەنامەیەک بۆ پتەوکردنی پەیوەندی خۆیان لەناو کۆماری عێراقدا ئامادە و تۆمار بکەن. باس و مشت ومڕی نێوان ناسیونالیستانی کورد و عەرەب بەرەو ئەوە دەچوو کە جارێکی دی بە زەبری چەک چارسەر بکرێ.

لە ڕاستیدا، ئەو شەڕەی کەلە ۱۹٦۱ دا دەستی پێکرد و ناو بەناو بۆ ماوەی کەم نەبێ، تا ساڵی ۱۹۷۵ بەردەوام بوو، سەرەنجام چ شتێکی حەل و فەسڵ نەکرد. ئەم شەڕە کە بەمانای وشەی شەڕ، شەڕ بوو، بریتی بوو لە زنجیرە شەڕێکی بچوک کە ناو بەناو ئاگربەتێکی کەم تا زۆریان بە پێی گۆڕانکاری بارودۆخی سیاسی عێراق دەکەوتە بەین، هەڵبەتە ئەم بارودۆخە سیاسیانەش دەکەوتنە ژێر کاریگەری ئەو شەڕانە و هەندێ جاریش بارودۆخە سیاسییەکان، دەبوونە مایەی هەڵگیرسانی شەڕەکان.

لە ماوەی ئەم چواردە ساڵەدا، بەلای کەمەوە چوار ڕژێم، بە زەبری چوار کودەتای کەم و زۆر خوێناوی، جێی یەکتر دەگرنەوە و لە بەغدایا دێنە سەر حوکم.

هەڵبەتە سیناریۆی ئەم ڕووداوە شتێکی ئاسایی و تەقلیدییە: لە دوای هەر کودەتایەک، ئەو گروپە تازەیەی دێتە سەر حوکم، پەیوەندی بە کوردەکانەوە دەکات. کوردەکانیش کە ماندووی شەڕی ڕژێمی پێشوو دەبن، ئاگربڕ قەبوڵ دەکەن و ئەم ئاگربڕە دەرفەتی ڕێبەرانی تازەی بەغدا دەدات کە دەسەڵاتی خۆیان قایم بکەن.

هەڵبەتە ڕژێمی تازە هەرکە هەستی کرد ئیدی پێویستی بە کورد نەماوە، بە هەمان سەرسەختی ڕژێمی پێشووەوە دێتەوە مەیدان و شەڕ و پێکادان دەست پێدەکاتەوە.

تەنیا ڕێککەوتننامەی ۱۱/۳/ ۱۹۷۰ توانی، هەرچەندە بەشێوەیەکی نوقستان بوو، بناغەیەکی تازەی ساف و پەیوەندیی لە نێوان هەردوو کۆمەڵگەی کورد وعەرەب دا دابڕێژێ، بەڵام ئەم ڕێککەوتنامەیەش پوچەڵ بووەوە و دوا بۆیەرین شەڕ، بریتی بوو لە داروخانی بزووتنەوەیەک کە جەنەراڵ بارزانی ڕێبەری بوو.

١

## سەرەتای شەڕ وشۆڕ

شەڕ لە هەلومەرج و بارودۆخێکی هەندێک ئالۆزدا دەست پێدەکات. بارزانی لە ئازاری ١٩٦١ دا دەچێتەوە بارزان، بەرە بەرە شەڕی نێوان بارزانی و زێبارییەکان زیاد دەکات تۆمەز جەنەراڵ قاسم ژێراوژێر چەک و پارەیان وێدەدات.

جەنەراڵ بارزانی لە ٧/١٥ دا ژمارەیەک چەکدار بۆ تەمبێکردنی زێبارییەکان دەنێرێ، شەڕو پێکادان تا ١٩٦١/٧/١٩ بەردەوام دەبێت، شەڕەکە بە شکستی سەرۆکی زێبارییەکان کۆتایی دێت و بە ناچاری پەناوەبەر تورکیا دەبات.

لە راستیدا حیزبی دیموکراتی کوردستان لە رەوتی رووداوەکان دوا دەکەوێ، لە مانگی ئەیلولی ١٩٦١وە کوردستان لە جموجۆڵدا بووە، ژمارەیەک لەسەرانی عەشیرەتەکان بە بێ پرسی حیزبی دیموکرات خۆ ساز دەکەن و دەکەونە شەڕ فرۆشتن بە (یەکەکانی سوپای عێراق) ئەگەرچی هەڵوێستی حیزبی دیموکرات سەبارەت بەم بویەرە روونە، لێ هیچ ئاشکرا نییە کە هەڵوێستی بارزانی لەم سەروبەندەدا چی بووە، ئایا ئەو بووەتە مایەی ئەم هەراو هەنگامەیە، ئایا لێبراوە جڵەوی وەزع و حاڵەکە بگرێتە دەستی خۆی، زۆر پرسیاران لەم بارەیەوە هەن کە تاکو ئەمڕۆ بێ وەڵام ماونەتەوە.

لە ١٩٦١/٩/٦دا حیزبی دیموکراتی کوردستان، بە بۆنەی یادی شەهیدانی خۆپیشاندانەکەی ٦/٩/ ١٩٣٠ی سلێمانییەوە مانگرتنێکی گشتی ساز دەکات، سێ رۆژان لەوە دوا سوپای عێراقی هێرش دەکاتە سەر عەشیرەتە کوردەکان، لە رۆژی شازدەیەمدا، (بارزان)یش بەر هێرش و پەلامار دەکەوێ و لە ١٩٦١/١٢/٢٤ جەنەراڵ قاسم لە هەڤپەیڤینێکی رۆژنامەوانیدا جاڕی لە دایک بوون و «نابوودی» شۆڕشی کوردان و هەڵوەشانەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان رادەگەیەنێت.[٢]

٢

## هەڵوێستی حیزبی دیموکراتی کوردستان

لێ حیزبی دیموکراتی کوردستان چەند هەیڤەک دوای رووداوەکان دەکەوێ، رێبەرانی حیزب، بەتایبەتی ئیبراهیم ئەحمەد لەبەغدایە دەمێنێتەوە و درێژە بە گفتوگۆیان دەگەڵ قاسمی دەدەن.

برایم ئەحمەد دوای چەند مانگێک بە ئەرێک رولوی پەیامنێری تایبەتی لوموند

دەڵێ:[٣] «حیزبی دیموکراتی کوردستان هەنگێکی پێی وا نەبوو کە بتوانێ لە بەرانبەر هێزی سوپایی عێراق بوەستێ و مقاوەمەتێکی جدی پێ بکرێ، دیهاتییەکان شەڕێکیان بۆ نابوێنەوە کە ئێمە پێشوەختە بە دوراومان دەزانی، بۆیە حیزب لە هەیڤی ١٩٦١/١٢ دا ئەوجا بە رەسمی چووە ژێرباری بەڕێوەبردنی شەڕەکانە

لە راستیدا حیزبی دیموکراتی کوردستان تا هەیڤی ئازاری ١٩٦٢ بە شێوەیەکی جیدی بەشداری شەڕەکان ناکات.

رێبەرانی حیزبی دیموکراتی عێراق، هەرگیز دەربارەی ئەم سیاسەتی سەبر و چاوەڕوانییە، کە هەرچییەک بێ سەیرە، روونکردنەوەیەکیان بڵاو نەکردۆتەوە.

ئایا بە تەمابوون کە سوپای عێراق ئەم شۆڕشە، کە لە روانگەی وانەوە، بێ ئەنجام و نایندەبوو، تێک بشکێنێ وبە هیوا بوون بەمجۆرە لە شەڕی بارزانی کە رۆژ بەرۆژ پتر دەست و پێی دەگرتن، بخەڵەسێن؟ ئایا هۆی ئەم دوو دڵیی و راراییە، ئەوەبوو کە حیزبی کۆمونیست دژی چەک بەکارهێنان بوو، بۆ «دابین کردنی داواکارییەکان لە دەرتێ چوارچێوەی خەباتی بزاڤی دیموکراتی عێراقدا دژی دەسەڵاتی فەردی جەنەراڵ قاسم؟» بێگومان کۆمونیستەکان ترسی ئەوەیان هەبوو کە شۆڕشی کوردان خێرابی بە کەوتنی قاسم ببەخشێت و فریا نەکەون لە چوارچێوەی «بەرەی نیشتمانی» دا چارەسەرێک بدۆزنەوە و شوێنی قاسمی پێ پر بکەنەوە، بۆیە بەم بزاڤەی کە لە باکوری عێراقدا هەڵگیرسا بوو ناقایل بوون.[٤]

پێناچێت ئەمە رێکەوتێکی سادە یان ئاسایی بێ کە رێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان تا مانگی ئازاری ١٩٦٢ بە شێوەیەکی جیدی بەشداری شەڕەکانیان نەکرد، چونکە بەراستی حیزبی کۆمونیست لە مانگی ئازاری ١٩٦٢ دا هەڵوێستی خۆی لەمەڕ مەسەلەی کورد دەگۆڕێ و دان بەوەدا دەنێ کە «گەلی کورد مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆی هەیە» و هەر بەوەندە ناوەستێ و دان بەمافی «جیابوونەوە» و «دامەزراندنی وڵاتی سەربەخۆ»دا دەنێ.[٥]

## ٣

## هەوەڵین تێشکانێن کورد

ئەنجامی یەکەمین رووبەروو بوونەوەو شەڕەکان، بە رواڵەت دروستی بۆچوونی هەردوو لایەنی شەڕەکان دەسەلمێنێ.

له راستیدا ناکامی شەڕەکان و دەستکەوتی شەڕەکان بۆ کوردەکان باش نەبوو، لە باشووردا واتە لە پارێزگای سلێمانی دا، چەکدارانی عەشایەر بەرگەی هێزی عێراقیان نەگرت و خراپ شکان.

لە دەڤەری هەولێریشدا هەروابوو، لەوێندەر چەند سەد کەسێک بە سەرکردایەتی عەبدوللا ئیسماعیل[٦] دوو مانگێک لەبەرانبەر هێزی عێراقدا وەستان و بەرگریان کرد.

جوتیارانی کوردی بێ ڕێبەر، بێ چەک، نەیان توانی بەرانبەر بە سوپایەکی زۆر بەهێز، کە هێزێکی فڕۆکەوانی ترسناک پشتیوانی دەکرد، مقاومەت بکەن.

جەنەراڵ بارزانی کە لەو سەروبەندەدا تەنێ «٦٦٠» جەنگاوەری دەگەڵ بوو ئەم جەنگاوەرانەش تەنێ تفەنگی ئاسایان پێ بوو،[٧] **بڕیارێکی دلێرانە و بوێرانە دەدات: ناوچەی بارزان کە شێخ ئەحمەد بێ لایەنی ناوچەکەی ڕاگەیاندبوو، بە جێ دێلێ و ڕوو دەکاتە کوێسارەکانی زاخۆی ئەوبەری ڕۆژئاوای بادینان و زستانی سالآنی ١٩٦١ -١٩٦٢ لەوێندەر و دوور لە خەتەری هێزی فڕۆکەوانی بەسەر دەبات.**

لە هەیڤی ١٢/١٩٦١دا برایم ئەحمەد و هەموو ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە بۆیان دەردەکەوێ ج ئومێدێکی ڕێکەوتن دەگەڵ ڕژێمی قاسم دا نییە، لەبە غدایە هەڵدێن و دەچنە ناوچەی سلێمانی و لەوێندەر بارەگای خۆیان دادەنێن ولە بەهاری ساڵی ١٩٦٢ دا لەگەڵ خۆیاندا ڕێکخستن دەبەنە نێو شۆڕشی کورد کە شوێنی لە نێو بزاڤ دا زۆر دیار بوو.

٤

## حیزبی دیموکراتی کوردستان و هێزی ڕێکخراوی دەزگای بەرگری

پارە کۆ کردنەوە[١٨] بلاو کردنەوەی ڕۆژنامەی خەبات، دابینکردنی نازوقە و خواردەمەنی بۆ خەڵکی، دامەزراندنی دەزگایەکی زانیاری و ڕێکخراوێکی تایبەتی «بۆ.... کوشتنی خائینان» ئەمانە ئەو ئەرکە زۆر ڕوالەتییە هەنووکەییانە بوون کە ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان خەریکیان بوون.

بەلآم ئەرکی بنەڕەتی وان دامەزراندنی «لەشکری شۆڕشگێری کوردستان»، لەشکرێکی بە زەبت و ڕەبتی ئەوتۆ کە بەرە بەرە جێی خەڵکی عەشایەر بگرێتەوە.

ئەم لەشکرە لە دەستە، پەل و لق پێک هاتبوو لە ٧٥٪ ئەندامانی حیزب دەگرێتە خۆ.[١٩] دەستە، ١٠، پەل ٤٠، لق ٢٥٠ چەکدار بوون: مانگانەی هەر پێشمەرگەیەکی

سەڵت ٠٥٧ فلس بوو (١٢ فرانکی فەرەنسی) ئەگەر خودان ماڵ و منداڵ بێ سێ دینار (بەرانبەر بە ٤٥ فرانکی فەرەنسی)

زەبت و رەبت و سەبر و توانای جەنگاوەرانی ئەم لەشکرە، کە زۆر بە دیققەت و بەپێی تایبەتمەندی بە دەنی و ئەخلاقی هەڵبژێردرابوون هەر زوو کارێکی وا دەکات لشکری شۆڕشگێری کوردستان ببێ بە هێزێکی نەوتۆ، کە وێڕای کەمی چەکدارانی، کە لەساڵی ١٩٦٢دا ژمارەیان لە ٧ هەزار کەس تێنەدەپەڕی، بتوانێ شکستی زۆر گەورە بەسەر سوپای قاسم دا بێنێ.

رێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان شان بەشانی دامەزراندنی ئەم دەزگا عەسکەرییە دەزگایەکی سیاسیش دادەمەزرێنن کە لە رێگەی شانەی حیزبیەوە هەموو ناوچەکەی دەگرتەوە.»[١٠]

**ئەم بەشەی کوردستان کە لە ژێر دەسەلاتی حیزبیدایە، دابەش دەکرێ بەسەر پانزدە بەشدا، هەر بەشەیان لەلایەن «کۆمیتەی ناوچەوە» بەرێوە دەبرێ، دیارە ئەم کۆمیتە ناوچەییانە بە شێوەی «رێبەرایەتی بە کۆمەڵ» دامەزرابوون و هەر یەکێکیان پێک هاتبوو لە یەک بەرپرسی عەسکەری، رابەرێکی سیاسی، بەرپرسێکی سیاسی، بەرپرسێکی ئیداری، بەرپرسێکی لوجیستیکی و[١١] بەرلەوەی حکومەتێکی ناوچەیی هاتبێتەسەرکار، لە راستیدا حکومەتێک پێک دەهێنن کە حوکم و دەسەلاتی لە رێگەی «کۆمیتە و ئەنجومەنی گوندەکانەوە» دەگەیە بچوکترین گوند.**

## ٥
## پەیوەندیێن بارزانی و حیزبی دیموکراتی کوردستان

بەلام بینای ئەم دەزگا گرنگە لە زەحمەت و دژواری بەدەر نەبوو: دەزگای حیزب و بارەگای رابەرانی حیزب کەبەزۆری لە باشوری کوردستانی عێراق دا جێگیر بووبوو، زۆر لەمەرکەزەوە نزیک نەبوو، تا پتر بەرەو باکور دەچویت، ئەوەندە دەسەلاتی حیزب کەمتر دەبووەوە، بارەگای عومەر مستەفا لە بیتواتە بوو، کە دورترین خاڵی بوون و دەسەلاتی حیزب بوو.

جەنەراڵ بارزانی حەزی نەدەکرد کەس لەلای ئەوباسی حیزب بکات، بارزانی لە مانگی ١٩٦٢/١٢ کە رۆژنامەوانێک داوای لێکرد باسی دەوری حیزب لە شۆڕش دا روون بکاتەوە «بۆ پتر سەرنج راکێشانی ئامادەبووان، دەنگی بەرزتر کرد و گوتی» ئەوەندەی

پەیوەندی بە منەوە هەیە، چ حیزبێک لە گۆڕێ نییە! گرینگ گەلی کوردە. ئەگەر سەربکەوین ئەوە گەلی کوردە کە سەرکەوتووە»[١٢]

دوای چەند مانگێک واتە لە ئازاری ١٩٦٣دا بارزانی بە نـاو هەموو پەیوەندییەکی خۆی دەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراقدا بڕی و «هەر جارێک ناوی حیزب دەهات تووڕە دەبوو»[١٣] بەرادەیەک کە گوتی «من هەرگیز نە سەرۆکی ئەم حیزبە ساختەیە بووم کە زیانی بۆ ئامانجە شۆڕشگێرییەکانمان پتر بووە تا قازانج، و نەسەرۆکیم»[١٤]

## ٦

## ڕۆشنبیرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان

ڕاستە، هەموو شتێک بارزانی لەم ڕۆشنبیرانە جیا دەکردەوە کە حیزبیان بەڕێوە دەبرد.

برایم ئەحمەد کە لە ساڵی ١٩١٣دا لە سلێمانی لە دایک بووبوو، لەو کاتانەدا کە قوتابی ماف بوو لە بەغدایە پەیوەندی بەبزووتنەوەی نەتەوەیی کوردەوە کردبوو، نامەی کۆتایی خوێندنەکەی (١٩٣٧) کە دەربارەی پەیوەندییەکانی عەرەب وکورد بوو، بووە هۆی ئەوەی لە دادگا بانگ بکرێ.[١٥]

برایم ئەحمەد کە لەساڵی ١٩٣٩ دا بەڕێوەبەری گۆڤاری گەلاوێژ بوو، لە ساڵی ١٩٤٦ داو بەولەوەی بێتە ڕیزی حیزبی دیموکراتی بارزانییەوە بەرپرسی لقی سلێمانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی قازی محەمەد بوو، کە پەیوەندی بە حیزبی دیموکراتی بارزانییەوە کرد، ئەم کارەی بەناباەدڵی کرد وپاشان ناکۆکی کەوتە نێوان ئەوو وبارزانی لە سەر دامەزراندنی حیزبێکی جیاو تایبەت بۆ کوردستانی عێراق و کاتێ کە پەیوەندی بە حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراقەوە کرد، ئەم حیزبە ئیدی لە ژێر دەسەڵاتی بارزانی دا نەبوو: بارزانی لە یەکێتی سۆڤیەت بوو پاش چوونی بۆ یەکێتی سۆڤیەت پەیوەندی حیزب لە گەڵی دا بڕا.

لەباری مەعنەوییەوە، ئیبراهیم ئەحمەد کەسێکی خوێنەوارە،[١٦] بەڕەوانی قسە بە زمانانی کوردی و عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی دەکات. چەند مانگێک لەوە دوا،کاتێ کە بۆ بەڕێوەبردنی مقاوەمەتی حیزب بۆ کوردستان دەڕوات، ئەو ڕۆژنامەوانانەی کە دیداری دەگەڵ دەکەن. لە بارەگاکەیدا کە لە ناو ئەشکەوتێک دا دەبێت، لە کتێبخانەکەیدا بەرهەمی برتراند راسل و دۆستوفسکی و مارکس ولنین و پاستەرناک و ئیلیج سالزبوری و

ژان پۆل سارتەر، بە ریزی یەکەوە دەبینین.[17] بەمجۆرە گێژەنگێکی مەعنەوی نەوی لە بارزانی جیا دەکردەوە، کە ج کەسێک نەیدیتبوو کتێب بخوێنێتەوە جگە لەو وێنانەی کە داڤید ئادامسۆنی رۆژنامەنووسی بەریتانیایی گرتبوونی و جەنەراڵیان لە حاڵێک دا نیشان دەدا کە زۆر بە قوڵی چاپێکی تازەی چوارینەکانی عومەری خەیامی موتاڵا دەکرد.[18]

لەباری سیاسیەوە، پێناسە و وەسفی برایم ئەحمەد کارێکی زۆر دژوارە، هەر بە هەوڵ و تەقەلای ئەو بوو کە «حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق بوو بە حیزبێکی مارکسی - لینینی، هەڤرکێن راست رەو برایم ئەحمەد بە «کۆمونیستێکی پەنهانی» دەزانن، کە خۆی لە پێستی «دیموکراتیکی لیبراڵ» دا حەشار داوە.[19]

بەلای چەپەوانیشەوە بابایەکی ناسیونالیستەکە زۆر لە عارفەوە نزیکە تا لە قاسم، خالید بەکتاش-ی سکرتێری حیزبی کۆمونیستی سوریا کە بە خۆی کوردە، لە ئەیلولی ساڵی ١٩٥٨ دا لە پراگ دیتبووی و هەنگێ گوتبووی کە «وەکو بەعسییەک قسەی دەکرد»[20]

جەلال تاڵەبانییش « لە ساڵی ١٩٣٣ دا لە کۆیە لە دایک بووە» لە بەغدایە و لەبەشی ماف خوێندوویەتی، بەڵام نەوەیەک لە دوای بارزانی و هەمزە عەبدوڵلا بوو، تاڵەبانی زاوای ئیبراهیم ئەحمەدە.

تاڵەبانی هەر زوو وەکو «بەچووە گورگی رادیکاڵی حیزب»[21] خۆی بە هەمووان ناساند. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پەیوەندی دەگەڵ بارزانی دا زۆر باش بوو، بارزانی بە چاوی «کوڕی» خۆی سەیری دەکرد، تاڵەبانی کە لایەنگری خەباتی چەکدارانە بوو، یەکێک بوو لە گروپە کەمەکەی کۆمیتەی ناوەندی کە باوەڕیان وابوو، حیزب دەبوایە هەر لە مانگی چواری ١٩٦١ وە دەستی بە شۆڕش بکردایە. لە هەمان کاتدا «تیۆریستێنێکی باش وپیاوێکی زۆر میللی»یە[22] و گەشەسەندنی کارامەیی پێشمەرگەکانی حیزب تا رادەیەک بۆ هەوڵ و تەقەلاکانی ئەو دەگەڕێتەوە.

## ٧

## ناکۆکییەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی

بەمجۆرە بزاڤی کوردایەتی لە ساڵانی ١٩٦١-١٩٦٣ دا دووسەری هەیە و ئەم ناکۆکییەش بە ئاشکرا لە ئامانجەکانیا رەنگی داوەتەوە: شۆڕشی چەکداری، بەشی

قەواعیدی حیزبە، ئەم قاعیدەیەش بناغەیە، شەوانە پێشمەرگەی کورد لە دەوری ئاگر دادەنیشن و سرروودی ئەی رەقیب دەڵێن: **ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان، نایشکێنێ دانەری تۆپی زەمان، کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە، زیندووە قەت نانەوێ ئاڵاکەمان)**

بەڵام لە ئاخی دڵەوە سرودێکی شۆڕشگێرانەی دیکەش دەڵێن: ئازادی خوای کوردین ئێمە.

رێبەرانی حیزبی دیموکرات هەرچەندە بەلای بارزانییەوە «رادیکاڵ» بوون، بەڵام بە خۆیان لەوە دەترسان کە بکەونە داوی جوتیارەکانیشەوە، ئەو جوتیارانەی کە دەیانویست وشەیلی «شۆڕشی کورد» مانا و چەمکیان هەبێ.

برایم ئەحمەد لەلای پەیامنێری تایبەتی لوموند[24] ئیعتراف دەکات: «من لێتی ئاشارمەوە کە لەوە دەترسین جوتیارەکان لە دەست دەربچن، هەڵبەتە ئێمە وەعدو بەڵێنێکی دیاری کراومان نەداونەتێ، بەڵام زاراوەی ئوتونومی لە نک وان رەهەندو مەودای بەهەشتێکی زەمینی وەرگرتووە، ئێمە ناتوانین بەم زووانە ئەم بەهەشتەیان پێشان بدەین، نەک بەم زوانە بگرە دوای چەندین ساڵی دیکەش ئەممان پێ ناکرێ»

بەلای جوتیاری کوردەوە مەسەلەی سەرەکی مەسەلەی زەوییە، بەڵام حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق بە هەموو «ورتێکییەوە لە سیستەمی دەرەبەگایەتی و مسکێنی» و بە هەموو تاسەیەکییەوە بۆ ئەنجامدانی ریفۆرمی زەوی و زار»[25] رای وایە کە لە ماوەی شەڕیدا دەگەڵ حکومەتی بەغدایە، بە مەبەستی ئەوروژانی سەرانی تەقلیدی کورد، ئەم مەسەلە کۆمەڵایەتییە دوا بخات و بەردێکی بنێتە سەر.

## ٨

## مەسەلەی ئوتونومی

لە قەواعیدی حیزب دا، دروشمی «کوردستان یان نەمان» بە تەواوەتی ئامانجی خەباتەکە رۆشن دەکاتەوە و مەبەستی: **«سەربەخۆیی» کوردستان دەگەیەنێ.**

بەڵام هەڵوێستی سەرکردایەتی و رێبەرانی حیزب تا ئەندازەیەک لیل بوو: رێبەرانی حیزب کەلەلایەکەوە نەیاندەویست قاسم گیرۆدەی شەڕێکی توند دژی کورد بکەن و لەلایەکی دیەوە نەیاندەویست وڵاتانی عەرەب لە خۆیان بتۆرێنن و برەنجێنن، لە شەش مانگی یەکەمی شەڕدا خۆیان لە بەکارهێنانی زاراوەی «ئوتونومی» دەپاراست کە

یەکێک بوو لە بەندەکانی پەیڕەو و پرۆگرامی حیزب.

لە مانگی چواری ١٩٦٢دا، خەبات ، ئۆرگانی رەسمی حیزبی دیموکراتی کوردستان، پاش ئەوەی ئەم لایەنە دوویات دەکاتەوە کە بزاڤی کوردێتی بە تەما نییە کوردستانی باشوور لە عێراق جیا بکاتەوە، ئامانجە سەرەکییەکانی شۆڕشی کورد بە ڕێبەرایەتی ڕۆڵەی ئەمەکداری عێراق، بارزانی قارەمان، بەمجۆرە دیاری دەکات.

١- کشانەوەی هێزەکانی عێراق بۆ ئۆردوگاکانی بەر لە دەست پێکردنی شەڕو هەڵوەشانەوە و چەک کردنی جاشەکان.

٢- ئاوەدان کردنەوەی ناوچە بۆردومان کراوەکان.

٣- ئازاد کردنی زیندانییە سیاسیەکان،

٤- لابردنی حوکمی عورفی و کۆتایی هێنان بە قۆناغی ڕەوتەنی و دابینکردنی ئازادییە دیموکراتییەکان.

٥- دانانی دەستوورێکی تازە لەلایەن کۆمیتەیەکەوە کە نوێنەری هەموو هێزە سیاسیەکانی عێراقی تێدا بێ، بە مەبەستی سەقامگیری ڕژێمێکی شورایی و بەمەبەستی دانی ئوتونومی بە گەلی کورد لە چوارچێوەی کۆماری عێراق دا.

٦- ئەنجامدانی ریفۆرمی زەوی و زار، لە کوردستاندا بە پێی هەلومەرجی ناوچەکەو بە مەبەستی پتر پشتیوانی کردن لە بەرژەوەندی جوتیاران، بایەخدان بەباری پیشەسازی لە کوردستاندا، بەرز کردنەوەی ئاستی ژیان و بژێوی گەلی کوردستان و.. هتد.

زاراوەی «ئوتونومی» سەرەنجام وەکو بەشێکی داواکانی کورد بە دیاردەکەوێ، بەلام ئەم بەدیار کەوتنە لە کۆتایی بەندی (٥) دا تێکەڵ بە جۆرە پارێز و ترسێکی زۆرە.

حیزبی دیموکراتی کوردستان ، کە سەرەنجام ئەم هەنگاوەی لەبواری داواکردنی ئوتونومیدا نا ، ئیدی هەموو شێوازێکی گرتەبەر بۆ ئەوەی قەناعەت بە عەرەبەکان بێنێ- بەعەرەبی بەغداو بەتایبەتی سەرانی قاهیرە و ولاتانی دیکەی عەرەب- کە شۆڕشی کورد ، تەنێ لەچوارچێوەی عێراق دایە و حیزبی دیموکراتی کوردستان بزووتنەوەیەکی جودا خوازیی نیە . هەر چەندە حاشا لەوە ناکات کەلە کوردستانی عێراق دا ڕەوتێکی جودایی خوازیش هەیە.(٢٨)

ئەمەش یەکێکە لە لایەنە هەرەسەرەکانی بزاڤی کوردێتی کەلەو دیمانە و چاوپێکەوتنانەی بارزانی و برایم ئەحمەد لە سالانی ١٩٦٢ و١٩٦٣ دا دەگەڵ

پەیامنێرانی تایبەتی لوموند و نیویورک تایمز و سەندەی تەلەگراف دا دەیکەن چ ئاماژەیەک بەم مەسەلەیە نایەتە کرن.

## ٩

## بارزانی و گەمەی دەسەلات

دەرکەوتنی جەنەراڵ بارزانی لە مەیدانی سیاسەتی جیهانی دا لەم قۆناغەوە دەست پێدەکات: بارزانی کە لە یەکەم شۆڕشی خۆیدا (١٩٤٢- ١٩٤٥) وە لە ڕووداوەکانی کۆماری مەهاباد دا، بە تەواوەتی لەلایەن ڕۆژنامەوانی جیهانییەوە فەرامۆش کرابوو، بەڵێ هەروەها کە لەکاتی پەناهەندەیی لە یەکێتی سۆڤیەت، چاپەمەنی ڕۆژاوایی ناوی «جەنەراڵی سوور»یان لێ نابوو. لە تکاودا ئەم پیاوە بووە، مایەی سەرنج و ئاوڕدانەوەی گەورەترین ڕۆژنامەێن ئەورووپا و ئەمەریکا و پەیامنێرانی ئەم چاپەمەنییانە لە هەمان کاتدا کە دڵبەند و شیفتەی ئەم «خانەدانە شۆڕشگێڕە» دەبوون، لە مامەڵە کردنیاندا دەگەڵ وی سەرسامیش دەبوون.[٢٩]

بارزانی هەنگێ تەمەنی شەست ساڵ بوو

لێ نەهێ دەورانی چالاکییەکانی ئەو چالاکی «پیاوێکی سیاسەتوان» بوو، لە هەڵس وکەوتیا لە رادەبەدەر بەپارێز بوو، دوو شەوی لەسەر یەک لە شوێنێک دا نە دەنووست، هەمیشە زیرەڤانانێکی لە دەور بوو کە دەهاتن و دەچوون، بێ ئەوەی کەسێک بە جێگاکەی بزانێ، جگە لە چەند کەسێکی زۆر کەم و زۆر ئەمین و ئەمەکدار.

بارزانی بە ئانقەست پەردەی نهێنی ئامێز بەسەر رابردووی خۆیدا دەدات، بێ خۆشێلوکردن پێت دەڵێ کە «باب و باپیرانی لە ١٢٠٠ ساڵ»[٣٠] لەمەوبەرەوە رێبەرانی عەشیرەتی بارزان بوونە! بەڵام سەبارەت بە مانەوەی لە یەکێتی سۆڤیەت و پەیوەندی دەگەڵ سۆڤیەتەکاندا، زار هەڵنایەنێ،

**بارزانی کە بە زمانانی کوردی و عەرەبی و فارسی و ڕووسی قسەی دەکرد، زمانی ئینگلیزی نەدەزانی و ئەم زمانە هەر فێر نەبوو، هەروەها زمانی فەرەنسیش فێر نەبوو، هەمیشە لە ڕێگەی تەرجومانەوە قسەی دەگەڵ ڕۆژنامەوانانی بێگانەدا دەکرد.[٣١]**

جەنەراڵ بارزانی کە پیاوێکی دەستەبالایە، بە جلکی کوردی ئاسایی و بە نیگای زیندوو زیرەک و چاوانی گەش، لە ژێر برۆی کوردی چڕ و بژەوە کار لە بەرانبەرەکەی دەکات، وێڕای زۆری تەمەنی و تۆزێک قەڵەوی، هێز و توانایەکی بەدەنی و تاقەتێکی بە

گوری پێوە دیارە، هەیکەلی بە جۆرێکە لە تۆ وایە لە بەردێکی یەکپارچە داتاشراوە، ورەیەکی پۆلایینی هەیە.

بەڵام ئەو رۆژنامەنووسانانەی کە لەسالانی یەکەمی شەڕدا (١٩٦٢-١٩٦٣) دەچنە کوردستان و بۆ ماوەیەک، هەندێ جار تەنانەت بۆ دوو رۆژ لە گەڵ جەنەراڵ بارزانی دا دەمێننەوە بە دیتنی کەسایەتی شکۆداری ئەو سەرسام دەبن.

جەنەراڵ بارزانی، بە جۆرێ خۆی لە وەڵامدانەوەی راستەوخۆی ئەو پرسیارانەی کە لێی دەکران دەرباز دەکرد کە دەبووە مایەی سەرسامی خاوەن پرسیارەکان.

پیاوێکی زۆر بە پارێزە، هەمیشە «لە حاڵەتی بەرگری» دابووە و هەمیشە دەبێ بەر لە قسەکرن، بەرانبەرەکەی باش هەڵسەنگێنێ،: بە سەعاتان بێ ئەوەی قسەیەک بکات، دادەنیشێ و لەبەرچاوی رۆژنامەنووسانی سەرسام لەم وەزعە چاوەڕوان نەکراوە، بۆ داوی کەو شوڵ دەتاشێ، هەروەها سوڕانەوەی بە دەوری بابەتی باسەکەدا، لەباری زهنییەوە بەرانبەرەکەی زۆر سەرسام دەکات، بە سەعاتان لە تەسڵی مەبەست دەردەچێت و دێتە سەر هەندێ مەسەلەی دیاری کراوی وەک تەدەخولی نەتەوەیەکگرتووەکان، هاوکاری بەریتانیای مەزن، وڵاتە یەکگرتووکانی ئەمەریکا یان فەرەنسا «ئیدی ب. گوێرەی قەومیەتی ئەو رۆژنامەنووسەی کە قسەی دەگەڵ دەکات» یان ئەگەری وەدەست هێنانی چەکی قورس، ئیدی بەو جۆرە بە دەوری بابەتەکەدا دەسوڕێتەوە.

پاشان گریمانەیەک دەخاتە روو، کە میوانی بێگانە بە ئاسانی نادروستی گریمانەکە دەردەخات، هەنگینێ دەچێتە سەر بابەتێکی دی، پاش سەعاتێک، دوو سەعاتی دی دێتەوە سەر هەمان ئەو بابەتەی کە لەسەرەتادا خستویەتی روو، باسەکە لە سفرەوە دەست پێ دەکاتەوە.

زۆر بابەت هەبوون کە بارزانی خۆی لێ دەپاراست، خۆ پاراستن: لە باسی ئەم بابەتانە، وەکو باسی پەیوەندییەکانی دەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا، بێگومان زادەی دووربینی و هوشیاری و بەپارێزی بوو!

بەڵام بە مەزەندەی ئەو رۆژنامەوانانەی کە بە سەعاتان دەگەڵ بارزانیدا بوون هۆی پارێزی جەنەراڵ بارزانی لە بابەتانی هونەری وەکو ئوتونومیی خواستی کوردان، یان مەسەلەی ئابوری « لە ترسی ئەوە بووە کە نەبادا لێی ئەزانێ و دووچاری هەڵەیەک بێ لەو رووەوە»

هەرکـاتێ بابەتێکی هێنابا پێـشێ و بابەتەکـە ببـوایەتە مـایەی سـەرنج و وروژانی بەرانبەرەکەی، ئیدی وازی لێدەهێنا.

لەباسی مەسەلەی ئوتونومی دا، لە ئاخروئوخری سالی ۱۹۶۲دا رایگەیاند کە سێیەکی دەرامەتی نەوتی عێراق وکورسییەکانی ئەنجومەنی بەغدا دەبێ بدرێ بە کورد، بدرێ بە دەولەتێکی ناوچەیی کە دارایی و پەروەردە و فێرکردن و هێزی بەرگری خۆی هەبێت، ئەنێ کاروباری دەرەوە لە قەلەمرەوی دەولەتە ناوچەییەکەدا بەدەستی دەولەتی بەغدا دەبێت، بە باوەڕی ئەو لەکاتی شەڕدا دەبێ دەولەتی مەرکەزی بۆ ڤڕی کردنی هێز بەرەو سنوور و تێپەڕبوونی ئەم هێزانە بە کوردستاندا، مۆلەت «لە دەولەتی ناوچەیی» وەربگرێ.(۳۲)

کاتێ کە دلنیا کرا کە ئەمە پتر لە سەربەخۆیی دەچێت تا لە ئوتونومی و لێیان پرسی بەرای ئەو جیاوازی لەنێوان ئەو دووەدا چییە، بێدەنگی لێ کرد.!

جارێکی دی، کەلەوە ئائومێد بوو بوو دەگەل بەغدایە پێک بێن، گوتی ئەگەر بیەوێ دەتوانێ کوردێن عێراق بخاتە سەر ئێران.

بیـرێکی سـەیر بوو!، بەلام هەرکـە بووە مـایەی سـەرنج ئیـدی خـۆی لێ بە خـاوەن نەکرد.(۳۳)

لە گفتوگۆیەکی دیدا دەگەل هەمان رۆژنامەنووسدا ئیعتراف دەکات کە نامەیەکی بۆ ئێـرانییـەکـان ناردووە و داوای یارمـەتی لێکردوون، بەلام وەلامی ئەم نامـەیان نەداوەتەوە.(۳٤)

لە راسـتیـدا بارزانی هەرگـیـز ناتوانێ بەو چاوە سـەیری رۆژنامـەنووسـان بکات کـە رۆژنامەنووسن! لەم قۆناغەدا بە جاسـوسـیـان دەزانێ، یان بە مەئموورانی وەزارەتی دەرێی ئینگلیز، یان وەزارەتی کـاروباری دەرێی فەرەنـسـایان دەزانێ، کـاتێ کـە دلنیـا دەبێ کـە ئەهی ئەمیانن نە هی ئەو، حەز دەکات بە پرسیار وەلامی پرسیارەکانیان بداتەوە.

بەلام ئەو شـتـەی کـە لە هەمـوو شـتـێـک پتـر مـیـوانانی بێگانە سـەرسام دەکـات ئەو ئائومێدییە زۆرە و ماندوویەتییەیە کە چنگیان لێداوە.

بەخـەمـێکی بێ چەند وچوون و حـاشـا هەلنەگرەوە دووبارەی دەکـاتەوە. **«کورد دۆستی نییە».**

راسـتە جەنەرال بارزانی لەم قۆناغەدا جگە لە چەند سەرۆک عەشیرەتێکی هاوپەیمانی وەک هەمزاغای مەنگور، کە ئەوەی یەکێک لە یارانی شێخ عوبەیدوللایە «دۆستی»نین.

عەزیز عەقراوی لەم سەروبەندەدا دەڵێ: «جەنەراڵ بارزانی ڕێبەرێکی گەورەیە، بەڵام سیاسەتوان نییە!»[٣٥]

بێگومان ئەمە داوەرییەکی یەکجار توندە، بەڵام ڕۆژنامەنووسێکی ڕۆژاوایی کە بە هۆشیاری و سەرناسی و تێگەیشتنێکی زۆرەوە پەی بە توخمەکانی پێکهاتەی دەروونی ئەم کەسایەتییە دژوار و ئاڵۆزە بردووە، بە جۆرە سۆزێکی بەزەیی ئامێزەوە دەڵێ «جەنەراڵ بارزانی هەرگیز هیچ فێر نابێت. ئەوەی مایەی داخ بوو ئەمە بوو کە پێدەچوو بە خۆشی ئەمەی زانی بێ» هەمان ڕۆژنامەنووس کە کەوتبووە ژێرکاریگەری «غرور وکبریا» و ئارادەیەک «ئەجابەتی» کەسایەتی ئەوەوە ناچار دان بە «شتێکی خراپ وسلبی لە سروشتی ئەودا» دەنێ.[٣٦]

تەنیا یەک شت بەلای بارزانییەوە مەبەست بوو: « دیپلۆماسیەت لە ئاستی بالادا» ئەو کەماوەیەکی زۆر، تا ساڵی ١٩٤٥ باوەڕی وابوو کە چارەنووسی کوردان پەیوەستە بە ئینگلیزەکانەوە، پاشان ڕەنگە لە ئەنجامی ڕووداوەکانی کۆماری مەهابادەوە بووبێ، بەلای سۆڤیەتدا بای دایەوە، کاتێکیش کە سۆڤیاتیەکان دەست بەرداری قازی محەمەد بوون، ئەو قەناعەتەی ل دەف چێ بوو کە دەسەلاتی گەورە لە ڕۆژهەلاتی ناڤیندا ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە. ئەو هەوڵی دەدا بە هەر شێوەیەک بووە پشتیوانی دەوڵەتی ئەوبراو بە دەست بێنێ، و لەبری ئەوە «سەرەنگونی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم و گۆڕینی عێراقی بۆ هاوپەیمانێکی یەکجار مکومی ڕۆژاوا، لە ڕۆژهەلاتی ناڤیندا بۆ ئەمەریکاییەکان پێشنیاز دەکرد» بارزانی بە جۆرە ساردییەکەوە، جارێ هەڕەشە دەکات و جارێک دان ڕۆ دەکات: « ئەگەر ئەمەریکاییەکان تەنێ بەرژەوەندی تورکیە و ئێران ڕەچاو بکەن، کە نایانەوێ ج کەسێک یارمەتی مە بدات، ئەوسا ڕەنگە ئێمەش ناچار بین یارمەتی کۆمونیستەکان قەبوڵ بکەین، ئەمە خەتەرێکە کەناکرێ، بە دوور بگیرێ» پاشان لەسەری دەڕوات «ئەگەر شەڕێک قەومی، پێویستتان بە ئێمە دەبێ، ئەم پێگە ستراتیژییەی کە ئێمە لەسەر ڕێگەی پێشڕەوی هێزێن سۆڤیەتی لە قەفقازەوە بۆ ڕۆژهەلاتی ناڤین هەمانە، فەرامۆش مەکەن، ئەوەش بزانن کە لەڕووی هێزی چەکدارییەوە ج پارتیزانی و ج عەسکەری، باشترین جەنگاوەران و سەربازانی ڕۆژهەلاتی ناڤینین، دەتوانین بەکەڵکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بێین، وەکو چۆن حیزبی کۆمونیست بۆ پێشڤەبرنی قازانجێن سۆڤیەت کار دەکات، ئێمەش دەتوانین بە قازانجی ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا کار بکەین»[٣٧]

دەساڵێکی خایاند تا ئەم قسانە سەرەنجام سەرنجی ئەمەریکاییەکانی راکێشا، ئەویش نەک سەرنجی دەوڵەتی ئەمەریکا بەڵکو سەرنجی (SIA) و ئەمەش بوو بەمایەی رۆژە رەشی کوردان.

لێ بارزانی لەراستیدا پەیوەندی دەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا نەبڕی بوو، بە پێی هەندێ زانیاریان سۆڤییەتەکان لەم قۆناغەدا، واتا هاوینی ١٩٦٢ چەندین جار لە رێگەی نوێنەرانی حیزبی کۆمونیستی عێراق و حیزبی تودەی ئێرانەوە پەیوەندییان پێوە کرد.

سۆڤیەتەکان ئاگاداریان کردەوە کە ئەگەر بزووتنەوەکە بۆ تورکیاو ئێران سیرایەت پێ بدات و بارەگەکەی لە نزیکی سنووری یەکێتی سۆڤیەتدا دابنێ، ئەوا دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەت هەموویارمەتییەکی پێویستی لە چەک و تەقەمەنی و پارە ویدەدات، کە بارزانی هەنگێ زۆری پێویست پێی بوو.(٣٨)

ئەگەرچی بارزانی لەم کاتەدا چ وەڵامێکی روسەکانی نەدایەوە، چونکە دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەت لەو سەروبەندەدا سەرچاوەی سەرەکی دابینکردنی چەک وپێداویستییە سوپاییەکانی حکومەتی قاسم بوو، لێ دوای روخانی قاسم هەندێ لەکۆمەکە مادی و مەعنەوییەکانی لە دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەت وەرگرت.

## ١٠

## شەڕو کریارێن سوپایی

بارزانی لە هەیڤی شوباتی ١٩٦٢، لە کۆسارەکانی نزیکی زاخۆ، کە لەوێندەر بارەگای تایبەتی دانابوو، دێتەدەرێ و هێرش دەکاتە سەر مەخفەرێن پۆلیس و بنکەو بارەگاکانی سوپای عێراقی، لەم شەڕانەدا سوود لە هەمواری ناوچەکە، کە بۆ شەڕی پارتیزانی یەکاویەک بوو، وەردەگرێ و لەگەلی سپی و گەلی زاویتە زنجیرە سەرکەوتنێک وەدەست دێنێ.

بارزانی لە ئاخرو ئوخری مانگی ئازاری ١٩٦٢دا دێتە کۆسارەکانی ئاکرێ، لەم قۆناغەدا دەگەڵ جەنەراڵ عەبودی نوێنەری قاسم دا دیدار دەکات.(٣٩) داخوازییەکانی بارزانی زۆر هەموارن: بارزانی جگە لە ئازادی زیندانیانی کورد، داوا دەکات کە دەوڵەت خێرا زنجیرە بەرنامەیەکی بوژانەوەی کشتوکاڵی و پیشەسازی لە کوردستاندا دەست پێبکات و قوتابخانان بکاتەوە و زمانی کوردی ببێ بەزمانی رەسمی ناوچە کوردنشینەکان.(٤٠)

لێ ئەم گفتوگۆیانە سەر ناگرێ، شەڕ سەرلەنوێ هەڵدەگیرسێتەوە، لە ئاخرو ئوخری هەیڤی ١٩٦٢/٥ دا بارزانی بادینان لە هێزێن عێراقی و جاشێن کورد پاک دەکاتەوە، سەرکردایەتی ناوچەکە بە ئەسعەد خۆشەوی دەسپێرێ و خۆشەوی لە یاوەرانی دێرینەی بارزانی بوو، لەگەڵی چوو بووە یەکێتی سۆڤیەت، بە خۆی لە زێی گەورە دەپەڕێتەوە و دوای گەمارۆیەکی سی و سێ ڕۆژە[41] مەخفەرەکانی حاجی ئومەران و رایت دەگرێ و بەمجۆرە جادەی هامیلتون، کە لە رواندزەوە دەگاتە سنووری ئێران و لەرووداوەکانی دواتری ئەم شۆڕشەدا رۆڵێکی گرنگ دەبینێ، کۆنترۆڵ دەکات.

سوپای عێراق ئیدی تا روخانی شۆڕشی بارزانی لە ١٩٧٥دا، ناگەڕێتەوە ئەم ناوچەیە.

بارزانی لەمانگی ١٩٦٢/٧دا چەکدارەکانی شێخ رەشیدی لۆلان بەرەو تورکیا و ئێران راو دەنێ و دەبێ بە دەسەلاتدار و حوکمڕانی هەموو بەشی باکووری کوردستان، لە زاخۆی سنووری تورکیا وسوریاوە تا دەگاتە سنووری ئێران.

لە هەموو ئەم شەڕو شۆڕانەدا هێزەکـی بارزانی تەنێ دەگەڵ یەکەی بچوکی سوپای عێراقی و یەکەی پۆلیس و جاشاندا رووبەروو بوو بوونەوە. ئەم جاشانە سەر بەو عەشیرەتانەن کە دژمنایەتی کۆنیان دەگەڵ بارزانی دا هەبوو، وەکو زێبارییەکان یا، لە زەمانی شێخ ئەحمەددا، پیاوانی شێخ رەشیدی لۆلان و «برادۆستەکانی» مەحمود خەلیفە.

لەساڵی ١٩٦٢ دا سوپای عێراق تەنێ چوار لەشکر بوو، بە هۆی قەیران و ناستەنگی کوێتەوە لەشکرونیوێکی سوپا لەباشووری عێراقدا بوو، جەنەراڵ قاسم هەوڵ دەدات کەمترین قوەتی سوپا لە چیاکانی باکوری کوردستاندا بهێڵێتەوە.

قوەتە عەسکەرییەکان پتر لە باشووری کوردستاندان، واتە لە ناوچەی سلێمانی و شەرگەی چوارتا خڕبوونەتەوە، بەلام سوپای عێراق کوردێکی زۆری تێدایە- چواریەک تا سێیەکی سوپا پێک دێنن- حاڵەتی هەلاتن لە خزمەت زۆرە: بەتایبەتی لەم سەروبەندەدا کەلە شەرگەی چوارتاوە عەبدولوەهاب ئەتروشی پەیوەندی بە بارزانییەوە دەکات. عەبدولوەهاب ئەفسەرێکی جارانی سوپای عێراقە، لەساڵی ١٩٣٨دا لەگوندی ئەتروشی سەر بە دهۆک لە دایک بووە، لە سالانی ١٩٦٥-١٩٦٦ دا فەرماندەی ناوچەی سلێمانی بوو، لە دوا ساڵەکانی شۆڕش دا دەبێتە بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری شۆڕش.[42]

وەکو پەیامنێری سەندەی تەلەگراف لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٢ دا دەڵێ، سوپای عێراق دەست لەگرتنی کۆسارەکان دەشوات و هەموو جموجۆڵێکی دێتە سەر چالاکی سوپایی-

ئەویش بەو پەڕی وڕە ڕوخاوی و نا ئومێدییەوە. لە دەشتەکاندا و بە پشتیوانی هێزی فڕۆکەوانی و بۆردومان کرنی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی کوردەکان.

عەزیز عەقراوی لە دەوروبەری هەولێرە، عەلی عەسکەری و جەلال تالەبانی لە دەشتی کەرکوک چالاکی دەکەن، دامەزراوە و دەزگا نەوتییەکانی عێراق لە دەستدرێژی پێشمەرگە بەدەرنین، شارەکانی کەرکوک و هەولێر و سلێمانی و کۆیە بە شەوان لە ژێر دەسەلات و حوکمی پێشمەرگە دلن.

## ١١

## کەوتنی قاسم

شەڕ، دەگەڵ شۆڕشگێڕانی کوردا کە لە هەرەڵەوە سووکە شەڕ بوو، بوو بە زۆنگاوێکی بێ پایانی ئەوتۆ کە ڕێژەیەکی زۆری دەرامەتی عێراقی قووت دەدا، -نزیکەی لە ٤٠٪ی بودجەی عێراق بۆ سوپا تەرخان دەکرا،- حکومەتی دیکتاتۆری قاسم ڕۆژ بە ڕۆژ پتر لەبەرچاو دەکەوت و نەیاری زیاتری بۆ پەیدا دەبوو.

بە کردەوە زۆربەی هەرە زۆری بیری گشتی عێراقی دژی قاسم بوو: سوپا، کە پێی وابوو تفاق و کەرەستەی پێویستی شەڕی کوردانی ناخاتە بەردەست، کۆڕ و ئەنجومەنە ناسیونالیستەکانی عەرەب، ناسری و بەعسییەکان.

لە نێو بەعسییەکاندا، ڕێکخراوێک بە ناوی «ئەفسەرانی ئازاد» دروست دەبێت و پەیوەندی دەگەڵ ڕێبەرانی شۆڕشی کوردا چێدەکەن، یەکێتی بەعسیان و کوردەکان شتێکی ناسروشتی بوو، پاشان هەر لایەنە هەر جۆرە «پەیمان» یا «ڕێککەوتننامەیەک» لەم ڕووەوە بە درۆ دەخاتەوە.

لە ساڵی ١٩٦٢ دا جەنەراڵ تاهیر یەحیا سوپاسالاری ئایندەی سوپای حکومەتی بەعسی حەسەن ئەلبەکر (شوباتی ٦٣-١١/٦٣) لە ڕێگەی ئەفسەرێکی گەنجی کوردەوە بەناوی کەریم قەرەنی، پەیوەندی دەگەڵ ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا کرد، هەرچەندە کوردەکان لە ناسیونالیستانی عەرەب زۆر بەگومان بوون، ئەوجاش ئەم پەیوەندی و دیدارانە چەند هەفتەیەک بەردەوام بوو.

مەبەستی هەنوکەیی بارزانی لە ڕاستیدا «ئەمانی دوپشکەکەی بەغدا»[٤٣] واتە قاسم بوو، ئەگەر بۆ ئەم کارە ناچار بێ دەست دەگەڵ دژمنانی ئایندەی کوردیش دا تێکەڵ بکات هەر ئەم سیاسەتە بوو کە درانزە ساڵان لەوەدا بووە هۆی دامرکاندنەوەی شۆڕشی نەتەوەیی

کورد بە ڕێبەرایەتی جەنەراڵ بارزانی.

لە ١٩٦٢/٤/٢٨ برایم ئەحمەد سیاسەتی هاوکاری هێزێن نەیاری قاسم قەبوڵ دەکات. بەڵام لە نامەیەکی دووورودرێژدا و بەو پەڕی ڕاشکاوی وردی مەرجەکانی کورد بۆ بەشداری لەم هاوکارییەدا روون دەکاتەوە و مەرجەکان ئەمانەن:

«گەلی کورد هەقی جیابوونەوەی لە وڵاتی عێراق هەیە، بەڵام نایەوێ ئەم مافە پیادە بکات.»

بۆ نەهێشتنی هەر جۆرە بەدحاڵی بوونێک لە ئایندەدا، پێویستە ئێوە بەر لە هەموو شتێک ئوتونومی ناوخۆی کوردستان قەبوڵ بکەن، ئەمە لە یەکێک لە یەکەمین بەیاننامەکانی حکومەتی شۆڕش دا ڕابگەیەنن»[٤٤]

**برایم ئەحمەد لەم نامەیەدا داوا دەکات کە «ئەفسەرانی ئازاد» رازی بن کە «جەنەراڵ مەلا مستەفا بارزانی وەکو سەرۆک وەزیر یان حوکمرانی کوردستان دابنێن و مافی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی ئوتونومیدار بەو بسپێرن.»[٤٥]**

کوردەکان، بەنووسین ئەو بەڵێنەیان پێ نادرێ، بەڵام ئەفسەرانی ئازاد لە هەیڤی ئابی ١٩٦٢ دا لە ڕێگەی فوئاد عارفەوە، کە یەکێک بوو لە حکومەتەکەی قاسم وپاشان بوو بەیەکێک لە حکومەتی حەسەن ئەلبەکریش بە زارەکی ئەم بەڵێنە دەدەن.

ڕۆژی هەینی ١٩٦٣/٢/٨، سەعات هەشتونیوی بەیانی رادیوی بەغدا لەنکاو بەرنامەکانی دەبڕێ، دوای بێدەنگییەکی چەند ساتی، لە پڕ یەکێک لە مایکرۆفۆنی رادیۆکەوە هاوار دەکات: «دیکتاتۆریەتی خیانەتکار وەکو مشک لە ژێر دارو پەردوی وزارەتی بەرگرییدا تۆپیوە.»

لە ڕاستیدا قاسم هێشتا زیندووە، بەڵام مردنەکەی وەستاوەتە سەر وەخت و لە نان وساندایە. قاسم دوای ئەمە بۆ بە درۆخستنەوەی مردنی خۆی، لە تەفزیۆن دا دەردەکەوێ و وا خۆی پیشان دەدات کە جەماعەتێکی کەمی خەڵکی بەغدا بۆ تازە کردنەوەی بەڵێن و وەفاداری هاتوونەتە لای و بەرێوە پێشوازی کردوون، هەوڵ دەدات بەرگرییەک رێک بخات، بەڵام شەوێ وەزارەتی بەرگری لەلایەن قوەتی زرێی ئوردوگای رەشیدەوە کە پەیوەندی بە کودەتاچییەکانەوە دەکات گەمارۆ دەدرێ. قاسم کە گەمارۆ دراوە، هەوڵێکی بێهودە دەدات کەخۆی بگەیەنێتە ڕوباری دیجلە و هیچ بەهیچ ناکات. لە سەعات شەشی بەیانی شەممەدا تەسلیم دەبێ دەیبەن بۆ بارەگای رادیۆ، لەوێندەر لەلایەن عەبدولسەلام

عارفەوە تەحقیقی لەگەڵ دەکریێ و دادگایی دەکریێ. قاسم کە لە ١٩٦١/٧/١٤ دا عەبدولسەلامی بەخشی بوو، عارف دەیەوێ تێی بگەیەنێ کە «ئەو سەرۆکی راستەقینەی شۆڕشی ١٤/تەمووزی/ ١٩٥٨» نەبووە. سەرەنجام قاسم لەبەردەم کامیرای تەلەفزیۆنی دا بە دەسترێژێک دێتە کوشتن.

## ١٢

## راوی کۆمۆنیستان

روخانی قاسم، خۆی لە خۆیدا نیشانەیەکی «راوی کۆمونیستان» بوو، شتی وا تەنانەت لەسەردەمی حکومەتی پاشایەتیش دا لە عێراقدا، رووی نەدابوو.

«بازوبەند کەسکانی» حەرەس قەومی کەوتنە راووشکاری راستەقینەی مرۆڤان. ژمارەیەکی زۆریان گرت، ئەوەندە زۆر بوون جێیان نەدەبوومەوە ناچار بوون لەسەربازخانەکانی بەغدایەدا، شوێنی تازەیان بۆ بکەنەوە، ژمارەیەکی زۆریانیش لە کۆمونیستان هەر لە جێوە و بێ دادگایی کوشت.

کودەتای بەعسیان لەبەغدایەدا بەلای کەمەوە بووە مایەی مەرگی هەزار کەس و (47) یەک هەفتە کوشتاری کۆمونیستان بەردەوام بوو، هاتوچۆ قەدەغەکرا، سوپا بە تانکەوە رێگەی هاتن و چوونی گەرەکە «هەژار نشینەکانی» بەغدای گرت و ماڵ بەماڵی تەحەری کرد.

ژمارەی گیراوان، کە هەرگیز بە تەواوەتی دەرناکەوێ، بەرادەیەک زۆر بوو کە لە وەزارەتخانەی نەوتدا تەنێ دوو فەرمانبەر مابوونەوە: ئەوانی دی لە بەڕێوەبەرەوە بیگرە تا دەگاتە دەرگاوان هەموویان هەر گیرابوون.[٤٨]

ژمارەیەک لە خەباتکارانی حیزبی دیموکراتی کوردستانیش بەو هەنجەتەی کە کۆمونیستن گیران.

## ١٣

## کاردانەوەی کوردان

جەنەراڵ بارزانی لە ١٩٦٣/٢/٨دا یەک لایەنە ناگربڕی راگەیاند بوو وکوردەکان لە حاڵێکدا کە گوێیان بە رادیۆوە نابوو، بە تاسەوە چاوەڕوانی خوێندنەوەی بەیاننامەی ئوتونومی بوون.

بەلام بەیاننامەکان یەک لەدوای یەک خوێندرانەوە و ج هەواڵێک لە «خەبەری جادویی» ئوتونومییەوە نەبوو.

هاونیشینانی بارزانی ئیدی بێ تاقەت بوون وگوتیان «ئەمجارەش کلاومان کرایە سەر»!

**سەرچاوە و پەراوێزان:**

١. بڕوانە کتێبی کوردستانی عێراق ل ٩٤-١٠٠-١٠١ نووسینی عیسمەت شەریف وانلی.

٢. کوردستانی عێراق بە سەرپشتی هێستروە II «پارتیزانەکان» ئەریک رولو. لوموند. ١٩٦٣/٤/١١.

٣. هەمان سەرچاوە

٤. هەمان سەرچاوە IV « سیاسەترلانانی ئەشکەوت نشین» ١٤-١٥/٤/١٩٦٣.

٥. بڕوانە کتێبەکەی عیسمەت شەریف وانلی، بەرپەڕێن ١٧٠-١٧٤.

٦. هەمان سەرچاوە ل ١٠١ لە ساڵی ١٩٧٤ دا عەبدوڵڵا ئیسماعیل یەکێک بوو لە رێبەرانی حزبی شۆڕشگێڕی کورد، کە هاوکاری دەگەڵ بەعس دا کرد.

٧. ئەریک رۆلو، لوموند، ١٩٦٣/٤/١١.

٨. لە ساڵی ١٩٦٢ دا تەنێ لە شاری کەرکوک دا ١٠/٠٠٠ دینار کۆکرابەوە «ئیبراهیم ئەحمەد، ناوپردان، ١٩٧٣».

٩. ئەریک رۆلو، لوموند ١٩٦٣/٤/١١

١٠. هەمان سەرچاوە ١٤-١٥/٤/١٩٦٣

١١. هەمان سەرچاوە ١٩٦٢/٤/١١

١٢. دانا ئادەمز سمیس، نیویورک تایمز ١٩٦٢/٩/١١

١٣. بە پێی بەیرەو پرۆگرام بەدرێژایی تەمەن سەرۆکی حیزب بوو.

١٤. ئەریک رولو «پاتریستێکی شۆڕشگێڕ» لوموند ١٩٦٣/٤/١٣.

١٥. ئەریک رولو، هەمان سەرچاوە ١٤-١٥/٤/١٩٦٣

١٦. عیسمەت شەریف وانلی ل ١١٧.

١٧. ئەریک رولو لوموند ١٩٦٣/٤/١٣

١٨. سەنەدی تەلەگراف ٣٠/١٢/١٩٦٣د

١٩. حەسەن ئەرفەع،کوردەکان، ل ١٣٦.

٢٠. زانیاری نهێنی

٢١. عیسمەت شەریف وانلی ل ١١٧

٢٢. هەمان سەرچاوە.
٢٣. ئەریک رولو «لەگەڵ قاچاخچیاندا» لوموند ١٩٦٣/٤/١٠
٢٤. هەمان سەرچاوە ١٤-١٩٦٣/٤/١٥
٢٥. هەمان سەرچاوە
٢٦. عیسمەت شەریف وانلی ل ١٢٠
٢٧. هەمان سەرچاوە ل ١٢١
٢٨. بروانە ژمارەی ١٩٦٢/١٠/١ی خەبات، کە لە لاپەڕەی ١٢٢-١٢٣ی کتێبەکەی عیسمەت شەریفەوە وەرگیراوە.
٢٩. ئەریک رولو، لوموند ١٩٦٣/٤/١٣
٣٠. دانا ئادامز سمیس، نیویورک تایمز ١٩٦٣/٤/١٣
٣١. جگە لە ئەریک رولو، کە دەیتوانی بە زمانی عەرەبی گفتوگۆی دەگەڵ دا بکات.
٣٢. دیڤید ئادامسن، جەنگی کوردستان، لەندەن ١٩٦٤، ل ١٤٧
٣٣. هەمان سەرچاوە ل ١٦٦
٣٤. هەمان سەرچاوە ل ١٨١
٣٥. هەمان سەرچاوە ل ١٥١
٣٦. هەمان سەرچاوە ل ١٨٦- ١٨٧
٣٧. دانا ئادامز سمیس، نیویۆرک تایمز ١٩٦٢/٩/١٠
٣٨. و. هاول، یەکێتیی سۆڤیەت و کوردەکان ل ٤١١، هەروەها پەراوێزی ل ٤١٢
٣٩. بە گوتەی دانا ئادامز سمیس ئەم دیدارە لە ١٩٦١/١٢/١٧ دلو لە سەرسەنگ رووی داوە. ل ٢٠٧، گەشتی نێو جوامێران.
٤٠. جەرجیس فەتحوڵلا، وەرگێڕی عەرەبی کتێبەکەی دانا ئادامز سمیس، هەڵبەیڤین دەگەڵ نووسەردا. حاجی ئۆمەران، ١٩٧٤
٤١. د. ئادامس، جەنگی کوردستان ل ١٩٦
سەربازگەی رایات ١٠٥ سەربازی عێراقی تێدا بوو، کە وێڕای نەبوونی خۆراک و ئاو بەرەڤانیان کرد.
٤٢. بە گوتەی دیڤید ئادامس ٧٠ ئەفسەر کە یەکێکیان جەنەراڵ بوو لەئاخر و ئۆخری ساڵی ١٩٦٣ دا لەسوپای عێراقی هەڵاتبوون. جەنگی کوردستان، ل ١١٧
٤٣. ئەریک رولو، لوموند ١٩٦٣/٣/١٢
٤٤. هەمان سەرچاوە.
٤٥. عیسمەت شەریف وانلی، کوردستانی عێراق ل ١٧٥
٤٦. پەیامی تەلەگرافی ئاژانسی فرانس پرێس ١٩٦٣/٢/١٤
٤٧. هەمان سەرچاوە.
٤٨. هەمان سەرچاوە.

## فەسلی حەوتەم

## بەشووی یەکەم

### شوبات - حوزەیران ۱۹٦۳

تاکو ئەمڕۆکەش پەردەیەکی ئەستور بەسەر ئەو هەلومەرجەوەیە کە کودەتای ۱۹٦۳/۲/۸ی تێدا ئەنجام دراو ئەخشی عەسکەرییەکان و مەدەنییەکان لەو کودەتایەدا چ بوو، چۆن بووە... ئەخشەدانەرانی ئەم کودەتایە، کە زۆر خراپ ئەنجام درا، بەعسییەکان بوون «ئەم یاوەرە عێراقییانەی میشێل عەفلەق کە خەڵکانی هەرزەکار و بێ ئەزموون بوون و لەلای خەڵکی نەناسرابوون، پێویستیان بەکەسایەتییەکی بەرجەستە، بەجەنەراڵ نەجیبێک هەبوو»[1]

ئەمانە کەلەسەر خەباتی نهێنی راهاتبوون، بەڵام هێشتا توانار لێهاتوویی ئەوەیان نەبوو کە بەم زووانە جڵەوی دەسەڵات بگرنە دەست و ژمارەیەکی زۆری رێبەرانیان هێشتا لە زیندان دابوون، وایان بیر دەکردەوە، کەئەگەر عەبدولسەلام عارف بسەرۆکی حکومەت دابنەن، بەو حەساوەی کەنێوبراو وەکو یەکێک لە قارەمانانی شۆڕشی ۱۹۵۸/۷/۱٤ ناوو ناوبانگ و پایەیەکی هەیە، دەرفەت و دەلیڤەیەکی چاکتریان بۆ دەرەخسێت کە لەدەسەڵاتدا بێیننەوە، بەمجۆرە شتەکە شێردرایەوە و هەر کە رادیۆی بەغدا لە هەوەڵ رۆژی کودەتاکە دا دامەزراندنی «ئەنجومەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕش»ی بە سەرۆکایەتی عەبدولسەلام عارف و بێ ناوهێنانی ئەندامەکانی تری ئەنجومەنی نێوبراو و بێ ئاماژە کردن بەکوردستان، رادەگەیەنێ، لایەنگرانی بارزانی دەیانەوێ دەم ودەست، دەست بە هێرشان بکەن و ئەو وەزع وحاڵە پەشێوە بقۆزنەوە و دەست بە سەر شارانی گەورەی وەک کەرکوک و سلێمانیدا بگرن و لە رژێمی تازەی بکەن بە ئەمری واقیع.[2]

بەڵام بارزانی کە لە هەموو تەمەنی دا هەر پیاوێکی بە پارێز بوو، خۆی لە «موغامەرە» نادات و دەیەوێ هەوەڵجار و بەرلەوەی دەست بداتە شەڕێکی تازە، هەموو رێگاکان و شێوازەکانی گفتوگۆ کەشف بکات و بدۆزێتەوە.[3]

دوای هەفتەیەک حکومەتی تازەی عێراق، کە دوو وەزیری کوردیشی تێدا دەبێت، نیازی خۆی سەبارەت بە «چارەسەری ئاشتیانە»ی مەسەلەی کورد پاش زانینی بۆچوونی خودی کوردەکان، رادەگەیەنێ.

## ١
## پەیوەندییە سەرەتاییەکان

هەر بۆ تاقیب و پەیگیری ئەم کارە، بارزانی رۆژی ١٩٦٣/٢/١٩ جەلال تالەبانی و سالح یوسفی بۆ تاقیکردنەوەی نیازی حکومەت بۆ بەغدا دەنێرێ. یەکەمین پەیوەندییەکان یەکجار بە فێڵ و فەند و پڕ لە تەڵەکەبازی دەبن، جەنەراڵ تاهیر یەحیا، کە لەبەهاری ساڵی ١٩٦٢دا بەخۆی لەنێوان «ئەفسەرانی ئازاد» وکوردەکاندا بوو، ئێستا سالاری سوپایە «زۆر زۆر عوزرخوایی دێنێتەوە» و ئەگەر ئەو پەیمان و بەڵێنانەی بە کورد دراون جێبەجێ نەکراون، هۆیەکەی ئەمە بوو کە «لەو کاتە بەملاوە ژمارەیەک لەناسیونالیستان هاتونەتە ناو ئەنجومەنەوە وزۆریان کەیف بە ئۆتونومی کوردستان نایەت.»[٤]

رێبەرانی بەعسی بەغدا بە زەبری لێهاتوویی و زیرەکیان لە فرتوفێڵان دا، لەسەری دەرۆن و دەڵێن نەیاندەتوانی هەر دوای دەسەلات وەرگرتن بە «هەراج کردنی» باکوری عێراق، هەموو ولاتانی عەرەب لە خۆیان بشەمزێنن و داوا دەکەن جەلال تالەبانی لە گەڵ ئەو شاندە رەسمییەدا کە بۆ گفتوگۆ دەگەڵ سەرۆک ناسر دەچێت بۆ قاهیرە، بڕوات بۆ نک وی، لە ناخی دڵەوە ئاواتەخوازن ناسر کە لەو سەروبەندەدا بە تەمای یەکخستنی جیهانی عەرەب بوو لەسایەی رێبەرایەتی خۆیدا، وەکو ئەوان چالاکی و چەلەنگی جوداخوازانەی کوردان ریسواو مەحکوم بکات.

## ٢
## سەرۆک ناسر و مەسەلەی کورد

بەلام گەورەترین سەرسامی بەلای عەرەبێن ئەندامی شاندی عێراقییەوە واتا بەلای عەلی سالح ئەلسەعدی یاریدەدەری سەرەک وەزیران و وەزیری ناوخۆ، تالیب شەبیب، وەزیری کاروباری دەرەوە، جەنەراڵ عەماشی وەزیری جەنگ،[٥] ئەمە بوو کە سەرەک ناسر «بە دڵ و بە گیان لایەنی کوردەکانی گرت» وگوتی: «چ کەسێک ناتوانێ نکوڵی لە بوونی نەتەوەی کورد بکات. ئەم میللەتە مافی خۆی هەیە و یەکێک لەم مافانەی داواکردنی ئۆتونومیە»[٦] ئەوجا بە دووپات کردنەوەی ئەم بابەتەی کە عەرەب دوژمنی بەهێزی وەکو ئیسرائیلیان هەیە، لەسەری رۆیی « ئێمە مختی ئەوەمان نییە کە بە کێشمانەکێشی ناوخۆ بیکوژێن، کوردەکان دەبێ لە چوارچێوەی عێراقدا بە مافی خۆیان بگەن و مافی خۆیان هەبێ، بۆچی لە زاراوەی ئۆتونومی دەترسن.»[٧]

بەلام بە هەموو راشکاوییەکەوە کە ناسر لەم بارەیەوە نواندی، ئەم هەلوێستە، نیمچە رەسمی بوو، لە هەلوێستی رەسمی دا دەبوایە ئەوپەڕی پارێزی بکار ببردایە. هەلبەتە تەنانەت دوای دەست پێکردنەوەی شەڕیش دەستبەرداری ئەم هەلوێستە پارێز ئامێزە هەر نەبوو.

ناسر لەمە حالی بوو بوو کە ئەگەر یەکێتی دەگەل عێراق و سوریادا سەربگرێ و ئەو «ناسر» قابیل بێ بەوەی ئوتونومی بە کوردان بدرێ ئەوا پلەوپایەی خۆی لە ناو عەرەبەکاندا دەخاتە خەتەرەوە. بەلام لە هەمان کاتدا هیچ مەیلی لەسەر ناردنی هێز بۆ شەڕی کوردستانی عێراق نەبوو. ئەوەش لە کاتێک دا کە هێزەکانی میسر لە زەلکاوی یەمەن دا چەقی بوون.[٨]

**شاندی عێراقی لە جەزایریشدا تووشی هەمان سەرسامی دەبن: سەرۆک بن بلا دەلێ: «من بەرلەوەی عەرەب بم مرۆڤم، من ئاگام لەم مەسەلەیە هەیە، ئێمە بە خۆشمان لە پێناوی ولاتەکەماندا خەباتمان کرد.»[٩] بەمجۆرە شۆڕشی کوردان و شەڕی بەرەی نیشتمانی ئازادیبەخشی جەزایر لەیەک ریزدا دادەنێ.**

## ٣

## خۆ دزینەوەی عێراقییەکان

بەلام رێبەرانی عێراق کەگوێیان لە ولاتانی عەرەب گرت، بە قسەیان نەکردن، کە گەڕانەوە بۆ بەغدا سەرلەنوێ کەوتنە بیانوو گرتن ومەسەلەی «ئامادە کردنی بیروڕای جەماوەری خەلکی عێراق»یان هێنایە گۆڕێ و بۆ خۆ دزینەوە لە بڕیاری یەکجارەکی هەزار و یەک بڕو بیانوو دەهێننەوە وپێشنیازی جۆراوجۆر دەکەن. جەنەرال عەماش پێشنیاز دەکات کە کۆنفرانسێکی گشتی بە بەشداری هەموو حیزبەکانی عێراق، بۆ باسی مەسەلەی کورد بگیرێ. ئەوجا پێشنیازی ئەوە دەکات ریفراندۆم سەبارەت بەم مەسەلەیە ئەنجام بدرێ. پاشان پێشنیاز دەکات رێککەوتننامەیەکی نهێنی بکرێ.[١٠]

**لە ئاخرو ئوخری شوباتی ١٩٦٣ (٢٨ شوبات) جەنەرال بارزانی لە هەلمەیەکی رۆژنامەوانی دا لەقەلادزێ توڕە دەبێت و رادەگەیەنێ کە فەرمانی بە پێشمەرگەکانی داوە بگەڕێنەوە سەنگەرەکانی خۆیان. رادەگەیەنێ کە ئامادەیە دەست بە شەڕ بکاتەوە و تەنانەت ئەگەر دەولەتی عێراقی بە ئوتونومی کوردستان رازی نەبێ، سەربەخۆیی رادەگەیەنێ،[١١] هەلبەتە ئەم هەڕەشانە کاری خۆ دەکەن.**

٤

## دیداری کانی ماران

ئەگەرچی زۆری نەمابوو، ئەم قەرارە لە دواساتەکانی خۆیدا هەڵوەشێتەوە بەلام سەرەنجام و لە ١٩٦٣/٣/٤دا لە گوندی کانی ماراندا دیدارێک لە نێوان جەنەراڵ بارزانی و شاندێکی عێراقی دا دەکرێ.

شاندە عێراقییەکە بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ تاهیر یەحیا بوو و بریتی بوو لە عەقیدێک، فەرماندەی هێزی فڕۆکەوانی وئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش (رەنگە حەردان تکریتی بووبێ) جەنەراڵ فەتاح شالی و سێ کەسایەتی کورد، بابا عەلی و فوئاد عارف کە وەزیر بوون، و حەیدەر سلێمان سەفیری عێراق لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

پەیامنێری تایبەتی لوموند، کەلەم دیدارەدا ئامادە بووە، هاتنی شاندە عێراقییەکەی بە هەلیکۆپتەر، وەسف کردووە، «ئەندامانی شاندەکە لە رووتەنێکی کانی ماران دا و لەناو بازنەی پێشمەرگەی سەراپا چەکداری بەرزاڵەت خۆشکوزەرانی، پۆشتەو پەرداخی، قایشی کامیرای رەسم گرتن بە شانا هاتووە خوارە»[١٢]

یەکەم دیداریان زۆر سارد بوو.

جەنەراڵ تاهیر یەحیا ئەوەی روونکردەوە کە ئەم شەڕو «براکوژییەی رژێمی قاسم بەسەر کورد وعەرەبیدا سەپاندە» و ئەوجا گوتی کورد و عەرەب هەمیشە «دوو نەتەوەی تەبا» بوون.

بارزانی بە شێوازە تایبەتییەکەی خۆی وەلامی دایەوە: «من و تۆ هەردووکمان سەر بە تیرەی بەشەرین.. لە گەڵ ئەوەشدا تۆ ناوت تاهیرەو من ناوم مستەفایە! ئیدی بێفایدەیە ئەگەر بلێین دوو مرۆڤی تایبەتی نین، کە هەریەکە و کەسایەتی تایبەتی خۆی نییە»

بە زمانێکی توندتر گوتی: «دیارە هەر رایەکی پێچەوانەی ئەمە بە ناچاری دەبێتە مایەی ململانێی بەردەوام، گەلی کورد چیتر باوەڕ بەوە ناکەن کە ئاشتی و دۆستایەتی بە قسەی رووت دابین بکرێ، قاسم زۆری لەم قسانە بۆ کردین ولە هەمان کاتیشدا درێغی لەکوشتنی ژن و منداڵمان نەکردا»

جەنەراڵ بارزانی پاشان لەسەری دەڕوات و هەر بەو زمانە دەڵێ «من بۆیە لایەنگری و پشتیوانیم لە رژێمی ئەنگۆ نەکردووە، بارێک و رەوان پێت بێڵم، لەبەر ئەمەیە کە بەغدا خۆی لەوە دزییەوەکە دان بە بەمافی ئۆتۆنومی گەلی کوردا، لە چوارچێوەی ولاتی عێراقدا

**بێ، جا ئەم داوایە ئەمڕۆکەش هەر هەمان داواکەی دوێنێیەو لایەنی کەمی داوای ئێمەیە بۆ کۆتایی هێنانی شەڕ»**

ئەوجا جەنەراڵ تاهیر یەحیا داوا دەکات کە گفتوگۆکە لە کۆمیتەیەکی بچوک دا بەردەوام بێ، دوای سێ سەعاتان، کوردەکان و نوێنەرانی دەوڵەتی بەغدا بەرووخۆشی و زەوقەوە لێکدی جودا دەبنەوە و مالاوایی دەکەن، ئەمە مایەی سەرسامییە، چونکە بارزانی داوا و داخوازی زۆر دژواری تەسلیم بە جەنەراڵ تاهیر یەحیا کردووە.

### ٥
### داخوازییەکانی بارزانی

ئەم لیستە بەتایبەتی ئەم بابەتانەی لە خۆگرتبوو

- دان نان بە مافی ئوتونومی بۆ گەلی کورد.
- دانانی ئەنجومەنێکی جێبەجێ کردنی تایبەت بە کوردستان، لەگەڵ سەرۆکێک دا کە لە بەرانبەر ئەنجومەنی کوردیدا کە ئەندامانی لە ریفوراندۆمێکی گشتیدا و راستەوخۆ و بە نهێنی هەڵبژێردراون، بەرپرسیار بێ.
- دانانی جێگرێکی کورد بۆ سەرکۆمار.
- هەرێمی کوردستان بازێرێن سلێمانی و کەرکوک و هەولێر و ئەو بەشانەی شارانی موسڵ و دیالە دەگرێتەوە کە زۆربەی دانیشتوانیان کوردن.
- دامەزراندنی هێزێکی جەندرمەی کورد.
- دابەشکردنی دەرامەتی نەوت.[١٣]

**بارزانی بە رێکخستنی ئەم لیستە بۆ یەکەمجار بیروبۆچوون و تێگەیشتنی کوردی لەمەڕ ئوتونومی بە شێوەیەکی ورد خستە روو، لەشێوەی جۆرە هۆشدارییەکدا، تەسلیم بە دەوڵەتی عێراقی کردبوو، بەو مەرجەی کەئەگەر ئەم داخوازیانە لەماوەی سێ رۆژاندا، وەڵام نەدرێتەوە ئەوا شەڕ دەست پێدەکاتەوە.**

دەوڵەتی بەغدا کە سەری لەم زێدەخوازییەی کوردان سوڕماوە، رایدەگەیەنێ کەئەم داخوازییانە قابیلی دان و ستان نییە. لە رۆژی شەشەمی ئازاری ١٩٦٣ دا، تالیب حوسەین شەبیبی وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق ویەکێک لە رێبەرانی باڵی راستی بەعسیان رایدەگەیەنێ: « باسی ئوتونومی نییە، تا ئێستا لە زیادە گفتوگۆمان دەگەڵ ئەم

«یاخی»یەدا، کە تەنانەت لەلایەن خودی کوردەکانیشەوە پشتیوانی لێناکرێ، دانوستانمان کردووە، ئەگەر جەنەراڵ بارزانی نەیەوێ سازشمان لەگەڵدا بکات، ئەوا لە ماوەیەکی کەمداو بۆ هەمیشە کۆتایی بە شۆڕشەکەی دێنین.(١٤)

لە بەغدایە کۆڕ و ئەنجومەنە نەتەوەییەکانی کورد، بەرانبەر بە بێدەنگی تەواوەتی ئەنجومەنە حکومەتییەکان سەبارەت بە پەیوەندییە بەردەوامەکان، زۆر بێ تاقەت و حەوسەڵە دەبن.

## ٦

## خەیاڵ و گومانان

بەڵام لە رۆژی ١٩٦٣/٣/٩ دا ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراقی « دان بەمافی لامەرکەزی گەلی کورد» دەنێت، بەڵام لە روانگەی رۆژنامەوانی جیهانییەوە، کوردەکان سەرکەوتوون، رۆژنامەی لوموند بە مانشێتی درشت دەنوسێت: بەغدا ئوتونومی بە کوردستان دەدات!» (١٩٦٣/٣/١٢)

بەڵام لەراستیدا شتەکان روون نین، حکومەتی بەغدا ئەم «لامەرکەزییە» بەبێ رەزامەندی بارزانی رادەگەیەنێ، بێگومان ئەم بەیاننامەیە بە هیچ جۆرێ داخوازی کوردەکان کە هێشتا هەر نهێنین و بەو شێوەیەی کە جەنەراڵ بارزانی لە دیداری ١٩٦٣/٣/٤ یدا دەگەڵ جەنەراڵ تاهیر یەحیا داوای کردبوو، دابین ناکات.

ئەگەر عەلی ساڵح ئەلسەعدی، یاریدەدەری سەرەک وەزیرانی عێراق لە هەڤپەیڤینێکی رۆژنامەوانی دا لە ١٩٦٣/٣/١١ لە دیمەشق بەرگری لەنەخشە وبڕیارەکانی وڵاتەکەی دەکات و دەڵێ کە «کوردەکان لە هەموو بوارەکاندا، جگە لە کاروباری دەرەوە و دارایی کە لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیدا دەبن، ئیدی دام و دەزگای ئیداری خۆیان دەبێ، ئەمە بە واتایەک بەرگرییە لە سیاسەتی دەوڵەتی خۆی و لە حەقیقەتدا چ رێککەوتنێک لەگەڵ کورددا نەکراوە، چونکە داواکانی بارزانی دەقاو دەق لە هەمان بواری دارایی و بەرگری دایە کەدان وستانەکەی راگرتووە.

بارزانی لەلایەن هەندێ کۆڕ وکۆمەڵی کوردەوارییەوە گوشاری لێدەکرێ کە دەگەڵ بەغدایە رێک بکەوێ، ئەویش داوای «کۆنفرانسێکی جەماوەری» دەکات، ئەم کۆنفرانسە لە١٨/٣/١٩٦٣ دا لە کۆیە و بەبەشداری ٢٥٠ نوێنەر «کە ٢٠٠یان مافی دەنگدانیان دەبێ» لە حیزبی دیموکراتی کوردستان و رێکخراوە عەسکەری و ناوداران وپیاو ماقوڵان

ورۆشنبیرانی کورد، دەکرێ.

کۆنفرانس لیستێکی تازەی داواکاری ئامادە دەکات و دەیکات بە یادداشتنامەیەک و بەویاداشتنامەی «٢٤/٤/١٩٦٣» ناو دەردەکات، ئەوجا شاندێک بەسەرۆکایەتی جەلال تالەبانی هەڵدەبژێردرێ و رای دەسپێرێ کەدان وستان دەگەڵ حکومەتی بەغدایە بکەن.[١٥]

## ٧

## چاووڕاوی بەغدا

گفتوگۆ سێ قۆڵییەکانی (میسر، سوریا و عێراق) لە قاهیرە جارێکی دی ئەوە نیشان دەدا کەسەرانی بەعسی بەغدا گەمەیەکی دوو لایەنەیان کردووەو هەرگیز نیاز و مەبەستیان نەبووە بەراستی دەگەڵ کوردا رێک بکەون.

لە ٨/ئازار/ ١٩٦٣دا واتە رێک مانگێک دوای روخانی قاسم، حیزبی بەعسی سوریا بە زەبری کودەتایەک دەسەلاتی وەرگرت، هەرچەند رۆژێک دوای کودەتاکە لە قاهیرەدا گفتوگۆ لەمەڕ یەکخستنی میسرو سوریا و عێراق لە چوارچێوەی یەک کۆمار دا بە نێوی «کۆماری یەکگرتووی عەرەبی» دەستی پێکرد.

سەرەک ناسر پێشنیاز دەکات نوێنەرانی جەنەراڵ بارزانی- یش بۆ بەشداری لە دوا قۆناغی گفتوگۆدا دەعوەت بکرێن کە قرێر بوو لەناوەراستی نیساندا لەقاهیرە ئەنجام بدرێ. لێ سەرانی بەغدا دەڵێن پێویست بەم کارە ناکات، چونکە مەسەلەکە «لە نێو خودی عێراقییەکان» دا حەڵ و فەسڵ بووە! لە کاتێک دا رێبەرانی بەغدا بەو جۆرە پاساو بۆ جێبەجێ نەکردنی داوایەکانی بارزانی دێننەوە کە گوایە مەسەلەی کورد لە «چوارچێوەی نیشتمانی» دەرچووە و ناسر دژی هەر جۆرە «ناشتەواییەک کە زیانبە یەکێتی عەرەب بگەیەنێ، دەوەستێ.»[١٦]

## ٨

## خاوبوونەوەی پەیوەندی بارزانی و بەعسییەکان

لە ناوەڕاستی نیسانی ١٩٦٣دا رۆژنامەی ترود Troud ئۆرگانی یەکێتی کرێکارانی یەکێتی سۆڤیەتی باسی ئەگەری هەڵگیرسانەوەی شەڕ دژی کوردان دەکات.[١٧]

لە راستیدا پچرانی پەیوەندی زۆر دوور نییە، جەلال تالەبانی دوای پازدە رۆژان

یاددلشتنامەکەی ١٩٦٣/٤/٢٤ی کوردان لە بەغدایە بلاو دەکاتەوە.- ئەم یادداشتنامەیە وێنەیەکی دەستکاری کراوی «لیستی ئەو داخوازییانەیە» کەلە ٣/٤ دا درابووە جەنەراڵ تاهیر یەحیا و لە کۆنفرانسی کۆیەدا پەسەند کرا.

لەم یادداشتنامەیەدا نە وشەی «ئوتونومی» و نە وشەی «لامەرکەزی» بەکار نەهاتووە و بەرچاو ناکەوێ، لێ داخوازییەکان لە رادەبەدەرن، کوردەکان لە راستیدا خوازیاری وڵاتێکی دوو میللەتێن لەسەر شێوازی وڵاتانی فیدراڵی ئەوروپایی «وەکو یوگسلاڤیا، یان تا ئەندازەیەک وەکو سویسرا»

تاڵەبانی دوای ئەوەی ئەم یادداشتنامەیە بلاو دەکاتەوە، کە هەر بلاوکردنەوەکە بەخۆی مانای برینی پەیوەندی دەگەیەنێ. رایدەگەیەنێ «ئێمە ئامادەین لە پێناوی گفتوگۆدا لە بەغدایە بمێنینەوە، بەلام ئەگەر حکومەتی بەغدایە چاکنیازی نیشان نەدات، ئەوا هەفتەیەکی دی بۆ باکور دەگەڕێینەوە»[١٨]

لێ تاڵەبانی رۆژی ١٩٦٣/٥/٣١ بە دیدارێکی دۆستانەی سەرەک ناسر بۆ میسر دەڕوات.

لێ ناسر چ کارێکی لە دەست نایەت جگە لەوەی دانیشێت و تەماشای هەڵگیرسانەوەی شەڕی بەغدا لە گەڵ کوردەکاندا بکات.

**سەرچاوە و پەراوێزان**

١. ئەریک رولو، لوموند، ١٩٦٣/١١/٢٠

٢. بروانە کتێبی «حیزبی سوسیالیستی بەعسی عەرەبی» نووسینی کەمال جابر، زانکۆی سیراکوز، نیویورک ١٩٦٦، نووسەر باسی دیدارێکی خۆی دەگەڵ تاریق عەزیزدا دەکات، لە شوباتەوە تا ١٩٦٣/١١ کە سەرنووسەری رۆژنامەی الجماهیربوو، دوای گەڕانەوەی بەعسی بۆ سەر حوکم بوو بە سەرنووسەری الثورة، لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٤ دا تاریق عەزیز بوو بە وەزیری رۆشنبیری و تا ساڵی ١٩٧٦ لەم پۆستەدا مابەوە.

٣. ئەریک رولو، لوموند ١٩٦٣/٣/١٢

٤. هەمان سەرچاوە.

٥. ئەندامانی نوێنەرانی کورد، بریتی بوون لە دوو وەزیر، باباعەلی و فوئاد عارف.

٦. ئەریک رولو، لوموند ١٩٦٣/٣/١٢.

٧. جەرجیس فەتحوڵلا هەمان سەرچاوە.

٨. کامیل ئەبوجابر، حیزبی سوسیالیستی بەعسی عەرەبی. ل ٧٩.

٩. جەرجیس فەتحوڵڵا، هەمان سەرچاوە.

١٠. ئەریک رولو، لوموند، ١٩٦٣/٣/١٢

١١. نیویورک تایمز، ١٩٦٣/٣/٢.

١٢. ئەریک رولو، لوموند ١٩٦٣/٣/٨ گوتەکان لەم گوتارەوە وەرگیراون.

١٣. پێرستەکە جەرجیس فەتحوڵڵا کردویەتی، حاجی ئۆمەران، ١٩٧٤

١٤. لوموند، ١٩٦٣/٤/١٦.

١٥. هەمان سەرچاوە

١٦. ئەریک رولو «سەرۆک ناسر خۆی لە دەست تێوەردانی جەنگی کوردستان دوور دەگرێ» لوموند ١٩٦٣/٦/١٩.

١٧. لوموند ١٩٦٣/٤/١٦

١٨. هەمان سەرچاوە ١٩٦٣/٤/٣٠

## فەسلی هەشتەم:

## شەڕی یەکەمی بەعسیان

## (١٩٦٣/١٢-٦)

رۆژی ١٠ /٦ /١٩٦٣ رادیۆی بەغدا بڵاوی دەکاتەوە کە «ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری داوە دەست بە جێ کردارێن عەسکەری دژی مەلا مستەفا بارزانی دەست پێبکات»

بەڵای کەمەوە ئەو شتەکان روونن، دەوڵەتی عێراق پاش چوار مانگان گفتوگۆ و دان و ستان وچاوو راو فێڵ و فەند و خۆ دزینەوە، سەرەنجام لە هەڵگیرسانەوەی شەڕەدا دەست پێشکەری کرد و وێ ئەودی هەوڵ بدات مەسئولیەتی ئەم کارە بخاتە ئەستۆی کوردەکان.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، وێڕای ئەوەی شۆڕشگێڕان بە «کۆمەڵێک جودا خواز و فیوداڵ و ستەمکار و چەتەو و جەردە ودژمنی کۆماری عێراق» وەسف دەکات کە لە دەوری بارزانی خڕ بوونەتەوە، لە هەمان کاتدا زنجیرە هەنگاوێکیش، بەرای خۆی «بۆ دابینکردنی ئاشتی هەمیشەیی لە نێوان عەرەب و کوردا»[1] دەنێ.

## ١

## پرۆژەی لامەرکەزی ئیداری

لە راستیدا ئەم پرۆسەیە بریتییە لە پرۆژەیەکی تازە کردنەوەی رێکخستنی ئیداری، بە دامەزراندنی چەند پارێزگایەک کە لەلایەن پارێزگارانێکەوە بەرێوە ببرێن کە راستەوخۆ پەیوەستن بە حکومەتی ناوەندییەوە، کۆمەڵێک فەرمانبەر یارمەتی ئەم پارێزگارانە دەدەن.[2]

کوردستان- کە بەپێی ئەم پرۆژەیە بەهیچ جۆرێ ناوی نابرێ- بەسەر دوو پارێزگادا دابەش بووە، پارێزگای کەرکوک و پارێزگای سلێمانی، کە بازێڕێن سلێمانی و هەولێر و دهۆک، لەگەڵ شارۆچکەکانی زاخۆ و ئامێدی و ئاکرێ و زێبار دەگرێتەوە.

تاقە دەستکەوتی ئەم پرۆژەیە بۆ کورد، ئەوەیە کە زمانی کوردی لەپارێزگای سلێمانیدا زمانی رەسمی دەبێ، پارێزگای کەرکوک لەم حاڵەتە بەدەرە..!

بەڵام لەم پرۆژەیەدا کە پەیوەندی بە هەموو عێراقەوە دەبێ، چ شتێک «کەسایەتی

کوردەی باکووری عێراق لە شوێنەکانی دیکەی کۆمار جیا ناکاتەوە، لە هەموو ڕوویەکەوە ڕوون و ئاشکرایە کە ئەم کارە تەنیا بۆ پرۆپاگەندەیە و چاوو ڕاوە لە جەماوەری خەڵکی ناوچەکە دەکرێ.

## ٢

## سەرەتای گریارێن سوپایی

لە ڕاستیدا سوپای عێراق کە سەعات پێنجی سپێدەی ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٩دا بەر لەوەی تەنانەت جەنەراڵ بارزانی ئینزار نامەکەی دەوڵەتی عێراقی پێ بگات کەداوای لێدەکات لە زەرفی ٢٤ سەعاتاندا خۆی تەسلیم بکات. لەشارانی کەرکوک و هەولێر و سلێمانیدا حکومەتی سوپایی «ئەحکامی عورفی» بەرپا کردبوو، سوپای عێراق بە تانک و زرێپۆشان گەمارۆی ئەو شارانەی داو کەوتنە گرتنی بە کۆمەڵی خەڵکی و تالانکردنی دوکان و موغازەکان و کوشتنی ئەو خەڵکانەی کە دەیانویست هەڵێن: بەتایبەتی لە سلێمانیدا چەند سەد کەسێکیان گرت و(٢٧٦) کەسیان کوشت و لە کەناری شاردا خستیانە گۆڕی بە کۆمەڵەوە.[٣]

## ٣

## شەڕی بەعسیان

ئەو شەڕە قورسەی کە سەرانی بەغدا لە مانگی شەشەوە تا مانگی یازدەی ١٩٦٣ هەڵیان گیرساند، «یەکەمین شەڕی بەعسیانە» بوو.

هەرچەندە کە عارف لەمانگی شوباتەوە خۆی کردبوو بە مارشاڵ، بەلام لەو سەرربەندەدا سەرۆکی وڵات بوو.

بەلام لەو سەروبەندەدا کە ئەو سەرۆکی حکومەت بوو، هەموو کاروبارە گرنگەکان لە دەستی بەعسیەکاندا بوو: وەزارەتی بەرگری «عەماش» وەزارەتی ناوخۆ «حازم جەواد» هێزی فرۆکەوانی «حەردان تکریتی» بوو، ئەمە جگە لە سەرەک وەزیران «حەسەن ئەلبەکر»

ئەدوارد ساب Edouard saab کە یەکێکە لە باشترین چاودێرانی بوبەر و ڕووداوەکانی ڕۆژهەلاتی ناڤین، هەر بەوەوە ناوەستێ و دەنوسێت: « لە سوپا و دام و دەزگا دەوڵەتیەکانی عێراق دا تەنانەت تاقە یەک پۆستی گرنگ نییە کە بەعسیەکان پڕیان نەکردبێتەوە» وەدەڵێ: « تەنانەت یەک سەرباز نییە کە ئەندامی بەعس نەبێت.» [٤]

وێڕای ئەممەش مارشاڵ عارف، کەهەڵبەتە سیاسەتوانێکی گەورە نەبوو، لەم شەڕەدا کە بە ناوی ئەوەوە دەکرا بەشدار و بەرپرسیار بوو، بەڵام بەلای ئەوەوە مەسەلەی کورد لەم قسەو قسەلۆکانە دا بەرجەستە دەبوو کە **«کوردەکان عەرەبن» وەچەتە ڕێگرەکانی بارزانی بە ئاسانی ڕاودەنرێن»**[٥]

**شەڕی توندی بێ وێنە و پێشینە.**

بەعس، کە پێویستی بە کارێکی نمایشی هەبوو، تا خۆی لەبەرچاوی سەرۆک ناسر بنوێنێ و وای دەربخات کە تاقە لایەنە شایستەی ئەوە بێ گفتوگۆی دەگەڵ بکرێ، بە درندەیی و توندییەکی وەها پەلاماری کوردەکانیدا کە تا ئەو دەمە لە مێژووی شەڕێن عەرەب و کوردا وێنەی نەبوو.

پیاوانی سوپایی عێراق، کە پێیان وابوو قاسم عەودالی سەرکەوتن بە سەر کوردەکان دا نەبوو، تەنیا دەبوێست (سوپا لە بەغدا دوور بخاتەوە) دڵنیا بوون کەبە چەک و هێزی مرۆڤانی پێویست «لە زەرفی یەک حەوتوودا شۆڕشی کورد لە نێو دەبرێت»[٦] هەر بۆیەش هێرشێکی قورسیان بۆسەر کوردان دەست پێکرد، لەم هێرشەدا تازەترین و کوشندەترین چەکیان بەکار هێنا، ناپاڵم، بۆمبای سوتێنەر، بۆردومانی یەک لەدوای یەک، زرێپۆش، تۆپخانەی قورس و... هتد.

بەعسییان لە پاڵ ئەم هێرشەدا، بڕیاریان دا کە خەڵاتێکی ۱۰۰۰۰۰ دیناری لە قەبیلی سەری بارزانی بکەن، لە ملی «شۆڕش بدەن» ودەستیان بە گرتن و ئەشکەنجەدان و کوشتاری بەرنامەداری ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان کرد، ساڵح یوسفی کە بەمەبەستی پەیگیری گفتوگۆکان لە بەغدایە ما بوودوە، گرتیان و بۆ ماوەی چەندین هەیڤ لە زنداندا ئەشکەنجەیاندا.[٧]

## ٤
## سیاسەتی عەرەباندنی (هەندێ بەشی کوردستان)

بەڵام تازەگەری و داهێنانی بەعس، بریتییە لە عەرەبهاندنی بەردەوامی بەبەرنامەی ناوچە کوردنشینەکان، بەعس پاشان کەلە ساڵی ۱۹٦۸ دا هاتەوە سەر حوکم جارێکی دی بایدایەوە سەر هەمان سیاسەتی عەرەباندن، هەر لە هەوەڵێ را، سوپا دانیشتوانی کوردی لە ناوچە ستراتیژییەکان، واتا لە ناوچە سنوری و بە نەوتەکاندا وەدەرنا، گوندەکانی کورد بۆردومان دەکات و دەسوتێنێ، و بە بۆلدزەر تەختی دەکات[٨]، بەمجۆرە

تەنێ لەناوچەی کەرکوک دا نزیکەی ٤٠ هەزار کورد لەماڵ و گوندێن خۆ وەدەردەنرێن،! لە دمشتی هەولێریش سیاسەتی «عەرەباندن» بەپێی بەرنامە پەیڕەو دەکرێ.

## ٥

## شەڕێن سوپایی

هێزەکانی عێراق هاوکات هێرش دەکاتە سەر، باکور، «بادینان» کە بە دەستی بارزانییەوە بوو، هەروەها ئەو بەشەی کوردستان کە لە ژێر حوکم و دەسەڵاتی حیزبی دیموکرات دابوو، «ناوەند وباشور» دەست بە سێ هێرش دەکات، سەبارەت بەم شەڕانە زانیارییەکی ئەوتۆ بڵاو نابێتەوە، بەڵام هەمووان دەزانن کە لەبادیناندا، بارزانی وەکو پیشەی جارانی رێی هێزەکانی عێراقیدا، زاخۆ و ئاکرێ و ئامێدی بگرن، هەر کاتێ کە گوشار زیاتر دەبوو، مەیدانی چۆڵ دەکرد و پەنای وەبەر کوێسار دەبرد.

لە ئابی ١٩٦٣ دا سوپای عێراق گەیی بووە زێبار و ناوچەی بارزانی لە (٨/١) دا گرتبوو و بارزانی وەکو ساڵی ١٩٣٢ بۆ چیاکانی باکوری بارزان، بەرەو سنووری تورکیا دوور خرابووەوە. بەڵام هێزە دەوڵەتییەکان تین و تاوو جۆش و خرۆشەکەی هەوەڵجاریان لە دەست دابوو و هێزەکانی بارزانی بە دەقی خۆیانەوە مابوونەوە.

لە شەرگەکانی دیکەشدا شەڕەکان بە دڵی هێزەکانی عێراق نەبوون: لە شەرگەی رەواندزدا فەوجێکی تەواو، لە گەلی عەلی بەگدا، کە بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک و تا ناوەراستی مانگی ئاب، مەیدانێکی سامناکی شەڕ بوو، کەوتە داوەوە، پێشمەرگەی کورد، کە بەدەست هێرشی فرۆکەوە حاڵیان شڕبوو، سەرەنجام دەستێکی باشیان لە هێزەکانی عێراق وەشاند، زەرەروزیانێکی زۆریان لێدان، رێگەی هاتوچۆیان لێبڕین و ئەوجا پاشەکشەیان کرد.

لە باشووردا، کوردەکان لە ٦/١٧دا دەزگاکانی نەوتی زەنبوور و لە ٦/٢٢دا دام ودەزگای نەوتی کەرکوک دەتەقێننەوە، بەڵام پێشمەرگەی کوردان خۆیان لەبەر ئەو هێزە گەورەیە ناگرن، کەسەرکردایەتی سوپای عێراق خستوویەتە مەیدانی شەڕەوە، پاشەکشە دەکەن، هێزەکانی عێراق لە هەیڤی نۆدا بارەگای جەلال تالەبانی ( کە هەنگێ لە ئەوروپا بوو) لە چەمی رێزان دەگرن ولەمانگی یازدەدا بەناچاری چۆڵی دەکەن.[٩]

مارشال عارف لە ١٩٦٣/٧/١٤ دا، واتە مانگێک دوای دەست پێکردنی شەڕ، لە گوتەیەکی دا، بە بۆنەی پێنجەمین ساڵیادی شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨وە، رایگەیاند کە

هێـزێن عـێـراق «حـاڵی حـازر بەشـێـکی گـەورەی ناوچەکـەیان لە شـۆڕشـگـانـان پاک کردۆتەوە»[١٠] بەڵام حەقـیـقـەت ئەمەیە کە جەنگی بەعسـیـیـان بۆ سـوپای عێراق « ئەو گەشتوگوزارە» نەبوو کە جەنەراڵ عەماش و جەنەراڵ حەردان تکریتی بەڵێنیان دابوو.

## ٦

## بەشداری سوریا لە شەڕدا

لە روانگەی سوپاییەوە، خاڵی هەرە دیار و بەرجەستـەی ئەم یەکەم شەڕەی بەعسـیـیـان، بەشـداری کـردنی سـوپای سـوریا بوو لەشەڕەکـاندا دژ بە کـورد: بەشـداری هێـزێن سـوریا لە مەیدانەکانی شەڕدا دژی کوردەکان کە لە سـەرەتادا لەلایەن بەغداوە حاشای لێدەکرا، لە ٢٢/١٠/١٩٦٣داو دوای ئەوەی مـارشـاڵ عـارف سـەری ناوچەی زاخـۆی دا، بە رەسـمی کەشف بوو، ئەم ڤوەتە بریتی بوو لە تـیـپی یەرمـوک کـە بۆ خۆی لە شـەڕگەی ئیـسـرائیل دابوو، بریتی بوو لە نزیکەی ٣/٠٠٠ هەزار سەرباز بە زرێپۆش وتۆپخانەوە.

بەشـداری ئەم هێـزە لە باری جوگرافیـیـاییـەوە تەنیـا ناوچەی زاخـۆ و دهۆکی دەگرتەوە و ماوەی مانەوەکەشی کەم بوو، چونکە روخانی بەعسەکان لە هەیڤی یازدەی ١٩٦٣دا، ئەم هێزەی ناچار کرد بەلەز بۆ سـوریا بگەڕێتەوە.

لەباری سـوپاییـەوە بەشـداری سـوریـیـەکـان هاوتای سـەرکـەوتن نەبوو و کـوردەکان زیانی گەورەیان لە یەکەکانی سـوریادا، بەڵام لەباری دەروونیـیـەوە ئەم بەشـدارییـە «جەنزەمەیەکی گـەورە بوو بۆ جـەنگاوەرانی کـورد، چونکە ئەوەی دەگـەیاند کـەوڵاتێکی دیکەش دژیانە».[١١]

بە هەرحاڵ، ئەمە یەکەم جار ودوا جـار بوو کە هێزێن بێگانە بەشـداری سـەرکوتکردنی شۆڕشی کوردی عێراقی کرد.

## ٧

## هەڵوێستی ناسر

کە شەڕ لە کوردستانی عێراقدا هەڵدەگیرسێتەوە، چاپەمەنی و رۆژنامەوانی میسری زۆر واقـیع بینانە رەفـتـار دەکـات، بەیاننامـەکـانی هەردوو لایەنی کـوردی و بەعـسی بێ ج شرۆڤەو لێکدانەوە و سەرنجێک بلاو دەکەنەوە.

لە راسـتیدا سـەرۆک ناسـر کە دە رۆژانبەر لە هەڵگیرسانەوەی شەڕ، بەرگەرمی پێشوازی لە جـەلال تالەبانی کـــردبوو، هەڵبــەتە ج پەیان و بەڵێنێکی نەدابوو، پاش دەست

پێکردنەوەی شەڕ نیدی نەیدەتوانی هەڵوێستگیری بکات- هەرچەندە وا باو بوو کە لایەنگری چارەسەری مەسەلەکە بوو لە رێگەی گفتوگۆوە.

دوای تێشکانی شۆڕشی ٨/٥/١٩٦٢ی لایەنگرانی ناسر لە حەلەب و شکستی پیلانی ٤/٢٥ ی لایەنگرانی ناسر لە بەغدا، نیدی بەینی ناسر و بەعس رووەو تێکچوون چوو، ناسر کە هەستی دەکرد بەعسیانی عێراقی و سوری دەستیان داوەتە (مانۆڕێکی لادەرانە) نەیدەتوانی لەم روەوە دەست پێشکەری بکات وپەیوەندییەکان ببڕێ و بە «هاوکاری دژمنانی نەتەوەی عەرەب» لەقەڵەم بدرێ.[١٣]

بەلام دوای چەند هەیڤەک، پاش شکستی پیلانی ناسری لە دیمەشق (١٩٦٣/٧/١٨) نیدی پەیوەندی نێوان ناسر و بەعسییان پچراو رادیۆی «دەنگی عەرەب» لە قاهیرەوە کەوتە دژایەتی کردنی بەعسیان وە گەلی موسولمانی سوریا و عێراقی هاندەدا کە دژی میشیل عەفلەقی کافر رابن[١٤] و حیزبەکەی کە بە تەما بوو کوفر وبێدینی لەسەر زەمینی ئیسلام دا بلاو بکەنەوە، ترۆ بکەن».[١٥]

بەلام لەم شەڕی راگەیاندنەدا چ هەواڵێک لە چارەنووسی کوردەوە نەبوو.

## ٨
## مامەڵەی ولاتانی رۆژئاوا دەگەڵ مەسەلەکەدا.

ولاتانی رۆژئاوا روخانی قاسمیان پێ خۆش بوو، چونکە رژێمی قاسم لە روانگەی ئەوانەوە رژێمێکی کۆمونیستی بوو. دیارە ئەم خۆشحالییە بەتایبەتی لە ولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا و لە بەریتانیادا، پاش گوتەکانی رۆژی ١٩٦٣/٢/١٦ی حازم جەواد، بە ئاشکرا هەست پێدەکرا: حازم جەواد لە قسەکانی خۆیدا گوتی دەوڵەتی تازە» رێزی ئەو قەرارارنە دەگرێ کە دەگەڵ کۆمپانیا نەوتییەکاندا مۆر کراوە.»[١٦]

هەر کە یەکیێتی سۆڤیەت بانگەشەی راگەیاندن دژی عێراق توند دەکات بەریتانیای مەزن و ولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا بەلەز رایدەگەیەنن کە ئامادەن جێی ئەو پربکەنەوە. لە ئاستی دیبلۆماسیدا، سیاسەتوانانی بەریتانیا لەساڵی ١٩٦٣دا ئاسانکاری بۆ گفتوگۆ لە مەر رێکەوتننامەیەکی جەنتلمانانەی نێوان عێراق و تورکیا و ئێران دەکەن، بە پێی ئەم رێکەوتننامەیە تورکیا وئێران بەڵێن دەدەن کە زۆر بە جدی هەوڵ بۆ «گۆشەگیرکردنی کورد» بدەن. هەر دوا بەدوای ئەو رێککەوتننامەیە ژمارەیەک لە خوێندکارانی کوردی عێراق لە تورکیا دا دەگیرێن و لە ئێرانیشدا چاودێری توند دەخرێتە سەر سنوورەکان.[١٧]

## ٩

## هەڵوێستگیری یەکێتی سۆڤیەت

بەڵام لەباری سیاسی و دیپلۆماسییەوە، گرنگترین ڕووداوی ئەم یەکەم شەڕی بەعسیە دژی کوردان، بێگومان هەڵوێستگیری دیار و ئاشکرای یەکێتی سۆڤیەتە بە قازانجی بزاڤی گەلی کورد بەڕێبەرایەتی جەنەراڵ بارزانی...

ڕەوتی ئەشوغمای ئەم سیاسەتەی یەکێتی سۆڤیەت کەلەسەردەمی قاسم دا خاوو و پڕ لە چاوەنۆڕی بوو، بە سێ قۆناغ دا ڕۆیی:

لە سەرەتادا، مۆسکۆ کە بەچاوی خۆی ڕاوشکاری ڕاستی کۆمونیستەکانی لە عێراقدا بینی، لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا تێکیدا. ڕادیۆی مۆسکۆ لە ١٩٦٣/٢/١٤دا هەواڵەکانی ئاژانسە ڕۆژاوایییەکان بڵاو دەکاتەوە و «نیگەرانی» جەماوەری خەڵکی سۆڤیەت سەبارەت بەم «کارە سامناکانە» دەردەبڕێ کە دژی « هێزە دیوکراتییەکانی عێراق» ئەنجام دەدەرێن. بۆ سبەینێ « الجماهیر» ی ڕۆژنامەی نیمچە ڕەسمی بەعسی عێراق، کە تاریق عەزیز بەرپرس و بەڕێوەبەری نووسینی بوو. بەو مەبەستەی دڵنەوایی سۆڤیەت بکات و نەیەڵێ پەیوەندییان دەگەڵ عێراقدا بپچڕێ،ڕایدەگەیەنێ « تیربارانکردنی کۆمونیستەکان بەو مانایە نییە کە نیمە پەیوەندی باشمان دەگەڵ مۆسکۆدا نەبێ»!. دەبێ ئەوە بزانرێ کەدژایەتی کۆمونیستانی ئیدەخۆێ هەرگیز دژایەتییەکی ئایدولۆژی نییە»[١٩].

مۆسکۆ هەر زوو دێتە وەڵام: لە ١٩٦٣/٢/١٦ کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمونیستی سۆڤیەت « حکومەتی دڕندەی خوێن ڕێژ و ئەو کاری سەرکوتکارییەی لە عێراق دا ئەنجام دەدەرێ، ریسواو مەحکوم دەکات» لە ڕوانگەی ئەم بیروباوەڕە کە « ئەم سیاسەتی چەتەگەریانەی کوشتاری باشترین ڕۆڵەین عێراق، ئاکامەکەی هەر شکستە».[٢٠]

جاری دووەم، پاش تێکچوونی پەیوەندی دەگەڵ بەغدایە، مۆسکۆ بە قازانجی بارزانی هەڵوێستگیری دەکات،[٢١] مەسەلەکە لێرەوە دەهاروژێنێ کە بزووتنەوەی کوردایەتی «لە جەوهەر و کرۆک دا بزاڤێکی دیوکراتییە» و قاسم بەوە تاوانبار دەکات کە (بێ چ هۆیەک هەوڵ دەدات» «ڕێبەرانی دلێری » ئەم بزاڤە « بە نۆکەر و دارەدەستانی ئیمپریالیزم» بە دنیا بناسێنێ.[٢٢]

پراڤدا، لە ١٩٦٣/٥/٦ و لە گوتارێکی درێژدا، هەنگاوێکی دی بە ڕێگەی هاودڵی و هاو سۆزی دەگەڵ کورداندا، دەنێ، بەڵام هێشتا هەر بە پارێزەوە زیاد جڵەو شل ناکات. «

بەپێی ئەو زانیارییانەی لە چاپەمەنی فەرەنگی دا بلاو بوونەتەوە، کوردەکان خوازیاری ئەوەن مافی دامەزراندنی دەوڵەت و پەرلەمانی تایبەتی خۆیان هەبێ کە رەنگدانەوەو دەنگدانەوەی ویست و خواستی گەلی کورد بێ و لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا کار بکات. لە حاڵی حازردا کوردستانی عێراق لەباری ئابوورییەوە یەکێکە لە پاشکەوتووترین ناوچەکانی ولات، بۆیە ئاساییە کوردەکان سوور بن لەسەر پەرە پێدانی پیشەسازی وکشتوکاڵی و رێگە وبان و گواستنەوە وسوور بن لەسەر ئەوەی پشکێکی دادوەرانە لە دەرامەتی نەوت بۆ هەرێمی ئوتونومی کە دەوڵەمەندترین کانگای نەوت کەوتۆتە خاکی کوردستانەوە، بۆ ئەو مەبەستە تەرخان بکرێ»[٢٣]

کە لە ١٩٦٣/٦/١٠ دا شەڕ دەستی پێکردەوە، ئیدی یەکێتی سۆڤیەت زۆر بە راشکاوی و بێ پێچ وپەنایان دەوڵەتی بەغدا بەوە تاوانبار دەکات کە تەنێ بەو مەبەستە دان وستانی دەگەڵ کورد کردووە تا «لەباری سوپاییەوە باشتر خۆی ئامادە بکات» و دەوڵەتی ناوبراو بەوە تاوانبار دەکات کە لە رەفتاردا «لاسایی هیتلەرییەکان» دەکاتەوە.
(٢٤)

لە ١٩٦٣/٧/٣دا کۆماری میللی مەنگولیا، داوا لە رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان دەکات کە مەسەلەی «کوردکوژی لەعێراق»دا بخرێتە بەرنامەی کاری کۆبوونەوەکانی داهاتووی ئەنجومەنی گشتییەوە.

**یادداشتنامەی ١٩٦٣/٧/٩ی یەکێتی سۆڤیەت.**

گرۆمیکۆی وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت لە ٧/٩دا یادداشتنامەیەک دەداتە سەفیری عێراق و ئاگاداری دەکاتەوە کە « رووداوەکانی باکوری عێراق رێگە بۆ دەست تێوەردانی ولاتان لە کاروباری ناوخۆی عێراق خۆشدەکات و رایدەگەیەنێ کە «ئەوسەرکوتکارییە خوێناوییەی دژی کوردان بەکار دەهێنرێ، تەنێ ولاتی عێراق لاواز دەکات. و هێزێن ئیمپریالیستی سوود لەم رووداوانە وەردەگرن و ئەمەش زیان بە سەربەخۆیی عێراق دەگەیەنێ و لەوەی پتر چ ئەنجامێکی دی نابێ»[٢٥]

گرومیکۆ، لە هەمان رۆژدا یادداشتنامەیەکی دی بە سەفیرانی ئێران و تورکیا وسوریا دەدا: لەم یادداشتنامەیەدا دوای ئەوەی ئاماژە بە«کوشتاری خوێناوی» کوردان دەکرێ، دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەت دەری دەخات کە « هەندەک ولاتان، بەتایبەتی ئێران و تورکیا و سوریا کەوتوونەتە دەست وەردان لەو رووداوانەی کە لە باکوری عێراق دا روو دەدەن و

تەنانەت هەندێک هەنگاویان لەورووەوە ناوەکە لایەنی سوپایی گرتۆتە خۆە و سۆڤیەت پێی وایە کە ئەم سیاسەتەی وڵاتانی «سەنتۆ» ئاقیبەت وناکامی مەترسیداری لێدەکەوێتەوە.[٢٦]

**مەترسی تەدەخولی سۆڤیەت:**

لە ١٩٦٣/٧/٩ دا نیکولای فدرینکو، نوێنەری هەمیشەیی یەکێتی سۆڤیەت لە رێکخراوی نێونەتەوەیی دا لە نامەیەکدا بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی ئاسایش، ئاگاداری دەکاتەوە ئە (زوڵم وزۆر وسەرکوتکارییەکی زۆر لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە لە باکوری ئەووڵاتەدا ئەنجام دەدرێ» ولە « مەترسی تەدەخولی وڵاتانی بێگانە» ئاگاداری دەکاتەوە و لە کۆتاییدا دەگاتە ئەونەنجامگیرییەی کە « رەنگە بۆ کۆتایی هێنان بەو وەزع و حاڵە و رێگە گرتن لە تەدەخولی بێگانان پێویست بەوە بکات کە ئەنجومەن داوای کۆبوونەوە بکات» وتەنانەت وڵاتانی رۆژاوایی بەتەدەخولی لە گوین و یەک لایەنەی یەکێتی سۆڤیەت دەترسێنێ: «درێژەپێدانی تەدەخولی بێگانە لەم رووداوانەدا، دەشێت هەموو وڵاتێک ناچار بکات، بۆ کۆتایی هێنان بەم تەدەخولانە وبە مەبەستی بەرگری لە ئاسایشی خۆی، بێدەنگ نەبێ».[٢٧]

**یادانەوەی یەکێتی سۆڤیەت.**

بەڵام یەکێتی سۆڤیەت لە بەرانبەر کاردانەوەی توندی وڵاتانی عەرەبی دا، لە هەموو هەڵوێستەکانی خۆی دەرهەق بە مەسەلەی کورد و باسکردنی مەسەلەی کورد لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی زێوان بووەوە، کۆماری میللی مەنغولیاش بەر لە دەست پێکردنی کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی گشتی، داواکەی خۆی لەمەڕ باسکردنی مەسەلەی کورد لە بەرنامەی کاری کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی گشتی کێشایەوە و ئەویش بایدایەوە[٢٨]

ئەم یادانەوە لە ئکاوە هەرگیز روون نەکراوەتەوە: بەپێی گوتەی هەندێک ژێدەران، **دەوڵەتی عێراق بەیەکێتی سۆڤیەتی راگەیاند کە ئەگەر مەسەلەی کورد لەرێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا باس بکرێ، ئەوا زۆربەی وڵاتانی عەرەب پەیوەندی خۆیان دەگەڵ سۆڤیەتدا دەبڕن.**

موسکۆ بەخۆیشی لەوە دەترسا کە نابادا عێراق هەوڵ بدات دۆستی تازە، بەتایبەتی چین، بگرێ!.

هەروەها دوور نییە، ئەم یادانەوە کوتوپڕەی سۆڤیەت ئەنجامی ڕەفتاری خودی بارزانی بووبێ، کە ئامادە نەبوو هەموو مەرجەکانی یەکێتی سۆڤیەت قەبوڵ بکات.

## ١٠
## لە دەسەلات کەوتنی بەعسییان.

لەسەرەتای هەیڤی یازدەی ١٩٦٣ دا شەڕ گەیی بووە بن بەست! بەفرو زستان بەر دەرکەی گرتبوو، هەر کەبەفر کەوتبا ئیدی شەڕ خۆیەخۆ دەوەستا. لە هەمان کاتدا تالیب حسێن شەبیبی وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق لەلەندەن و لەکۆبوونەوەیەکی تایبەتیدا گوتی: « ئێمە چۆن دەتوانین ئەوەی کە کوردەکان داوای دەکەن وێهانبدەین؟ ڕێک وەکو ئەوەوایە کـە بمانەوێ وڵاتێکی سەربەخۆیان بۆ دامەزرێنین، ئەمە نابێ بە وڵاتێکی فیدراڵ!»[٢٩]

لەم کاتانەدا چ چارەسەرێکی سیاسی یان سوپایی، لە ئاسۆدا بەدی نەدەکرا، ڕێک لەم وەزع و حاڵەدا بوو کە هەمدیس کودەتایەک ئەنجام دراو جارێکی دی وەزع حاڵی سیاسی لە عێراقدا ژێر و ژوور بوو!.

لەمانگی ١٠/١٩٦٣ بەمـلاوە باڵی چەپی بەعسی بەرێبەرایەتی عەلی ساڵح ئەلسەعدی یاریدەدەری سەرەک وەزیران ونەیاری ناسر و باڵی ڕاستی بەعس بە ڕێبەرایەتی تالیب شەبیب و حازم جەوادی وەزیری ناوخۆ دووچاری ناکۆکی و دوو بەرەکییەکی توند بوو. ساڵح ئەلسەعدی لایەنگری سوسیالیستاندنی خێرای ئابوری عێراق بوو و تالیب شەبیب و حازم جەواد بە «کۆمونیست»یان دەزانی.

لە کـۆنگرەی حیزبی بەعس دا کـەلەلایەن نەیارانی ئەلسەعدییەوە ڕێکخرابو لە١١/١٠/١٩٦٣دا لە بەغدا کۆبوونەوەی خۆی کرد و ئەلسەعدی دەنگی پێویستی نەهێنا و بە فڕۆکە بۆ ئەسپانیا نێردرا.

دوای چل و هەشت سەعاتان، لایەنگرانی ئەلسەعدی ڕژانە نێو شەقامەکانی بەغدا ڕفڕۆکەکانی سوپای عێراق کۆشکی سەرۆکایەتی کۆمار و وەزارەتی بەرگرییان بۆردومان کـرد، لە سەرداوای ڕادیۆی بەغـدا «سەرکـردایەتی نەتەوەیی» بەعس لە ١٤/١٠ دا هاتنەبەغدایە، میشیل عەفلەقی دامەزرێنەری حیزبی بەعس و جەنەراڵ ئەمین ئەلحافزی سەرۆکی ئەنجومەنی شۆڕشی سوریا و جەنەراڵ ساڵح جەدیدی سەرۆکی سەرکردایەتی سوپای سوریا هەوڵیاندا تەیرانی نێوان هەر دوو باڵی ناکۆکی حیزبی بەعسی عێراق

چارەسەر بکەن، بۆیە و هەر بەم مەبەستە رێبەرایەتی حیزب و بەڕێوەبردنی کاروباری عێراقیان تا هەڵبژاردنی «سەرکردایەتی ناوچەیی» گرتە ئەستۆی خۆیان.

ئەم گروپەش، تالیب شەبیب وژمارەیەک لە لایەنگرانی شەبیبیان دوور خستەوەو، بۆیە ئەمەیان کرد کە گوایە جۆرە هاوسەنگی و یەکسانییەک لەنێوان هەردووک گروپی هەڤرکدا چێ بکەن.[30]

لە راستیدا عەفلەق وئەمین ئەلحافز بەم کردەوەیە بە تەواوەتی حیزبی بەعسیان لە رێبەرایەتی دوور خستەوە وئیدی چ کۆسپێک لە بەردەم سوریاییەکاندا نەما تا حوکم بگرنەدەست.

رۆژی ١٨/١١/١٩٦٣ رادیۆی بەغدا لە سەعات شەش و چل دەقیقەی سپێدەدا بەرنامەکانی خۆی بڕی و رایگەیاند کە سوپا بە سەرکردایەتی مارشال عارف جڵەوی حوکمی گرتۆتە دەست. بۆ ماوەی یەک ساڵی تەواو هەموو دەسەلاتێک سوپایی و دەوڵەتی بە عارف سپێردرا،[31] رێبەرانی بەعسی سوریا کە لە سپێدەی ١٨/٢ دا گیرابوون تا سبەینێ، واتا تا دوای دامرکانەوەی هەموو بەرگرییەک دەرهەق بە کودەتاکەی عارف، ئازاد نەکران.

حیزبی بەعس، پاش تێپەڕ بوونی ماوەیەکی دە مانگی لە حوکمرانی، کە ماوەیەکی زۆر درەخشانیش نەبوو، هەرەسی هێنا: هەندێ لە «میانەرەوان» پەیوەندییان بە رژێمی عارفەوە کرد، جەنەراڵ تاهیر یەحیا بوو بەسەرەک وەزیر، جەنەراڵ حەردان تکریتی بوو بەوەزیری بەرگری، هەشت وەزیری کابینەی پێشوو لە حکومەتی تازەدا مانەوە. لە کاتێک دا کە «توندرەوەکان» کە لەبەرەی دژدا مانەوە، یان ولاتیان بەجێهێشت یان خۆیان شاردەوە، بێ ئەوەی توانیبێتیان مەسەلەی کورد «یەک لایی» بکەنەوە.

چاپەمەنییانی ئەوسەی ئێران باسی هەندێک بانگەشەیان کرد کە گوایە دوای لە کارکەوتنی بەعسییە توندرەو، کوردەکان لە بەرەکانی موسڵ و خانەقین دا، دەستیان بەهێرشێکی گشتی کرد. بەلام هاتنی زوو بەزووی زستان هەموو هێرشەکانی پەک خست و دوای پەیامەکەی ٢٨/١١/١٩٦٣ی[32] عارف بۆ کوردان، ئیدی پەیوەندی نهێنی و ژێراوژێر لە نێوان دەوڵەت و جەنەراڵ بارزانیدا چێ بوو.

## سەرچاوە وپەراوێزان

١- لوموند، ١٩٦٣/٦/١١
٢- بۆ زانیاری تەواو لەمەڕ دەقەکە، بڕوانە عیسمەت شەریف وانلی، کوردستانی عێراق، ل ٣٧٢-٣٧٥
٣- خەبات، ژمارە ٤٦٩، ١٩٦٣.٦.٦ لەلاپەڕە ١٩٦ی کتێبەکەی عیسمەت شەریفەوە وەرمگرتووە.
٤- لوموند، ١٩٦٣/٩/١٨
٥- لوموند، ١٩٦٣/٢/٢٠
٦- ئەریک رولو،لوموند، ١٩٦٣/٤/١٦
٧- عیسمەت شەریف وانلی، ل ١٩٧
٨- دەیلی تەلەگراف، ١٩٦٣/٦/١٩
٩- دەیڤید ئادامسن، جەنگی کوردستان، ل ١١٧
١٠- لوموند، ١٩٦٣/٧/١٦
١١- عەبدولوەهاب ئەتروشی، هەڤپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، ناوپردان، شوباتی ١٩٧٥
١٢- ئەریکد رولو، سەرەک ناسر، خۆی لەدەست وەردان لە شەڕی کوردستان دوور دەگرێ، لوموند، ١٩٦٣/٩/١٩
١٣- هەمان سەرچاوە.
١٤- میشێل عەفلەق، ی دامەزرێنەری بەعس، دیانە.
١٥- لوموند، ١٩٦٣/١١/٢٠
١٦- هەمان سەرچاوە، ١٧-١٨/٢/١٩٦٣
١٧- دیڤید ئادامسن، ل ١٦٤، ناوی سەرچاوەکەی نەبردووە.
١٨- لوموند، ١٩٦٣ /٢/ ١٦
١٩- هەمان سەرچاوە ١٩٦٣/٢/١٩
٢٠- هەمان سەرچاوە
٢١- بەلام یارمەتییەکانی سۆڤیەت تا هەیڤی حەوت هەر بەردەوام بوو.
٢٢- پراڤدا، ١٩٦٣/٢/٢٣، لە کتێبی سۆڤیەت و کوردەکان، ل ٤١٢- ٤١٥، نووسینی هارل، وەریگرتووە.
٢٣- پراڤدا ١٩٦٣/٥/٦ وەرگێڕانی گوتارەکە لە ژمارە ٢٦ی ساڵی ١٩٦٣دا، ل ١٧٠-١٧٢ بڵاوکراوەتەوە.
٢٤- ئاژانسی دەنگوباسی تاس، لوموند، ١٩٦٣/٦/١٨
٢٥- لوموند، ١٩٦٣/٧/١١

٢٦- هەمان سەرچاوە.

٢٧- واشنگتون پۆست، ١٩٦٣/٧/١١ لە و. هاول وە ل ٤٢٢-٤٢٣ وەرگیراوە.

٢٨- و. هاول، ل ٤٢٤ نەقلی گوتەکانی سەرهەنگ محەمەد کشمو، پاشکۆی عەسکەری سەفارەتخانەی عێراق لە واشنگتون.

٢٩- دیڤید ئادامسن، جەنگی کوردستان. ل ١٩٧

٣٠- بروانە کتێبەکەی کامیل نەبوجابر (حیزبی سوسیالیستی بەعسی عەرەبی) ل ٨٢-٨٣.

٣١- لوموند ١٩٦٣/١١/١٩

٣٢- رۆژهەلات، ١٩٦٣/١١/٢٠

## فەسڵی نۆیەم

## پشووی دووەم (١٩٦٤/٢-١٩٦٥/٤)

### قەیرانی ساڵی ١٩٦٤

### ١

### ئاگر بڕی ١٩٦٤/٢/١٠

**بە ناوی خوای دەهەندە و دلۆڤان**

**برایان**

**« قسەی راست کەلامی خوای هەموو عالەمە کە لە کتێبەکەی خۆیدا دەفەرموێ: یاایهاالذین آمنو اتقوالله حق تقاته و لا تموتن الا و انتم مسلمون، واعتصموا بحبل الله جمیعا و لا تفرقوا و اذکروا نعمةالله علیکم اذ کنتم اعدائا فألف بین قلوبکم فاصبحتم بنعمته اخوانا. »[1]**

بانگەوازی سەیری ١٠/٢/١٩٦٤ی جەنەراڵ بارزانی بۆ «برایانی»کورد کە ئاگر بڕی فەوری رەچاوبکەن، کە ئەو بە پێی رێککەوتننامەیەک دەگەڵ مارشال عارف دا رایگەیاندووە، بەم جۆرە دەست پێدەکات،

ئەم بانگەوازە ئەگەر سەبارەت بە ئاماژە بۆ خوای موسولمانان زۆر روون و رەوان و ئاشکرایە، بەلام دەربارەی چارەنووسی کوردستان، زۆر ئالۆز و ناروون بوو. بارزانی هەر ئەوەندەی راگەیاند بوو کە پاش (شەڕێن براکوژی) دەولەتی عێراق هەنگاوی شایستە « بۆ بوژانەوەی ژیان و سەقامگیری ئەمن و ئاسایش لە ناوچەکەدا دەنێ و پێکەوە کار بۆ ئەوە دەکەین کە زەمینەی لەبار بۆ راگەیاندنی مافی نەتەوەیی هاوولاتیانی کورد، لە چوارچێوەی عێراقێکی یەکگرتوودا، خۆش بکەین». لەم نامەیەدا نە وشەی «ئوتونومی» و نە وشەی «کوردستان» بەکار نەهێنراوە، لەگەڵ ئەمەشدا پاش ئاماژەیەکی ئالۆز بە «مافی نەتەوەیی هاوولاتیانی کورد» داوا لە جەماوەر دەکات کە ئەمن و ئاسایشی ناوچەکە بپارێزن وبەم گوتەیە کە «خوا پشتیوانی بڕیار ونیازی ئێمەیە» کۆتایی بە نامەکە دێنێ.

هەر لە هەمان رۆژدا سەرۆک عارف لە بەیاننامەیەکی دووروودرێژدا دەربارەی ئاگربڕ، ئەو خالانەی راگەیاند:

- دان نان بە مافی نەتەوەیی برایانی کوردا ئەم مافە لە دەستووری کانی دا تۆمار دەکرێ.
- عەفواتی گشتی و ئازاد کردنی هەموو زندانیان.
- گەڕانەوەی دامودەزگای ئیداری بۆ ناوچەکانی باکور
- گەڕانەوەی فەرمانبەرانی دەرکراو بۆ سەرکار.
- لابردنی گەمارۆی بازرگانی و بەرووبوومی خۆراک لە ناوچەکانی باکور.
- ئاوەدانکردنەوەی دەم و دەست وبەلەزی باکور.
- قەرەبووکردنەوەی ئەو موڵکدارانەی کە زەوی وزارەکانیان کەوتوتە ژێر ئاوی بەنداوەکانەوە.
- گەڕانەوەی ئەمن و ئاسایش.

ئەم بڕیارەی بارزانی کە لەئەنجامی پەیوەندی کرتی نهێنی ئەو و عارفەوە درابوو. هەڵبەتە چ شتێک لەمەڕ ئەو پەیوەندییانە نەزانراوە،[2] بووە مایەی گەورەترین قەیرانی ناوبزاڤی نەتەوەیی کورد و ئەم قەیرانە بە درێژا کاری کوشندەی لە بارزانییش کرد.

جەنەراڵ بارزانی ورێبەرانی حیزبی دیموکرات هەر لە سەرەتای گەڕانەوەی بارزانییەوە، لەساڵی ١٩٥٨ لە سۆڤیەت نەیانتوانی بوو پەیوەندی ئاسایی لە بەینی خۆیاندا بەرقەرار بکەن، دوای تێکچوونی بەینی بارزانی و قاسم، ئەم پەیوەندییانە زۆر بە خێرایی بەرەو خراپی چوون و کارگەییە رادەیەک کە هەموو ئەوڕۆژنامەوانانەی لەساڵانی ١٩٦٢ و١٩٦٣[3] دا بەکاری رۆژنامەوانی دەچوونە کوردستان، باسی ئەم قەیرانەیان دەکرد کە ژێراوژێر بە شێوەیەکی پەنامەکی دە نێوان رێبەرانی حیزب و جەنەراڵ بارزانی دا هەبوو، هەرچەندە بە ئاشکرا «چ حاڵەتیکی هێرش» لە نێوان لایەنگرانی حیزبدا نەبوو، بەڵام لە خۆیان دەپرسی کە لەوەیە «ژێراوژێر) لەگەڵ دەوڵەتی بەغدایەدا سەرو کارێکیان هەبێ.[4]

دوای ئەوەی بارزانی لە ١٠/٢/١٩٦٤دا ئاگربڕی راگەیاند،قەیرانەکە ئاشکرا دەبێ و شەڕی نێوخۆ هەڕەشە لە کوردستان دەکات.

٢

## بیانوی بارزانی بۆ «راگەیاندنی ئاگربڕ»

بە بۆچوونی بارزانی، ماندوویەتی جەماوەری کورد، خۆی لە خۆیدا بەڵگەی دروستی و هەقانییەتی، هەڵبەتە بەلای خودی ئەوەوە، ئاگربڕ بوو.

بارزانی بە هەمان شێوە و شێوازی ئایشی تایبەتی خۆی بۆ پاکانەی ئەم بڕیارەی خۆی ئەم حیکایەتەی دەکردە بەڵگە و دەهێنایەوە.

« جارێک لە دیلێک کەبە درەختێکەوە بەسترابوو، و دەم بەندێکیان لە زاری کردبوو. دەپرسن چ ئارەزوویەکت هەیە، وەڵامی دایەوە وگوتی: « لەم درەختەم بکەنەوە و بمبەن لەو درەختەم، کە هەنگاوێک دوورتر بوو، بمبەستنەوە» دیلەکە بینی نیگابانەکەی ئەم داوا بێ سوودەی پێ سەیرە، گوتی: « بۆیە ئەم داوایەم کرد تا بتوانم سێ شەقاوێک بڕۆم».

هەڵبەتە لەم حیکایەتەدا دیلەکە کوردە و سێ شەقاوەکە ماوەی ئەو ئاگربڕەیە کە لەنێوان کورد و بەغدایە ئەنجام دەدرێ. [٥]

بەپێی گوتەی مێژوونووسی کورد، عیسمەت شەریف وانلی، بارزانی زۆر جار ئەم فرمۆڵە کورتەی دووبارە دەکردەوە« لەسەرەتادا چەکدارانی ئێمە لە سەر خەڵکی دەژیان. پاش دوو ساڵان شەڕ، وەزع بە جۆرێ گۆڕا کە خەڵکی لەسەر چەکداران ژیان.» [٦]

ئەم دوو نوکتەیە، ئەم دوو فرمۆلە، ئەم ... ڕێنمایە، بۆ بارزانی هەردووکیان نیشانەی یەک چەمک بوون، دوای دوو ساڵان شەڕ، بەتایبەتی دوای ئەو وێرانکارییانەی کەلە شەڕی یەکەمی بەعسییان کەوتنەوە، خەڵکی کورد نیدی توانای بەردەوامبوونیان لەسەرشەڕ نەما، ڕۆژنامەوانێک، کە دوای ئاگربڕی ٢/١٩٦٤ بە مانگێک سەری کوردستانی داوە لەوێندەر جگەلە «کاولکاری و ێرانی» چ شتێکی نەدی بوو دەڵێ: هەموو گوندەکانی کەناری ڕێگا وجادە سەرەکییەکانی سلێمانی بۆردومان کرابوون و بە ناپاڵم سوتێنرابوون و بوو بوون بەخاک و خۆڵەمێش. « هەلاتووان لەکەپری پەڕپووتی بە گەلا وچیلکە داپۆشراودا دەژین. لەماوەی ٥ هەیڤاندا سێ هەزار گوند وێران بوون.! دانیشتوانی سەدان گوند لە گوندەکانی خۆیان دەرکراون..» [٧]

هەڵبەتە بیانوو و بەڵگەی زاتیش بۆ ئەم ئاگر برە هەبوون، ماندوێتی و نا ئومێدی... و لەوەیە شتێکی نەگوتەنیش هەبێ:ڕێکەوتننامەی ئاگربڕ دەگەڵ عارف دا، لەوەیە لە حەقیقەت دا کارێک بووبێ دژی ڕێبەرانی حیزبی دیموکرات، قسە سەیرەکانی جەنەراڵ عارف بە ڕواڵەت پشتیوانیە لەم بۆچوونە «لێ ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان، کە دەوری بارزانییان گرتووە، ئەمانە شەڕ فرۆشن، جاسووس و داردەستی ئیمپریالیزمن، بارزانییش وەکو ئێمە دەیەوێ ئەم حیزبە سەرکوت بکات!» [٨]

## ٣
## جیابوونەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان و بارزانی

ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە باوەڕیان وابوو دەوڵەتی عێراق پاش کودەتای هەیڤی ١٩٦٣/١١ لەباری سیاسی و سوپاییەوە لاواز بووە، خۆازیاری ئەوە بوون کە شەڕ توندتر بکرێ، تا بتوانرێ لەباری قوەتەوە دان وستان دەگەڵ دەوڵەتدا بکرێ، ئەم ژمارەیەی کەسەریان لە رازی بوونی بارزانی بە ئاگر بڕ سوڕمابوو، بۆ ئەوەی ئۆتونومی یان تەنانەت لامەرکەزی لەلایەن دەوڵەتەوە رابگەیەنرێ، هیوایان دەخواست بەلای کەمەوە ڕێککەوتنامەکەی عارف و بارزانی هەندێ خاڵی «نهێنی» تێدا بێ. جەلال تالەبانی تەنانەت لە کۆنفرانسێکی چاپەمەنی دا کە بارزانی لە ١٩٦٤/٢/٢٢ لە رانیە ئەنجامی دەدات، بەشداری دەکات، بۆ ئەوەی کەمترین نیشانەی نارەزایی دەربڕێ.

بەلام دوا بە دوای راپۆری پەیامنێری ڕویتەر لەمەڕ ئەوەی کەبارزانی لەم کونفرانسەدا ئامـاژەی بۆ «هەندێ ڕێکەوتنی نهـێنی» کـردووە،بارزانی لە ١٩٦٤/٣/٣ بوونی ڕێکەوتنی لەو بابەتە بەدرۆ دەخاتەوە.[٩]

لێ بە گـوتەی ڕێبـەرانی حیـزبی دیوکـراتی کـوردسـتـان هۆی ئەم جیـابوونەوەیە هەڵوێستگیری بارزانی بوو دەربارەی چارەنووسی لەشکری کورد. بارزانی لە بروسکەیەکی دووردرێژدا لە ١٩٦٤/٣/٢ داوا لە «سەرانی حیزب» دەکات کە «ئەگەر هێزێن دەوڵەتی هاتنە پێش وسـەرلەنوێ ناوچەکانی ژێردەسـەلاتی ئەنگۆیان گرت» با هێزێن حیزب هەقیان بەسـەرەوە نەبێ وبکشـێـنەوە بۆ شـوێنانی دی. لە بروسکەکـەدا لە سـەری دەڕوات: «هەرپێکدادانێکی نێـوان ئێـوەو هێزێن دەوڵەتی، پێکادانی چەکدارانەی لەنێوان ئێوە و ئێمەدا لێ دەکەوێتەوە».[١٠]

کە ئەم بروسکە هەرەشە ئامێزە وەردەگرن، شەش ئەندامی مەکتەبی سیاسی وکۆمیتەی ناوەندی حیزب لە قەلادزێ دەگەڵ جەنەراڵ بارزانی دا دیدار دەکەن.

هەمـدیس بە گـوتەی حیـزبی دیوکـراتی کـوردسـتـان، جـەنەراڵ بارزانی لەم دیدارەدا «سەرسەختی» کرد و دڵنیـای کردن کە دەبێ گوێرایەڵی «رابەر» و«نوێنەری نەتەوەی کورد» و «فەرماندەی گشتی هێزەکان» و«سەرۆکی حیزب» بن لە کاتێکدا کەپێشتر هەر کەسێک دەچووە نک وی، دەیگوت کە چ پەیوەندیەکی بەم حیزبەوە نییە.! .

لە ئاخرو ئۆخری هەیڤی سێ دا، کۆنگرەیەکی سوپایی بەئامادەبوونی هەموو سەرانی

سوپایی کورد، دەبەستری و بارزانی عومەر مستەفا و عەلی عەسکەری لەپۆستەکانیان لا دەبات وعەقید عەزیز عەقراوی و نوری مەعروف لەجێی ئەوان دادەمەزرێنێ.[11]

## ٤

## کۆنفرانسی حیزبی دیموکراتی کوردستان (٤-١٩٦٤/٤/٩)

سەرانی حیزب لە دیداری بارزانیدا هیچ بە هیچ ناکەن. بۆیە لەو پێوداتگەوە کە بارزانی دەیەوێ «شۆرشی کورد لە نێویەرێ» بریار دەدەن کە حیزب «کۆنفرانس»ێک بگرێ. ئەم کۆنفرانسە بەئامادەبوون و بەشداری ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی و نوێنەری ریکخستنە جیاوازە حیزبی و لەشکرییەکان، بۆ بریار وەرگرتن لەمەر هەلوێستی بارزانی پاش راگەیاندنی ئاگربر، لە بارەگای شارۆچکەی ماوەتدا دەبەسترێ.

سەرەنجام حیزبی دیموکراتی کوردستان لە بەیاننامەیەکی شازدە لاپەرەییدا و بە ناونیشانی «ئایا رێکەوتنی عارف- بارزانی پەیمانی ئاشتییە، یان تەسلیم بوونە» هەلوێستی خۆی دەردەبرێ. ئەم بەیاننامەیە لە١٩٦٤/٤/١٩ دا بلاو دەکاتەوە (لە راستیدا ئەم قەوالەیە بە تیراژی زۆر کەم و سنووردار بلاو بووەوە)

حیزب ، لەم بەیاننامەیەدا، جەنەرال بارزانی بەوە تاوانبار دەکات کە:

- بۆ ئەوەی دەولەتی ناوەندی دان بە هیچ مافێکی بنەرەتی گەلی کوردا نابێت، پەیمانی ئاگربری دەگەلدا بەستووە.

- لەئەندازە بەدەر متمانەی بەدەولەت کردووە.

- ئاسانکاری زۆری بۆ گەرانەوەی سوپا و دامودەزگای ئیداری عێراق بۆ کوردستان کردووەو لە هەمان کاتدا هەولی داوە حیزب وهێزی چەکداری حیزب لە نێو بەرێ.

- بۆ کۆتایی هێنان بە شۆرشی کورد، بە کردەوە دەستی دەگەل دەولەتدا تێکەل کردووە.

بەیاننامەکەی حیزبی دیموکرات دوای ئەو ئەنجامگیرییەی کە بارزانی لە حالی حازر دا گەورەترین هەرەشە و خەتەرە بۆ شۆرشی کورد، دەلێ: «ئەرکی بنچینەیی حیزب ئەمەیە کە بە ئومێدی دەست هەلگرتنی بارزانی لەم رەفتارە، بە هەموو شێوەو توانایەکییەوە، رووبەرووی ئەم سیاسەتە ببێتەوە.»[12]

دوای کۆنفرانسی ماوەت شاندێک لەلایەن حیزبەوە راسپێردرا کە بروات بۆ لای بارزانی

و نیـوەرۆکی ئەم بەیاننامـەیەی پێ رابگەیەنێ، بارزانی وەلامی دانەوە کـە کـۆنفـرانسی ماوەت پاسـایی نەبووە، چونکە بێ ئامادەبوونی رابەری حیزب بەستراوە، پێشنیـازی کرد کە لەماوەی یەک مانگ دا کۆنگرەی حیزب لەقەلادزێ بگیرێ. بەلام مەکتەبی سیاسی حیزب قایل نەبوو، بەم کۆنگرەیەی کە «لەسایەی چەکدارانی بارزانی دا دەگیرا».

لە ئاخـرو ئوخری هەیڤی شـەش دا، شـاندێکی دیکەی حـیـزب کـە بریتی بوو لە برایم ئەحـمەد و عـەلی عـەبدوللا (ئەندامـانی مـەکـتـەبی سیـاسـی) وعەزیز شـەمزینی (ئەوەی سینـاتۆر عەبدولقادر و کاندیدی ئەندامی مەکتەبی سیاسی لە هەولێکی ئاشتیـانەی دیدا چوون بۆ قەلادزە بۆ لای بارزانی.

## ٥

## دیداری بارزانی- تاهیر یەحیا (سەرەتاکانی ٦/١٩٦٤)

لەم کاتەدا بارزانی چاوەنۆڕی هاتنی جەنەراڵ تاهیر یەحیای سەرەک وەزیری عێراق بوو.

جەنەراڵ بارزانی شـان و شەپێلک داکەوتوو، شەکەت و سیـما ماندوو، هەرگیز تا ئەم رادەیە نـا ئومـێـد نەبووە، هەر وەکـو رەنگدانەوەیەکی ئەو حـالەتە گـوتی: «من ئیـدی بۆ هەمیشـە عێراق بە جێ دێلم، ئیدی ماندوو بوومە.»[١٤]

زۆر بە نارەحەتیەوە باسی تەنیـایی و «بێکەسی» کوردانی دەکرد، کە نەک هەر عێراق دژیەتی، بەلکو تورکیا و ئێرانیش دژین. جەنەراڵ دیگول خۆی لە ئاستی داواکـانی کەڕ کردووە، ئەمەریکایی و ئینگلیزەکان لەبەر بەرژەوەندیە ئەوتییەکانی خۆیان پشتیوانی لە عێراق دەکەن، تەنانەت سۆڤیەتەکانیش دەستیان لێ بەرداوە.!

بێگومان لە نێو شۆڕشیشدا هەستی بە جیاوازی و ناکۆکی دەگەڵ سەرانی حیزب دا دەکرد: عەلی عەبدوللا و برایم ئەحمەد و جەلال تالەبانی لە راستیدا چوو بوون تا بەشداری لەم دیدارەی بارزانی و سەرەک وەزیری عـێـراقدا بکەن. بەلام بارزانی عـەلی عـەبدوللا و برایم ئەحـمـەد پشت گـوێ دەخـات و رووی قـسـان دەکـاتە جـەلال تالەبانی، ئەوەش بە زمانێکی توند.[١٥]

لەم هەلومـەرجەدا «شاندی بارزانی بە نزیکەی ٢٠ ئۆتومبیلی جیبـەوە کەبەم تەرتیـبە بوون: شێخ لەتیف وسـالح یوسفی، عەزیز عەقراوی (کە ئەو دەمە«بەرپرسی حیمایەی» بارزانی بوو) و دەگەڵ ژمارەیەک لە سـەرانی عەشایەر دەگەنە دیدارگەی خەلەکانی نزیکی رانیە.

دوای یەک سەعاتان گفتوگۆ، بارزانی کە لە نیازی دەوڵەت حاڵی بوو، گوتی: «چاکە، بەڕێزان، ئێستا فەرموون لەگەڵ نوێنەرانی گەل دا گفتوگۆ بکەن» ئاماژەی بۆ سەرانی حیزب کرد و کۆبوونەوەکەی بەجێهێشت.

زمانی ئەم گفتوگۆیە خێراو بە شێوەیەکی مەترسیدار گۆڕا و توند بوو، نوێنەرانی دەوڵەت هەموویان جگە لە دکتۆر فەلوجی، بەڕێوەبەرەی ئیدارەی چاپەمەنی وەزارەتی دەرەوە، هەموویان سوپایین، لەم باوەڕەدابوون کە مەسەلە سیاسیەکان، «حەل وفەسڵ» بوونەو تەنها تاقە شتێک کە ماوە «سڕینەوە وە تەهێشتنی نیشانە و شوێنەوارەکانی شەڕە»

سەرانی حیزب گفتوگۆیەکە بەرەو بواری پرەنسیپیان رادەکێشن، و دەیانەوێ پێناسەیەکی ورد و دیاریکراو لەمەڕ ئوتونۆمی ئیداری، کە کوردستان بە تەمایەتی، بەدەستەوە بدرێ، لەم کاتەدا سەرەک وەزیر دەناڵێنێ وە دەڵێ: «بێ کردنەوەی دەرگای جیابوونەوە، ناکرێ باکوری عێراق بە هیچ ناوێکی دیکە پێناسە بکرێ!»(١٦)

سەرەک وەزیر لە قسەکانیدا داوای هەڵوەشانەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەکات. جەنەراڵ هاتی خەماسی سەرۆکی ئیدارەی دووەمی سوپا، داوا دەکات ئەفسەرانی کۆمونیست یان ئەو ئەفسەرە «پێشکەوتنخوازانە»ی کە پاش روخانی قاسم پەنایان وەبەر کوردستان بردووە بە دەوڵەت تەسلیم بکرێنەوە!.

کاتێ سەرانی حیزبی دیموکرات پێشنیازی عەفواتی گشتی دەکەن، سەرەک وەزیر بەتوندی ئەم پێشنیازە رەت دەکاتەوە!

پاشان سەرەک وەزیر پێشنیاز دەکات کە مەسەلەکە تا هەڵبژاردنی پەرلەمان لە زەرفی سێ ساڵاندا دوابخرێ و بەردێکی لەسەر دابنرێ، هەرچەندە گفتوگۆیەکە تا درەنگە شەوانێ دەخایەنێ، بەڵام هەردووک لا بێ ئەوەی لە بۆچوونی یەکدی نزیک ببنەوە، لێکدی جیا دەبنەوە.

دکتۆر فالوجی،بە شێوازی تایبەتی خۆی، بۆچونی دەوڵەت لەمەڕ هەڵوێستی کوردان، بەم شێوەیە خۆڵاسە دەکاتەوە: «کوردەکان دەیانەوێ هەموو تایبەتمەندییەکانی سەربەخۆییان هەبێ بەڵام لەهەموو سەرێشەیەکیش بە دوور بن.»

## ٦
## بچڕانی پەیوەندی لەگەڵ حیزب

بارزانی کە بە کردەوە لەگەڵ دەوڵەتدا تێکی دابوو، پەیوەندی دەگەڵ سەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانیشدا دەبچڕی.

سەرانی حیزب لە راستیدا بەوە قایل بوو بوون کە کۆنگرەی حیزب لە ٦/٢٥ دا «بە چاودێری کۆمیتەیەکی بێلایەن»[١٨] بگیرێ، بەڵام بارزانی لەنکاودا لە هەلومەرجێکی وەهادا، کە ج کەسێک زانیارییەکی دروستی دەربارەی نیە، دەستووری گرتنی عەلی عەبدوڵلا وعەزیز شەمزینی دەدات، بەڵام برایم ئەحمەد دەتوانێ خۆی بگەیەنێتە بارەگای حیزب.

لە سەرەتاکانی مانگی ١٩٦٤/١ دا جەنەراڵ بارزانی شەشەمین کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە رانیە و بە بەشداری نزیکەی ٩سەد نوێنەر و بێ ئامادەبوونی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی حیزب، کە ئەم کارەی بارزانی بە «کودەتا» ناو بردووە، دەکاتەوە.[١٩] کۆنگرەی رانیە، چواردە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزب بە تۆمەتی «چالاکی و چەلەنگی جوداخوازی و کەچرەوی و خەراپەکاری» لە حیزب دەردەکات و مەکتەبێکی سیاسی تازە لە ٥ ئەندام هەڵدەبژێرێ: لەوانە حەبیب محەمەد کەریم، سکرتێری گشتی حیزب، دکتۆر مەحمود عوسمان.

مەکتەبی سیاسی حیزب بە رێبەرایەتی برایم ئەحمەد لە وەڵامی ئەم کۆنگرەیەدا بارزانی «بە کەسایەتیەکی عەشایەری» وەسف دەکات و رادیۆی حیزب داوا لە هێزی پێشمەرگە دەکات کە دژی «سەرکردایەتی» تازەی حیزب راپەڕن. دیارە بەم کارەی برایم ئەحمەد هەموو پەیوەندییەک دەبڕێت.

لەباری سوپاییەوە نایەکسانی هێزەکان دیار بوو، لەراستیدا وێڕای داوای برایم ئەحمەد و تاڵەبانی لە هێزی پێشمەرگەی حیزب، ژمارەیەکی کەم لەهێزی پێشمەرگە پەیوەندییان پێوە کردن کە ژمارەیان لە هەزار کەسێک تێنەدەپەڕی، لەکاتێکدا هێزی پێشمەرگەی سەر بە بارزانی خۆی لە ١٥ تا ٢٥ هەزار پێشمەرگە دەدا.[٢٠]

لە ناوەڕاستی ١٩٦٤/٧ هێزێن سەر بە جەنەراڵ بارزانی، بە سەرکردایەتی عوبەیدوڵلای کوڕی، چوونە ناوچەیەکەوە کەتا ئەو کاتە لە ژێر دەسەڵاتی حیزب دابوو و هێرشیان کردە سەر بارەگای ماوەت.

یەکەمین شەڕ لە ڕۆژی ۷/۱۷ دا ڕوویدا، کە کوژراوێک و چەند بریندارێکی لێکەوتەوە.[٢١]

## ٧

## برایم ئەحمەد لە ئێران دا

سەرانی مەکتەبی سیاسی «جماعەتی برایم ئەحمەد» (جەلال تالەبانی، عومەر مستەفا، عەلی عەسکەری و حیلمی عەلی شەریف) بەمەبەستی خۆ پاراستن لە تەشەنەکرنی شەڕ یان لەوەیە لە رووی ناچارییەوە بووبێ، پەنایان وەبەر ئێران برد، حیزبی دیوکراتی کوردستانی عێراق بە بێ رابەر مابوووە، چونکە دوو ئەندامی دیکەی مەکتەبی سیاسی (عەلی عەبدوڵلا و عەزیزی شەمزینی) لە زیندانی بارزانی دا بوون و یەکێکی دیکەیان کە نوری شاوەیس بوو لە ئینگلتەرا بوو.

پاشان جەلال تالەبانی لێکدا لێکدا دووپاتی دەکردەوە کە پێشتر هەرگیز پەیوەندی بە دەسەڵاتداران وکاربەدەستانی ئێرانییەوە نەبووە، بەڵام هەر کە ئێرانییەکان ئەندامانی ئەم حیزبەیان کە ساواک «لەو دیوی سنوورەوە بە نیگەرانییەوە چاودێری کارو کردەوەکانی دەکردن و بە کۆمونیست)ی دەزانین، قەبوڵ کرد، ئەمە خۆی لە خۆیدا سەیر بوو و لە گومان بەدەر نەبوو. مەگەر ئێمەش ببێ بەهاو پاساوی J.P viennot) و بڵێین کە ئەم کارەی ئێران «زیاتر زادەی دژمنایەتی بەغداو قاهیرە بوو تا زادەی خۆشەویستی کوردان بێ.»[٢٢]

بە هەر حاڵ مەسەلە کە هەر چۆنێک بوو، تالەبانی بە مەبەستی گفتوگۆ دەربارەی چارەنووسی خۆی وهاورێکانی دەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێرانی دا، چوو بۆ تاران. ئەنجام هاورێکانی لە هەمەداندا جێگیر بوون، جەنەراڵ بارزانی دژی هاتنی سوپای ئێران بۆ کوردستانی عێراق و «پشتیوانیان» لەلایەنگرانی تالەبانی ومستا و نارەزایی دا بە ئێران.

سەرانی حیزبی دیوکراتی کوردستان و لایەنگرانیان تا دەست پێکردنەوەی شەڕ لە کوردستانی عێراقدا ولە ساڵی ۱۹٦٥ دا، لە ئێران مانەوە، لەو ساڵەدا مۆڵەتیان وەرگرت کە بگەڕێنەوە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بارزانی، کە گەڕانەوە کوردستان، بارزانی جەلال تالەبانی و عومەر مستەفا و عەلی عەسکەری و حیلمی عەلی شەریفی وەکو نیمچە دەست بەسەر خستنە ژێر چاودێرییەوە.[٢٣]

## ٨
## ئاقیبەت و شوێنەوارێن قەیرانی ١٩٦٤

پچڕانی پەیوەندی بارزانی دەگەڵ ڕێبەرانی حیزبی دیموکرات و چوونی ژمارەیەکیان بۆ ئێران، ئاقیبەت و شوێنەوارێکی زۆری بەسەر بزووتنەوەی کورد ـیەوە بەجێ هێشت.

لە باری فیکرییەوە، جەماعەتی برایم ئەحمەد- تاڵەبانی بێگومان باشترین ڕۆشنبیرانی کوردیان لەخۆ خڕکردبووەوە، دوای ئەم قەیرانە کە «لەگەڵ سیاسەتوانانی ئەشکەوت نشین» دا هاتە ئارەوە. بارزانی کەوتە ناو هاوکارانێکەوە کە پتر لەبەر وەفاداری و پابەندییان بە شەخسی خۆیەوە، نەک لەبەر توانا و شایستەیی فیکری و مەعنەوییانەوە، هەڵی بژاردبوون.: لەمە بەدواوە، واتە لە ساڵی ١٩٦٤ بەملاوە ئیدی دەنێو حیزب دا جێگەیەک بۆ هزرڤانان و خەڵکانی سەربەخۆ لەباری فکرییەوە نەما، تا ساڵی ١٩٧٠ و بەتایبەتی ساڵی ١٩٧٤ کە ڕۆشنبیرانی کورد بە کۆمەڵ پەیوەندی بە شۆڕشی بارزانییەوە دەکەن، بارزانی چ جێیەکی بۆ ئەم جۆرە کەسانە نابێ و چ جێیەکیش بەمجۆرە کەسانە نادات.

بارزانی هەرگیز نابێ بە دکتاتۆر، بەڵام دە ساڵان لەوە دواتر، واتە لە ساڵانی ١٩٧٣-١٩٧٥ دا هەموو بڕیار وقەرارە گرنگەکان بەنهێنی ولەلایەن ژمارەیەکی زۆر کەمەوە، لە حەقیقەتدا لەلایەن گرووپێکی سێ کەسییەوە دەدرێن، گرووپەکە بریتییە لە شەخسی بارزانی و ئیدریس و مەسعود. ئیدی کەس نیە زاتی ئەوە بکات لەقسەکانی بارزانی دەربچێت، لە کاتی ڕووخانی شۆڕش دا کەس نابێ جێی ئەو بگرێتەوە.

وێڕای ئەمەش خەتاو مەسئولیەتی جماعەتی برایم ئەحمەدیش کەم نیە: تاکو ئەوڕۆکەش هۆ و سۆنگەو فاکتەرێن پچڕانی پەیوەندییان دەگەڵ بارزانی داو ئەو هەلومەرج و باروودۆخانەی کە ئەم ڕووداوەیان لێکەوتەوە بە دروستی دیار نیە، بەڵام شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئەم جەماعەتە بایەخ و دەسەڵاتی بارزانییان دەنێو شۆڕشی کوردا بەهەند نەگرتبوو، چونکە گۆشەگیری دواتریان و هەڵسوکەوتەکانی سەرەتاییان دەگەڵ بارزانی، پەنا بردنە بەر ئێرانیان نیشانەی دروستی ئەو بۆچوونەن کە بایەخ و دەسەڵاتی بارزانییان دەنێو شۆڕشی کوردا زۆر بە کەم گرتبوو.[٢٤]

پاشان، ڕێبەرانی حیزب لە ساڵی ١٩٦٤ دا هەمان هەڵەیان کرد، کە حیزبی کۆمونیستی عێراق لە ساڵانی ١٩٥٩-١٩٦٠ دا کردیان، بەسەرسەختی و بادانەوەی خۆیان زەمینەیان بۆ تەسلیم بوونی بارزانی خۆشکرد.

## ٩

## ئاڵۆز بوونی بەینی بارزانی و بەغدایە

ئەگەرچی یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی کۆنگرەی شەشەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق بریتی بوو لە پچڕانی پەیوەندی بارزانی دەگەڵ دام و دەزگای ڕێبەرایەتی کۆنی حیزبدا، لە هەمان کاتدا نیشانەی ئاڵۆز بوونی بەینی بارزانی و بەغدایش بوو: بارزانی ڕێگە لەگەڕانەوەی دام و دەزگای ئیداری حکومەت بۆ ناوچە ئازاد کراوەکان دەگرێ و لێدەبڕێ بە یادداشتنامەیەک داوای ئۆتۆنۆمی بکات.

هەر لەم کۆنگرەیەدا، هەموو ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ بە مارکسیزم- لینینزم لە پرۆگرام وبەرنامەی حیزبدا لا دەبرێ.

بارزانی و مەکتەبی سیاسی تازە، پاشماوەی ساڵی ١٩٦٤ بۆ دامەزراندنی هەندێ دام و دەزگا تەرخان دەکەن کە لە باری کردارەوە کوردستان بگۆڕێ بۆ ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمیدار، وەک:

- دامەزراندنی ئەنجومەنێکی شۆڕشگێڕی و «پەرلەمانی، پەنجا ئەندامی.»
- دامەزراندنی مەکتەبێکی جێبەجێ کردن، یانی لەڕاستیدا کابینەی وەزیران.

جەلال تاڵەبانی و هەڤاڵەکانی ئەم دوو دامەزراوەیە بە چاوی «تۆماری ئەحواڵ» تەماشا دەکەن.(٢٥)

## ١٠

## قەلا و حەساری کوردستان

لەم قۆناغەدا واتە لەساڵی ١٩٦٤ دا جەنەراڵ بارزانی حوکم و دەسەلاتی خۆی بەسەر ناوچەیەکدا دەسەپێنێ کە تا ڕوخانی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٥دا، بە دەستییەوە دەمێنێ، ئەم ناوچەیە کە پشتی بە سنورەکانی ئێران وتورکیاوە بوو لە ڕۆژهەلاتەوە دەگەییە شارۆچکەی خانەقینی سەر سنووری ئێران و لە ڕۆژاواوە دەگەییە شارۆچکەی زاخۆی سەر سنووری تورکیا و سوریا، پانتایی ئەم ناوچەیە دەگەییە نزیکەی ٣٥٠٠٠ کیلۆمەتری چوار گۆشە، واتە نیوەی پانتایی هەمووی کوردستانی عێراقی دەگرتەوە. ناوچەکە لە دوو بەشی سەرەکی پێک هاتووە: ناوچەی بادینان، کە بەدەستی ئەسعەد خۆشەوییەوە بوو، بارزانی بارەگای خۆی لە بەشی ڕۆژهەلات دا، واتە لە نزیکی جادەی هامیلتون دانابوو.

هیچ شارێکی گەورەی کوردی، واتە سلێمانی، کەرکوک، هەولێر، ئاکرێ، دهۆک و زاخۆ، لە نێو ئەم حەسارەدا نەبوون، بەلام نزیکەی نیوەی جەماوەری خەلکی کوردستان، واتە نزیکی یەک ملیۆن کەس[٣٦] لەم ناوچەیەدا کە لە ژێر حوکم و فەرمانی نەتەوەپەروەرانی کوردایە، دەژین.

بە کردەوە هەموو سنووری نێوان عێراق و تورکیا و پتر لە سێ یەکی سنووری عێراق و ئێران لە دەستی دەولەتی بەغدایە دەرچووە.

بارزانی لە نێو ئەم «حەسارە»دا دەسەلاتی رەهاوێن چەندو چونە: سنووری دەسەلاتی زۆر لە رادەو سنووری دەسەلاتی سەرەک وەزیرانێکی ناوچەی ئوتونومیدار پترە.

**لە هەقیقەتدا بارزانی سولتانی بێ تەخت و تاجی کوردستانی عێراقە. لە سەردەمی نیمچە ئەفسانەیی بەدرخان بەملاوە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد هەرگیز پایەو بناغەیەکی جوگرافیایی و ستراتیژی وەهای نەبووە.**

**سەرچاوە پەراوێزان**

١- وەرگێرانی س. گانتز «ژان پی ڕوینو» رۆژهەلات ١٩٦٥، ٢٣/٣٣.

٢- لە دیداری سەرانی عەرەبدا، لە ١/ ١٩٦٤، سەرەک ناسر، گوشاری لە عارف کرد کە بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد، بە مەبەستی ئەوەی کە سوپای عێراق بە کێشەی ناوخۆوە مژول نەبێ، لە گەل کوردەکاندا رێک بکەوێ. (لوموند، ١٢/ ٢/ ١٩٦٤)

٣- دانا ئادامز سمیس، لە نیویۆرک تایز و سەفەری نێو جوامێراندا، دیڤید ئادامسن، سەندی تەلەگراف، جەنگی کوردستان، ئەریک رولو، لوموند.

٤- دەیڤید ئادامسن، جەنگی کوردستان، ل ١٦٢

٥- ئەم بابەتە لە نامەکەی س. گانتز ژ.پ رینودا دەربارەی بزاڤی کورد، باس کراوە: رۆژهەلات ١٩٦٥

٦- عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٢٠

٧- ئەریک رولو « هەلومەستەیەک لە کوردستانی عێراقدا» لوموند، ٧/٧/١٩٦٤

٨- هەڤپەیڤینی سەرۆک عارف دەگەل ئەریک رولودا، لوموند، ١٣/٦/١٩٦٤

٩- عیسمەت شەریف وانلی دەقی یەکێک لەم «رێکەوتنە نهێنیانەی» لە کتێبەکەی خۆیدا تۆمار کردووە، ل ٢١٨-٢٢٠

١٠- جەنەرال پی رونیو، بەیاننامەی ١٠/ ٤/ ١٩٦٤ حیزبی دیموکراتی کوردستانی دەربارەی ئاکرێ لە

نامەکەی خۆیدا تۆمار کردووە، رۆژهەلات ١٩٦٥.

١١- عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٢٢

١٢- ژ.پ. وینو رۆژهەلات ١٩٦٥

١٣- عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٢٣

١٤- ئەریک رولو، لوموند، ١٩٦٤/٧/٧

١٥- هەمان سەرچاوە، ١٩٦٤/٧/٨

١٦- ئەم زانیاریانە لە گوتارێکی ئەریک رولو وە کە لەم دیدارەدا ئامادە بووە، وەرگیراوە، لوموند، ١٩٦٤/٧/٨

١٧- هەمان سەرچاوە

١٨- عیسمەت شەریف وانلی ل ٢٢٣

١٩- ژ، پ وینو، هەمان سەرچاوە، ل ١٠٥

٢٠- هەمان سەرچاوە.

٢١- بە گوتەی ژ.پ.وینو، رۆژهەلات، ل ١٠٦ عیسمەت شەریف وانلی ژمارەی کوژراوەکان بە ١٢ کەس دادەنێ، ل ٢٢٣

٢٢- رۆژهەلات ١٩٦٥ ل ١٠٧

٢٣- عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٢٤

٢٤- ناوی گوتارێکی ئەریک رولویە

٢٥- بۆ زانیاری لەسەر چۆنیەتی ئەم بنەمایانە بڕوانە لێکۆڵینەوەکەی عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٣٢-٢٤٠

٢٦- هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٩

## فەسڵی دەیەم

## شەڕی عارف

(١٩٦٥/٤-١٩٦٦/٦)

ئایا شەڕی مارشال عارف دژی جەنەراڵ بارزانی، لە حەقیقەتدا شکستی ڕێککەوتنەکە بوو، یان تەنێ کۆتایی هاتنی سەردەمێکی دوور و درێژی ئاڵۆزی و سەرگەردانی بوو؟ هەرچەندە ئەو هەلومەرج وبارودۆخەی کە ئاگربڕی ساڵی ١٩٦٤ی تێدا ئەنجام درا، هەلومەرجێکی نهێنی بوو، تا ئەوڕۆ نهێنییەکانی نەزانراون، ئەوجاش ناتوانرێ لەم ڕووەوە چ داوەرییەک بکرێ.

بەڵام بەر لە دەست پێکردنەوەی شەر، هەست بەساردی نێوان بارزانی و دەوڵەتی ناوەندی دەکەین، کە ئاڵوگۆڕی یادداشتنامەو دەرکردن و بڵاوکردنەوەی بەلاغ و بەیان و هەرەشە کردن لە تایبەتمەندییەکانێتی.

لە ١١/١٠/١٩٦٤دا جەنەراڵ بارزانی یادداشتنامەیەک بە دەوڵەتی عێراق دەدات، لەم یادداشتنامەیەدا کە پتر لە یادداشتنامەکەی ٢٤/٤/١٩٦٣ دەچێت، بارزانی داوا لە دەوڵەت دەکات کە «لەدەستووری عێراق دا دان بە مافی کورددا لەسەر بنەمای ئۆتونۆمی» بنرێ، لەم یادداشتنامەیەدا مادەیەک هەیە سەبارەت بە سوپا، کە زۆر قورسە، بارزانی داوا لە دەوڵەت دەکات کە یەکە جەنگاوەرییەکانی کورد «بە هەمان شێوەی خۆیان» بمێننەوە تا «دامەزراندنی ئەنجومەنی ویلایەت» (لە سیستەمی ئیداری عوسمانی دا ویلایەتی موسڵ شارانی سلێمانی و هەولێر و کەرکوکی دەگرتەوە، لێرەدا نووسەر مەبەستی لەوجۆرە تەقسیم بەندییە ئیدارییەیە.)

کە ئەوساکە دەکرێن بە حەرەسی سنووری ڕێک و پێک و ژمارەیان لە ٢٠/٠٠٠ هەزار کەس تێنەپەڕێ.[1]

لە هەیڤی ١٢/١٩٦٤ دا لە ناوچەی چەمچەماڵ کەلە ژێر دەستی پێشمەرگەی کوردایە و سوپای عێراق بەتەمایە بیگرێ، هەروەها لە دەربەندیخان و لە خانەقین دا هەندێ شەڕوپێکادان لە نێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەدا ڕوو دەدەن.

بەڵام ئەم شەڕو پێکادانانە هێشتا شەڕی تەواوەتی نین.

بەڵام لە ١٩٦٥/١ دا عەبدولحەمید سویحی، وەزیری ناوخۆی سەرۆک عارف رایدەگەیەنێ کە تا لەشکری کورد هەڵنەوەشێننەوە و چەکەکانی تەسلیم بە دەسەڵاتدارانی حکومەت نەکات، دەوڵەتی عێراق نامادەی گفتوگۆ نیە! هەروەها دەڵێ کە عێراق بە تەما نییە نوتونومی «نە ئێستا و نە لە ئایندەدا»[٢] بە کورد بدات.

ئێستا ئیدی پچڕانی پەیوەندی زۆر دوور نییە.

## ١
## سەرەتای شەڕ

سەرکوتکردنی هەراو هەنگامەکانی سلێمانی لە ١٩٦٥/٤/٢ و بەکارهێنانی زرێپۆش بۆ ئەو مەبەستە، کەبووە مایەی کوشتنی نزیکەی شەست کەس و بریندار بوونی نزیکەی سەد کەسێک،[٣] لە راستیدا راگەیاندنی شەڕی عارف بوو دژ بە کوردان، دوا بەدوای ئەم کارە سوپای عێراق دەست بە هێرشێکی گشتی دەکات. بەو مەبەستەی کە هێڵی بەرگری کوردەکان بشکێنێ و بگاتە سنوورەکانی ئێران وتورکیا.

دەوڵەتی عێراق سانسۆرێکی زۆر توندی خستبووە سەر ئەم کارە سوپاییانە و تا چەند هەفتەیەک هەر حاشای لێدەکرد، بە رادەیەک کە جارێک رۆژنامەوانێک بروسکەیەکی پێ گەیی بوو کە وشەی «کورد»ی تێدا بەکارهاتبوو، لەسەر ئەوە بۆ دەزگای ئاسایشی سوپایی بانگ کرابوو.[٤] تەنێ جەنازەی ئەو ئەفسەرانەیان بۆ باشور دەبردەوە کە لەکوردستاندا دەکوژران و داوایان لە ماڵباتەکانیان دەکرد کە بەوپەڕی پارێزەوە بە خاکیان بسپێرن.

بەکردەوە هەموو سوپای عێراق ٤٠-٥٠ هەزار سەرباز بە پشتیوانی فڕۆکەی میگ وهانتەرەوە لە کوردستاندا، لەشەڕدا بوون.

یەکێک لە تایبەتمەندی شەڕەکانی عارف، توندی و بەربڵاوی شەڕەکان بوو، کوردەکان بەرە بەرە چەکی قورسیان وەدەست دەکەوت و بەرەبەرە شەڕی بەرەیی جێی شەڕی پارتیزانی دەگرتەوە. تەنۆ کۆمەک و یارمەتی ئێران بۆ کوردان دەستی پێکردبوو.

لە سەرەتادا هێزەکانی عێراق روو دەکەنە هەندێ ناوچەی دیاری کراو: چوارتا، پێنجوین و قەڵادزە دەگرن، شەڕی زۆر قورس بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک لە ناوچەی هەولێر و زنجیرە چیای سەفین دا بەردەوام دەبێت.

بەڵام لەپاییزی ١٩٦٥دا کوردەکان دەست بە هێرش دەکەن، پەلاماری رێگەوبان و جبەخانەکانی سوپای عێراقی دەدەن و گەلێک لە ناوچە داگیرکراوەکانی لێ دەسەنێتەوە

وچوراتا و سەفین دەگرنەوە.

بۆ یەکەمجار لە مێژووی شەڕەکانی عێراق دەگەڵ بارزانیدا، هاتنی زستان نابێتە مایەی وەستانی شەڕەکان، لە راستیدا لەبەرەبەری هاتنی سالی نوێی مەسیحی (١٩٦٥)دا، سوپای عێراق لەبەرەی پێنجوێنەوە دەست بە هێرش دەکات. شەڕ تا شوبات بەردەوام دەبێ.

دوای روخانی بەعسییەکان ولاچونیان لەسەرکار، سێ حکومەتی یەک لە دوای یەک دێنەسەرکار. لە ئەیلولی ١٩٦٥ دا پیاوێکی مەدەنی دەبێ بەسەرۆکی حکومەت: ئەویش دکتۆر بەزازی ئەوقات دەبێ. بەلام لەراستیدا حوکم بەدەستی سوپاییەکانەوە بوو، وەزیری بەرگری جەنەراڵ عوقیەلی بوو، کە پیاوێکی توند رەوی دژە کورد بوو.

## ٢

## پەیوەندیێن بارزانی دەگەڵ ئێراندا

جەنەراڵ بارزانی، لەم قۆناغەدا بڕیارێکی گرنگ دەدات، کە بۆ ئایندەی شۆڕشی کورد، بڕیارێکی کوشندەیە: پەیوەندی دەگەڵ دەسەلاتدارانی ئێرانی دا تازە دەکاتەو.

بارزانی هەمیشە بەینی دەگەڵ خێلە کوردەکانی ئەو دیوی سنووردا خۆش بوو: هەر لە کۆنەوە لە هەیڤی هەشتی ١٩٤٥وە چەند سەد پێشمەرگەیەکی کوردی ئێرانی هاتنە هانای بارزانییەوە بەگەلی کەوتن و دژی هێزێن عێراقی خەبتی بوون. ئەوسەردەمە کەمی مابوو کە ئەم رووداوە گەورە ببێتەوە و ببێ بە تەیرانێکی نێو نەتەوەیی.[٥]

لەسالی ١٩٦٢ وە، هاوکاری کوردێن ئێران بۆ بارزانی بایەخێکی پتر وەردەگرێ، بەلام ئەو ئەم کۆمەکە جۆرێکی دییە: کوردەکان لەو خالە سنوورییانەوە کە سوپای عێراقی لێ نیە، یارمەتی خۆیان دەگەیەننە بارزانی. ئەم یارمەتییانە دەکەنە کارێک کە بارزانی وێرای گەمارۆی ئابوری حکومەتی بەغدا لەسەر کوردستانی عێراق، بتوانێ درێژە بە بەرگری و بەرەڤانی خۆی بدات.

خۆراک، پۆشاک، پارە، چەک وتەقەمەنی[٦] لەلایەن خەلکانی ئاساییەوە، بەلام زۆربەی کات بە ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا، بۆ بارزانی دەنێردرێ.

جەنەراڵ بارزانی لە هاوینی ١٩٦٢وە، لە راستیدا تۆڕێکی بەرێبەری عەبدوللا ئیسحاقی کە زیاتر بەناوی ئەحمەد تۆفیق ناسراوە و لە سەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانە، دەکەوێتە دەست.

هەر هەمـان تێوە کە کاری هێنانی ڕۆژنامەوانان دەگرێتە ئەستۆ، ئەو ڕۆژنامەوانانەی کەلە ئاخرونۆخری سـالی ١٩٦٢ وە دێنە کوردسـتان ویەکەمین ڕاپۆری خۆیان لەمەڕ شۆڕشی کورد ئامادە دەکەن.(٧)

پەیوەندی بارزانی دەگـەل کـوردیـن ئێـراندا لە سـالی ١٩٦٢وە تا سـالی ١٩٦٤و پێ بەپێی تەشـەنە سـەندنی شەڕ، پەرە دەسـتێنێ. ژمارەیەک لەسەرانی عەشایەری کوردی ئێران، لە کوردستانی عێراقدا و لەپاڵ بارەگای جەنەراڵ بارزانیدا، بارەگا دادەنێن وجێگیر دەبن، بەلام ئەم پەیوەندییانە پەیوەندی شەخسی و تایبەتین، ئەو کۆمەکانەی دەنێردران لەلایەن ئەو کـوردانەوە بوو کـەشـۆڕشی کـوردیان خۆش دەویسـت وجۆرە پەیوەندییـەکیـان دەگەلی هەبوو.

## ٣
## و شا

بارزانی، دوای قـەیران وتەنگژەی سالی ١٩٦٤ ئەوەبوو سـەبارەت بە جەماعـەتی برایم ئەحمەد، بۆ یەکەمجار پەیوەندی بە دەسەلاتدارانی ئێرانەوە کرد.(٨) هەڕەشەی ئەوەی کرد کـە ئەگەر یارمـەتی «ئەو ئەیارانەی»ی کە لە هەمەداندا نیشـتـەجێ بوو بوون بدەن، ئەوا تۆلە دەکاتەوە.

کـەس نازانێ ئەم «پەیوەندییـە سـەلبیـە» کـەی و لە چ هەلومـەرجێکدا گۆڕاو بوو بە «پەیوەندی ئیجابی» شا، بۆی دەرکەوت کە جەماعەتی برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی لە ئاستی ئەو شـۆڕشـەدا کە بارزانی ڕێبـەری بوو، سـەنگ و بایەخێکی ئەوتۆی نیـیـە، لەم بوارەدا زۆر واقـیـعـبـینانەتر لە سـەرانی عـێـراق ڕەفـتـاری کـرد، کـە تا سـالی ١٩٧٠ چارەنووسی خۆیان بە چارەنووسی ئەم «نارازییانەوە» بەست.

**فاکتەرێکی دیکە کە شای ناچار کرد، بڕیاری یارمەتی دانی جەنەراڵ بارزانی بدات، ئەو یارمەتییە فرلوانەبوو کە کوردێن ئێران پێشکەش بە شۆڕشی کوردی عێراقیان دەکرد: ئاشکرا بوو کە باشترین ڕێگە بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەم یارمەتییە، ئەوەبوو کە شا بەخۆی سەرپەرشتی بکات و جلەوی بگرێتەدەست.**

لە مانگی پێنجی سـالی ١٩٦٥ ڕە پەیامنێرانی تایبەتی ڕۆژنامە جیـهانییـەکان، ڕۆژ بەڕۆژ چەکی نوێ، چەکی «قورس»ی زیاتر لەکوردستاندا دەبینن.(٩)

لە پاییـزی سالی ١٩٦٥ دا یارمـەتی شا بۆ بارزانی زیاد دەکـات و دەبێت بە یەکـێـک

لەو خالانەی کە شا حوسەینی شای ئوردن لە سەفەرە تایبەتییەکەی خۆیدا بۆ ئێران، بەمەبەستی چارەسەکردنی، باسی دەکات (سەفەرەکە لە ٢٥-١٩٦٥/٩/٢٨ ی خایاند)[١٠]

زۆری پێناچێت کە دنیای عەرەب کاردانەوە، دژی کورد وئێرانییەکان نیشان دەدەن، دەسەلاتدارانی میسری لەناخر و ئۆخری هەیڤی دە دا، دوای سەفەری دکتۆر بەزازی سەرەک وەزیری عێراق بۆ میسر، شەوکەت عەقراوی نوێنەری بارزانی لە قاهیرە دەردەکەن.

## ٤

## یەکەمین ڕووداوێن نێوان ئێران و عێراق.

ئەو کێشمانەکێشەی کە لە ناوەڕاستی هەیڤی ١٩٦٥/١١ وە کەوتبووە نێوان ئێران و عێراقەوە، لەمانگی ١٩٦٦/١دا، کاتێ سەفیری ئێران لە بەغدایە،داوا لە دەولەتی عێراق دەکات «زیاتر ئاگای لە سنوورەکانی خۆی بێ»[١١] ئاشکرا دەبێت: کوردەکان لەقۆلی پێنجوینەوە و بەسەرکردایەتی عەزیز عەقراوی هێرش دەکەن و دوای شەڕێکی توندی سێ ڕۆژە زەرەروزیانێکی قورس لە سوپای عێراقی دەدەن و دوای گرتنی «قەلای» پێنجوێن سێ ئەفسەر و چل و یەک سەربازی عێراقی دەکوژن.

جەنەراڵ عوقەیلی وەزیری بەرگری عێراق «نومێد» دەخوازێ کە دەولەتی ئێران سنوورەکانی لە ڕووی شۆڕشڤانانی کورد دابخات، چونکە «ئەم کەلێنە سنووریانە، زۆربەی پێویستی کوردەکان لە باری دارایی و مرۆڤییەوە دابین دەکەن» هەروەها لە بندێری گوتەکانی دا « هەندێ دەسەلاتی بێگانان بەوە تاوانبار دەکات کە کوردەکان هاندەدەن تا ئیسرائیلێکی تازە لەباکوری عێراقدا» دابمەزرێنن![١٢]

دەولەتی عێراق لە ١٩٦٦/١/٤دا بە ڕەسمی ناڕەزایی خۆی بۆ دەسەلاتدارانی ئێرانی سەبارەت بە « پشتیوانی مادی و مەعنەوی» کوردەکان، دەردەبڕێ.

عەدنان پاچەچی وەزیری دەرەوەی عێراق یادداشتنامەیەک دەدات بەکارداری سەفارەتخانەی ئێران و لەم یادداشتنامەیەدا ئێران بەوە تاوانبار دەکات کە «ڕێگەی ئاژوەچی وپاخییانی داوە تا لە ناو خاکی ئێرانەوە سەنگەری هێزەکانی عێراق» بەتایبەتی لە ١/٢) دا تۆپ باران بکەن» ، هەر لەم یادداشتنامەیەدا وەزیری دەرەوەی عێراق، ئێران بەوە تاوانبار دەکات کە «ئەوزاری جەنگی گرنگی ، بەتایبەتی هاوەن وتۆپ و مینی دژە تانک ونارنجۆکی دە ئیختیاری یاخیان ناوە.»[١٣]

بەڵام وەزیری دەرەوەی عـێـراق هەر بەوەندەوە ناوەسـتێ: هەمـان ڕۆژ سـەفـیـرانی ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیای مەزن و فەرەنسە بۆ دیوانی وەزارەتی دەرەوە بانگ دەکات تا لە بۆچوونی ولاتی خۆی دەربارەی ئەو قەیرانەی کە کەوتۆتە بەینی ئێران و عێراقەوە، ئاگاداریان بکاتەوە. دوای چەند ڕۆژێک جەنەراڵ عەبدولرەحمان عارفی برای سەرکۆمار عەبدولسەلام عارف و سەرۆکی سەرکردایەتی سوپا، ئەمیر عەباس هوەیدای سەرەک وەزیرانی ئێران بە «پیلانگێڕی» دژی عێراق تاوانبار دەکات، چونکە لە سەرەتای هەیڤی ١١/١٩٦٥ دا دیدارێکی دەگەڵ بارزانی کردبوو.[١٤]

هەڵبەتە زۆر کەس ئەو خاڵە فەرامۆش دەکەن، کەلە زستانی ١٩٦٥ -١٩٦٦وە ئیدی زەمینەیەکی نێونەتەوەیی ئەوتۆ خۆش بوو بوو و کە دە ساڵی ئایندەی شۆڕشی کوردی بە جۆرێ ئاراستە کرد کەبووە مایەی ڕوخانی شۆڕش.

٥

## سەرچاوەێن دابینکردنی چەک

جگە لە ئێران، زانیاری لەمەڕ ئەو سەرچاوە و ولاتانەی کە چەکیان بەبارزانی دەدا، زۆر کەمە.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، لە هەوەڵی هەیڤی ١٩٦٦/١ دا پۆلیسی ئەڵمان لە ساربروک دا و چوار هاوولاتی ئەڵمـانیـای ڕۆژاوایـیـان گـرت، چونکە چەند لۆرییـە تفـەنگێکی ئوتوماتیکیان لە چیکۆسلۆڤاکیاوە بۆ جەنگاوەرانی کورد بار کردبوو، ئەم چەکانە کە لە چیکوسلواکیا کڕابوون قەرار بوو لە ئەستەموڵەوە ڕەت بکرێن. بەڵام پۆلیسی ئەڵمان ئەوە ڕوون ناکاتەوە کە ئایا ئەم ڕاسپاردەیە تایبەتی بووە یان «ڕەسمی».[١٥]

٦

## پەیوەندی کردنی جەماعەتی تاڵەبانی بە دەوڵەتەوە.

لە هەیڤی ١٩٦٦/١ دا عومەر مستەفا وعەلی عەسکەری و حیلمی شەریف،بە دزییەوە خۆ بە خاکی عێراقدا دەکەنەوە و ( هاوینی ١٩٦٥ ) پەیوەندی بە دەسەلاتدارانی عێراقەوە دەکەن.[١٦]

زۆری پێناچێت کەشان بەشانی سوپای عێراق، تاقمە بەکرێگیراوێکی تازە لە مەیدانی شەڕدا دەردەکەون: «جاشەکانی ٦٦»، بەڵام ئەمجارەیان ئەم جاشانە، خەڵکانی عەشایەر نین کە دەوڵەتی عـێـراقی بۆ ڕقەبەرایەتی بارزانی سـوودی لێ وەرگرتبێ. ئەمـجـارە ئەم

جاشانە رۆشنبیرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانن.

برایم ئەحمەد و جەلال تالەبانی و عەلی عەسکەری و حیلمی شەریف وعومەر دەبابە بە بیانووی « رزگارکرنی شۆرشی کورد لە چنگی سەرکردایەتی خێڵەکی و وپاشکەوتوو » ئەمە لایەنی کەمی ئەو ناوو ناتۆرەیەیە کە لە بلاوکراوەکەی خۆیا [illegible] دا بەنێوی النور، بلاوی دەکەنەوە) نزیکەی ۲۰۰۰ کەسێک خڕ دەکەنەوە و حکومەتی عێراق پارەو چەکی پێویستی بۆ دابین دەکردن، ئەم جەماعەتە لە شەڕی عێراق و بارزانیدا تا سالی ۱۹۷۰ رۆلێکی [illegible] دەبەک گرنگ دەبینن.

ئەم رەفتارە کە دەرککردن و تێگەیشتنی بۆ کەسێکی رۆژاوایی قورس و دژوارە، لە راستیدا ئەنجامی ئەو هەلۆکیە شەخسییەیە کە سکرتێری گشتی جارانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی رووبەرووی سەرۆکی بیست سالەی حیزب کردەوە، واتە دەگەرێتەوە بۆ **سەردەمی مەهاباد، بۆ ئەو دەمەی کە بارزانی هەمزە عەبدوللای بۆ عێراق ناردەوە تا حیزبی دیموکراتی کوردستانی (جیا لە حیزبی قازی محەمەد) دابمەزرێنن.**

## ۷

## شەڕی هندرێن (۱۹۶۶/۶،۵)

شەڕی هندرین، فەسلێکی تازە لەمێژووی کوردستان دەکاتەوە: لە راستیدا کوردەکان وعێراقییەکان بۆ یەکەمین جار، بۆ چەندین هەفتە شەڕی جەبهەیی دەگەل یەکدی دا دەکەن و خەلکانێکی زۆر دەخزێننە مەیدانی شەڕەوە: دوو لەشکری تەواو لەسوپای عێراق بە پشتیوانی تۆپخانەو هێزی فرۆکەوانی و بە کرێگیراوانی جەماعەتی برایم ئەحمەد.

ئەم شەڕە شەڕی گرتنی چیای هندرینە (۲۸۷۵ مەتر لە دەریاوە بەرزە) لەگەل چیای زۆزک دا کە زالە بەسەر هەموو ئەو رێگایانەدا کە دەچنەوە سەر جادەی هامیلتون، لە ۴/۱۳ دا مارشال عارف لەرووداوی کەوتنە خوارەوەی هەلیکۆپتەرەردا مرد و دوای چەند رۆژێک لەمەردنی وی، هێزێن عێراقی دەست بە هێرش دەکەن و دەتوانن یەکێک لە لوتکەکانی هندرین بگرن. بۆ ماوەی دە رۆژان هێرش و دژە هێرش پەیتا پەیتا و بەتوندییەکی بێ وێنەوە بەردەوام دەبێت. لە ۱۹۶۶/۵/۱۲ دا هێزەکانی عێراق پاش دژە هێرشێکی کوردان بەوپەڕی پەشێوی و سەرگەردانییەوە مەیدان چۆل دەکەن، رنیە موریە Rene maureisی رۆژنامەوانی فەرەنسی کە بەخۆی لە شەرەکەدا بووە، چۆنیەتی ئەم شەڕە مێژووییەی بە دووروودرێژی نووسیوە.[۱۷]

ناکامی شەڕی هەندرێن بۆ سوپای عێراق کارەساتە: چەند سەد کوژراو بەرانبەر بە شەست کوژراوی کورد.[18] لەمەش گرنگتر ئەمەیە کە قوەتەکانی عێراق لە مەیدان هەلاتوون و چەک و تفاق و تەقەمەنییەکی زۆریان لە دوای خۆ بە جێهێشتووە. چوار تۆپی جەوەلی، چوار هاوەنی قورس، شەش رەشاشی قورس و سەدان تفەنگ.[19]

## ٨

## رێکەوتنی ١٩٦٦/٦/٢٩

بەغدا لەم کاتەدا «تێکشکانی» شۆڕشی کورد و مردنی ئیدریس بارزانی رادەگەیەنێ و ئەم وەختە بەساتی هەرە لەبار بۆ ئەو کارە دەزانێ. بەلام لە هەمان کاتدا حکومەتی عێراق ژێراوژێر دەگەڵ بارزانیدا دەکەوێتە گفتوگۆ: لە ١٩٦٦/٦/١٣ دا شاندێکی کوردی بە سەرۆکایەتی حەبیب کەریمی سکرتێری گشتی تازەی حیزبی دیموکراتی کوردستان و ئەندامێتی سالح یوسفی و موحسین دزەیی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی، بۆ بەغدایە دەچێت و لەلایەن جەنەراڵ عەبدولرەحمان عارفەوە، کەلەبری کاکی بووە بە سەرکۆمار، پێشوازی دەکرێ.[20]

گفتوگۆ یەکە بە شێوەیەکی غەریب دەست پێ دەکات، حەبیب کەریم دەڵێ: «لەگەڵ جەنەراڵ عارف دا، کە کەسایەتیەکی لاواز بوو، جگە لە هەندێ گفتوگۆی گشتی قسەیەکی دیمان نەکرد. بۆچی لەگەڵ یەکدا شەڕ دەکەین؟ ئێمە هەردوولامان موسولمانین، موسولمان برانە، ئیدی کورد بن یان عەرەب! ئێمە چ ناکۆکییەکمان لە بەیندا نییە!»

گفتوگۆی راستەقینە دەگەڵ عەبدولرەحمان بەزازی سەرەک وەزیران دا بوو، کەلە زانستگادا مامۆستای حەبیب کەریم بوو بوو، گفتوگۆیەکە لە کەش وهەوایەکی گەرم و دۆستانەدا (!) ئەنجام درا.

پاشان نوێنەرانی بارزانی داوا لە دکتۆر بەزاز دەکەن کە بە رەسمی ئوتونومی کوردان رابگەیەنێ، بەلام دکتۆر بەزاز رازی نابێت ودەڵێت سوپا بەمە قایل نابێت و پەنا وەبەر قوەت دەبات. لە ١٩٦٦/٦/٢٩ دا دوای چەند جارێک هاتوچۆ لە نێوان بارەگای بارزانی و بەغدایەدا، سەرەک وەزیرانی عێراق لەتەلەفزیۆنی عێراقەوە ئاشتی و رێکەوتن رادەگەیەنێ و «مافی نەتەوەیی کوردان» لە چوارچێوەی «لامەرکەزی»دا بەرەسمی رادەگەیەنێ.

رێککەوتننامەی بەزاز ١٢ خالی گرتبووە خۆ، لە وانە: هەلبژاردنی ئەنجومەن و

دەرکردنی عەفوانی گشتی وبەکارهێنانی زمانی کوردی بە شێوەی رەسمی و ... هێزی پێشمەرگە وەکو « هێزێکی دەوڵەتی» تا ئاسایی بوونەوەی ژیان و گوزەران لە ولاتدا.[21]

هەندێ لە خاڵە نهێنییەکانی ئەم رێککەوتننامەیە ئەوە بوو ... سەرۆک وەزیر بەڵێنی دابوو کە حیزبی دیموکراتی کوردستان بکات بە حیزبێکی قانونی و مۆڵەتی کارکردنی بدات. زیندانیانی سیاسی ئازاد بکات و لە دەوروبەری دهۆک، لە بادینانندا، شارێک «لیوایەک ... روست بکات.[22]

کوردەکان جارێکی دیکە و پاش ١٤ هەیڤان شەڕ و وەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی گەورە، بەشێکی کەمتر لە ئوتونومی، کە لە بەرنامەی حیزبەکەیاندا وەکو ئامانجی سەرەکی خەباتیان تۆماریان کردبوو، رازی بوون و سولحیان کرد.

حەبیب کەریم دوای ماوەیەک دەڵێ: «وەزعمان باش نەبوو، چەک و تەقەمەنیمان نەبوو، پاش چواردە مانگان شەڕی قورس، تەواو ماندوو بوو بووین و تواناکمان لەبەر برا بوو.»

١٤ ساڵان دواتر ئەندامێکی دیکەی مەکتەبی سیاسی، واتە دکتۆر مەحمود عوسمانش کە ئەو دەمە بە «وەزیری دەرەوەی بارزانی حەساو دەکرا» ویستی بەم قسانە پاساو بۆ کرداری بارزانی لەم بارەیەوە بێنێتەوە. «دەمانتوانی بە پشتیوانی ئەم سەرکەوتنە بێ وێنەیە، داوای دەستکەوتی زیاتر لە بەغدایە بکەین، بەڵام بە هەر حاڵ سیاسەت هونەری مومکیناتە. ئێمە پێمان باشتر بوو رێگەی بەرە بەرە بەرەو ئامانج بگرینە بەر.»[24]

**جارێکی دیکە کوردەکان، کە شەڕیان بردبووەوە ئاشتیان دەدۆڕاند.**

**سەرچاوە پەراوێزان:**

١- فەجری نوێ، یەکێکە لە گۆڤارەکانی بەغدایە، ١٩٦٥/٢/١١. لە عیسمەت شەریف وانلیەوە وەرگیراوە. ل ٢٥٨.

٢- گۆڤاری المحرر- ی لوبنانی لە کتێبەکەی عیسمەت شەریفەوە «مێژووی شۆڕشی نەتەوەی کورد» رۆژهەلات ١٩٦٥، ٣٢، ٣٣

٣- هەمان سەرچاوە.

٤- پیتەر منسفیلد، سەندەی تایمز، ١٩٦٥/٥/١٦

٥- بڕوانە کتێبەکەی عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٦٠.

٦- چەک و تەقەمەنی لە ئەفسەرانی ئێران دەکڕدران.

٧- دانا ئادامز سمیس، ١٩٦٢/٨ و ڤیڤید ئادامسن، ١٩٦٢/١٠

٨- جگە لە نامەکانی بارزانی کە وەلام نەدرابوونەوە، ڤیڤید ئادامسن ئامارە بۆ ئەم نامانانە دەکات.

٩- پیتر منسفیلد، «کوردەکان، جەنگ بە چەکی تازە» سەندەی تایز، ١٩٦٥/٥/١٦

١٠- لوموند، ١٩٦٥/٩/٣٠

١١- هەمان سەرچاوە، ١٩٦٥/١١/١٧

١٢- هەڤپەیڤینی جەنەراڵ عـوقەیلی دەگـەڵ المنار دا، ١٩٦٦/١/٣. لە لوموندەوە وەرگیـراوە، ١٩٦٦/١/٥

١٣- پەیامی تەلەگرافی ١٩٦٦/١/١٥ی ئاژانسی دەنگ وباسی فەرەنسا، لوموند، ١٩٦٦/١/٦

١٤- جەواد عەلامیر، پەیامنێری لوموند، لە تاران ١٩٦٦/١/٥

١٥- لوموند، ١٩٦٦/١/٢٥

١٦- بە گوتەی عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٦٤

١٧- ر. موریە، یان کوردستان یان نەمان، ل ١٧٥ - ١٨٥

١٨- حەبیب کەریم، هەڤپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، ئاوپردان، شوباتی ١٩٧٥

١٩- راپۆری عەبدوللا پشدەری بۆ عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٦٦

٢٠- هەڤپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، ئاوپردان، شوباتی ١٩٧٥

٢١- هەمان سەرچاوە.

٢٢- بۆ زانیاری تەواو لەمەڕ دەقی تەواوی ڕێکەوتنامەکە بڕوانە عیسمەت شەریف وانلی ل ٣٧٩-٣٨٠.

٢٣- هەڤپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، ئاوپردان، شوباتی ١٩٧٥

٢٤- هەمان سەرچاوە.

# فەسڵی یازدە

## پشووی سێیەم

۱۹٦۹/۱-۱۹٦٦/٦

### ۱

### جەنەراڵ عارف و مەسەلەی کورد

جەنەراڵ عەبدولرەحمان کە پیاوێکی بە ناوەز نەبوو، ڕێگەی پێشقەچوونی بۆ رەونەق ومایەی خۆی لە دوای روخانی قاسم بڕی بوو: ئەو کە «دوای روخانی قاسم» پلەی جەنەراڵی وەرگرتبوو،لە ۱۹٦۳/۱۱/۱۷ دا، لە کودەتای دژە بەعسی دا،بەخۆی و قوەتە زرێپۆشەکەیەوە رۆڵێکی گرنگ و بنجیری بینی. لە دوای ئەوەی گەیبە پلەی یاریدەدەری سەرکردایەتی سوپا، ئەوجا بوو بە فەرماندەی لەشکر (۱۹٦٤) وپاشتر بوو بە بریکاری سەرکردایەتی سوپا و برایەکەی نەیتوانی وەکو سەرۆکی سەرکردایەتی سوپا بەسەر سوپاییانی عێراقی دا بیسەپێنێ، هەموو پێشکەوتن و پێشقەچوونێکی لە سۆنگە وسایەی براکەیەوە بوو: سەرانی سوپایی عێراقی کە لە ئەنجامی مەرگی لەنکاوی عارفدا عافلگیر بوو بوون و لەنێوخۆیاندا زۆر ناکۆک وناتەبا بوون، هەموو رازی بوون لەسەر ئەوەی ئەم کەسایەتییە «گاڵتەجارە» لە جێی ئەو دابنرێ.

لە ۱۹٦٦/٦/۲۹ واتە چوار هەیڤان پاشی ناگربڕ، جەنەراڵ عارف لە ۱۹٦٦/۱۰/۲۸ دا لە ئوردوگای دووڕیانی «مەفرەق»[1] رەواندزدا دیداری دەگەڵ جەنەراڵ بارزانی دا کرد. یەکێک لە نوکتە عەنتیکەکانی ئەم دیدارە ئەوە بوو کە عارف قورئانێکی بە دیاری دا بە بارزانی و بارزانیش ئەو تۆپانەی کەلە شەڕی هندرێن دا لە سوپای عێراقی گیرابوون، دایەوە بەو.[2]

بەڵام جگە لە ئازاد کردنی ژمارەیەک لە زیندانیانی سیاسی کورد و وەرگرتنەوەی سەرەوت وسامانی دەست بەسەرگیراو دەرکردنی رۆژنامەی «التاخی» بە زمانی عەرەبی و بەسەرپەرشتی ساڵح یوسفی ئیدی «رێکەوتنی» بەزاز بووبە مەرەکەبی سەرکاغەز و پەیوەندیەکان سەرلەنوێ بەرەو تێکچوون چوون.

لە هەوەڵێ هەیڤی ۱۹٦٦/۱۱دا جەنەراڵ عارف گەشتێکی یەک هەفتەیی باکوری کرد و بە هەمان گەشبینی ئاسایی خۆیەوە رایگەیاند کە «مەسەلەی کورد کۆتایی هاتووە.

جەنەراڵ بارزانی بەراشکاوی پێی گوتوین کە خوازیاری ئوتونومی کوردستان نییە، دژی هەر جۆرە جودا خوازییەکە.»[٣]

لێ چەند رۆژێک دوای کۆنگرەی حەوتەمی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە لە ١٥-٢١/ ١١/ ١٩٦٦ لە گەلاڵە گیراو مەکتەبێکی سیاسی پێنج کەسی هەڵبژێردرا و بریتی بوون لە: حەبیب کەریم سکرتێری گشتی دکتۆر مەحمودعوسمان، نوری شاوەیس، عەلی عەبدلا و ساڵح یوسفی، کە هەر هەموویان گوێڕایەڵ وسەر بەفەرمانی بارزانی بوون، جەنەراڵ بارزانی بە چەند رۆژێک دوای کۆنگرەی نێو براو یادداشتنامەیەکی هەڕەشە ئامێزی دا بە جەنەراڵ عارف و ناجی تالیبی سەرەک وەزیرانی عێراق. جەنەراڵ لەم یادداشتنامەیەدا ئەوەی دووپات کردەوە کە بەردەوامی چالاکی «ئەو نەیارانە»ی کە لە لایەن هەندێ ئوتنەرانی دەوڵەتەوە پشتیوانی دەکرێن. نیشانەی ئەوەیە کە شەڕ بە کردەوە کۆتایی نەهاتووە و دەوڵەتی بەوە تاوانبارکرد کە دەیەوێ وڵات بخاتە گێژەنێکی شەڕی ناوخۆوە و داوای کرد فەوری «کۆمیتەیەکی باڵا» بۆ ئەو مەبەستە دروست بکرێ.[٤]

ئەمە بە مانای پچڕینی پەیوەندی نیە، بەڵام سەرەتای «فشەسوڵحێکە) کە تا بەهاری ساڵی ١٩٦٩ درێژە دەکێشێت، وێڕای زنجیرە شەڕێکی گەورە، کەچی سەرنجی گشتی لەسەر مەسەلەی کورد لا دەچێت و دەکەوێتە سەر مەسەلەی کێشەی عەرەب و جولەکە، شەڕی شەش رۆژەی (حوزەیرانی ١٩٦٧) کە چەند مانگێک لەوەدوا بەعس دێتەوە سەرکار وتا ئەوڕۆکەش (١٩٧٨) هێشتا هەر لەسەر حوکمە.

## ٢
## بارزانی و شەڕی شەش رۆژە

لە حاڵی حازردا ناتوانرێ بە دروستی ئەوە دیاری بکرێ کە جەنەراڵ بارزانی و جولەکەکان لەکەیەوە پەیوەندییان پێکەوە هەبوو. لێ لە بوبەرەکانی شەڕی شەش رۆژەدا (١٩٦٧/٦) دا جەنەراڵ بارزانی بە ئاشکرا لە دەرەوەی بازنەی کێشەکەدا مایەوە، کاتێ جەنەراڵ عارف داوای لێکرد ژمارەیەک لە پێشمەرگەکانی بۆ بەرەی جولەکە بنێرێ، وەڵامی دایەوە: «شەش ساڵە دەگەڵ کوردا شەڕ دەکەی و دەتەوێ کورد وگەلی کورد لە نێو بەی، چۆن بە تەمای کە من یارمەتیتان بدەم؟» وەختێ عارف پێ دادەگرێ کە بارزانی بە لایەنی کەمەوە هێزێکی رەمزی بۆ بەغدایە بنێرێ، بارزانی دەڵێ «من وەکو چۆن باوەڕم بە ئەفسانە نییە، باوەڕم بە شتی رەمزیش نییە»[٥]

ئەم بێ موبالاتیە سەبارەت بە شتێک کە بەلای عەرەبەوە مەسەلەیەکی بنەڕەتییە، خۆی لە خۆیدا سەرەتای ئەو دوورکەوتنەوەیەیە کە دەکەوێتە بەینی بارزانی و ڕژێم و سات بە سات توندتر دەبێت. لەباری تیۆرییەوە، ئەو ناوچە شاخاویانەی باکووری عێراق، کە بارزانی تێدا جێگیر بووە، هەمیشە بە بەشێک لە کۆماری عێراق حەساو دەکرێ؛ بەلام بارزانی پاش ئەوەی کە لەماوەی چەندین ساڵ دا بۆخۆی لە ناوچەکەدا جۆرە ئەزم و ئیزامێکی لەدەرتی حوکم و دەسەلاتی بەغدایە دامەزراند بوو، وردە وردە بە شێوازێکی هەست پێ [illegible] او، بەرەو «دیبلۆماسیەتی» سەربەخۆیی هەنگاو دەنێ.

سالح یوسفی راشکاوانەتر لە بارزانی رایدەگەیەنێ کە «ئێمە دژی هەر جۆرە زیدەگاڤییەکین، لێ لایەنگری مافی دیاری کردنی چارەنووسی هەموو میللەتانین.» بەمجۆرە هاوبەستەگی بەکردەوەی کوردان بۆ جولەکە، دژی عەرەب تەئیید دەکات.

لە بواری پراتیکیدا، جگەلە سەردانی نوێنەرانی بارزانی بۆ ئیسرائیل، چ شتێکی ئەوتۆ لەمەڕ ئەو کۆمەکانەی کە ئیسرائیل پێشکەش بە بارزانی کردبێ، لەبەردەستدانین.

## ٣

## بەهای یارمەتییەکانی شا

لە ماوەی ئەم «فشەسولحەدا» کە چەندین مانگان درێژە دەکێشێت.

بارزانی پەیوەندیێن خۆی دەگەڵ شادا پتەو دەکات و شا یارمەتی گرنگ و گرنگتری دەداتێ.

لێ دەبێ تا ساڵی ١٩٦٧ سەبر بکرێ تا ئەوە بزانرێ کە ئەم یارمەتییانە بە چ نرخ وبەهایەک پێک دێت. لە مانگی ١٩٦٧/٥ دا دەستەیەک لە جەنگاوەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران «لەخاکی عێراقەوە» بۆ ناو ئێران دەگەڕێنەوە تا لەوێندەر «بنکەیەکی پارتیزانی» دابمەزرێنن، سامی (مەحمەد مەحمود عەبدولرەحمان)ی نوێنەری کۆمیتەی تەنفیزی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق، سێ ڕێگە بۆ ئەو کوردانەی کەلایەنگری شەڕی چەکدارین دژی ڕژێمی شا، دا دەنێ: یان لە بەغدایە وەمێنن، یان بێنە کوردستانی عێراقەوە، یان بۆ ئێران بگەڕێنەوە و هەموو پەیوەندییەکیان لەگەڵ بارزانی دا ببڕن.[٦]

دوای چەند هەیڤەک، واتە لەمانگی ١٩٦٨/١٠ دا دکتۆر مەحمود عوسمان دەڵێ: «ئێمە دەست لە کاروباری ئێران و تورکیا وەرنادەین و تاران و ئەنقەرە زۆر باش دەزانن کە

ئەگەر سەرکێشی بکەن و پەلامارمان بدەن، ئەوا دەتوانین لەنێو کوردی، ئەو ولاتانەدا شۆڕش بەرپا بکەین»[٧]

«وەزیری دەرەوەی» جەنەراڵ بارزانی لە ژێر ئەم «نیمچە حەقیقەتەوە» درۆیەکی گەورە دەشارێتەوە.

دیارە بارزانی لە بری ئەم کۆمەکانەی ئێران، بەڵێن دەدا کە رێگە لە هەڵگیرسانی شۆڕش لە کوردستانی ئێراندا بگرێ و هەر کوردێکی ئێرانی زاتی ئەوە بکات لەم خەتە دەربچێت، ئەوا پەنا بۆ چەک دەبات.

بارزانی تاکو سەرپابەندی ئەم بەڵێنە دەبێت: لە هەیڤی ٤-٥/١٩٦٨دا سلێمانی موعینی ئەندامی «کۆمیتەی شۆڕشگێڕی» و خەلیل شەوباش دەگرێ و دەیانکوژێت و جەنازەکانیان تەحویلی دەسەلاتدارانی ئێرانی دەداتەوە.[٨]

## ٤
## لابردنی جەنەراڵ عەبدولرەحمان عارف

رژێمی جەنەراڵ عارف نەیتوانی مەسەلەی کورد چارەسەر بکات، پاش شکستی حوزەیرانی ١٩٦٧ تەواو بێ ئیختیار بوو بوو، لەئاخر و ئۆخری ساڵی ١٩٦٧دا دەستەیەک پارتیزان لە زۆنگاوەکانی باشوری عێراقدا پەیدا بوون[٩] رژێمی جەنەراڵ عارف هێندەی دی لاواز بوو.

کە جەنەراڵ عارف لە هەیڤی ٥/١٩٦٨دا جارێکی دی درێژە پێدانی «قۆناغی رەوتەنی» راگەیاندەوە و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی بۆ ساڵی ١٩٧٠ دوا خست، کە ئەم دوو خاڵە لە رێککەوتننامەکەی ساڵی ١٩٦٦ی بەزازدا بەڵێنیان درابوو، بەم کارە لە راستیدا چارەنووسی خۆی دیاری کرد.

ئەوە بوو لە ١٩٦٨/٧/١٧ دا لەلایەن دوو کەس لە هاوکارانی نزیکی جەنەراڵ عارفەوە، جەنەراڵ عەبودی فەرماندەی گاردی سەرۆکایەتی کۆماری و عەقید نایفی سەرۆکی ئیدارەی دووەمی سوپا و سەر بەرێکخراوی ئەفسەرانی ناسیونالیست، کودەتایەکی سپی لێکرا، پاشان لە فرۆکەیەکیان ناو بۆ لەندەنیان نارد.

جەنەراڵ حەسەن ئەلبەکری سەرەک وەزیرانی جارانی مارشال عارف لە ساڵی ١٩٦٧ دا، بوو بەسەرکۆمار و عەقیدنایف بوو بەسەرەک وەزیر.

له ۱۹٦۸/۷/۳۰ داو دوا به دوای کوده‌تای دووەم، عەقید نایفش نەفی کراو جەنەراڵ حەسەن ئەلبەکر هەموو دەسەڵاتێکی گرتە دەست و حکومەتێکی دامەزراند کە جەنەراڵ حەردان تکریتی بوو بە وەزیری بەرگری و جەنەراڵ عەماش بوو بە وەزیری ناوخۆی.

بەمجۆرە بەعس، دوای شکستە حەیابەرەکەی ساڵی ۱۹٦۳یان بە پێنج ساڵ، هاتنەوە سەرکارو لەسەر حوکم مانەوە.

## ٥

## کورد و بەعس

گەڕانەوەی بەعسییان بۆ سەر حوکم، نیشانەی ڕووداوێکی شوم بوو بۆ کوردان، لە نێو هەموو ئەو ڕژێمانەدا کەلە دوای ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی هاشمییەکان بەملاوە هاتبوونەسەر حوکم، بێگومان بەعسییەکان سەرسەختترین وخوێنڕێژترین، دژمنی کورد بوون.

هەڵبەتە جەنەراڵ بارزانی لە «قەڵاو حەساری کوردستانەوە» لەم بارەیەوە غافڵ نەبوو، بارزانی دوای چەند هەفتەیەک گوتی: «ئێمە ئەوانەی کەوا دەنوێنن، بەرپەرێکی تازە لە پەیوەندی نێوانماندا هەڵدەدەنەوە، چاک دەناسین، لە ساڵی ۱۹٦۳دا جەنەراڵ تکریتی نزیکەی ۲/۰۰۰ گوندی بۆردومان کردین، جەنەراڵ عەماش باسی «گەشتی» سوپای عێراقی لە باکوردا دەکرد. ئەوڕۆکەش هەموو خەمێکیان ئەوەیە کە جێ پێی ڕژێمەکەیان قایم بکەن.[۱۰]

پەیوەندی بەینی کورد و دەسەڵاتدارانی بەغدا، سروشت و تایبەتمەندییەکی ئەوتۆی هەیە کە ئەقڵیەتی کەسێکی غەیرەز ڕۆژهەڵاتی و مەنتیقی بە ئاسانی هەرسی ناکات، ڕێک وەکو ئەو پەیوەندییانەیە کە لەساڵی ۱۹۷۱دا وپاش نیمزای ڕێککەوتننامەی ساڵی ۱۹۷۰ لە گەڵ بەعسیاندا دەمان بینی.[۱۱]

لە لایەکەوە لە باکوری عێراقدا هەر کە شەو دادێ چ جۆرە هاتوچۆیەک نامێنێ و «سنووری» واقیعی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی جەنەراڵ بارزانی لەباقی ناوچەکانی عێراق جیا دەکاتەوە (ناوچەکانی ئەوبەری ڕەواندز)

حالبۆکی لەباری تیۆرییەوە، بەرنامە دوانزە مادەییەکەی حوزەیرانی ۱۹٦٦ وەکو قەواڵە و بەڵگەنامەیەکی بنەڕەتییە و هەوێنی پەیوەندی دەوڵەت و جەنەراڵ بارزانی پێک دێنێ، دەوڵەت بێ چ بنچ و بناوانێک، لاقی ئەوە لێ دەدات کە ئەم دوانزە مادەیە جێبەجێ

کراون. بەڵام کوردەکان گوێ بەم شتانە نادەن.

هەر لەم کەین و بەینەدا حکومەتی عێراق رۆژنامەوانانی بێگانە بۆ دیداری جەنەراڵ بارزانی دەنێرێ، بەڵام بارزانی ئەم دیدارانە بە دەرفەت دەزانێ و هێرش دەکاتە سەر رژێمی بەغدایە.

**هەڵبەتە لە بەغدایە و بە سەپەرشتی ساڵح یوسفی رۆژنامەی «التاخی»ی سەر بە بارزانی دەردەچوو، ئەم بڵاوکراوەیە لە نێو هەموو بڵاوکراوەکانی عێراقدا، تاقە بڵاوکراوە بوو کە زاتی دەکرد دەربارەی مەسەلەکانی رۆژ، هەموو ئەو مەسەلانەی کە بەعێراق و بە کوردەوە پەیوەست بوون، هەڵوێستگیری بکات.**

جەنەراڵ حەسەن ئەلبەکر، دوو وەزیری کورد- ئیحسان شێرزاد و موحسین دزەیی کە سەر بە بارزانی بوون، لە کابینەکەی خۆیدا دادەنێ، بەڵام لە هەمانکاتدا یارمەتییەکی چاک دەخاتە بەردەستی جەماعەتی لادەری برایم ئەحمەد وتاڵەبانی، کە رۆژنامەیەکی تایبەت بە خۆیان بە نێوی النور بڵاو د.ـــەنەوە، کە لەرووی هونەرییەوە باشترین بڵاوکراوەی عێراقە.[12] هەموو رۆژێک هێرش دەکاتە سەر بارزانی و بە «خێڵەکی» و «فیوداڵ» و داردەستی ئیمپریالیزم ناوی دەبات.

**لە مە بە دواوە ئیدی زیاتر ئەم جەماعەتەی «النور» دەبنە مایە فیتنە و هۆی شەڕو ئاژاوە، کە ژمارەیان خۆی لە ۲/۰۰۰ کەسێک دەدات و بەشی هەرە زۆریان لەو «بەکرێگیراوانەن» کە لەبەرخاتری چواردە دینار مانگانە لە دەوریان خڕ بوونەتەوە و سەدو پەنجا کەسێک لەمانە کوردی ئێرانین.**

کاربەدەستانی بەغدا خۆ لە پچڕانی پەیوەندی دەپارێزن و دەیانەوێ وەزعەکە بەوە رابگرن کە **«سەگ بەربدەنە سەگ و خۆیان لەدوورەوە تەماشا بکەن.»** را مەزندە دەبەن کە بتوانن بەبێ تەدەخولی راستەوخۆ بزووتنەوەی کورد لە نێو بەرن.[13]

شان بەشانی ئەم کارە، حکومەتی عێراقی هەندێ پشی پشی بۆ «لادەران» دەکات: زانستگەیەک لە سلێمانی دەکاتەوە، ئەکادیمیایەکی کوردی (کۆڕی زانیاری) لە بەغدایە دادەمەزرێنێ، هەڵبەت ئەم مافانە خەتەرێکی ئەوتۆیان تێدا نیە، **بەتایبەتی سەبارەت بە تاقمێک کە بە بێ کۆمەکی عێراقی خۆ بە پێوە ناگرێ،** بەڵام بۆ حکومەتی بەغدایە، ئە حاڵی برینی پەیوەندی دەگەڵ بارزانی دا دەرفەتی ئەوەی دەبێت کە لافی ئەوە لێ بدات کە مافی کوردان دراوە و لایەنگرانی بارزانی بە رێگرو چەتەو «داردەستانی ئیمپریالیزم

وزایونیزم» تۆمەتبار بکات.

**یارمەتییەکانی ئێران:**

جەنەراڵ بارزانی کە دەکەوێتە بازنەی نیمچە گەمارۆی ئابورییەوە و دڵنیا دەبێت کە کاربەدەستانی بەغدا «بە تەما نین هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی بە گەلی کورد بدەن» پەیوەندی خۆی دەگەڵ ئێران دا پتەور کۆک دەکات، کاتێ کەلە هەیڤی ۱۹۶۹/۱ دا شەڕ دەست پێدەکاتەوە، کوردەکان لە حاڵێکی وا دا دەبن کە هەرگیز کۆمەک و هاوکاری وا فراوانیان لە هیچ وڵاتێکەوە وەرنەگرتبوو.

پێشمەرگەی کورد بوون بە خودانی چەکی قورس، واتە بوون بە خودانی هاوەن و رەشاشی قورس و تۆپ و چەند چەکێکی فڕۆکەشکێن- و زۆری پێناچێت کە سوپای ئێران راستەوخۆ شان بەشانی کوردەکان دێنە مەیدانی شەڕ.

**سەرچاوە پەراوێزان**


١- پەیامی تەلەگرافی فەرەنسا، لوموند، ٣٠-٣١/ ١٠/١٩٦٦

٢- عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٦٩

٣- لوموند، ١٩٦٦/١١/٣

٤- هەمان سەرچاوە، ١٩٦٦/١٢/٢٩

٥- ئەریک رولو «وەزنە کوردستانە» لوموند، ١٢/ ١٩٦٨/١٠

٦- هەڵپەیڤین دەگەڵ یەکێک لە رێبەرانی شۆڕش لەبەغدایە، ١٩٧٣

٧- ئەریک رولو، لوموند، ١٢/ ١٩٦٨/١٠

٨- کاروانی شەهیدان، کەریم حیسامی، ل ٧٥-٧٩

٩- «عەزیز الحاج»ی سکرتێری گشتی حیزبی شیوعی عێراق رێبەری باڵی قیادەی مەرکەزی بوو. عەزیز محەممەد رێبەری لیژنەی مەرکەزی سەر بە سۆڤیەت بوو.

١٠- ئەریک رولو، لوموند، ١٢/ ١٩٦٨/١٠

١١- هەمان سەرچاوە،

١٢- عیسمەت شەریف وانلی، ل ٢٧٥

١٣- هەمان سەرچاوە،

١٤- لوموند، ١٢/ ١٩٦٨/١٠

## فەسڵی دوازدەیەم

## شەڕی دووەمی بەعسییان

## (بەهاری ١٩٦٩-١٩٧٠/٣)

پاش ئەو «فشە سوڵحەی» کەلە ئەنجامی ئاگربڕی حوزەیرانی ١٩٦٦ بەرقەرار بوو، حاڵەتێکی «نەشەڕ و نەئاشتی» هاتە ئاراوە، ئەم حاڵەتی «نەشەڕ و نەئاشتی»یە ناو بەناو شەڕو سوکە شەڕی تێ دەکەوت و ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو زیاتر دەچوو بەتایبەتی کە هێزەکانی عێراق بە ئاشکرا پشتیوانیان لە «جاشەکانی ٦٦» واتە لە جەماعەتی «ئەلنور» دەکرد، بۆیە ناتوانرێ مێژوویەکی دیاری کراو بۆ سەرەتای شەڕی دووەمی بەعسییان دیاری بکرێ، بەتایبەتی کە لە کوردستاندا قۆناغێکی «دواخستنی» تا رادەیەک دوور ودرێژ هەیە کە ساتەکانی بڕیاردان و ئەنجامدانی بڕیارەکان لێکدی جیا دەکاتەوە.

### ١

### هێرشی کەرکووک ١٩٦٩/٣/١

لە راستیدا لە سەرەتای هەیڤی دوانزەی ١٩٦٨ دا سەرانی کورد لێدەبڕێن هێرش بکەنە سەر دام ودەزگا نەوتییەکانی کۆمپانیای نەوتی عێراق. ئەم بڕیارە لە کۆبوونەوەیەکی گەرم و گوڕی ئەندامانی مەکتەبی تەنفیزی حیزبدا دەدرێ، کە جەنەراڵ بارزانی و ژمارەیەکی کەم لە سەرانی دیکەی حیزب، لە گەڵ بڕیارەکە دا نابن.[1]

**سەرەنجام رابەرانی کورد بڕیار دەدەن دامودەزگای «کۆمپانیای نەوتی عێراق»ە بتەقێننەوە، بەڵام رادەی خسارەتەکە لە سنوورێکی دیاریکراودا بێ، هەڵبەت مەبەست لە هێرش بۆ سەر کەرکوک وێران کردنی دەزگا نەوتییەکان نەبوو، بەڵکو گەیاندنی پەیامێک بوو، تا کاربەدەستانی بەغدایە بزانن کە ئەگەر هەر سووربن لەسەر ئەوەی بە پارەی نەوت چەک بکڕن ئەوا سەرچاوەی دەرامەتەکەیان کە لەم سەرویەندانەدا مانگانە دەگەیبە دە ملیۆن دۆلار، دەکەوێتە خەتەرەوە، هەڵبەتە رووی ئەم پەیامە لە کاربەدەستانی «کۆمپانیای نەوتی عێراق»یشە. کە کۆنسرسیومێکی نێونەتەوەییە.[2]**

دوای شناسایی تەواوی ناوچەکە لە ١٩٦٨/١٢/٢٦ دا سامی (محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان) کە لە مانگی ئابی ١٩٦٤ دا بوو بوو بەئەندامی مەکتەبی تەنفیزی دەکرێ

بە فەرماندەی ئەم چالاکییە. ئەویش لە ۱۹٦۹/۲/۲۳ دا قوەتێکی دوو سەد نەفەری بەسەد هێستر و شەش هاوەن و دوو سەد گوللە هاوەنەوە دەنێرێتە بۆ شوێنی چالاکییەکە.

ئەم قوەتە، هێڵەکانی عێراق دەبڕێ و لە سەعات هەشت و ٤٧ دەقیقەی شەوی یەکەمی مانگی ۳ دا، یەکەمین گوللە هاوەن دەگرنە دەزگاکانی «کۆمپانیای نەوتی عێراق» لە نیو بابا-ی (New baba) باکوری رۆژاوای کەرکوک و دوای هاویشتنی کەمتر لە سەد گوللە هاوەن، قوەتەکە بەناسانی بۆ باکور گەڕانەوە.

زەرەور و زیانەکە زۆر بوو، بە دوو ملیۆن دۆلار مەزندە دەکرا. کۆمپانیای نەوتی عێراقی ناچار کرد بۆ ماوەی یەک مانگی تەواو بەرهەمهێنانی خۆی بە رادەی ۷۰٪ کەم بکاتەوە و بەمجۆرە زیانی کۆمپانیای نەوتی عێراق گەیبە دە ملیۆن دۆلار.[۳]

دەوڵەت لە بەغدایە، بێدەنگی لەم هێرشە کرد و هەواڵەکە بڵاو نەبووەوە. تا «کۆمپانیای نەوتی عێراق» لەم بارەیەوە نامەیەکی نەنارد.

بەلام وێڕای چەند هێرشێکی دی بۆسەر بۆرییە نەوتەکانی کۆمپانیای نەوت، ئومێدی سامی بەوەی کە بەریتانیای مەزن و وڵاتە خودان بەرژەوەندییەکانی دی بە نیگەرانی بدینێ، سەرنجیان بۆ مەسەلەی کورد رابکێشێت. پوچەڵ بووەوە.[٤]

## ۲
## هێرشی بەهاری ساڵی ۱۹٦۹

چەند هەفتەیەک لە دوای هێرشی کوردان بۆسەر کەرکوک، دەوڵەتی عێراق چوار لەشکری گەورە دەنێرێتە شەڕی کوردان و بۆ ماوەی چەندین مانگ شەڕێکی توند و پشت گوێ خراو لەلایەن جیهانەوە، لە کوردستاندا بەردەوام دەبێت. دەوڵەتی عێراق سانسۆرێکی توند دەخاتە سەر هەواڵەکانی ئەم شەڕە بەهارییە و نایەڵێت چ هەواڵێک لە باکوری عێراقەوە، بگاتە ناوەوە و دەرەوە.

## ۳
## کێشمانەکێشی نێوان ئێران و عێراق

بەلام هێرشەکانی عێراق بۆسەر کوردان، لە ئەنجامی ئەوکێشانەوە کە کەوتنە نێوان ئێران و عێراقەوە ئە کاریگەرییەیان نەبوو.

لە ناوەڕاستی مانگی یەکی ساڵی ۱۹٦۹دا دەوڵەتی ئێران «مافی سیژوبیی» ئێرانی لە

ورگەی بەحرین دا هێنایە گۆرێ و لە هەمان کاتدا سەرانی بەعسیانی بەغدایە، کەوتنە لاف و گەزافی ئەوەی کە هەردووک رەختی کەنداوی فارس هی عەرەبن و عەرەبین.

پەیوەندی نێـوان هەردووک ولات بەزوبی تێک چوو، لە ١٩/٤ دا دەولەتی ئێـران، پەیمانی سـالی ١٩٣٧ی کە سنووری ئێران و عێـراقی لە رەخی رۆژهەلاتی شەتی عەرەب دا، دیاری کردبوو، هەلوەشاندەوە.[٥] دەولەتی عێـراق بۆ وەلامی ئەم کـارە، هێزی بردە سـەر سنووری ئێـرانی نێـوان خـانەقین و ئابادان، مـەسـەلەکـەی گـەیاندە رێکخـراوی نەتەوەیەکگرتووەکان.

٤

## سێکوچکەی ئێران- عێراق- کوردستان

بەمجۆرە سێکوچکەیەک چێ بوو، کە پاشان کێشەی کورد کەوتە ناوییەوە.رژێمی تاران کە دەیویست دەسەلات بەسەر ناوچەی کەنداوی فارس دا پەیدا بکات، ئامادە بوو جگە لە شەری ئاشکرا پەنا بۆ هەر کارێکی دیکە ببات لەپێناوی روخانی رژێمی بەعسی بەغدایە یان لاواز کردنی رژێمی ناوبراو، رژێمی بەعسیش هەر بە هەمان نەفەسەوە کاری بۆ روخان یان لاواز کرنی ئێران دەکرد.

لە پەراوێزی کێشەی کەنداوی فارسدا، دوو کێشە سەریان هەلدا، یەکێکیان شەری کوردستان و ئەوی تریان شەری زەفار بوو.

شەری کوردسـتان کە لە هی زەفار نزیکتر بوو، تایبەتمەندییەکی دیکەشی بۆ شای ئێران هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کـە دەیتـوانی راستـەوخـۆ قـورتی رژێمی بەغـدایە بگرێ و لە پەلوپۆی بخات، شەری کوردستان لە سالی ١٩٦١وە تا سالی ١٩٦٩ بۆ رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێـراق یەک میلیـارد دۆلاری تێـچوو بوو، ئەمە جگە لەوەی زەمینەی بۆ روخانی هەندێ لەو رژێمانە هەموار و خۆشکرد بوو.

باشـترین رێگە بۆ لاواز کردنی رژێمی بەعس کە هەم لەباری ئەفـەرەوە و هەم لەباری پارەوە کەمی تێ دەچوو و کەمتر مایەی ناوزران بوو، یارمەتیـدانی بەردەوام بوونی شەری کوردسـتان بوو، ئەویش بە دانی هەندێ کۆمەک و هاوکاری بە جەنەرال بارزانی.

بارزانی باش لە مـەبەسـتی شـا حـالی دەبوو، بەتایبـەتی لە سـالی ١٩٧٢دا ئەم حـالی بوونەی بە چاکی نیشـان دا، بەلام وا ئێـدەفکری کە دەتوانێ هەڤرکی تاران و بەغـدایە بە قازانج و بەرژەوەندی گەلی کورد بقۆزێتەوە.

لە گەڵ ئەوەشدا بارزانی هەڵەیەکی گەورەی کرد کە هاوکاری شای بە پێی مەرجەکانی شا قەبوڵ کرد: ئەویش پاراستنی ئارامی بوو لە کوردستانی ئێراندا بەهەر نرخێ بێ، هەڵبەتە ئەمە شتێک بوو کە سەرانی کوردی ئێران پێی قایل نەبوون.

جەنەراڵ بارزانی کە لە ساڵی ١٩٤٦دا بە دامەزراندنی حیزبێکی جیا لە حیزبی دیموکراتی قازی محەمەد مەسئولیەتی پارچە پارچە کرنی بزووتنەوەی کوردی کەوتبووە ئەستۆ، پاش بیست ساڵان هەمان هەڵەی دووبارە کر دەوە، بەڵام جەنەراڵ بارزانی ئەمجارەیان بە تەنید کردنی ئەو سنوورە دەستکردانەی کە هێزە گەورەکان بەسەر کوردستانیاندا سەپاند بوو، لە راستیدا لقە جیاوازەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی کرد بە گژ یەکدا.

٥

## گرووپی وەفاداران

جەنەراڵ بارزانی توانی لە بەهاری ساڵی ١٩٦٩وە گرووپێکی وەفادار و پابەند بە خۆی پەیدا بکات و لە رێگەی ئەوانەوە تا روخانی یەکجارەکی شۆرش لەئازاری ١٩٧٥ دا، حوکمڕانی کوردستان بکات.

جگە لەو پێنج کەسەی کە لە ١٩٦٦ دا کرابوون بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی واتە جگە لە حەبیب کەریم، دکتۆر مەحمود عوسمان، ساڵح یوسفی، نوری شاوەیس و عەلی عەبدلڵا، سامی و عزیز عەقراویش کران بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی.

بەڵام ئەم ئەندامانە لە روی سەنگ و پایەخەوە زۆر نا یەکسان بوون، «کۆنەکان» ساڵح یوسفی و نوری شاوەیس وعەلی عەبدوڵلا دەورێکی یەکجار سنووردار و کەمیان هەبوو.

جگە لە دکتۆر مەحمود عوسمان، کە لەساڵی ١٩٥٥ وە ئەندامی چالاکی حیزب بوو، ئە زەمانە بەیەکێک لە باڵی چەپی حیزب دەژمێردرا، ئیدی ئەوانەی کە ئێستا لە سەرکردایەتیدا حەساویان بۆ دەکراو بارزانی گوێی لە قسەیان دەگرت «تازەکان» بوون کە زۆر بەلەز بەرزبوو بوونەوە.

سامی کە ناوی خۆی (محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان)ە لە ساڵی ١٩٣٩ دا لەدەڤەری ژەنگار لە دایک بووە، دوای خوێندنی ئەندازە لە مانچستر و درێژە پێدانی خوێندنی ئابوری لە لەندەن، کە لە ریزەکانی حیزبدا کاری کردبوو، لە ساڵی ١٩٦٣دا پەیوەندی بە بارزانییەوە کرد، سەرەتا لە رادیۆی کوردستان کەوتە کار، پاشان وەکو زۆربەی ئەو

خوێندکارە کوردانەی کە لە هەندەران گەڕابوونەوە، وەکو تەرجومان و ڕێنوێنی ڕۆژنامەوانان کەوتە کار، هەر لەم پۆستەدا بوو کە ڕێنوێنی «لوردکیل براکن»ی لە یەکەم سەفەریدا بۆ کوردستان لە ساڵی ١٩٦٦ دا ،کرد.

دوای سێ ساڵان بوو بە ئەندامی مەکتەبی تەنفیزی و مەکتەبی سیاسی. سامی یەکێکە لە هاوکارانی هەرە نزیکی بارزانی و جگە لە کوڕەکانی بارزانی، لە هەموو کەسێکی دی نزیکترە لە بارزانی.

سامی کە بوو بوو بەئەنتی کۆمونیستێکی سەرسەخت، لە دوای ساڵی ١٩٧٠ وە لە شۆڕشی کوردا دەورێکی زۆر گرنگ دەگێڕێ، لە قۆناغی ئاگربەری ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ دا دەبێ بە وەزیری کاروباری باکوور لە کابینەی حکومەتی عێراقدا و لە دوا ساڵانی شۆڕشی بارزانی دا بە کردەوە «سەرەک وەزیر»ی کوردستان بوو.

حەبیب کەریم لە کوردە فەیلییەکانی بەغدایە بوو، لە دایک بووی ساڵی ١٩٢٨» « باب و باپیرانی کوردی لورستانی ئێران بوون ولە بەغدایە ئاکنجی بوو بوون» حەبیب کەریم، بەپێچەوانەی جەعفەر عەبدولکەریمی برایەوە، کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ یەکێک بوو لە سەرانی باڵی چەپی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق، پیاوێکی «ئیدیۆلۆگ» نییە، حەبیب دەرچووی زانستگەی بەغدایە و بەشی مافی خوێندووە. لە ساڵی ١٩٦٤داو لەشەشەمین کۆنگرەی حیزب دا، لەو کۆنگرەیەدا کە بارزانی جڵەوی حیزبی گرتە دەست، بە سکرتێری گشتی هاتە هەڵبژاردن.

هەڵبەتە کادرێکی چاکە و یەکێک بوو لەوانەی کە لە دوای ساڵی ١٩٦٩وە زامەکانی حیزبی سارێژ کرد.

بەڵام ئەو دوو کەسەی کە لە سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردا ڕۆڵی هەرە گرنگ دەبینن، دوو کوڕە لاوەکەی بارزانی، ئیدریس و مەسعودن.

ئیدریس لە ساڵی ١٩٤٤ لە بارزان لە دایک بووە. ئیدریس لە ساڵی ١٩٦٢ وە وەکو سکرتێری بابی دەست بەکار بوو، بەڵام دوای ساڵی ١٩٦٦ کەوتە ئەوەی ڕۆڵی گرنگ ببینێ، شان بەشانی عەبدوللا پشدەری لەشەڕی هندرێن دا «هەیفی ٥/١٩٦٦» سەرکردایەتی هێزی کوردی کرد.

لەمە بەدواوە زۆر بە خێرایی دەرکەوت و بەرز بووەوە: لەساڵی ١٩٦٨ دا، لەگەڵ مەسعودی برایدا، دەبێ بە ئەندامی مەکتەبی تەنفیزی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی

کورد. دوای ماوەیەکی دیکە و هەر بەهەمان شێوە، دەبێ بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزب و لە ساڵی ۱۹۷۳ بەملاوە لەگەڵ بابی و براکەیدا بەنەمەلی جڵەوی بڕیاردان دەگرنە دەست.

ئیدریس بارزانی کە سیمایەکی هەندێک خەمینی هەیە، پێناچێت نە لەرووی هێزی بەدەنییەوە و نە لەرووی بەهێزی کە سایەتییەوە چوو بێتەوە سەر بابی. ئیدریس بارزانی کە تەبیعەتێکی شەرمنی هەیە، پاشان لەنەنجامی تێکەڵاو بوون و هەڵس وکەوتی لەگەڵ بێگانانەدا (تایبەتی رۆژنامەوانان) و لەو قۆناغەدا کە ئەوەندە زمانی ئینگلیزی فێر بوو بتوانێ دەگەڵ ئەواندا تێکەڵاو بێ (۱۹۷٤) باشتر بوو، توانی رووبەروویان بێتەوە و تەنانەت بە چاکی باس و خواسیان دەگەڵ دا بکات، بەلام لەمرووەوە چوو بووەوە سەر بابی کە بەو چاوە بڕوانێتە رۆژنامەوانان کە نێردراوی تایبەتی ولاتەکانیان بن.

مەسعود کە لە ساڵی ۱۹٤٦ دا لە هاوسەری دووەمی جەنەراڵ بارزانی لە دایک بوو بوو، سەرەتا وپاش رۆیشتنی بابی بۆ تاراوگەی یەکێتی سۆڤیەت لەنێو عەشیرەتەکەی دایکی دا (کە کیژی مەحمود ئاغای زێباری بوو) گەورە بوو، لە ۷-۸ ساڵیدا پێی لەسەر ئەوە داگرتبوو کە لە نێو کەس وکاری خۆیدا واتا لە نێو بارزانییەکاندا بژی.

ئەویش وەکو ئیدریسی برای، لەساڵی ۱۹٦۸وەبەشداری کۆبوونەوەکانی مەکتەبی تەنفیزی دەکرد، بەلام تاکو ساڵی ۱۹۷۰ رۆڵێکی بەراستی گرنگی نەبوو، لە د وا قۆناغەکانی شەڕدا (۱۹۷٤-۱۹۷٥) لەگەڵ ئیدریسدا بەشداری رێبەری کردنی شەڕەکان دەکات و سەپەرشتی دەزگای «پاراستن» دەکات.

**ئیدریس و مەسعود وێڕای هەموو خەسڵەتێکی خۆیان- واتە بوێری لەرادەبەدەر و دڵسۆزیان سەبارەت بە دۆز و رێبازی کورد، بێگومان لەبەرز بوونەوە و بەدیار کەوتنی بروسکەناساییان دا، قەرزباری ئەم حەقیقەتەن کە کوڕانی بارزانین.** ئەم دوانە کە شەهادەیان نەبوو، جگە لەچەند مەئموریەتێکی کورتی دیبلۆماسی بۆ ئەورووپا و رۆژهەلاتی ناڤین، یا رەنگە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئیدی بە کردەوە بە دنیای دەرەوە نا ئاشنابوون و بێگومان لە باری دیبلۆماسییەوە دەوەقەتی دەولەترانانی وەکو شای ئێران و سەدام حوسێن و دکتۆر هنری کیسنجەر نەدەهاتن کە لەم ساڵە چارەنووس سازانەدا گەمەیان بە چارەنووسی کورد دەکرد.

## ٦
## هێرشی هاوینی ١٩٦٩

سوپای عێراق لە ناوەڕاستی ئابی ١٩٦٩ دا هەموو ئەو یەکەو قوەتانەی کە بۆ سنووری ئێرانی ناردبوون هێنانیەوە و لە کوردستاندا مۆڵی دان وئەوجا کەوتە هێرش بۆ سەر کوردەکان.

هەر لە زاخۆوە تا پێنجوێنی نزیکی سنووری ئێران، هەر هەموو شەڕگەکانی کورد، دەکەونە بەر بوردمانی فڕۆکە وتۆپبارانی تۆپخانەی عێراقی لە دەڤەری بادیناندا شەڕی یەکجار توند، لە ناوچەی زاخۆ و ئاکرێ روو دەدەن.

سەعدون غیدانی ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، جەنەراڵ عەماشی یاریدەدەری سەرەک وەزیر و وەزیری ناوخۆ بە خۆیان سەرپەرشتی شەڕەکان دەگرنە ئەستۆ. لێ سوپای عێراق، وێڕای بە دەست هێنانی هەندێک سەرکەوتنی ناوچەیی، ناتوانن خەتی بەرگری گوندەکان بشکێنن.

هەڵبەتە ئەم شەڕە رووداوی خوێناوی بەگەڵ کەوت، لە ناوەڕاستی ئابی ١٩٦٩دا سەربازانی سوپای عێراق لە گوندی داکانی سەر بەشارۆچکەی شێخانی باکوری رۆژاوای ئاکرێ، ٦٧ ژن و منداڵکە پەنایان وەبەر ئەشکەوتێک بردبوو، قانگ دەدەن و هەموویان دەخنکێنن.

لە ١٦/٩/١٩٦٩دا لەگوندی سورەیای ناوچەی زاخۆدا، ئەفسەرێکی عێراقی هەموو پیاوانی گوندەکە لە باخێک دا کۆ دەکاتەوە. دێهاتییەکان وا خەیاڵ دەکەن کە دەیەوێ قسانیان بۆ بکات، لێ ئەفسەرەکە لە نکاودا دەست دەداتە کلاشنکۆفەکەی و لەگەڵ سەربازەکانیدا خەڵکەکە بەردەستڕێژان دەدا: لەم رووداوەدا ٥٣١ کەس کوژرلن و ژمارەیەکیش بریندار دەبن.

سوپای عێراق، بە هۆی باڵا دەستی چەکییەوە هەندێک سەرکەوتن بەدەست دینێ، لە ئاخرو ئوخری ئەیلولی ١٩٦٩ دا شارۆچکەی کۆیە دەگرێتەوە بەڵام مەبەستی هێرشەکەی کە گەیشتن بە سنوور و کۆنترۆڵ کردنی بوو نایەتە دی و سەرناگرێ.

## ٧
## تەدەخولی ئێران «ئەیلولی ١٩٦٩»

ئەم هێرشە بێ وێنەیەی سوپای عێراق، بە تەواوی هێزی پێشمەرگە تەنگەتاو دەکات، جەنەراڵ بارزانی داوای کۆمەکی پتر لە ئێران دەکات، بۆ یەکەمین جار قوەتی ئێرانی بە مەبەستی یارمەتیدانی کوردان، دێنە ناو کوردستانەوە.

لە ناوەڕاستی ئەیلولی ١٩٦٩دا تەلەفزیۆنی عێراق، دەستەیەکی لەو «سەربازە ئێرانیانەی» کە لە خاکی عێراقدا بەخسیر بوو بوون نیشان دا.[٧]

دەوڵەتی عێراق کە بەربلاوی یارمەتی ئێران بۆ کوردەکان دەبینێ، هەوڵ دەدات قەناعەت بە ئێران بکات کە ئەم یارمەتییانە ببڕێ، شاندێکی عێراقی بەوپەڕی نهێنی دەچێت بۆ تاران و لەوێندەر چاویان بە ئەمیر عەباس هوەیدای سەرۆک وەزیری ئێران دەکەوێت، لەم دیدارەدا عێراقییەکان گوتیان «ئامادەن هەر ئیمتیازێک بدەن، بە مەرجێ کە دەوڵەتی ئێران سنووری خۆی دابخات» هوەیدا پاشان بەو کەسەی کە دیداری دەگەڵ کردبوو، گوت: «من پێم گوتن، ئێمە ناتوانین سنور دابخەین. دەبێ ئێوە سنوورەکە دابخەن. ئەگەر دەتوانن»[٨]

## ٨
## گفتوگۆ

سەرانی بەعس لە مانگی حەوتی ١٩٦٩ بەملاوە لە ڕێگەی خوێندکارانی کوردی دانیشتووی بەغداوە، پەیوەندییان دەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستاندا ، کردبو، بەلام لە ئەیلولی ١٩٦٩ دا بوو کە یەکەمین پەیوەندی جیدی کرا.

سەرتیپ تاریق کە فەرماندەی هێزەکانی عێراق بوو لە شەڕگەی ڕەواندز، چوو بۆ دیداری بارزانی لە ناوپردان و ڕایگەیاند کە دەوڵەت ئامادەی گفتوگۆیە تا بگەنە ڕێکەوتنێک.

لێ لە حەقیقەتدا تێشکانی هێرشەکەی پاییزی سوپای عێراق و مەترسی تەدەخولی زیاتری ئێران. سەرانی عێراقی ناچار کرد کە بڕیاری گفتوگۆیەکی جیدی بدەن، پاش دیداری نیمچە ڕەسمی عەزیز شەریفی سەرۆکی بزووتنەوەی ئاشتی عێراقی لە سەرەتای مانگی دوانزەی ١٩٦٩ دا. ئەوجا پەیوەندی ڕەسمی لە ١٢/١٩ دا دەستی پێکرد.

بەعسییەکان سەمیر عەزیز نەجمی ئەندامی سەرکردایەتی نەتەوەیی و بەرپرسی سوپایان دەگەڵ فوئاد عارف دا بۆ ناو پردان نارد.

نوێنەری بەعس پاش گفتوگۆیەکی تەسەل دەگەڵ جەنەراڵ بارزانی و ئیدریس ومەسعود و دارا تۆفیق و دکتۆر مەحمود عوسمان و سامی دا، بە روویەکی خۆشی (زۆر دۆستانە)وە گوتی کە دەوڵەت کەیفی لەوەیە کە کۆتایی بەم شەڕە بهێنن و لەسەری رۆیی « ئێمە دەزانین کە کوردەکان بۆچی شەڕ دەکەن. ئەنگۆش حیزبێکی پێشکەوتوخوازن!» جەنەراڵ بارزانی بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە حیزبی دیموکراتیش کەیفی لە گفتوگۆیە، دارا تۆفیقی، کە پاشان بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، لەگەڵ سەمیر عەزیز دا بۆ بەغدایە نارد.

هەڵبەت هەندێ گرووپی بەعسی و سوپا دژی هەر جۆرە گفتوگۆیەک بوون، لە لایەکی دیکەشەوە بە هەر نرخێک بووایە نەدەبوو بهێڵن جەماعەتی برایم ئەحمەد و تاڵەبانی پەی بەم هاتوچۆیە ببەن، جا بۆ ئەوەی هیچ خەبەر و دەنگۆیەک لەم بارەوە دزە نەکات، دارا تۆفیق هەر پێنج رۆژی مانەوەکەی لە بەغدایە (لە ٢١/تا ٢٥/١٢/١٩٦٩) وەکو زیندانیەک لە کۆشکی سەرۆکایەتی کۆماریدا بەسەر برد.

## ٩
## رۆڵی سەدام حوسێن

ئەم گفتوگۆ سەرەتاییانەی نێوان کورد و بەعس پشتیوانێک بوو بۆ بەرزبوونەوەی سەدام حوسێن، لە راستیدا دارا تۆفیق یەکەمین دیداری دەگەڵ ئەودا کرد: هەر لە سەرەتاوە سەدام حوسێن دەری خست کە سورە لەسەر ئەوە کە لەم بوارەدا رێکەوتنێ بە دەست بێنێ، بەڵام لە هەمان کاتدا بە روونی ئەوەی لە نوێنەری بارزانی گەیاند کە کوردەکان نابێ بۆ گەیشتن بە دەسەڵات پشت بە هێزێن سیاسی دیکە ببەستن. سەدام حوسێن لەلای دارا تۆفیق ئەو پیلانەی کە دژی رێکخرا بوو و بە خۆی پوچەڵی کردبووە، باسکرد، سەدام لە حەقیقەتدا پاش ئەوەی هەندێ پیاوی خۆی ژێراوژێر خستنە نێو پیلانگێڕەکانەوە لە مانگی یەکی ساڵی ١٩٧٠ گرتیانی و پتر لە حەفتا کەسی، کە زۆربەیان سوپایی بوون، لە سێدارەدا.

هەروەها سەدام حوسێن لە ١٩٦٩/١٢/٢١دا پاش وتووێژێکی کورت دەگەڵ سەرۆک حەسەن ئەلبەکردا ،سەرۆکایەتی یەکەمین کۆبوونەوەی «گرووپی کاری» گرتە ئەستۆ کە زۆربەی رێبەرانی بەعس تێیدا بەشدار بوون: لەوانە جەنەراڵ عەماش، مرتەزا حەدیسی

ئەندامی ئەنجومەنی شۆڕش، عیزەت مستەفا، سەعدون غیدان، عەبدوڵلا سەلوم سامەڕایی و ژمارەیەکی دیکە لەبەرپرسان.

لەم کۆبوونەوەیەدا سێ بابەتی سەرەکی خرانە بەر باس و لێکۆڵینەوە: مافی نەتەوەیی کورد، پێویستی دیاری کرنی سنووری کوردستان، و مەسەلەی پەیوەندی دەگەڵ ئێراندا.

سەبارەت بە دوا بابەت، سەدام حوسێن بە وەلامی دارا تۆفیق قاییل بوو: دارا تۆفیق گوتی کورد نامادەنە پەیوەندی خۆیان دەگەڵ ئێرانیدا ببڕن و کۆتایی پێ بهێنن، هەموو شتێک پەیوەست بێ بە پەیوەندییان دەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی دا.

دارا تۆفیق چووە بەیروت، لەوێندەر میشێل عەفلەقی دامەزرێنەری بەعسی بینی و بەو باوەڕەوە بۆ ناوپردان گەڕایەوە کە بەعس دەیەوێ ئۆتۆنۆمی بە کوردان بدات وجەنەراڵ بارزانی دەبێ ئەم ئوتونومیەی لە بەعس بوێ.[١٠]

سەدام حوسێن پاش ئەوەی بیروبۆچوونی خۆی لە مەڕ ئەم رێکەوتنەی کە لە گوێن بوو بێتە دی، گەڵاڵە کرد، لە بەغدایە و لە ئاخرو ئوخری مانگی ١٢/١٩٦٩ دا نزیکەی ٦٠٠ ئەفسەری سوپای خڕ کردەوە تا لەمەڕ ئەو گفتوگۆیەیان ناگادار بکاتەوە کە لەگۆڕێ بوو، پێی راگەیاندن کە «ئەوانەی شەڕ دەکەن، تەنێ دەستەوتاقمێکی یاخی نین.»

سەدام حوسێن بە زمانێکی بێ پەردە گوتی کەسوپا دەبێ گوێڕایەڵی قەرار وبڕیاری دەوڵەت بێ: وەکوو چۆن لابردنی حەردان تکریتی و دوور خستنەوەی بۆ کوێت نیشانیدا.ئاشکرا بوو کە هەموو فەرماندەکانی سوپا چاوەنۆڕی شتێکی وەها نەبوون. (حەردان تکریتی پاش دوور خستنەوەی بە چەند هەفتەیەک لەکوێت کوژرا)

لەوە بەدواوە ئیدی دیداری هەردوولا بە تەواوەتی دەستی پێکرد:لە ٣١/١٢/١٩٦٩ شاندێکی گرنگی بەعسیان بۆ ناوپردان چوو کە بریتی بوون لە: حەردان تکریتی و عەبدولخالق سامەڕایی و تاریق عەزیز و دوو کەسایەتی سەربەخۆ کە بریتی بوون لە عەزیز شەریف و فوئاد عارف، کە یەکەمیان زۆر لە کۆمونیستەکان نزیک بوو.

پاش چەند رۆژێکی دی شاندێکی کورد بۆ بەغدایە چو کە پێکهاتبوو لە دکتور مەحمود عوسمان، سامی، نوری شاوەیس، دارا تۆفیق، نافیز جەلال، موحسین دزەیی، سالح یوسفی، ئیدریس و مەسعودیش چەند سەفەرێکی کورتیان بۆ بەغدایە کرد.

لە هەمان کاتدا کە هەموو ئەندامانی شاندی کورد هێشتا هەر لە بەغدایە بوون، سەدام حوسێن چوو بۆ ناوپردان تا دیدارێکی دووروودرێژ دەگەڵ جەنەراڵ بارزانی دا ئەنجام بدات.

هەردووک لایەن سوور لەسەر ئەوەی بگەنە ڕێکەوتنێکی پایەدار و بەردەوام، دەقی ڕێککەوتننامەکە وشە بە وشە، خاڵ بە خاڵ، خرایە بەر باس و لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ. یەکێک لەو کوردانەی کەبە خۆی بەشداری ئەم گفتوگۆیانەی کردبوو پاشان گێڕایەوە: « هەندێ جار دوو ڕۆژان بەباسی یەک خاڵەوە پان بە شێوازی دارشتنی یەک دەستەواژەوە دەبووین.»[11]

بەرهەڵستی سەرەکی لەبەردەم هەردووک شاندی بەعسی و کوردا، مەسەلەی دیاریکردنی سنووری جوگرافیایی ناوچەی ئوتونومی بوو. بەلای کوردەکانەوە ئوتونومی بێ خاک، بێ سنووری دیارو ئاشکرا، چ ماناو جەمکێکی نەبوو.

بەلام بە پێچەوانەوە، وەکو چۆن لە ڕۆژنامەی الشورة د ابلاو دەکرایەوە، بەلای بەعسییەکانەوە « ناسیونالیزمی کورد پێویستی بە دامەزرانی هەرێمێکی جوگرافیایی تایبەتی نەبوو، تا کوردەکان لە چوارچێوەیدا مافی نەتەوەیی خۆیان پیادە بکەن، گرنگ ئەمە بوو لە سایەی هەنگاوانانی «ناوخۆیی و یاسایی» دا کە بە گیانێکی دیموکراسییەوە وەردەگیرێن بتوانن ئەم «مافانە نەک هەر لە هەولێر و سلێمانیدا (واتە لە کوردستاندا) پیادە بکەن، بەڵکو لە بەغداو لە بەسرەش دا کەڵکی لێوەربگرن.»[12]

لە ڕاستیدا ڕێبەرانی بەعس ئامادە بوون هەرێمێک بۆ کوردان دیاری بکەن، وەکو چۆن ئینگلیزەکان لە سالانی ١٩١٩ و ١٩٢٤ دا ئەمەیان دەگەڵ شێخ مەحموددا کردبوو، ئەوانیش لارییان لەوە نەبوو کە شاری هەولێر و سلێمانی و دهۆکیان بدەنێ.

**گیروگرفتی کارەکە کەرکوک بووە.**

لە هەوڵی ئازاری ١٩٧٠دا چ کارێک سەری نەگرتبوو، بە گوتەی دکتۆر مەحموود عوسمان ڕێبەرانی بەعس لە هەوڵی ئەوەدا بوون ناوچە کوردنشینەکانی کەرکوک و هەموو ناوچە نەوتییەکانی دی لەکوردستان دابڕن.

لێ لە ١٠/٣/١٩٧٠ دا، دوای سێ هەیڤان گفتوگۆ، لەنکاو جەنەراڵ بارزانی ڕسەدام حوسێن لە قوتابخانە بچوکەکەی ناوپردان دا ڕێکەوتننامەیەکیان کە بە «ڕێکەوتننامەی یازدەی ئازاری ١٩٧٠» ناوی دەرکرد، ئیمزا کرد.

## ڕێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١

«مادەی بنەڕەتی و سەرەکی ئەم ڕێکەوتننامە پازدە مادەییە، بێگومان مادەی چواردەمییەتی کە بریتییە لە دانانی بە ئۆتونومی گەلی کورد لە چوارچێوەی شارە کوردەکان و هەموو ئەو شوێنانەی کە بە پێی سەرژمێرییەک کە لە ئایندەدا ئەنجام دەدرێ. زۆربەی دانیشتوانیان کوردن.»

باقی خاڵە گرنگەکانی ڕێکەوتننامەکە بریتین لە قایل بوون بەوەی کە زمانی کوردی وەکو زمانی ڕەسمی و خوێندن (لەگەڵ زمانی عەرەبی)دا لەو ناوچانەدا بەکاربێت کە زۆربەی دانیشتوانیان کوردن، دامەزراندنی کوردەکان بەبێ چ جیاوازی کردنێ لە دامودەزگا حکومەتی و لەشکرییەکاندا، تەرخان کردنی بەشێکی «دادوەرانە» لە داهاتی ئاوەدانکردنەوە بۆ ناوچە کوردنشینەکان، دامەزراندنی کەسێکی کورد بەجێگری سەرەک کۆمار، بەشداری کورد بەگوێرەی ڕێژەی خۆیان لە عێراقدا، لە ئەنجومەنی یاسا دانان.[١٣]

بۆ یەکەمین جار لە پەیمانی سیڤەر بەملاوە وپاش دە ساڵان شەڕ کە ناوە ناوە ئاگر بڕ و ڕێکەوتنی درێنەی تێ دەکەوت، بەشێک لە گەلی کورد ئۆتونۆمییان وەرگرت، ئەمجارەیان بەڵێنێک نەبوو کە دەسەڵاتێکی مردەلۆخ دابێتی، بەڵکو قەرارێک بوو کە لە ئەنجامی باس و گفتوگۆی نێوان دەوڵەتێک و شۆڕشی نەتەوەی کوردەوە هاتبووە دی.

دارا تۆفیق کەبەخۆی یەکێک بوو لە سەرانی بزاڤی کوردی عێراق، چەند ڕۆژێک دوای دارڕخانی یەکجارەکی شۆڕشی جەنەراڵ بارزانی دەربارەی ڕێکەوتننامەکە گوتی: «ڕۆژی ١٩٧٠/٣/١١ بوو بە خۆشترین ڕۆژی مێژوویی عێراق: لە یازدەی ئازاردا خەڵکی لە هەموو شوێنێک دا بێ چ پێشەکیەک لە شادیاندا کەوتنە سەماو هەڵپەڕکێ.»

لێ مەخابن ئەمجارەش ئەو ئومێدە گەورەیەی کە لە ڕێکەوتنی ١٩٧٠/٣/١١ وە هاتبووە دی، هەرەسی هێناو خۆشی و شادی کوردان تەمەن کورت بوو.

### سەرچاوە و پەراوێزان

١- بڕوانە گوتارەکەی لورد کیل براکن، لە سەندەی تایز، ڕۆژی ١٩٦٩/٥/١١ بە ناوی «هێرشبەران بۆ سەر کۆمپانیای نەوتە» کە زۆربەی ئەو زانیاریانەی خوارەوە لەو گوتارەوە وەرگیراوە.

٢- لەم کاتەدا دەوڵەتی بەریتانیا تەنیا ١١/٦٪ و ئەمەریکا و فەرەنسا ٢٣/٥٪ و هۆلەندا ١٤/٢٥٪یان هەبوو.

٣- نیویورک تایمز ١٩٦٩/٣/٣٠ لەم سەردەمەدا دەرامەتی نەوت بە پێی رێسای پەنجا بەپەنجا دابەش دەکرا.

٤- سەندەی تایمز ١٩٦٩/٥/١١

٥- عەیبی گەورەی ئەم پەیانە کە میراتی «ئیمپریالیزمی بەریتانیا» بوو لە روانگەی شارە ئەمە بوو کە کەشتییە جەنگییەکان نەیاندەتوانی بە بێ رەزامەندی هەردوولا رەت بێن و بە پێی ماددەیەکی دی، کە زۆر گرنگ نەبوو، بەڵام هەندێک سوکایەتی تێدا بوو، ئەوە بوو کە کەشتیوانانی هەر کەشتییەک لە شەتاوی عەرەبەوە رەت دەبوو، عێراقی بوون.

٦- بە گوتەی جەنەراڵ عوقەیلی وەزیری جەنگی عارف، کە لە ئەریک رولووە وەرگیراوە، بروانە لوموند، ژمارە نۆ مانگی ١٠/١٩٦٨

٧- NYT «نیویورک تایمز» ١٩٦٩/٩/١٥

٨- سەرچاوەیەکی نهێنی

٩- سەدام حوسێن لە ساڵی ١٩٣٧دا لە تکریت لە دایک بووە.

١٠- هەڵپەیڤینێک دەگەڵ دارا توفیق دا، دەربەند، شوباتی ١٩٧٥.

١١- هەمان شوێن، دەگەڵ دکتور مەحمود عوسمان دا.

١٢- ئاژانسی فەرەنسا، لوموند، ١٩٧٠/٢/١٩

١٣- نامەیەک بۆ عیسمەت شەریف وانلی ل ٣٤١

## فەسڵی سیزدەیەم

## ئاگربڕی درێژخایەن

## (ئازاری ۱۹۷۰ ئازاری ۱۹۷٤)

ڕێکەوتننامەی ۱۱/۳/ ۱۹۷۰ نوقسانییەکی گەورەی هەبوو: ئەویش ئەوەبوو کە زوو بەزوو جێبەجێ نەکرا.

دیاریکرنی سنووری هەرێمی ئوتونومی بەسەر ژمێرییەک سپێردرابوو، تا ئەو ناوچانە دیاری بکات کە زۆربەی دانیشتوانیان کورد بوون. بە پێی یەکێک لە خاڵە نهێنییەکانی ئەم ڕێککەوتنامەیە قرێر بوو ئەو سەرژمێرییە لە زەرفی شەش مانگاندا ئەنجام بدرێ.

لێ، ڕێککەوتننامەی ۱۱/۳/ ۱۹۷۰ سەبارەت بە ڕێکخستنی بونیادی سیاسی ناوچەی ئوتونومی و چۆنیەتی پەیوەندی ناوچەی ئوتونومی بە دەوڵەتی ناوەندییەوە، بە تەواوەتی بێدەنگ بوو: بەپێی مادەیەکی نهێنی دیکەی هەمان ڕێکەوتننامەیە دەبوایە ئەم مەسەلەیە لە ماوەی ئەو پەڕەکەی چوار ساڵان دا چارەسەر بکرێ. «لیژنەیەکی باڵا» کە لە سەرەتادا بە سەرۆکایەتی مورتەزا حەدیسی بوو بۆ جێبەجێ کردنی خاڵ و مادەکانی ڕێکەوتننامەکە دامەزرێنرا.

**مرۆڤ تێناگات، کوردەکان کە لە هەموو کەس پتر شارەزا وئاشنای بێ بەقایی و دەم دەمییەتی مجێزی سیاسەتی عەراق بوون چۆن بەوە قایل بوون ڕێکەوتننامەیەک ئیمزا بکەن کە سنووری ناوچەی ئوتونومی ڕاتدەگەیاند ودیاری نەدەکرد، ئەم هەڵەیە زیاتر لەم ڕوومەوە مایەی داخە کە لە بەهاری ساڵی ۱۹۷۰ دا سەرانی بەغدایە بەخۆیان مەجبوری ڕێکەوتن بوون وئامادە بوون هەموو جۆرە ئیمتازێکی لە پێناودا بدەن.**

ئیبراهیم ئەحمەد کە لە وەزع وحاڵێکدا بوو باشتر ئاگای لە وردەی بەعسییەکان بێ دەڵێ: «بەعسییەکان بە تەواوی ماندوو بوو بوون، ئەمە دەزانم وبارزانی دەیتوانی زۆر لەمانە پتر داوا بکات.»[1]

جەنەراڵ بارزانی پاشان بۆ پاساوی ئەم کارە دەڵێ: «حکومەت سوور بوو لەسەر ئەم چوار ساڵە، ئەمەی کردبوو بەمەرجی بنەڕەتی ڕێکەوتنەکە، ئەگەر بەم ماوەیە قایل نەبوایەن ڕێکەوتننامەکەی ئیمزا نەدەکرد.. دەیگوت ئەم ماوەیە بۆ ئەوەیە کە فریا بکەوێ

ناوچەکە ئاوەدان بکاتەوە، سەرژمێری ئەنجام بدات و لەم بابەتە بیانوانە. بەڵام لە راستیدا ئەمە بۆ لەبەین بردنی بزاڤی کورد بوو. ئەوان دەیانزانی ئێمەش دەمانزانی. بەڵام لەسەر بێ و ئامادەبووین بۆ پوچەڵکردنەوە و بەربەرچدانەوەی هەوڵەکانیان لە پێناوی لە بەین بردنی شۆرشی کورد و ئامادەبین، و ئاشتی بۆ ئێمە لە هەر شتێکی دی گرنگتر بوو.»[٢]

## ١

## سەرەتا وجێبەجێکردنی رێکەوتنامەکە

دوای ئیمزای رێکەوتنامەکە کەش و هەوایەکی شادی و خۆشی ئامێزی ئەوتۆ هاتە ئاراوە کەس باوەری نەدەکرد رۆژێ لە رۆژان ئەم رێکەوتننامەیە کۆسپ و تەگەرەی تێبکەوێ: سەرانی بەغدایە بە گوێرەی بەڵێنەکانی خۆیان کاریان کرد، زیندانیانی سیاسیان ئازاد کرد و عەفواتیان بۆ هەموو کوردەکان چ خەڵکانی عەسکەری و چ خەڵکانی ئەهلی دەرکرد، فەرمانبەرانی کوردی حکومەت گەرانەوە سەر کارو فەرمانیان، سێ کەسی کورد بە پارێزگاری هەولێر و دهۆک و سلێمانی دامەزرێنران، پێنج وەزیری کورد دامەزرێنران.[٣] حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق مۆڵەتی وەرگرت کە سەرلەنوێ چالاکی خۆی بکات و رۆژنامەی التاخی سەرلەنوێ و بەسەرپەرشتی دارا تۆفیق دەرچووەوە، دەوڵەتی عێراق بیست ملیۆن دیناری (بەرانبەر بە ٦٠ ملیۆن دۆلار بوو) بۆ ئاوەدانکردنەوەی باکوری عێراق تەرخان کرد و کارەکان بەلەز دەست پێکران، لە ئەنجامدا بەعسیەکان چەکدارە بەکرێگیراوەکانی ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانییان هەڵوەشانەوە.[٤]

## ٢

## یەکەمین پەڵە هەور

لە هەیڤی تەمووزی ساڵی ١٩٧٠وە واتا لەو کاتەوە کە هەشتەمین کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە گەڵاڵە بەسترا (١-١٠/٧/٧٠) کەیف و خۆشی رەویەوە و جۆرە نا ئومێدییەک جێی گرتبووەوە.

هەڵبژاردنی یەکەمین کورد بۆ جێگری سەرەک کۆمار کە لە رێکەوتنی یازدەی ئازاردا قەرای لەسەر درابوو، یەکەمین دەمبۆڵەی نێوان کورد و بەعسیان بوو: بەعسیەکان دەیانویست کە (کوردەکان جەنەراڵ بارزانی یان بەلای کەمەوە ئیدریسی کوری بۆ ئەم پۆستە هەڵبژێرن، بەڵام کۆنگرەی گەڵاڵە سکرتێری گشتی حیزبی، واتە حەبیب کەریم-ی

هەڵبژارد، سەرانی بەعس، لەبەر ئەوەی حەبیب کەریم ئێرانی نەژاد بوو، بۆیە هەڵبژاردنی ئەویان بە جۆرە «هاندانێک» دەزانی و لە هەیڤی ئەیلول دا رەفزیان کرد.

بەڵام ئەوەی کە تەگەرەی بنەڕەتی دەخستە بەردەم جێبەجێ کردنی ڕێکەوتنامەکە، دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئوتونومی بوو، لە هەیڤی ۱۰/ ۱۹۷۰ دا کاربەدەستانی بەغدایە لێدەبڕین جێبەجێ کرنی ئەو سەرژمێرییەی کە قەرار بوو ناکۆکی و جیاوازییەکان، بەتایبەتی چارەنووسی کەرکوک- یەک لایی بکاتەوە، دوا بخەن بۆ بەهاری سالی ۱۹۷۱.

لە ئاخر و ئوخری ساڵدا (۱۷/ ۱۲/ ۱۹۷۰) لە هەلومەرجێکی ئاڵۆزدا و لە بەغدایە هەوڵی تیرۆر کردنی ئیدریس بارزانی دەدرێ.

لە یەکەمین ساڵیادی ئیمزای ڕێکەوتننامەی ۱۱/ ۳/ ۱۹۷۰ دا، لە بەغدایە ڕپاش ڕێپێوانێک تا مەیدانی ئازادی، شبل العیشمی یاریدەدەری سکرتێری گشتی بەعس، و مورتەزا ئەلحەدیسی سەرۆکی کۆمیتەی ئاشتی و جەنەراڵ عەماشی یاریدەدەری سەرەک کۆمار، گوتاری پڕ جۆش و خرۆش بەو بۆنەیەوە دەخوێننەوە.

عەماش لە گوتەکانی خۆیدا دووپاتی دەکاتەوە کە ئەم ڕێکەوتننامەیە شتێکی «یەکجارەکییە» و هەر کەسێک بیەوێ کۆسپ بخاتە ڕێگەی ئەنجامدان و جێبەجێ کردنی «پەنجەی پەشمانی دەگەزێت»[٥]

بەڵام لەلایەن کوردانەوە، چ کەسایەتییەکی گەورە بۆ بەشداری ئەو خۆپیشاندان و ڕێپێوانانە نەهاتبوو بۆ بە بەغدایە وساڵح یوسفی وەزیری داد بە ناچاری بەو بۆنەیەوە وتەیەک لەمەڕ «یەکێتی نیشتمانی لەسەر بنەمای متمانە کردن بەیەکدی» دەدات. لێ لە ڕاستیدا قسەی دڵی و قسەی زمانی یەک نەبوو.

پاشان ڕێبەرانی بەعس لێدەبڕین، کە سەرژمێرییەکە بۆ ڕۆژگارێکی نادیار دوا بخەن و لەسەر بنەمای سەرژمێری ساڵی ۱۹۵۷ ڕێکەوتننامەی ۱۱ی ئازار جێبەجێ بکەن!

جەنەراڵ بارزانی لە هەڤپەیڤینە ڕەسمییەکانی خۆیدا و بۆ ئەوەی وەزعەکە تێک نەچێت، بە نەرمی قسان دەکات و باسی پێویستی «ڕەخساندنی کەش و هەوای دۆستانە و متمانە بەیەکدی» دەکات. بەڵام لە قسە تایبەتییەکانی خۆیدا پتر توندی نیشان دەدات: «دەساڵان لە ڕای ئوتونومی خەبتین، ئەگەر پێویست بکات پێنج ساڵیش لە پێناوی کەرکوک دا دەجەنگین.»[٦]

## ٣

## ئەیرانی ١٩٧١

لە مـانگی ٣-١١/ ١٩٧١ گـەلێک رووداوی گـرنگ و گـرنگتـر دەکـەوێتـە نێـو پەیوەندییەکانی بەغدا و جەنەراڵ بارزانی، لەماوەی چەند مانگێک دا ئەم وەزع و حاڵە لە قۆناغی بێ متمانەییەوە دەگاتە قۆناغی نیمچە بڕینی پەیوەندی.

### مەسەلەی کوردە ئێرانی نەژادەکان لە عێراقدا

کـاربەدەسـتـانی بەغـدا چەندین هەیڤ بوو کـە سـیـاسـەتی «عـەرەباندنی» ناوچە کوردنشینەکانیان گرتبووە بەر ولەم ناوچانەدا، بەتایبەتی لە ناوچە ستراتیژییەکانی وەکو دەوروبەری کەرکوک و ژەنگار، کەوتبوونە ئاکنجی کرنی عەرەبی کۆچەری.

لەلایەکی دیکەوە کوردەکانی عێراق خوازیاری ئەوە بوون کە مافی هاووڵاتیەت بە کوردە « ناعێراقییـەکان» بدرێ، کە زۆربەیان بریتی بوون لەو کوردە ئێرانیانەی کە لەعێراقدا دەژیان. لەمـانگی پێنجی ١٩٧١دا مـشـتـومڕێکی توند، لەم بارەیەوە، دەکـەوێتـە بەینی رۆژنامـەی الجـمـهـوریەی ئۆرگـانی دەوڵـەتی عـێـراق و رۆژنامـەی التـاخی، التـاخی دەڵێ دەوڵـەتی عێـراق بەڵـێنی داوە کـە مـافی هاووڵاتیـەت بەم کـوردانە بدات، کـە ژمـارەیان ١٠٠٠٠٠ کـەسـە، الجـمـهـوریە لە وەڵامـدا داوا لە رێبـەرانی کـورد دەکـات قـەواڵەو بەڵگەنامـەی ئەم بەڵـێنە بخـاتە روو و بڵاو بکاتەوە. لەسـەری دەڕوات و دەڵێ بە هەر حەساوێ بیگرێ، ژمارەی ئەم کوردانە لە ١٥/٠٠٠ کە س پتر نییە.(٧)

سـەرەنجام، دەوڵـەتی عێـراق، بە شێـوازی تایبـەتی خۆی، بە وەدەرنانی ٤٠٠٠٠ کوردی فەیلی لە هەیڤی ١٢/ ١٩٧١ کۆتایی بەم قەرقەشەیە دێنێ.

### رووداوەکانی بارزان (ناوەڕاستی تەموزی ١٩٧١)

لە هەفـتـەی دووەمی تەمـوزدا، سـەرکـردایەتی سوپای عێـراق قـوەتێکی زۆر لە دەڤـەری بارزان خڕ دەکـاتەوە: یەک تیپ بە تۆپخـانەو زرێپـۆشـەوە. بارزانی لە ١١/ ٧ دا سـەرانی کورد بۆ «لێکۆڵینەوەی وەزعـەکە» بانـگ دەکـات، بەڵام سەرەک حـەسـەن ئەلبەکر بەخۆی تێـدەکـەوێ و هەوڵ دەدات وەزعـەکـە ئارام بکاتەوە، بۆیە هەڵچـوونەکـە بەخـێـرایی دادەمرکێتەوە، لە راستیدا شەڕ لە نان وساتدا بوو کە هەڵگیرسێتەوە، جڵەوی گیرا.

### هەوڵی تیرۆر کرنی بارزانی (٢٩/٩/١٩٧١)

بەڵام بێ چەند و چوون ئەوەی بووە سەرەتای دوورکەوتنەوەی بارزانی لە سەرانی بەغدا،

ئەو هەوڵی تیرۆرکارییە بوو کەلە ٩/٢٩ دا دەرهەق بە خودی ئەو کراو بارزانی بە شێوەیەکی پەرجوو ئاسا لێی خەلەسی. نۆ مەلا بەناوی هەموارکردنی کاری نزیک خستنەوەی دەولەتی ناوەندی و کوردان، بە دوو ئوتومبێل لە بەغدایەڕا دێنە دیدەنی بارزانی، لە بەغدایە «چەند میکرۆفۆنێکیان» بەمەبەستی تۆمار کردنی قسەکانیان دەگەڵ بارزانی دا، وێدەدەن تا لەبەر پشتێنەکانیاندا وەیشێرن، بەلام لە راستیدا ئەوەی خستبوویانە بەر پشتێنەکانیان دینامێت بوو، کەیەکێک لەشۆفیرەکان لە دوورەوە تەقاندیەوە هەموو مەلاکان کوژران. جەنەراڵ بارزانی بەهۆی یەکێک لە دەست وپێوەندەکانیەوە کە لەو کاتە فنجانێک قاوەی بۆ دادەنا و بەردەمی گرتبوو، لەمەرگ دەرباز بوو، دکتۆر مەحمود عوسمانیش کەلەم کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوو، لە خەتەر خەلەسی.

ئەمە بەلای کەمەوە رووداوێکبوو کە کوردەکان چەند هەیف لەوە دوا لەکاتی پیشاندانی ئەوژوورە یان ئەو «هۆڵەی» کە بارزانی لە حاجی ئۆمەراندا پێشوازی میوانانی لێدەکرد، بۆ خەلکی و میوانانیان دەگێرایەوە، هێشتا شوێنەواری تەقینەوەیەکی توند لەنێو هۆلەکەدا مابوو، ڕێنوێنەکان هەندێ پارچەی خوێناوی جل وەرگیان، کە بەبن میچەکەوە نووسا بوو، پیشانی بینەران دەدا.

بەلێ،پاش تەق و تۆقێکی کەم شوفیرەکان کوژران و کوردەکان بڕێکی دی دینامێتیان کەلە نێو ئوتومبێلەکاندا قایم کرابو، دۆزییەوە.

جەنەراڵ حەسەن ئەلبەکری سەرکۆماری عێراق دەم و دەست بروسکەیەکی بۆ جەنەراڵ بارزانی نارد و پیرۆزبایی ئەوەی لێکرد کە بە سەلامەتی لەم رووداوە دەرچوو. لێ بارزانی دڵنیا بوو کەئەم تیرۆرکارییە کاری رێبەرانی بەعسە. هەڵبەتە بەغدا حاشای لەوە کرد کە بە هیچ جۆرێ دەستی لەم کارەدا هەبێ.لێ لەمانگی ١٩٧٣/٧ دا، پاش تێکشانی «پیلانەکەی» ناژم گزاری بەڕێوەبەری گشتی دەزگای ئەمنی عێراق، رێبەرانی بەغدایە بە شێوەیەکی نیمچە رەسمی گوتیان کە ئەو تیرورکارییەکەی ر ێک خستووە. بێ ئەوەی دیاری بکەن کە دەستووری سازدانی ئەوکارە لەلایەن چ کەس و دەزگایەکەوە درابوو. پاش ئەم رووداوە ئیدی جەنەراڵ بارزانی باوەڕی بە مەسەلەی «تازە کردنەوەی متمانە» یا «دان وستان» نامێنێ، لەمە بەدواوە ئیدی نەک لە بەغدایەڕا، بەڵکو لە تاران و واشنگتۆن بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد دەگەڕێ.

که لەناوەڕاستی هەیڤی ١١/١٩٧٣دا سەرەک حەسەن ئەلبەکر پێشنیازی بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستان و هەموو «هێزێن نەتەوەیی و نیشتمان پەروەر و پێشکەوتن خوازە کر کە لە «یەک بەرەدا» کۆ ببنەوە، جەنەراڵ بارزانی ئەم پێشنیازەی رەفز کرد و گوتی ناتوانێ «متمانە بە کەسانێک بکات کە لە هەر رەوشتێک بەدەرن، دەردی کارەکە لەمەدایە کە ئەمانە خاوەنی قسەی خۆیان نین.!»

## ٤

## شای ئێران ورێکەوتننامەی ١١/٣/١٩٧٠

ئەگەرچی نوکە ناتوانرێ ئەوە دیاری بکرێ کە جەنەراڵ بارزانی کەنگێ دۆستایەتی دەگەڵ شای ئێرانێ تازە کردەوە، لێ گومان لەوەیدا نینە کەپاش ئیمزای رێکەوتننامەی ١١/٣/١٩٧٠ بە تەواوەتی پەیوەندی خۆی دەگەڵ شادا بڕی.

یەکێک لەو کەسانەی کە لەو زەمانەدا پێناوی ئەو و شا بوو دەڵێ: «شا تووڕەبوو» رێکەوتنی نێوان بەعس وکوردان لەراستیدا بۆ شای ئێران بەومانایە بوو کە عێراق بە توانایەکی زیاتر لەهەر زەمانێکی دی، لە شەڕ دەربازبووەو ئەمەش هەڕەشە لە دەسەڵات و باڵا دەستی ئەولە هەموو ناوچەی کەنداودا، دەکات، ئەم رێککەوتننامەیە بە مانای سەرهەڵدانی دەم و دەستی شۆڕش بوو لەکوردستانی ئێراندا، ئەو شۆڕشەی کە ئیدی جەنەراڵ بارزانی مەجبوور نەبوو بەری لێبگرێ.

لێ کاتێ نوێنەرانی شا دێن و لە بارزانی دەپرسن: « ئایا دەیەوێ ببێ بە عەرەب؟!» بارزانی کە پێشتر رایگەیاندبوو هەرگیز لەگەڵ بەعسدا رێک ناکەوێ، وەڵامی دایەوە: «... لێ تەنانەت منداڵەکانیشم پێم دەڵێن: « ئێستا کەئوتونومیمان هەیە ئیدی بۆچی دەجەنگین!»

## ٥

## دوا نێوانجیاتی سۆڤیەت

لە گوینە، دوای ئیمزای پەیمانی عێراق و سۆڤیەت (١٩٧٢/٤/٨) کە شای ئێران لە بوونی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە ناوچەکە نیگەران بووە، سەرلەنوێ پەیوەندی دەگەڵ بارزانیدا کردبێتەوە.

لە حەقیقەتدا جەنەراڵ بارزانی لە هەیڤی دوودا، لەناوپردان پێشوازی لە شاندێکی رەسمی بەسەرۆکایەتی M. Romansev ی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی

کۆمونیستی سۆڤیەتی کردبوو، لەم دیدارەدا کەلە کەش و هەوایەکی زۆر دۆستانەدا کرا، سۆڤیەتەکان داوایان لە جەنەراڵ بارزانی کرد، کە رابردوو ژ بیر بەرێ و لاپەڕەیەکی دی بۆ پەیوەندییەکانی دەگەڵ بەغدایەدا بکاتەوە. جەنەراڵ بارزانی کە زمانی روسی چاک دەزانێ بە هەمان شێوازی پڕ لە راشکاوی خۆی وەڵامی دایەوە. «سەدام حسێن سەراپای بە گو لەوتاوە! بۆیە پارمەتی ئێوەی دەوێ، تا خۆی پێ پاک و خاوێن بکاتەوە. ئەگەر دەتانەوێ کۆمەکی پێ بکەن، ئەوا بۆ ئەم کارە پێ مەخەنە سەرشانی میللەتی کورد، وەکو تایوان! ئەو دەمە نیکسۆن لەپەکێن بوو.»

بارزانی داوای لە سۆڤیەتەکان کرد کەبەرلەوەی هەر جۆرە پەیمانێک دەگەڵ رژێمی بەعس دا ببەستن، راوێژ و تەگبیر بە باقی رێکخراوە سیاسیەکانی عێراق بکەن.

دوای چەند هەفتەیەک کاسیگێن بەرەسمی سەفەری عێراقی کرد و لە رێگەی رادیۆوە رێبەرانی کورد بەپەیمانی دۆستایەتی عێراق و سۆڤیەتیان زانی. محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان (سامی) ی ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی دیموکرات و وەزیری کاروباری باکور، بە دەستووری بارزانی داوای لە کاسیگێن کرد کە ببینێ و یادداشتنامەیەکی لەمەڕ وەزع و حاڵی وەخت، بە کاسگین دا. کاسیگێن قەولی داین کە دەگەڵ رێبەرانی عێراقدا مەسەلەی کورد باس بکات، داوای لە کوردەکان کرد کە شاندێک بە سەرۆکایەتی حەبیب کەریمی سکرتێری گشتی بۆ یەکێتی سۆڤیەت بنێرن.

لێ کاسیگێن، لە گفتوگۆکانیا دەگەڵ کاربەدەستانی عێراقدا، مەسەلەی کوردی باسنەکرد و سەفەری شاندی کوردیش بۆ سۆڤیەت بە گوتەی کوردەکان، بە هۆی «باروودۆخ»ی عێراقەوە دوا خرا بۆ ئایندەیەکی نادیار.

لە راستیدا، پاش نا ئومێد بوون لەسۆڤیەت ئیدی چ کەس و چ شوێنێک نەمابوو کە کوردەکان رووی تێ بکەن. جگە لە شای ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

## ٦
## رێکەوتن دەگەڵ CIA، و شادا

بەلای کوردەکانەوە مردوو لەمەی پاکتر نەدەشۆردرا، بەرژەوەندی دوولایەنە لەم کارەدا بوو: ئێران بە نیگەرانییەوە سەیری دەکرد سۆڤیەت پەیمانی دۆستایەتی دەگەڵ عێراقدا بەستووە، شاهنشا کە بۆخۆی لەباکورەوە سنوورێکی دوورودرێژی دەگەڵ سۆڤیەتدا هەبوو، ئێستاش لەنکاودا دەبینی کە سۆڤیەتییەکان لە قوڵی رۆژاوایەوە واتە لەعێراقدا جێ

پێیەکیان دۆزیوەتەوە و پێگەیەکیان لە کەنداوی فارس دا کە دەکاتە شا دەماری ئێران-
بەدەست هێناوە.[11]

ئەمەریکاییەکان کە بە تەما بوون جێی ئینگلیزەکان لەکەنداوی فارسدا بگرنەوە،[12]
بۆ لاواز کردنی رژێمی عێراق هەمان پاساویان هەبوو، بەلام بۆ پشتیوانی بزووتنەوەیەکی
دژ بەعێراق، هۆ و فاکتەر و پاساوی تایبەتی دیکەش هەبوون. کوردەکان بەشێکی گەورەی
سوپای عێراقییان لە کوێسارەکانی باکوردا گیرۆدە کردبوو، وایان بەستبوونەوە کەعێراق
نەتوانێ بەشداری لە کێشمانەکێشی نێوان عەرەب و ئیسرائیلدا بکات.

جگە لەو تۆزە زانیاریانەی کە دزەی کردبوو، کردبویە کارێک کە گۆڤاری «دەنگی گوند»
بتوانێ «رابۆری پایک» لەمەر چالاکی و چەلەنگییەکانی «سیا»[13] بلاو بکاتەوە، ئیدی
چ شتێک لەمەر دەستی «سیا» لە رەوتی شۆرشی کوردان نەزانراوە، ئەمە یەکێکە
لەوکارە هەرە نهێنیانەی کە «سیا» سازی داوە.

لە راستیدا «سیا» پێشتر، واتە پێش ئیمزا کردنی رێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١ لە
تاوتوێ کرنی ئەوەدا بوو کە لە شەری دووەمی بەعسیاندا دژی کورد، کۆمەکی جەنەراڵ
بارزانی بکات، هەڵبەتە سەفیری وەختی ئەمەریکا لە تارانێ دژی هەر جۆرە تەدەخولێکی
ئەمەریکا بوو کە ببێتە مایەی «بەردەوامی شۆرشی کورد و کەڵکەڵەی جیابوونەوەیان لە لا
دروست بکات و ئەگەری دەرفەت بۆ سۆڤییەتەکان برەخسێنێ کە سەربەشەو دژواری بۆ
«باقی هاوپەیمانانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا» دروست بکەن.[14] جا ئەمەریکا
ناچار بوو لە ژێر کوشاری ئەم نارەزاییەدا، چاو لەبەرنامەی کۆمەکی کوردان بپۆشێت.

«سیا» لە هەیڤی ١٩٧١/٨ و مانگی ١٩٧٢/٥ دا لەنوێ دەست بەکار دەبێتەوە،
بەلام پێشنیازەکەی سیا جارێکی دی، پاش لێکۆڵینەوەی فایلی کارەکە، لەلایەن دکتۆر
هنری کیسنجەری راوێژکاری کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی نیکسۆنەوە رەت دەکرێتەوە.

پاش مۆر کردنی پەیمانی دۆستایەتی نێوان عێراق وسۆڤیەت، کیسەنجەر رای گۆری،
سەرەک نیکسۆن پاش دیدارێکی «تایبەتی» دەگەڵ شادا، لە ٣٠ یان ١٩٧٢/٥/٣١
لێبرا نەخشەکەی «سیا» پەسەند بکات، ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی کە جەنەراڵ بارزانی
بتوانێ لە ماوەی هەیڤی ١٩٧٣/٨ وە تا ساڵی ١٩٧٥ سوود لەکۆمەکی شازدە ملیۆن
دۆلاری ئەمەریکا وەربگرێ.

چەند هەفتەیەک پێشتر شا لە دیدارێکی تایبەتیدا[15] دەگەڵ بارزانی دا ئاشت بووەوە

و کۆمەکێکی وەهای کوردەکانی کرد کە ١٦ ملیۆن دۆلارەکەی سیا لە چاویا «زۆر کەم» بوو.[١٦]

لێ بارزانی هەرگیز باوەڕی بە شا نەبوو و لە نیاز مەبەستەکانی بە گومان بوو، لێ هاتنە پێشەوەی (سیا) بۆ ئەو جۆرە «زامنکارییەک» بوو: بەڕای ئەو هاتنە پێشەوەی ئەمەریکا ڕێگەی لەوە دەگرت کە شا ئەمڕۆ دەگەڵ بارزانی دابێ و سبەینێ دەستی لێ بەربدات.

لە ڕاستیدا جەنەراڵ بارزانی بۆ بەدبەختی خۆی وێ بەختی میللەتی کورد وای بیر دەکردەوە کە یارمەتی وەرگرتن لە «سیا» بە مانای دان پێدانانێکی نیمچە ڕەسمییە بە شۆڕشی کورد لەلایەن دەوڵەتی ئەمریکاوە، - کەوا نەبوو.

تەنێ سێ چوار کەس لە ڕێبەرانی کورد ئاگاداری ئەم پەیوەندییە بوون دەگەڵ نوێنەرانی «سیا»دا: کورانی بارزانی، واتا ئیدریس و مەسعود، سامی «محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان»، ئیدریس و مەسعود ئەزموونێکی ئەوتۆیان لە بواری دیبلۆماسیدا نەبوو، تەنیا سامی بوو کە لەوەی ئاگادار کردەوە کە بە پێی پێناسە دەوڵەتییەکان ئەمەریکا پابەندی چالاکییەکانی دەزگایەکی زانیاری وەکو سیا، نابێت.

بەڵام بارزانی متمانەی تەواوی بە ئەمەریکا هەبوو، «متمانەی بە هیچ زلهێزێکی دیکە نەبوو.» بارزانی بە خۆی ئەمەی بە زۆربەی ئەو ئەمەریکاییانە گوتبوو کە گفتوگۆیان لەگەڵیدا بوو بوو، گوتبووی کە «ئەگەر شۆڕش سەربکەوێ ئامادەیە ببێ بە ویلایەتی پەنجاو یەکەمینی ئەمەریکا.»[١٧]

جا لێرەدا مرۆڤ لە خۆی دەپرسێت، تۆ بڵێی جەنەراڵ بارزانی لە دیداریدا دەگەڵ هنری کیسنجەر دا واڵە و بەڵێنی ڕەسمی تری وەرنەگرتبێ؟

جەنەراڵ بارزانی، زۆری ستایشی وەزیری دەرەوەی ئایندەی ئەمەریکا دەکرد، تەنانەت جارێک سێ ئۆرتەی بە دیاری دابێ و کە ژنیشی هێنا گەردانەیکی زێڕ و مرواری کردە دیاری بۆ هاوسەرەکەی[١٨] لە حاڵێک دا کە هیچ پێویستییەک بۆ پێشکەش کرنی ئەو جۆرە دیاریانە بە ئەو یان بە سەرەک نیسکون یان وەزیری دەرەوە، ویلیام راجرز، نەبوو.[١٩]

بە گوێرەی هەواڵی رادیۆی «دەنگی کوردستان» بارزانی لە هەیڤی ١٠/١٩٧٤ جارێکی دی و لە تاران دا دیداری دەگەڵ کیسنجەر دا کرد.[٢٠] لەم بەینەدا بارزانی لە حەقیقەتدا بوو بە قوربانییەکی «میکاڤیلیزم»ی ڕاوێژکاری سەرۆک نیکسۆن.

## ٧

## تێکچوونی نێوان بارزانی و بەغدایە

لەسەر داوای شا، سەرۆک نیکسون و کیسنجەر نهێنیکاریەکی زۆریان کرد کە پەیوەندی بارزانی و ئەمەریکاییەکان دزە نەکاو نەچێتە دەرێ. سەرۆک نیکسون لە ناوەراستی تەموزی ساڵی ١٩٧٢دا، جۆن کاناڵیی کۆنە وەزیری دارایی خۆی بۆ تاران نارد تا شا ئاگادار بکاتەوە کە ئەمەریکا لێبڕاوە نەخشەکەی «سیا» پەسند بکات. وەزارەتی دەرەوە کە دژی ئەم کارە بوو، پێدەچێت لە پرۆسەکەدا نەبووبێ.[٢١]

شای ئێرانیش زۆر بە پارێزەوە پەیوەندی دەگەڵ بارزانی دا دەکرد، ئەو سەردەمە لە ئێران دا کۆمیتەی لێکۆڵینەوەی پەرلەمانی- سەر بە ئەمەریکا نەبوو، بەڵام وێڕای ئەم هەموو نهێنیکارییە، سەراتی بەغدا هەر زوو بۆنی هەندێ شتیان کرد. لە ئاخرو ئوخری تەموزی ١٩٧٢دا رۆژنامەی الثورەی ئۆرگانی بەعسی عێراق، بارزانی بەوە تاوانبار کرد کە چەکی ئورس و رادیۆیەکی تازەی لە ئێران وەرگرتوە، چەندین ئۆردوگای لە ئێراندا کردۆتەوە بۆ مەشقدانی ئەو هێزە کوردانەی کە «پڕپاگەندەی روخانی حکومەت و دەسەڵاتی نیشتمانی بڵاو دەکەنەوە.»[٢٢]

کوردەکان هێشتا (٥) وەزیریان لە کابینەی حکومەتدا هەبوو، بەڵام پاش هەوڵێکی دیکەی تیرورکارانە دژی جەنەراڵ بارزانی لە ١٩٧٢/٧/١٥ هەرچەندە کۆمەڵێک نامە و یاداشتنامە لەو بارەیەوە لە نێوان هەردوولادا ئەنجام درا، پەیوەندییەکان بە کردەوە پچران.[٢٣]

مەکتەبی سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٧٢/٧/٣١ دا یاددداشتنامەیەکی یازدە خاڵی بە بەعس دەدات و لەو یادداشتنامەیەدا «کاربەدەستانی باڵای وەزارەتی ناوخۆ و بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی عێراق» بەوە تاوانبار دەکات کە ئەوان هەوڵەکانی تیروری بارزانییان سازداوە، دووپاتی دەکاتەوە کە لە رێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١ بەم لاوە هەرگیز بەینی حیزبی دیموکرات و بەعس ئەوەندە خراپ نەبووە و رایدەگەیەنێ کە وەزع و حاڵەکە «لە تەقینەوەدایە» و ئەگەر سەراتی عێراق (کەمەکتەبی سیاسی حیزب بەوەی تاوانبار کردون کە سیاسەتێکی فزونکاریان گرتۆتەبەر) رێبازێکی جیاواز لە رابردوو نەگرنەبەر، ئەوا حیزب ناچارە «بەرەڤانی بکات.»[٢٤]

پاش ئاڵوگۆڕی زنجیرە یادداشتنامەیەکی «نهێنی» لە نێوان کاربەدەستانی بەعس

(١٩٧٢/٩/٢٣) و حیزبی دیموکراتی کوردستان (١٩٣٨/١٠/٢٨) شەڕێکە ئاشکرا دەبێت و ڕۆژنامەی الثورە «ئەندامانی باڵای» حیزبی دیموکراتی کوردستان بەوە تاوانبار دەکات کە «زانیاری سوپایی لەمەڕ سوپای عێراق دەدەن بە کاربەدەستانی ئێرانی و ئەفسەرێکی پێناوی (رابیت) ئیسرائیلی» و لەسەری دەڕوات کە پەیوەندی بەینی «شۆڕشی چەکدارانەی کورد و سەرانی کۆنەپەرستی ئێران تەگەرەی هەرە گەورەیە لە ڕێی یەکێتی هەردوو حیزبی دیموکراتی کوردستان و بەعس دا.»[٢٥]

## ٨
## فشە ئەشتی ساڵی ١٩٧٣

لە بەهاری ساڵی ١٩٧٣ دا عێراق بە کردەوە دوولەت بوو: سنوورێکی نادیار «کوردستانی ئازاد» (کوردستانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەکانی جەنەراڵ بارزانی» بە کردەوە لە بەشەکانی دیکەی وڵات جیا دەکاتەوە، ئەگەر کەسێک بیەوێ و بتوانێ لە بەغدایەڕا بۆ کوردستان بڕوات، بە درێژایی ڕێگەی کەرکوک و هەولێر تووشی چەندین بازگە و خاڵی پشکنین دەبێت و داوای ناسنامەی لێدەکرێ و ئوتومبیلیان تەفتیش دەکرێن. پارێزگاری هەولێر کوردێکە بە ناوی عەبدولوەهاب ئەتروشی کە لە ساڵی ١٩٦٢وە پەیوەندی بە بارزانییەوە کردووە، بەڵام دەسەڵاتی بەسەر «ئەمنی» ناوچەکەدا هێندە لاوازە کە حسێن شێروانی سەرۆکی پۆلیسی هەولێر، کە ئەویش کورد بوو، بە ڕۆژی روناک لە شاری بەغدایە رفێنراو لەسەرەتای ١٩٧٣ دا جەنازەکەی بە شێواوی درایەوە بە کەسوکاری.

بەینی بەغدایە و جەنەراڵ بارزانی هەرگیز هێندە خراپ نەبووە، وەکو حەبیب کەریمەی سکرتێری گشتی حیزبی دیموکرات دەڵێ، بەینی حیزبی دیموکرات و بەعس کە بە درێژایی ساڵی ١٩٧٢ بەردەوام روو لە خەراپی بوو، سەرەنجام «گەییە سفر»[٢٦] بەرای سەرانی حیزبی دیموکرات، مەبەستی سەرەکی سەدام حوسێن «کوشتنی بارزانی و جێبەجێ کردنی ڕێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١ بوو لەگەڵ تاقمێک دا کە بە دڵی بەعس بن» کوردەکان هەموو ساتێ چاوەنۆڕی هێرشی سوپایی عێراقن، لێ هێشتا گفتوگۆ نەبڕاوە.

عەبدولخالق سامەرایی تیوریستێنی بەعسی عێراق بۆ چارەسەری ئەم قەیرانەی کە کەوتبووە بەینی هەردوولاو متمانەیانی بە یەکدی لەق کردبوو، بۆ دڵنیاکردنەوە و سڕینەوەی بەدگومانی «ئەو کەسانەی کەوا دەزانن سەدام حوسێن لە پشت ئەو کەسانەوەیە

که دەیانەوێ حوکم و دەسەڵاتی بارزانی لە بەین بەرن» پێشنیاز دەکات کە دیدارێک لە نێوان سەراندا نەنجامبدرێ و یەکێک لە کوڕانی بارزانی بە مەبەستی زەمنیە خۆشکرن بۆ سەفەری سەدام بۆ ناوپردان، بچێتە بەغدایە.

هەڵبەتە پاش ئەو هەوڵەی کە لە هەیڤی ١٢/ ١٩٧٠ و لە بەغدایە بۆ تیرۆر کردنی ئیدریس درا، ناردنەوەی ئەو بۆ بەغدا لە ئارادا نەبوو، بۆیە ئەمجارەیان مەسعود دەڕوات تا زەمینە بۆ سەفەری سەدام خۆش بکات.[٢٧]

لە کوردستاندا چ شتێک لەمەڕ ڕێکەوتنی نێوان بارزانی و ئێران و سیا دزە ناکات، بەڵام لە ناو مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی حیزب دا جۆرە جوداییەک بەرچاو دەکەوێ: ژمارەیەک کە پێدەچێ چ شتێکیان لەم بارەیەوە نەزانیبێ بێ، هێشتا پێیان وابوو کە دەکرێ لە ڕێگەی دانوستانەوە بگەنە چارەسەرێک، کەچی هەندێکی دی (لەوانە دکتۆر مەحمود عوسمان) بە هیچ جۆرێ لەگەڵ سازش دا نەبوون.

لە ناوەڕاستی هەیڤی ١٩٧٣/٦دا جەنەراڵ بارزانی هەڤپەیڤینێکی سەیر دەگەڵ پەیامنێری واشنگتون پۆست دا ئەنجامدەدا و لەو هەڤپەیڤینەدا داوا لە ئەمەریکا دەکات « بە شێوەیەکی سیاسی، ئینسانی، یان سوپایی ئاشکرا یان نهێنی» پارێزگاری لە کورد بکات، لەم هەڤپەیڤینەدا بارزانی لەسەری دەڕوات: «ئێمە ئامادەین ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم گورگانەمان بپارێزێ و پشتیوانیمان بکات ئەوا لەم دەڤەرەدا بە پێی سیاسەتی ئەو کار دەکەین، ئەگەر بە باشی پشتیوانیمان لێبکرێ دەتوانین ناوچە بە نەوتەکانی کەرکوک بخەینە ژێر دەستی خۆمان و ئیمتیازی نەوتەکە بدەین بە کۆمپانیا ئەمەریکاییەکان: ئەم دەڤەرە هێی ئێمەیە، ئەم خۆماڵی کرنی نەوتە، خۆماڵی کرنی «کۆمپانیای نەوتی عێراق» لە ١٩٧٢/٦/١ دا کارێک بوو کە لە دژی ئێمەی کورد کرا.»!

جەنەراڵ بارزانی لە کۆتایی قسەکانیدا دەڵێت کە ئامادەیە هارکاری و کۆمەکی ئەمەریکا «لە ڕێگەی ئێران یان ئیسرائیلەوە وەربگرێ، بەڵام هەڵبەتە کۆمەکی ڕاستەوخۆ بێ باشترە.»[٢٨]

دیارە ئیدی باسی سەفەری مەسعود بۆ بەغدایە و دیداری سەران، باسێکی زیاد و بێهودە بوو.

٩
## بەرەی نیشتمانی (١٩٧٣/٧)

دامەزراندنی «بەرەی نیشتمانی» لە ١٩٧٣/٧/١٧دا کە تەنیا بریتی بوو لە حیزبی بەعس و حیزبی کومونیستی عێراق، دوای ئەوەی کە پارتی نەچووە ناوی، خۆی لە خۆیدا قۆناغێکی تازە بوو لە تێکچوونی یەکجارەکی بەینی بارزانی وبەغدا.

کوردەکان لە یادداشتنامەیەک دا مەرجەکانی خۆیان بۆ چوونە نێو بەرەی نیشتمانی دیاری کر ـ ـ، بریتی بوون لە:

- ڕێکەوتنی جاران لە مەڕ ئوتونومی.
- ڕێکەوتنەکەی جاران لەمەڕ شێوازەکانی دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئوتونومی.
- بەشداری کردنی ڕاستەقینەی هەموو حیزبەکانی ناو بەرەی نیشتمانی لە کاروباری بەڕێوەبردنی وڵاتدا (حیزبی کومونیستی عێراق و حیزبی دیموکراتی کوردستان) بۆ ئەوەی دامودەزگای حکومەت بە تەنێ لە دەستی بەعس دا نەبێ.
- بە مەبەستی گێڕانەوەی دیموکراسییەتی ڕاستەقینە بۆ وڵات، ریفراندۆمی ئازاد و گشتی، لە ماوەی ئەوبەری ساڵێک دا دوای پەیوەندی کردنی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە بەرەی نیشتمانییەوە ئەنجام بدرێ.

دکتۆر مەحمود عوسمان هەست و بۆچوونی کوردان لەمەڕ بەرەی نیشتمانی ئێوبراو بەم شێوەیە روون دەکاتەوە. «سێ ساڵ ونیوە لە حکومەتدا بەشدارین وج شتێک ئەنجام نەدراوە. بۆیە ئێمە ناتوانین بچینە ریزی رێکخراوێکی تازەوە»[٢٩]

بەڵام دامەزراندنی بەرەی نیشتمانی بۆ کوردەکان ئاقیبەت و ئەنجامی گرنگی هەبوو: پەیوەندییان دەگەڵ کۆمونیستەکاندا پچڕا، چەند مانگێک لەوە دوا پەیوەندی نێوان حیزبی دیموکراتی کوردستان و حیزبی کومونیستی عێراق بە رادەیەک تێک دەچێت و دەشێوێ کە شەڕ وپێکادانی چەکدارانە لە نێوان کوردە کۆمونیستەکان و پارتییەکاندا روو دەدات. ئیدی لەمە بە دواوە حیزبی دیموکراتی کوردستان بە تەواوەتی گۆشەگیر دەبێت.

## جەنەراڵ بارزانی و شەڕی عەرەب و ئیسرائیل (١٩٧٣/١٠)

میسری وسوریەکان لە ٦/ ١٠/ ١٩٧٣ هێرشیان کردە سەر ئیسرائیل و ئەمە بووە مایەی ئەوەی بۆ شەش مانگێک هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە کوردستاندا دوا بکەوێ: بەڵای کەمەوە ئەمە بیروبۆچوونی سەرانی کورد بوو، کە باوەڕیان وا بوو ئەگەر شەڕی ئیسرائیل نەبوایە ئەوا سەرانی بەغدایە هەڵبژاردەترین لەشکری خۆیان بۆ سەر کوردستان دەنارد.(٣٠)

لە ١٩٧٣/٩/١٨ بەملاوە، ژمارەی شەڕەکانی سەرانسەری کوردستان زیادی کردبوو، دوو فەوجی سوپای عێراق لە ئەڵقوش و شێخاندا هێرشیان کردبووە سەر هێزی پێشمەرگە و لە ١٣/ ١٠/ ١٩٧٣دا سوپای عێراقی هێرشی کردبووە سەر هێزەکانی جەنەراڵ بارزانی لە «دەربەندیخانەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەوێندەر دەریان پەڕاندبوون و پاشان ئەو شوێنانەیان چۆڵ کردبووەوە.

داوا لەمەکتەبی سیاسی حیزب کرابوو کە کۆبوونەوە لەسەر لێکۆڵینەوەی بارودۆخەکە بکات، کە شەڕی ڕەمەزان دەستی پێکرد: جەنەراڵ بارزانی دەمودەست «کارتی هاوبەستەگی دەگەڵ وڵاتانی عەرەبدا دژی ئیسرائیل خستە کارە و فەرمانی بە هەموو هێزەکانی خۆیدا کە خۆ لە شەڕی سوپای عێراق دوور بگرن و لە ڕێگەی عەزیز شەریفی وەزیری ڕاوێژکاری و براوەی خەڵاتی ئاشتی لینینەوە نامەیەکی بۆ جەنەراڵ حەسەن ئەلبەکر نارد و پێشنیازی کرد «دان و ستانێک» ئەنجامبدرێ و ڕایگەیاند کە ئامادەیە بۆ ئەو مەبەستە شاندێک بۆ بەغدایە بنێرێ یان پێشوازی هەر شاندێک بکات کە بەغدا بیەوێ بۆ نک وی بنێرێ.(٣١)

بەڵام سەرۆک بەکر چ وەڵامێکی ئەم پێشنازەی نەدایەوە.

لێ لە ڕاستیدا جەنەراڵ بارزانی لە هەمان کاتدا کە دوو دیپلۆماسی سۆڤیەتی بۆ دیداری ئەو چوو بوونە حاجی ئۆمەران تا داوای لێبکەن چ چەرمەسەرییەک بۆ عێراق چێنەکات، لە ١٥/ ١٠ دا لە نامەیەک دا کە زانیارییەکی دروست لەمەڕ ئێوەرۆکەکەی لەبەر دەستدا نییە، پرسیاری لە کیسنجەر کرد چۆنە هێرشێکی سەرانسەری بکاتە سەر سەنگەرەکانی سوپای عێراق!

بەڵام وەکو لە « ڕاپۆرتی پایک» دا بە دیار دەکەوێ سەرۆک نیکسۆن-ش وەکو

کیسنجەر و - شای ئێران بەر لەهەموو شتێک حەزی دەکرد ئەو بارودۆخ و رەوشەی هەیە وەکو خۆی بمێنێ و ئەم وەرەمە شێرپەنجەییە لە «جەستەی عێراق» دا بمێنێ تا قورتی بگرێ و هیچ یەکێک لەوانە خوازیاری سەرکەوتنی کوردەکان و بەدەست هێنانی ئوتونومی راستەقینە نەبوون.[٣٢]

کیسنجەر لە ١٦/ ١٠/١٩٧٣دا، واتا نۆ رۆژ دوای دەست پێکردنی شەڕی عەرەب و جولەکە، دەستووری دا کە وەڵامی بارزانی بدەنەوە و بڵێن کە ئەو «کیسنجەر» لە گەڵ ئەو هێرشە سەرتاسەرییەدا نییە کە بارزانی پێشنیازی کردووە و ئەو کارە بە مەسڵەحەت نازانێ، لە حاڵێکدا بە گوتەی ئامادەکارانی «راپۆری پایک» ئەگەر ئەو هێرشە بکرایە ئەگەری هەر جۆرە سەرکەوتنێکی هەبوو.

١١

## پرۆژە و پێشنیازێن پەیوەست بە دەستووری بنەڕەتی

ئەگەر شەڕی عەرەب و جولەکە هەڵنەگیرسابا، ئەوا سوپای عێراق بە هەموو ئەگەرێک لە سەرەتای هەیڤی ١٠/١٩٧٣دا هێرشی دەکردە سەر کوردەکان.

ئەگەر کیسنجەر بە مەسڵەحەتی زانیبا و رازی بوایە، بێگومان بارزانی پاش چەند رۆژێک لە هەڵگیرسانی شەڕی عەرەب و جولەکە، هێزی پێشمەرگەی وەگەڕ دەخست و پەلاماری سەنگەرەکانی سوپای عێراقیان دەدا،

لە مەسەلەی ئوتونومیدا بەڵێنی ئەوە دراوە کە کوردەکان بۆیان هەیە، زانستگەیەک بە زمانی کوردی بکەنەوە.

وێڕای هەموو ئەمانە دەبێ ئەوە بگوترێ کە ئەو پرۆژەیەی پارتی لەمەڕ چاک کردن و تۆمار کردنی دەستووری هەمیشەیی خستبۆیە رو و پێشنیازی کردبوو مایەی سەرنج بوو، چونکە ئەو پرۆژەیە مەسەلەی ئوتونومی کوردستان لە ئاستێکی تیروتەسەڵتر و وردتر لەوەی کە تا ئەو شۆڕشی کورد داوای دەکرد، دەخاتە بەرچاوان.

ئەم قەواڵە و بەڵگەنامە تێروتەسەلە کە بە ئاشکرا داوا دەکات،بەشی ناوچەی ئوتونومی لە دەرامەت و بودجەی گشتی وڵاتدا دەبێ لەگەڵ رێژەی دانیشتوانی ناوچەی نێوبراودا گونجاو بێ» لە راستیدا پێشنیازی دامەزراندنی دام و دەزگایەکی جێبەجێ کردن و یاسا دانان بۆ کوردستان دەکات، ئەویش بە دامەزراندنی:

- ئەنجومەنێکی ناوچەیی، کە دەسەڵاتێکی فرەی هەبێ لە پەسند کردنی بودجە و

بەرنامە دانان و دانانی یاسایێ ناوچەیی.

- ئەنجومەنێکی جێبەجێ کردن لە ١٤ وەزیر و بە هەڵبژاردنی سەرۆکی ئەنجومەنی جێبەجێ کردن، کە بە خۆی لەلایەن پەرلەمانەوە هەڵبژدرابێ.

- دادگایەکی باڵای دەستووری بنەڕەتی.

سەرۆکی ئەنجومەنی جێبەجێ کرن، کە سەرکۆمار بە فرمانێکی کۆماری ئەرکەکانی پەسەند کردووە، خۆ بەخۆ دەبێت بە یاریدەدەری سەرەک وەزیری کۆماری عێراق.

کەموکوڕی سەرەکی ئەم بەڵگەنامەیە، کە پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی ناوەندی و ناوچەیی بە وردی و تیۆرتەسەلی شرۆڤە و روون دەکاتەوە ئەمەیە کە کەم و زۆر باسی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی ناوەندی و ناوچە عەرەب نشینەکانی وڵات ناکات یان دەرەنگی بەینی دەسەڵاتی ناوەندی و ناوچە عەرەبییەکان وەکو حەقیقەتی حاشا هەڵنەگر قەبوڵ دەکات.

بۆ ئەوەی بمانەوێ سەراپای ئەم پڕۆژەیەی بخەینە بەر لێکۆڵینەوەو گفتوگۆ ئەوەندە دەڵێین کە پڕۆژەی کوردەکان داوای دام و دەزگایەکی یاسا دانان و جێبەجێ کردنی ئەوتۆی دەکرد کە تەنیا لە چوارچێوەی وڵاتێکی فیدرالدا دەشیا و لە چوارچێوەی هیچ رژێمێکی دیکەدا ئیمکانی نەبوو.

هەروەها بۆ ئەوەی بچینە ناو وەردەکاری پڕۆژەکەی حیزبی کومونیست و بەعس لەمبارەیەوە، پێویستە بڵێین کە پڕۆژەی بەعسییان هەرچەندە زۆر دووروودرێژ و پڕ شەرح و شرۆڤە بوو، زۆر لەم پڕۆژەیە «دراکەوتووترە بوو، بە تایبەتی لەم رووەوە کە دەیگوت سەرۆکی ئەنجومەنی تەنفیزی «جێبەجێ کردن» لەلایەن سەرکۆماری عێراقەوە هەڵدەبژێردرێ نەک لەلایەن جەماوەری خەڵکی کوردەوە، ئەمە جگە لەوەی کە پڕۆژەی بەعس وشەی «وەزیرەی بەکار نەدێنا و تەنیا بە دە ئەمینداریێتی قایل بوو، کەبۆ هەر یەکێکیان ئەمینداریێکی گشتی دابنرێ.

بەڵام لە هەموو ئەمانە گرنگتر ئەوەبوو کەپڕۆژەکەی بەعس لە پێشەکییەکەی خۆیدا دەیگوت دەبێ پایتەختی ناوچەی ئوتونومی «سلێمانی، یان هەولێر یان دهۆک» بێ، و کەرکووکی لەم حسابە دەردەکرد.!

دیارە ئەمە بۆ جەنەراڵ بارزانی، خۆی لە خۆیدا مانای راگەیاندنی جەنگ بوو.

## کوردستان لەنێوان ئۆتۆنۆمی،سەربەخۆیی و نەماندا

لە پاییزی ١٩٧٣ دا، بێ ئەوەی چ شتێک لەمەڕ کۆمەکی شاو «سیا» بۆ بارزانی دزەی کردبێ و بڵاو بوو بێتەوە، لە کوردستاندا گۆڕانکاریەکی ئەوتۆ بەرچاوی رووی دابوو کە تەنانەت سەرنجی بینەری ئاناگاشی رادەکێشا و هەستی پێدەکرد.

لە باری سوپاییەوە، تۆپێکی بەرگری دژە هەوایی گرنگ لە دەوروبەری بارەگای جەنەراڵ بارزانی لە ناوپردان و قەسرێ و نزیکی حاجی ئۆمەران دامەزرێنرا بوو.

پتر لە هەزار کورد، بەسەربازی ئاسایی و دەرەجەدار و ئەفسەرەوە، کە ئەیان توانی بوو لەوەی پتر لە ریزی سوپای عێراقدا وەمێنن، پەیوەندییان بە جەنەراڵ بارزانییەوە کردبوو.

لە دەوروبەری بارزانی دا، لە «حەسارو قەڵای کوردستان»دا گەلێک سیمای تازە دەکەوتنە بەرچاو: هەندێک لەمانە لاوانی خوێندکاری زانستگەکان بوون کەلە ئەوروپایە دەیانخوێند و بە پێچەوانەی هەموو تێکۆشەرانی کورد، لە پێناوی مانەوە لەبەغدایە پشتیان نەکردبووە کۆساران.

بەڵام گۆڕانکاری بەرچاوی،گۆڕانکاری سیاسی بوو، لەراستیدا سەرانی کورد گۆڕا بوون، ئەو ئارامی و پارێزکارییەی جارانیان وەلا نابوو، سەرسەختی و سەرکێشیەکی ئەوتۆیان دەنواند کە دەشێت بگوترێ سەیر بوو!

ئاستی مەبەست و تەماکان بە ئاشکرا بەرز بوو بووەوە، ئامانجی جەنەراڵ بارزانی و ئەوانی دی لە شەڕدا تەنێ وەدەست هێنانی ئۆتۆنۆمی نەبوو.

عێراقیەکان یەکەم کەس بوون لە مەیدانی تاوانبار کردنی بارزانی بە پەروەردە کردن و بڵاو کردنەوەی بیری جودا خوازی، وشەی سەربەخۆیی کوردستانیان بەکاربرد، لێ کوردەکان تاماوەیەکی دوودرێژ بە هەر حاڵ لە گفتوگۆیاندا دەگەڵ فەرەنگیاندا،خۆیان لە باسی سەربەخۆیی دەپاراست.

بەڵام ئەم ئۆزناغە لەنکاودا هاتبووە ئاراوە، هەڵبەتە مەنتیقی کوردەکان زۆر جوان و ئاسکبوو، حەبیب کریمەی سکرتێری گشتی پارتی دەڵێ: «سەربەخۆیی بەرنامەی ئاسایی وسروشتی مێژووی هەموو میللەتانە» و لەسەری دەڕوات» بزانێن ئەتەوەیی کەشە دەکەن بڕوانە جەزایرییەکان. لە سەرەتادا داوای سەربەخۆییمان نەدەکرد، تەنێ خوازیاری یەکسانی و وەدەست هێنانی مافی سیاسی راستەقینە بوون لە مەیدانی

خەباتدایە کە بەرەی ئازادیخوازای نەتەوەیی جەزایر داواکانی زیاتر دەکات و سەرەنجام داوای سەربەخۆیی دەکات.. ئێمەی کوردیش لە سەرەتادا چمان دەویست؟ مافی قسە کردن و فێر بوون بە زمانی زگماکی خۆمان، ڕێزگرتنی کەسایەتیمان، ئەمەیان پێ ڕەوا نەبینین، ئەوجا داوای ئوتونومیمان کرد و خەباتمان لە پێناودا کرد، ئوکەش لە بەرانبەری رەفتاری دەم دەمیانەی سەرانی بەعس و لەبەرانبەر ڕووداوانی وەکو دەمیسەکەی ئازم گزلروا[٣٤] ناچارین بۆ پاراستنی مافەکانمان داوای ئوتونومی بکەین، داواکانی ئێمە لەم سەرچاوەیەوە هەلقوڵیون، بەلام ئەگەر ئەمەشمان پێ ڕەوا نەبینرێ، ئەگەر شەرێکی دیکە هەڵگیرسێتەوە، هەنگینێ چاو دەبڕینە سەربەخۆیی.»

حەبیب کریم لە کۆتایی پەیڤێن خۆیدا دەڵێ : « ڕەوت و ڕەوورەوەی ڕووداوان بۆ هەموو میللەتان هەر ئەمەیە، ئەوسایە؟» لەسەری دەڕوات:

«پێویســـــتە ئەم خاڵە ڕەچاو بکرێ کە خۆ ویستی و دوورەپەرێزی رژێمە عەرەبییە یەک لەدوای یەکەکانی بەغدایە کردیانە کارێ کە ئێمە داواکانمان زیاتر بکەین.»[٣٥]

جەنەراڵ بارزانی هیچ نەگۆڕاوە، لەسالی ١٩٧٣ شدا وەکو ١٩٦٢ لەسەر هەمان بیروباوەڕ کەنەو ڕۆژنامە نووسانەی کوردستان، نوێنەر و نێردراوی وڵاتەکانی خۆیانن، بەشی یەکەمی گفتوگۆ هەمیشە لە کەش و هەواو ژینگەیەکی تا رادەیەک غەریب و نامۆدا ئەنجام دەدرێ، جەنەراڵ هەمیشە بەبێ سەبرییەوە چاوەنۆڕە بەرانبەرەکەی پشتیوانی لە هیواو ئاواتەکانی بکات. کاتێ سەرەنجام ناچار دەبێ مل بدات بۆ ئەوەی کە یارێی بەرانبەری «تەنێ ڕۆژنامەنووسە و هیچی دی» هەنگینێ لەرێگەی ئەوەوە نامەیەک بۆ وڵاتەکەی ئەو دەنێرێ.

جەنەراڵ بارزانی دەڵێ: « ئێمە ئامادەین پەیوەندیمان دەگەڵ فەرەنسەدا هەبێ، وڵات و خاکی ئێمە دەوڵەمەندە، ئەگەر دەوڵەتی فەرەنسە کەسێک بنێرێ دەتوانین سەبارەت بە هەندێ شت، بۆ وێنە سەبارەت بەمەی کە ئایا ئوتونومی بەمە... یان دەربارەی سەربەخۆیی! قسان بکەین.»[٣٦]

لەوپەڕی نارەحەتی تەرجومانەکەدا «دکتۆر مەحمود عوسمان، کەئەم شتانە بە کۆمەڵە مەسەلەیەکی «خەیالی» دەزانێ» جەنەراڵ بارزانی نەیتوانی خۆی بگرێ و ئەم قسانە نەکات کە پێویستە بۆ کەسێکی دیپلۆماسی بکرێ: «سەرزەمینی کوردستان، پڕە لە کانە نەوت، ئەمە خاکی ئێمەیە، هی ئێمەیە، ئێمە بە وەرگرتنی ئەو مافە زۆڵم لە چ کەسێک

ناکەین، ماڵی ئێمەیە...» جەنەراڵ بارزانی ئەوجا لەسەری ڕۆیی : «ئەگەر ناردنی نەوتەکەمان لە ڕێگەی سوریاو عێراقیشەوە مەیسەر نەبێ، گرنگ نییە، ئێمە دەتوانین ڕێگەیەک بۆ بۆری نەوتەکەمان بدۆزینەوە، ئەگەر کۆمەکێکی باش بکرێین دەتوانین چارسەرێک بۆ ئەم گرفتەش وەدۆزین!»

جەنەراڵ بارزانییش وەکو ڕێبەرانی ناسیونالیستی ئەستەمۆڵی پەنجا ساڵ لەمەوبەر، دەیەوێ سەربەخۆیی کوردستان بەو «سەروەت و سامانە» دابین بکات کە دەکەوێتە دەستی واتە ئەگەر ڕۆژێک کوردستان سەربەخۆ ببێ!

جەنەراڵ بارزانیش وەکو هەمان ڕێبەرانی ساڵانی دەیەی بیست، سەبارەت بە وەرگرتنی ئوتونومی یان سەربەخۆیی، کە زۆر ئارەزووی بەدەست هێنانی دەکرد، بێدەسەلاتی دەنوێنێ، لە هەیڤی ۱۹۷۳/۱۰ دا لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کە ئایا بەڕاستی بەئوتونومی قایل دەبێت، لە حاڵێک دا هەنوکە کوردستانی ئازاد کراو سەربەخۆیی هەیە، دەڵێت: «ئەمە بە بڕیاری ئێمە نابێ، ئەم بڕیارە لە دەستی ئێمە دا نییە، دەبێ ئەم پرسیارە لە زلهێزەکان بکرێ: بۆچی کوردیان بەو حاڵەوە هێشتۆتەوە؟»

ئەم وەڵامە کە بۆ ئەوکات نامەفهوم بوو، ئێستا ڕوون و ئاشکرایە: «بارزانی خۆی لە حاڵەتی وابەستەیی تەواودا دەبینیەوە: لە باری دەروونییەوە بەتەما بوو زلهێزەکان سەربەخۆیی «بدەنێ»، لە باری سوپایی و مادی و داراییەوە بەرادەیەک پابەندی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو کە ئیدی سەربەخۆیی ڕاوبۆچوونی لە دەست دابوو.

لێ ئەوسا کە چ کەسێک ئاگاداری ئەو مەسەلە و کێشانە نەبوو کە بارزانی دەگەڵ ئەمەریکایی و ئێرانییەکاندا هەی بوون، چ کەسێک نەیدەزانی کە لەکاتی شەڕی ئوکتوبەری ۱۹۷۳ی عەرەب و جولەکەدا، کیسنجەر ڕازی نەبووە بارزانی هێرش بەرێتە سەر سوپای عێراق، ئەوەی کەلە بەرچاو بوو و هەموولن دەیانبینی کۆمەکەکانی ئێرلن بوو.

تەنانەت لە بەغدایەش خەڵکانێک لە خۆیان دەپرسی ئایا دەشێت شای ئێران بەڕاستی بیەوێ کومەکی بارزانی بکات تا سەرەتا سەربەخۆیی وەربگرێ و پاشان بە هەردوو کوردستانی عێراق و ئێران کوردستانی گەورە دروست بکات، ئەوسا بیخاتە ژێر ڕکێف و سایەی خۆی؟ هەر لە ئێستاوە زاراوەی کورد دلش، یان بۆ ئەم وڵاتە تازەیە دارشتبوو، (کورداش لەسەر وەزنی بەنگلادش)

چ کەسێک لەو سەروبەندەدا نەیدەزانی کە ئەم گومان و مەزەندەیە لەمەڕ مەبەست و نیازی شا تەنێ خەیاڵ پڵاوە و هیچی دی.

## ١٣

## هوومیدا و مەسەلەی کورد

هەڵبەتە سەرانی ئێران لە قسە رەسمییەکانی خۆیاندا زۆر بەپارێز بوون، کاتێ لە ئەمیر عەباس هوەیدای سەرەک وەزیری ئێرانیان پرسی پەیوەندی ئێران دەگەڵ جەنەراڵ بارزانیدا چۆنە، لە وەڵامی مەبەستە سەرەکییەکە هەڵهات و گوتی:

«کوردەکان، یەکەمین ئێرانیانن کە هاتونەتە دەشتی ئێران، ئێمە ئەوان بە نەتەوەیەکی جیا نازانین، ئێرانین، هەموان دەڵێن ئێران بارزانی چەکدار کردووە، من پێم وا نییە، بارزانی پێویستی بەوە بێت کە ئێران چەکی بداتێ، خودی سوپای عێراق لە مەیدانەکانی شەڕدا هێندەی چەک و تەقەمەنی بەجێهێشتووە کە بارزانی پێویستی بە چەک و تەقەمەنی کەسی دی نەبێت، ئەمە جگە لەوەی ئەو دەتوانێ بە ئاسانی لە دۆستە عێراقییەکانی لە ناوچەکانی دیدا چەک و تەقەمەنی وەربگرێ، لە رێگەی شەتی عەرەبەوە، ئێمە لەم بارەیەوە هەندێ شت دەزانین.»[٣٧]

سەرەک وەزیری ئێران ئەوجا لە سەری دەڕوات:

«بەلام خۆ ئێمە ناتوانین چارەنووسی کوردەکان پشت گوێ بخەین، ئەمانە، من ناتوانم بڵێم کە ئێرانین، ئەوساکە دەڵێن کە ئێمە چاوی تەماحمان بڕیوەتە ئەو دیوی سنوور، نا، وا نییە.

«ئیدی پێمان خۆشە ئەوان لەو دیوی سنووردا بن، ئەوەی کە دەیانەوێ لەوێندەر بۆیان مەیسەر بێت.

«بەلام لەگەڵ ئەمەشدا یەک رەگ و نەژادین، ئەگەر وشەی نەژاد شتێک بگەیەنێ، گوتنی ئەم قسەیە قورسە، لە دیوێکی سنووردا، لێرە ئێرانە، لەو دیوی سنووردا لەوێندەر عێراقە!.

«بڕوانە، لێرە پس مامان نیشتەجێن، لەو دیو پس مامان، هاتوچۆ لە نێوان هەردوو لادا هەیە.»

سەرانی ئێرانی هەرگیز بە ئاشکرا لەمەی پتر خۆیان گیرۆدەی چارەنووسی «پس مامێن» کوردی خۆ ناکەن، لێ ئەم کارە بە رواڵەت هۆی نیگەرانی جەنەراڵ بارزانی نییە، لەوەیە وا بیر بکاتەوە کە دوژمنانەتیی تری هەن.

## ١٤
## لە فشە نشتییەوە تا شەڕ

لەمانگی ١٩٧٣/١٠ دا بەینی بەغداو جەنەراڵ بارزانی بە تەواوەتی تێک چوو، سەرانی بەعس لێبڕا بوون کە بەرنامەی ئۆتۆنۆمی خۆیان بە ڕەزامەندی یان بێ ڕەزامەندی ئەو کوردانەی لە دەوری بارزانی خڕ بوو بوونەوە، جێبەجێ بکەن.

سەدام، دوای ڕێکخستنی پرۆژەی «دەستووری» بنجی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە ١٩١ ١٠/١٧ دا، لە گەرمەی شەڕی عەرەب و جولەکەدا، پرۆژەی تێوبراوی خستەبەردەستی کۆڕێکی چەند سەد کەسی لە خەڵکانی «پێشکەوتوخواز» کە چەند کەسایەتییەکی «سەربەخۆی» کوردیشیان تێدا بوو.

بەلای سەرانی پارتییەوە ئەم کارە جۆرە «تەوس» و شەڕخوازی یەک بوو.

بەلای سەدام حسێنەوە، پارتی نوێنەری هەموو کورد نەبوو، ئەمەش قسەیەکی دۆغری بوو.

لێ سەدام پاش ئەوەی کە بەم شێوەیە خەڵکی کورد لە پارتی و لە بزاڤی کوردێتی بە ڕێبەرایەتی جەنەراڵ بارزانی جیا دەکاتەوە، زۆر زوو دەگاتە ئەم ئەنجامگیرییەی کە جەنەراڵ بارزانی نەک هەر نوێنەری گەلی کورد نییە، تەنانەت «دژمنی» گەلی کوردە، کەدیارە ئەمە قسەیەکی ناپەجێ و نادروستە.

وێڕای ئەوەی کە «جاشەکانی ٦٦» (برایم ئەحمەد و تاڵەبانی) لەسالانی ١٩٦٦-١٩٧٠ دا نەیانتوانی کار لە بیروبۆچوونی بەشێکی گرنگی گەلی کورد بکەن و لە بارزانیان دوور بخەنەوە، کەچی سەرانی بەعس هەوڵدەدەن سەرلەنوێ دوو بەرەکی بخەنە ناو ریزەکانی بزاڤی کوردێتییەوە.

## ١٥
## کورتەمێژوویەکی پچڕانی پەیوەندییان

بەر لە هەڵگیرسانەوەی شەڕ، سێ مانگێک بەدان وەستانەوە برایە سەر، و پاش ئەوە شەڕ بە ناچاری دەستی پێکرد.

«بەرەی نیشتمانی» لە١٩٧٣/١٢/١٢ دا پرۆژەی دەستووری بنەڕەتی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، کەلە لایەن بەعسەوە ئامادە کرابوو، بەرەسمی خستە بەردەستی پارتی.

لەسەرەتای هەیڤی ۱/۱۹۷٤دا شاندێکی کوردی دەچێت بۆ بەغدایە و بۆماوەی مانگێکی تەواو لەوێندەر دەمێنێتەوە، لەم دیدارەدا باسی چۆنیەتی چون بۆ بارەگای بارزانی لە حاجی ئومەران و هاتنەوە بۆ بەغدایە دەکرێ.

ئەندامانی ئەم شاندە بەسەرۆکایەتی حەبیب کەریمی سکرتێری پارتی بریتی بوون لە «سامی» و نوری شاوەیس، سالح یوسفی، دارا توفیق و ئیحسان شێرزاد.

سەدام حوسێن سەرۆکی شاندی «بەرەی نیشتمانی»یە.

لە سەرەتادا هەر شاندێک راوبۆچوونی خۆی بەیان دەکات، پاشان هەردوو شاند پێکەوە ئەو مەسەلە گرنگانەی کە لەسەری تاکۆکن، دەکەن بە لستێک:

- دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئوتونومی
- مەسەلەی هێزێن پێشمەرگە
- مەسەلەی چاودێری سنوور لەلایەن کوردەکانەوە
- پەیوەندی کورد دەگەل ئێراندا.
- بەشداریکردنی کورد لە «بەرەی نیشتمانی»دا.

ئەوەی سەیرە حەبیب کەریمی سکرتێری گشتی پارتی لە سەرەتادا تا رادەیەک گەشبین بوو: ئەوەی وە بیرلن دێناوە کە «دان وستانەکانی لەمەر رێکەوتننامەی سالی ۱۹۷۰ش لە هەوەلێ را دژوار بوو.»

رێبەرانی بەعس، جگە لە هەر باری سەرلجێکی دی، زۆر بەوە نارەحەت بوون کە حەبیب کریم سەرۆکی شاندی کوردی بوو، لە سالی ۱۹۷۰ شدا، لەبەر ئەوەی بەرەچەلەک ئێرانی بوو، رەفزیان کردبوو کە ببێ بە یاریدەدەری سەرکۆماری عێراق.

سەدام حوسێن، لە یەکێک لە کۆبوونەوەکاندا جلەوی لەدەست بەردا، لە سکرتێری گشتی پارتی پرسی: « تۆ نوێنەری کێی؟» وەلامی حەبیب کەریمیش زۆر توند بوو: « من نوێنەری ئەو هێزەم کە تۆی ناچار کرد چەندین جار بێیتە چیا.»

لێ دوای پازدە رۆژان ئیدی حەبیب کریم رەشبینی خۆی لەمەر دان وستانەکە نەدەشاردەوە و بە ئاشکرا دەری دەبری.

لە کۆتایی هەیڤی یەک دا کوردەکان و بەعسیەکان لێبران کەلە هەیڤی دوودا دیدارێکی دیکە بکەن.

ئێستا رەوشەکە زۆر گرژ بوو، ژمارەیەک لە کوردەکان گەرابوونەوە بۆ چیا، حەبیب و

نوێنەری کوردەکان لەمانگی دوو دا نەچوون بۆ بەغدایە و فوئاد عارف و ئیحسان شێرزاد، کە دوو کەسایەتی «سەربەخۆی» کورد بوون لەبری ئەوان چوون.

بەلای سەدام حسێنەوە، نەهاتنی حەبیب کریم و ئەندامانی تری شاندەکە بۆ بەغدایە، خۆی لە خۆیدا بڕینی گفتوگۆیەکەبوو، دۆخ و رەوشەکەش،گرژ و گرژتر دەبوو.

## ١٦

## دوا هەولی ئیدریس لە بەغدایە

دارا تۆفیق لە ١٩٧٥/٣/٥دا (دەبێ ١٩٧٤/٣/٥ بێ، - وەرگێڕی کوردی -) بە نامەیەکی بارزانییەوەبۆ سەدام حسێن دێت بۆ بەغدا: بارزانی لەم نامەیەدا دەنووسێت: «دەبێ رێگە لە خراپتر بوونی رەوشەکە بگیردرێ، دەبێ دان وستانی جدی بێتە کرن..»

سەدام حسێن کە لە ٣/٧ دا وەلام دەداتەوە و «سەرسامی خۆی لەمەڕ نەچوونی شاندی کورد بۆ کۆبوونەوەی مانگی شوبات، دەردەبڕێ» و لە سەری دەڕوات «هەمیشە چاوەنۆڕە کە بارزانی یەکێک لە کوڕەکانی خۆی بنێرێ.»

ئیحسان شێرزادیش، نامە بۆ بارزانی دەنێرێ و داوای لێدەکات کەیان ئیدریس یان مەسعود بنێرێ، شێرزاد دەڵێ «ئەمە فیداکارییەکە، بەلام ئێوە لە ژیانی خۆتاندا فیداکاری زۆرتان کردووە، ئەمە بۆ ئایندە باشە!»

ئەوسا خەتێکی تەلەفونی راستەوخۆ لە نێوان بەغدا و بارەگای جەنەراڵ بارزانی دا هەبوو، بارزانی داوای لە بەغدایە کرد کە فرۆکەیەک بۆ رەواندز بنێرێن. بۆ سبەینێ واتە ١٩٧٤/٣/٨ سەعات پێنجی پاش نیوەڕۆ ئیدریس بارزانی لە تەک شاندێکی گرنگی کوردی دا کە هەموو وەزیرە کوردەکان و دارا تۆفیق و ئیحسان شێرزاد و فوئاد عارفی لەگەڵ بوو، گەییە بەغدایە، بەلام شوێنی کەسایەتییەکی بەرجەستە خالی بوو: حەبیب کریم.

نوێنەرانی کورد لە کۆشکی «میوانانی رەسمی» دا جێگیر بوون و دەم وەدەست دان وستان دەستی پێکرد.

کوردەکان و بەعسییەکان پێکەوە مەسەلەکانیان خالبەندی کرد.

١- دان وستان لەمەڕ رێکەوتنە سیاسییە بنەڕەتییەکان بەمەبەستی ئەوەی هەردوولا، بەعس وکورد بگەنە ستراتیژییەکی هاوبەش. و پێشـ ـبوانی کردنی کورد لە عەرەب ـ

فەلستین و مافی عەرەب لە کەنداوی فارس و پشتیوانی کردنی عەرەب لە کورد نەک هەر لە عێراقدا بەڵکو لە ئێران وتورکیاش!

٢- دیاری کردنی سنووری ناوچەی ئوتونومی، باسکردنی کێشەکانی کەرکوک و ژەنگار و خانەقین (سەبارەت بە کەرکوک هەشت جۆرە چارەسەر خرایە بەر باس و لێکۆڵینەوە.)

٣- بارودۆخی حقوقی و یاسایی، ناوچەی ئوتونومی، دامەزراندنی ئەنجومەنێک، دیاری کردنی ئەو رێژە دەرامەتەی کە پێویستە بۆ ناوچەی ئوتونومی دیاری بکرێ، مەسەلەی دستووری ئەساسی.

شەوی هەمان رۆژ (٣/٨) سەعات هەشت، ئیدریس و سەدام پێکەوە دانیشتن و کەوتنە گفتوگۆیان، لەم دیدارە تایبەتییەدا ئیدریس گوتی: کە « کوردەکان ئامادەن، کە ئەگەر رێکەوتنێکی تەواوەتی بەدەست بێ، هەموو پردە تێهینەیەکان دەگەڵ ئێراندا، بروخێنن» و داوای کرد کە بۆ زەمینە خۆشکرن بۆ رێکەوتنێکی بەو ئاوایە دەرفەتی چەند رۆژێکی بدرێتێ.

دەربارەی کەرکوک، ئیدریس بە سەدام حسێنی گوت: « ئەگەر ئێوە یەک هەنگاو بێنە پێشەوە، ئێمەش دێینە پێشەوە.»

سەدام پێی دەڵێ هەر سبەینێ داوای کۆنگرەی نائاسایی حیزبی بەعس دەکات.

## ١٧
## ئینزار

رۆژی ١٩٧٤/٣/٩ ئیدریس بارزانی گەشبینی خۆی دەردەبڕێ، وای بۆ دەچێت سەدام حسێن پێشنیازەکانی ئەوو مۆڵەتخوازی چەند رۆژەی ئەو قەبوڵ دەکات.

بەڵام نیوەڕۆی هەمان رۆژ «غانم عەبدولجەلیل»ی ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی عێراق و بەرپرسی کاروباری کوردستان دێتە دیداری ئیدریس و دەڵێت:

- ئەگەردەتانەوێ گۆڕانکارییەک لەم پرۆژەیەی ئێمەدا بکەن دەبێ بەر لەسەعات دوانزەی رۆژی ٣/١١ ئەم کارە بکەن!»

- لە ٣/١١ بە دواوە پانزە رۆژتان هەیە تا پێشنیازەکانتان لەسەر دیاریکرنی سنووری ناوچەی ئوتونومی بخەنەروو، بەمەرجێ کە لەم ماوەیەدا چ کارێک نەکەن.»

- «دەربارەی کەرکوک دەبێ یەکێک لەم دوو پێشنیازە هەڵبژێرن، یان ناوچەی

کەرکوک لەلایەن دام و دەزگایەکی هاوبەشەوە بەڕێوە ببرێ و لە سایەی حوکم و سەرپەرشتی دەوڵەتی مەرکەزیدا بێ یان پارێزگای کەرکوک دابەش بکرێ و دەو قەزای بخرێتە سەر ناوچەی ئوتونومی و ئەوی دی بۆ دەوڵەتی ناوەندی بێ!»

ئیدریس یەکسەر دەڵێ: «بەڵام ئەمە ئینزارە!» کاتێ مەسەلەی -رژمێری باس دەکات، عەبدولجەلیل دەڵێت: « هەرگیز دەگەڵ ئەنگۆدا سەرژمێری ئەنجام نادرێت» و کە ئیدریس دڵنیای دەکات کە سەرژمێری «لەیاسادا» بڕیاری لەسەر دراوە (یاسای ١١/٣/ ١٩٧٠) غانم عەبد...لیل دووبارەی دەکاتەوە «بەڵام لەگەڵ ئێوە دا نا!»

ئیدریس سەیر دەکات کە ئیدی ج کارێکی لە بەغدایە نەماوە، بە غانم عەبدولجەلیل دەڵێ: «ئێمە پێشنیازەکانی ئەنگۆ دەبەینەوە بۆ جەنەراڵ بارزانی، بڕیار بەدەستی ئەوە.ئەگەر وەڵامەکەی ئیجابی بێ دەگەڕێینەوە.»

شاندی نوێنەرانی کورد بەرەو رەواندز وەرێ دەکەوێ و رادەسپێرن کە بۆ سەعات چواری دوای نیوەڕۆی سبەینێ فڕۆکەیان بۆ ئامادە بکەن.

## ١٨

## دوا پێشنیازێن بارزانی

لە ١٩٧٣/٣/١٠، دوای پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ فڕۆکەکە دەگەڵ دارا توفیق و ئیحسان شێرزادا دەگەڕێتەوە: ئەم دووانە هەندێ پێشنیازی بارزانیان دەربارەی رەوشی کەرکوک پێ دەبێ. کە دەم و دەست لە رێگەی غانم عەبدولجەلیلەوە دەیگەنە دەست سەدام حسێن.

پێشنیازەکانی بارزانی سێ چارەسەری جیاوازن:

– پارێزگای کەرکوک وەکو خۆی و بێ دەستکاری بمێنێتەوە و لەلایەن دام و دەزگایەکی هاوبەشەوە بەڕێوە ببرێ کە سەر بەناوچەی ئوتونومی بێ.

– ئەگەر دەوڵەت بەم چارەسەرە رازی نەبێ لەو حاڵەدا بارزانیش بێ چەند وچون ئەوپرۆژەیەی دەربارەی ئوتونومی لەلایەن دەوڵەتەوە خراوەتە روو، قەبوڵ دەکات.

– پارێزگای کەرکوک بکرێ بە دوو بەشەوە.

حەویجە و قەرەتەپە بدرێ بە دەوڵەت، ئەوی تری، لە گەڵ کەرکوک دا، بخرێتە سەر ناوچەی ئوتونومی.

- پارێزگای کەرکوک بەو شێوەیەی سەرێرا دابەش بکرێ. بەڵام بۆ شاری کەرکوک وەزع و حاڵێکی تایبەتی لەبەرچاوبگیرێ، لەم حاڵەدا دەبێ ئەم گۆڕانکارییە لەو پرۆژەی یاسای ئوتونومییەدا بگونجێنرێ کە لەلایەن پارتییەوە پێشنیاز کراوە.

سەعات دەی شەو غانم عەبدولجەلیل تەلەفۆن بۆ دارا تۆفیق دەکات و دەڵێت: «پێشنیازەکانی پارتی بە ورد و درشتییەوە لەلایەن «بەرەوە رەفز کراوە» بەڵام دەڵێ حەز دەکات ئەو ببینێ، دارا تۆفیق نیوەشەو بەنائومێدی لەم دوا دیدارەدا دێتە دەرێ.

بۆ سبەینێ ۱۹۷٤/۳/۱۱ دارا تۆفیق بە ئوتومبیل بەرەو باکور دەڕوات، ئەمە کۆتایی دان وستانەکان و پچرانی پەیوەندییەکان بوو.

کەسایەتیە سەربەخۆکانی کورد، خەڵکانی وەکو فوئاد عارف هەوڵ دەدەن بە خستنە رووی پێشنیازی میانە هەڵوێستی پارتی و بەعس لەمەڕ مەسەلەی کەرکوک لێکدی نزیک بکەنەوە.

لە ۱۹۷٤/۳/۲۰ فەتاح شاڵی کە کەسایەتییەکی دیکەی کوردی سەربەخۆیە، دێتە بەغدایە تا بە دەسەڵاتداران رابگەیەنێ کە جەنەراڵ بارزانی بە دابەشکردنی کەرکوک لە نێوان ناوچەی ئوتونومی و دەوڵەتی ناوەندی دا رازی دەبێت کە لە لایەن دەزگایەکی هاوبەش لە نوێنەرانی ناوچەی ئوتونومی و دەوڵەتی ناوەندییەوە بەڕێوە ببرێ.

بەڵام بەعسییان دەڵێن ئەم پێشنیازە شتێکی تازەی تێدا نییە. ئەمە کۆتایی یەکجارەکی رووداوەکەیە.

## ۱۹

## بەرپرسیارێتی

هێشتا زووە و ناتوانرێ مەسئولیەتی پچرانی دان و ستان و دەست پێکردنەوەی شەڕ بە شێوەیەکی بنجبڕ دە ئەستۆی لایەک لەو دوولایەنە بخرێ.

لێ هەموو کوردێن سەر بەباڵی چەپی حیزبی دیموکراتی کوردستان، کە یەکجار دژی یەکێتی دەگەڵ ئێران بوون و بە جیدی لەگەڵ یەکێتی دەگەڵ بەعسیان بوون و باوەڕیان وابوو کە یەکێتییەکی لەو جۆرە دەرفەت بۆ عێراق دەرەخسێنێ ببێ بە هێزێکی پێشکەوتوخوازی بە دڵی وان، لە بەهاری ساڵی ۱۹۷٤دا قایل بوون بەوەی کە سەدام حسێن و هەموو رێبەرانی تری بەعس رێککەوتنیان مەبەست نەبووە.

جەنەراڵ بارزانی چاوی پڕی بووە کەرکوک و بە هیچ جۆرێ ئامادە نەبوو دەست بەرداری بێ، بە بۆچوونی ئەوان سەدام حسێن لەم ڕووەوە ڕێکەوتنی مەبەست نەبوو، سەدام حسێن لە ١١/٣/١٩٧٤ لەو کۆبوونەوەیەدا کە پڕۆژەی یاسای ئوتونومی بەعسی تێدا خرایە ڕوو، بۆچوونی خۆی لەمەڕ خاڵی ناکۆکی نێوان کورد و بەعسیان خستە ڕوو.

بە بۆچوونی سەدام حسێن، دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئوتونومی پێویستە بەرەچاو کردنی ئەم خاڵانە ئەنجام بدرێ.

« ئەم سنوورە بە پێی ڕێژەی چڕی دانیشتوانی ئەو شوێنانە دیاری بکرێ کە کەوتوونەتە ناوچەی ئوتونومییەوە، خاڵی سەرەکی لە دیاری کردنی سنووری ناوچەدا ئەمەیە، بە مەرجێک کە ناوچەکە وەکو بەشێکی لە جیا بوونەوە نەهاتوی وڵات و سەرزەمینی نیشتمانی بێنێتەوە.»

لەسەری دەڕوات:

«ئێمە نامانەوێ کە دیاری کردنی سنووری ناوچەکە وەکو جیا بوونەوەی یەکجارەکی یان گۆشەگیری وابێ، شتی واهی مانای جیا کردنەوەی کوردەکان لە کۆمەڵگەی عێراق و گۆشەگیرکردنیانە لە ناوچەیەکی تەسکدا.

ئێمە ئوتونومی بەو مانایە وەرناگرین کە بریتی بێ لە دوورخستنەوەی عێراقیانی غەیرە کورد لە ناوچەی ئوتونومی: ئێمە ئوتونومی بە «پەیوەندی تەواو» دەزانین، بەڵام لە ناوچەیەکی دیاری کراوا کە لەو سنوورە دا مافی ئوتونومی لە چوارچێوەی دەسەڵاتدارێتی عێراقدا بەڕێوە ببرێ.»

وتەکانی یاریدەدەری سەرکۆماری عێراق، زۆر گرنگە و ئەم بۆچوونە لەلای پیاو دروست دەکات کە بە قەولی کوردەکان بە دەستێک دەیدات و بە دەستەکەی تری وەریدەگرێتەوە.

سەدام حسێن پاشان لە سەری دەڕوات: « شتێکی ئاشکرایە کە ناکرێ دوای یەک بە یەکی ئەندامانی هەر گروپێکی نەتەوەیی کە ئوتونومی دەیگرێتەوە بکەوێ و بە زۆر بیانکەی بە بەشێک لە ناوچەی ئوتونومی..»

لە ڕاستیدا دەیەوێ بڵێ کە (ناوچە تێکەڵاوەکان) بەتایبەتی کەرکوک - نابێتە بەشێک لە ناوچەی ئوتونومی.

مرۆڤ وا خەیاڵ دەکات کە سێ بەنجا ساڵ لەوەو پێش گەڕاوەتەوە، واتە بۆ ئەو سەردەمە گەڕاوەتەوە کە ویلسن ونونیل لە سەر سنووری گروپە نەتەوەییەکان مشتومڕیان بوو.

سەدام حسێن، سەبارەت بە دابەشکردنی دەرامەتی عێراق بەپێی ڕێژەی دانیشتوان و دیاریکردنی بودجەی ناوچەی ئوتونومی لەسەر ئەو بنەمایە، باوەڕی وایە کە «ئەم پێشنیازە نە دەگەڵ ئوتونومی دا و نە دەگەڵ یەکێتی گەلدا، ناگونجێت!»[39]

کەواتە تێگەشتنی ڕێبەرانی بەعس لە مەڕ «ئوتونومی» چ بوو؟ لە ڕاستیدا هەر چەندە هەموویان زاراوەی «ئوتونومی»یان بەکار دێنا، لێ وا دیار بوو هەرگیز بیریان لە «سنووری لامەرکەزییەکی سادەی ئیداری» هێوەتر نەدەڕۆیی.

ئەمانە هەرگیز ئەوەیان لە خەیاڵدا نەبوو وەکو شەریک و بە جۆرێکی یەکسان مامەڵە لەگەڵ کوردا بکەن، دەیانویست دەسەڵات بە هەموو شێوەیەک و تا سەرو بن چەند و چوون لەدەستی خۆیاندا بێ.

بەپێی گوتەی هەندێ لە شایەتانی کورد، بە درێژایی دوا قۆناغەکانی دان و ستانی هەیڤی ١-٣/١٩٧٤ ڕێبەرانی بەعس، بەتایبەتی سەدام حسێن، «بێ منەتی و سەرسەختی و خۆپەسندییان» نواندووە.

سەدام حسێن و باقی ڕێبەرانی عێراق پاش خۆماڵیکرنی «کۆمپانیای نەوتی عێراق» وایان بیر دەکردەوە کە ئیدی چ شتێک و چ کەسێک ناتوانێ خۆی لەبەریان بگرێ و بە گژیاندا بچێت.

هەرگیز ئەوەندە زەنگین و پارەدار نەبوون، (نرخی نەوت بوو بوو بە چوار بەرانبەری جاران)

لەباری سیاسی و دیپلۆماسییەوە، بەعسییەکان دەیانتوانی حیساب لە سەرگۆشەگیری کوردەکان بکەن، یەکێتی سۆڤیەت دەست بەرداریان بوو بوو، حیزبی کۆمونیستی عێراقیش چوو بوونە بەرەی نیشتمانییەوە.

دەکرا بە هەوڵێکی بانگەشەیی زیرەکانە لە ڕۆژاواش «بسەلمێنرێ» کە ڕێبەرانی بەغدایە لەسەر بەڵێنی خۆیانن و ئوتونومییان بە کوردەکان داوە، لێ بارزانی قەبوڵی نەکردووە.

چ کەسێک دەچوو تاقیبی دروستی و نادروستی ئەم پروپاگەندەیە بکات؟ و سەرەنجام دەبێ ئەوە بگوترێ کە ئەم قسەیە ڕاست نییە کە گوایە بارزانی کە هەم پەیوەندی دەگەڵ شادا و هەم دەگەڵ «سیا» دا بەستبوو، ئیدی نەیدەویست یان نەیدەتوانی دەگەڵ بەعسییان دا پێک بێت. نە، بارزانی دەبێ بوو لە وەزع و پێگەی خۆی بەرانبەر بە پارەتییەکانی شا و لەساڵی ١٩٧٣ بەملاوە بەرانبەر بە کۆمەکەکانی سیا، حاڵی بوو

بوو.

وەکو هەژاری شاعیری کورد دەڵێ: بارزانی سەبارەت بە گەلی کورد «وەکو دەروێشێک وابوو، دەرویش بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە و دەخولێتەوە تا سەرەنجام کەسێک بدۆزێتەوە کە بۆ بەهەشت ڕێنوێنی بکات.»[40]

**ئەگەر بەعس، زەمانەتی تەواوی بە بارزانی دابووایە، بارزانی دەیتوانی لە دوا ساتدا هەموو پردەکانی پشتەوە دەگەڵ ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بە هەمان بێ مبالاتی و ئاسانی بروخێنێ کە ئەم دوو وڵاتە وایان دەگەڵ ئەودا «بارزانی» دا کرد.**

## سەرچاوە و پەراوێزان

١- هەڵپەیڤینێک دەگەڵ نووسەردا، ناوپردان، ١٩٧٣

٢- هەمان سەرچاوە، حاجی نۆمەران، مانگی ١٠/١٩٧٣

٣- «سامی» ئیحسان شێرزاد، نووری شاوەیس، ساڵح یوسفی، نافیز.

٤- پاش ئیمزا کردنی ڕێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١ برایم ئەحمەد داوای لە سەرانی بەعس کرد بەشی سێ هەیڤان پارەی ڕێدەن تا بڕوات بۆ ئێران.

٥- دەیلی ئەستار، بەیروت، ١٩٧١/١١/١٢

٦- « عێراق: بۆنی توندی نەوت» کریس کوچیرا، ئەفریقای جەوان ١٩٧١/٧/١٣

٧- دەیلی ئەستار، ١٩٧١/١٠/١٠

٨- هەڵپەیڤینێک دەگەڵ Lejour - Lorient بەڵێکی ئازاد، ١٩٧١/١١/١٩.

٩- سەرچاوەیەکی نهێنی

١٠- «لە بەرەی ناوخۆی عێراقدا» کریس کۆچیرا، ئەفەریقای جەوان ١٩٧٢/٩/٩

١١- بڕوانە هەڵپەیڤینی ئەمیر عەباس هوەیدا، ی سەرەک وەزیری ئێران، دەگەڵ کریس کوچیرا، ئێکسپرێس ١٩٧٣/٤/٨

١٢- بڕوانە «کەنداوی فارس، کەنداوێکی ئەمەریکاییە؟» نووسینی کریس کوچیرا، لا فرانس کاتولیک، ١٩٧٢/١١/٣

١٣- دەنگی گوندی، نیویورک ١٩٧٦/٢/١٦

١٤- هەواڵ و ڕادیۆی پایک، نووسراوی ٤٥٩

١٥- بە گوتەی سەرچاوە کوردییەکان، ژمارەی ئەم دیدارە تایبەتییانە بەلای کەمەوە ٣-٤ جار بوو.

١٦- ڕاپۆری پایک، دەنگی گوندی.

١٧- ڕاپۆری پایک، نووسراوی ٤٦٢

١٨- هەمان سەرچاوە.

١٩- ڕاستە، و. ڕاجرز کە لە ساڵی ١٩٧٣ دا لەسەرکار نەمابوو، هەمیشە ناڕەزایی خۆی دەربارەی هەر جۆرە دەسەرکێشی وناژاوەیەک لە کوردستان)دا دەربڕی بوو.

٢٠- ئاژانسی دەنگوباسی ڕویتەر، دەیلی ئەستار، ١٩٧٥/١/١٠ ئەم هەواڵە لە لایەن دەزگا

ڕەسمییەکانی ئەمەریکاوە بە درۆ خرابەوە.

٢١- ڕاپۆرتی پایک، نووسراوی ٤٦٦

٢٢- ئاژانسی رویتەر، دەیلی ئەستار، ١٩٧٢/٧/٢٦

٢٣- بڕوانە گوتاری (میکاڤیلی، بەعس و کوردەکان) نووسینی کریس کۆچێرا، کە لە ئەفەریقای جەولانی ڕۆژی ١٩٧٣/٧/٢١ دا بڵاو کراوەتەوە.

٢٤- دەیلی ئەستار، ١٩٧٢/٨/١٣

٢٥- رویتەر، دەیلی ئەستار، ١٩٧٢/١١/٣

٢٦- دیمانە دەگەڵ نووسەردا، ناوپەردان، ١٩٧٣/٤

٢٧- بڕوانە گوتاری «لە خەبات بۆ ئوتونومییەوە تا کەڵکەڵەی سەربەخۆیی» کە لە لوموند دیپلۆماتیک ی ١٩٧٤/٤ دا بڵاو بووەتەوە.

٢٨- هەڵپەیڤینی جەنەراڵ بارزانی دەگەڵ جیم هوگلاند، واشنگتۆن پۆست، ئینتەرناشنال هیرالد تریبۆن ١٩٧٣/٦/٢٢

٢٩- «لە ئوتونومییەوە تا کەڵکەڵەی سەربەخۆیی» کریس کۆچێرا.

٣٠- هەمان سەرچاوە.

٣١- هەمان سەرچاوە، ئەم زانیارییانە لەلایەن حەبیب کەریم و دکتۆر مەحموودەوە دراون بە نووسەر، ناوپەردان، ١٩٧٣/١٠

٣٢- ڕاپۆرتی پایک، نووسراوی ٤٦٥

٣٣- بڕوانە لوموند دیپلۆماتیک، ژمارەی مانگی ١٩٧٤/٤

٣٤- بەگوێرەی گوتەی بەرپرسانی ڕەسمی، نازم گزار ویستی لە ١٩٧٤/٦/٢٠ دا دەسەڵات بگرێتە دەست و هەموو ئەو ڕێبەرانە لە نێو بەرێت کە چوو بوون بۆ فڕۆکەخانە بۆ پێشوازی حەسەن بەکر (بەکر لە سەفەرێکی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات دەهاتەوە)، نازم گزار، پاش شکستی ئەم پیلانە و پاش ئەوەی کە حەماد شەهابی وەزیری جەنگی کوشت و سەعدون غەیدانی وەزیری ناوخۆی زامدار کرد، گیرلو لە دادگایەکدا بەسەرۆکایەتی عیزەت دوری دادگایی کرا وحوکمی ئیعدام درا، بڕوانە ژمارەکانی ڕۆژانی ٢١،٢٠،١٩ / ١٩٧٣/٧ ی لوموند، گوتارێکی ئەریک ڕولو بە ناوی «وڵاتێک لە سایەی پیلاندا».

٣٥- کریس کۆچێرا «لە خەبات بۆ ئوتونومییەوە تا کەڵکەڵەی سەربەخۆیی» ئەم دیمانەیە لە مانگی ١٩٧٣/١٠ دا ئەنجام دراوە.

٣٦- هەڵپەیڤینی سەرۆک وەزیرانی ئێران دەگەڵ کریس کۆچێرا دا ١٩٧٣/٣، کە لە ژمارەی ١٩٧٤/٣/١٠ ی دەیلی ئەستاردا بڵاو بووەتەوە.

٣٧- دکتۆر مەحمود عوسمان، ناوپەردان ١٩٧٣/١٠

٣٨- لەو کەسایەتییە کوردانەوە وەرگیراوە کە لەم گفتوگۆیەدا بەشداربوون.

٣٩- سەدام حسێن، دەربارەی مەسەلەکانی ڕۆژ، الثورة، بەغدا.

٤٠- بڕوانە لوموند دیپلۆماتیک، ١٩٧٤/٤

## فەسلی چواردەیەم

## شەری سێیەمی بەعسییان

## (١٩٧٤/٣-١٩٧٥/٣)

رێبەرانی بەغدایە بەمتمانەی تەواوەوە کەوتنە دامەزراندنی دام و دەزگاکانی ناوچەی ئوتونومی ... ای چەند هەفتەیەک وایان ئواند کە مەلا مستەفا بارزانییان لەزۆربەی جەماوەری گەلی کورد داببریوە.

وەکو سالانی ١٩٦٣ و ١٩٦٩ سانسۆرێکی توندیان خستە سەر هەوال و باسی ئەو شەرە توند و تیژەی لە باکوردا گەرم بوو.

لە ١٩٧٤/٣/٢٦ دا لە کۆتایی ئەو مۆلەتە چواردە رۆژییەی کە سەدام حسێن دابووی، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش عەفواتێکی گشتی بۆ هەموو ئەو کوردانە دەرکرد کە لە زەرفی یەک مانگ دا لە باکور بگەرێنەوە.

**لە سەرەتای مانگی چواری ١٩٧٤ دا کابینەی حکومەت تازە کرایەوە و پێنج دکەسایەتی کوردی سەرە (بە بەعس) لە جێی ئەو پێنج وەزیرەی کە لە هەیڤی شوباتدا چووبوونەوە بۆ کوردستان، هێترانە ناو کابینەی حکومەت.**

١

### هاوکارانی کورد

یەکێک لە وەزیرە تازەکان عوبەیدوللا بارزانی، کوری جەنەرال بارزانی بوو. خیانەت رەگەزێکی نەگۆری مێژووی کوردە، لە ئەمیر بەدرخانەوە بیگرە کە یەزدانشیری برازای خیانەتی لێکرد تا شێخ سەعید (١٩٢٥) و سەید رەزا **(١٩٣٧)، بەلام سرۆک بە زەحمەت لەوە دەگات کە چۆن کوری قارەمانێکی نەتەوەیی دەتوانێ دژی بابی خۆی بوەستێ و بداتە پال خراپترین دژمنانی ئەو.**

سەدام حسێن بەمجۆرە بۆ ئەم بابەتە دەچێت: «وەفاداری و خۆشەویستی ولات پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە مالبات و عەشیرەتەوە نیە! لە هەلبژاردنی سیاسی دا، کور دتوانێ بە پێچەوانەی بابییەوە بێ.»[1]

لێ ئالۆزی کارەکە لەمەدایە کە عوبەیدوللا زۆر «خێلەکی» ترە لە بابی. عوبەیدوللا لە

دایکبووی ساڵی ١٩٢٧، کاتێ کە بابی رۆیی بۆ سۆڤیەت، ئەم بیست ساڵان بوو، وەختێ بابی گەڕایەوە، تەمەنی سی وهەندێک ساڵ بوو. لەبەر ئەمە کاتێ کە بارزانی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی لە عێراقدا گرتە دەست لە یەکدی بێگانە بوون، لە ساڵانی یەکەمی شەڕدا، بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٦٤ دا، عوبەیدوڵلا شان بەشانی بابی رۆڵێکی دیاری لە ئەستۆ بوو.

بەڵام بێگومان بوونی ئەم پیاوە، لە پایەو پێگەی کوڕی کەسێکی وەکو بارزانی دا، ئەم «زدبەلاحە پیرۆزە» دەستکراوە و بێ سنووردا، پێگەو پایەیەکی زۆر دژوار بووە.

لەم بارەیەوە ئەم خاڵە مایەی سەرنجە کە ئەو کوڕانەی بارزانی کە زۆر لێوەی نزیکن و هاوکاری دەکەن واتا ئیدریس و مەسعود، لە راستیدا کەسانێکن کە دەکرێ بە وەچەی دووەمی کوڕانی مەلا مستەفا بژمێردرێن. جیاوازی تەمەنیان ئەوەندە زۆرە کە دەکرێ لە جێی نەوەی بارزانی بن. بۆ ئەم دوو جەوانە کە سەرەتا سکرتێری بابیان بوون و پاشان بوون بە یاریدەدەری، هەرگیز مەسەلەی ـ 'خی بوون بەرانبەر بە دەسەڵاتی بابێک کە بە رۆیشتنی خەمیان خواردووە و بەگەڕانەوەی شاد بوون، لەگۆڕی نەبووە.

یەکێکی دی لە «هاوکارانی» ساڵی ١٩٧٤ عەزیز عەقراوییە، کە پیاوێکی تووڕە و توندە تەبیعەتە و پێشتر دەگەڵ بارزانی و باقی رێبەرانی حیزبدا تێک گیرابوو[٢]، بەڵام بە وەندە وازی هێنا بوو کە دانیشتبوو، لە ناوچە «ئازاد کراوەکانی کوردستانە دا مابووەوە، پەیوەندی کردنی ئەم ئەندامەی مەکتەبی سیاسی، کە جەنەراڵ بارزانی بە دکتاتۆریەت تاوانبار دەکات، بێگومان بۆ پروپاگەندەی بەعس سەرکەوتنێکی گەورەیە، بەعس لە دەرێی وڵاتدا ئەوپەڕی سوودی لێوەر دەگرێ.

سێ وەزیرە تازەکەی دی بریتین لە هاشم عەقراوی[٣] و دوو کەسایەتی پلە دوو، عەبدوڵلا ئیسماعیل[٤] و عەبدولسەتار تاهیر شەریف، کە حیزبی شۆڕشگێری کوردیان دامەزراند، کە رێکخراوێکی کارتۆنییە و چووە نێو «بەرەی نیشتمانی».

دامەزراندنی ئەم پێنج وەزیرە «هاوکارە» نیشانەی پچڕانی یەکجارەکی پەیوەندییەکانی نێوان بارزانی و سەدام حسێن بوو، سەدام حسێن چەند رۆژێک لەوە دواتر رایگەیاند کە « بارزانی ج چارێکی نەماوە جگە لەوەی تا زۆر درەنگ نەبووە ئاڵای سپی هەڵبکات» «هێمن»ی شاعیری کورد ئەم وەڵامە جوانەی ئەو گوتەیەی دایەوە: «لە کوێ دەتوانرێ پەڕۆی سپی بۆ دوو ملیۆن و نیو کورد پەیدا بکرێ؟»

## ٢

## شەڕی سوپایی

لە ناوەڕاستی شوباتی ١٩٧٤ دا زنجیرە شەڕە تۆپێک لە نێوان سنووری ئێران و عێراق دا ڕوویداو بووە مایەی کوشتنی دووسەد کەس، لە هەردوو... ەمەش شەڕ دەستی پێکرد.

لە ناوەڕاستی هەیڤی ٣/١٩٧٤ دا، بە چەند ڕۆژێک پاش ئەوەی کە «دەوڵەتی عێراق یەک لایەنە ئوتونومی کوردستانی» ڕاگەیاند شەڕی ڕاستەقینە، بەتایبەتی لە دەڤەری زاخۆی نزیک سنووری تورکیا[٥] دەستی پێکرد بوو.

لە ١٩٧٤/٤/٨ دا سەدام حسێن لە هەڤپەیڤینێکی ڕۆژنامەوانیدا لە بەغدایە گوتی: «ئێمە رایدەگەیەنین کەلە حاڵی حازردا چ کریار و شەڕێکی سوپایی لە گۆڕێ نییە.»

نیوەی ئەم گوتەیە دروست بوو: سوپای عێراق تا یەک مانگ هەر لە حاڵی بەرگریدا بوو: ٥-٦ ئۆردوگای سوپای عێراق لە ناو جەرگەی کوردستاندا بە تەنێ مابوونەوە، بەتایبەتی ئۆردوگای زاخۆ و ڕەواندز، کە بەتەواوی لەسەربازخانەکانی کەرکوک و موسڵ دابڕابوون.

ئەم ئۆردوگایانە بۆ ماوەی چەندین هەفتە بە هەلیکۆپتەر ئازوقە وخواردنیان بۆ دەبرا، لە هەمان کاتدا سەرکردایەتی سوپای عێراق خۆی بۆ پەلاماردانی کوردەکان ساز دەکرد و ئەم هێرش و پەلامارە بە چەند ڕۆژێک دوای قسەکانی سەدام حسێن دەستی پێکرد.

## ٣

## هێرشی بەهارە (١٩٧٤/٤)

سەرکردەکانی سوپای عێراق بە هەمان گەشبینی ئاسایی خۆیانەوە پێیان وابوو کە لەماوەی شەش مانگێک دا شەڕ تەواو دەبێ و بە خۆشحاڵییەوە ڕایاندەگەیاند کە «لە مانگی نۆدا لەگەڵاڵە نیوەڕۆژە دەکەن.»

هێرشی قوەتی زرێپۆشی عێراق بە مەبەستی شکانی ئابلۆقەی ئۆردوگای زاخۆ (کەهەزار نەفەری تێدابوو) لە ١٩٧٤/٤/١٥ دا دەست پێدەکات.

تانکەکانی عێراق بێ چ کۆسپ و تەگەرەیەک لە دەشتی موسڵ دا پێشڕەوی دەکەن، بەڵام لە دەوروبەری ١٩٧٤/٤/٢٥ دا کە دەگەنە کۆسارەکان، لە پازدە کیلۆمەتری

زاخۆدا، پێشمەرگەی کورد بە سەرکردایەتی عیسا سوار، ڕێیان لێدەگرن، لە هەمان کاتدا نۆردوگای زاخۆ بەر هاوەنان دەدەن.[٦] عێراقییەکان لە ئەنجامداو لە ٨/٥/١٩٧٤دا دوای دوو هەفتە شەڕی قورس، لە دوو قۆڵەوە کۆنترۆڵی زاخۆ دەکەن.[٧]

بەڵام سوپای عێراق لەم هێرشە بەهارەیەدا پتر سوود لە هێزی فڕۆکەوانی وەردەگرێ و «شوێنی کۆبوونەوەی» هێزی کورد و بارەگای جەنەراڵ بارزانی لە ناوپردان بە بەردەوامی دەکوتێ.

بۆ یەکەمین جار فڕۆکەی تۆپ هاوێژی تۆپولوف ٢٢، کە زیاتر پێشدەچوو لەلایەن فڕۆکەوانانی سۆڤیەتییەوە لێ بخوردرێن، لە ئاسمانی کوردستاندا بەدیار دەکەون.

لە ٢٤/٤/١٩٧٤ دا هێزی فڕۆکەوانی عێراق، شاری قەڵادزێ کە لە حاڵی ئاساییدا دە هەزار کەسێک دەبێت و ئێستا بەهۆی پەیوەندی کردنی خەڵکی بە شۆڕشەوە (بەتایبەتی خوێندکارانی زانستگەی سلێمانی) بوو بوو بە دوو بەرانبەر، بۆردومان دەکات.

هێزی پێشمەرگە کە تەنێ یەک دژشکایان هەبوو بۆ بەرگری کردن لە شار، بە نائومێدییەوە دەڕوانە بۆردومان کردنی شار لەلایەن دوو فڕۆکەی «سوخوی»یەوە. ئەنجام، چواریەکی شار وێران دەبێ و ١٣٠ کەس دەکوژرێن.[٨]

دوای دوو ڕۆژی دی، واتە لە ٢٦/٤/١٩٧٤ دا فڕۆکەی عێراقی شارۆچکەی هەڵەبجە بۆرودمان دەکات و ٤٣ کەس دەکوژرێ، لە ٢٩/٤/١٩٧٤ دا پردی گەڵاڵە بۆردومان دەکرێ و٢٩ کەس دەمرن و دەکەونە ژێر دارو پەردوی پردەکەوە.[٩]

بە درێژایی مانگی ٥و ٦/١٩٧٤ فڕۆکەکانی عێراق بەردەوام کوردستان بۆردومان دەکەن، لە هەمانکاتدا سوپای عێراق لێکدا لێکدا دەکەوێتە عەرەباندنی ناوچە گرنگەکانی ژەنگار و کەرکوک و خانەقین، گوندە کوردنشینەکان بە بلدۆزەر تەخت دەکات و کۆمیتەی «زەوی و زارە تاپۆی مۆڵکایەتی بە کوردەکان نادات و بە بەردەوامی زەوی و زاری جوتیارانی کورد بە عەرەبەکان دەدات.

## ٤

## هێرشی هاوینە (٧-٨/١٩٧٤)

لەمانگی حەوت دا وپاش چەند مانگێک لە خۆ ئامادە کردن و بانگکردنی مەوالیدی سەربازی، ئەوجا سەرکردەکانی سوپای عێراق دەست بە هێرش بۆسەر (حەسارو قەڵای) کوردستان دەکەن.

مەبەستی سوپاییانی عێراق دیارە، کە تانک و زرێپۆشان بۆ ڕەواندز و قەلادزێ دەنێرن، دەیانەوێ کوردستان بکەن بە سێ بەشەوە، چونکە پێیان وایە کە ئەگەر کوردەکان لێک دابڕێنران هەنگیتی زو دێنە شکاندن و بەرگرییان پێ ناکرێ.

ئەو هێزەی کە سوپای عێراق بۆ ئەم هێرشە کۆی کردۆتەوە زۆر سامناکە، سەدان تانکی T54 ، T55، T62 تەنێ لە شەڕی ڕەواندز دا ١١٥ تانک بەشدارن و چەندین لەشکر[١٠] بە پشتیوانی هێزی فڕۆکەوانییەوە و فڕۆکەی میک ١٧، میک ٢١، دوای ماوەیەک میک ٢٣، بە فڕۆکەوانی سۆڤیەتی یان هندییەوە، تۆپولوفی ١٧ و ٢٢.

هەڵبەتە بەرانبەر بەم هێزە گەورەیەی زرێپۆشی، کوردەکان بە کردەوە هیچیان نیە و بێ چەکن: جگە لە بازۆکای بچوک و چەند ئارپی جی ٢ و ئارپی جی ٧ چ چەکێکی دیکەیان نیە وشەڕی تانک، بە ئارپی جی ٢، لە دەشتی کراوەدا، جۆرە خۆکوژییەکە، چونکە ئارپی جی بەدەست دەبێ لە دووری سەد دوو سەد مەتری هەدەفەکەوە تەقە بکات، ئارپی جی ٧هەندێ چاکترە، دەکری بەم چەکە لە دووری ٥٠٠ مەتر یێەوە تەقە لە تانک بکرێ» بەلام بەرپرسانی شەڕگەی ڕەواندز تەنیا پێنج ئارپی جی٧یان لەلایە.

کوردەکان دەشکێن، لە ١٩٧٤/٨/١٩ دا سوپای عێراق قەلادزە دەگرێ و لە ١٩٧٤/٨/٢٢ دا ڕەواندز دەگرێ کە بەتەواوەتی چۆڵ کرابوو، تەنێ چەند خێزانێکی کۆمونیستی هاوپەیان و هاوکاری بەعس نەبێ چ کەسێکی دی لە شاردا نەمابوو.[١١]

بەلام سەرکەوتنی عێراقییەکان لە نیمچە سەرکەوتن زیاتر نیە، سوپای عێراق کە دەگاتە قەلادزە بەمە خەتی سوپایی و پەیوەندییەکانی خۆی لە سەر زەمینێکی ناهەموواردا بەرادەیەک درێژ دەکاتەوە کە دەبێت بە هەدەفێکی زۆر لەبار بۆ چالاکی و پەلاماری پێشمەرگانەی کوردان، ئەمە جگە لەوەی کە لە شەڕگەی ڕەواندز دا هێشتا چیای هەندرێن و زۆزگ هەر بەدەست کوردەوە بوون.

## ٥
## پەیوەندی کرنی خەلکی کورد بە بارزانییەوە

شەڕی کوردستان زوو بەزوو ڕەهەند و مەودایەکی ئەوتۆ بە خۆوە دەگرێ کە تەنانەت لە خراترین قۆناغی جەنگ و شەڕەکانی پێشووی بەعس دا وێنەی نەبووە!

بە پێچەوانەی بانگەشەی بەعسیانەوە کەدەڵێن بارزانی لە میللەتی کورد دابراوە، ڕێک لەم کاتانەدا کە زۆربەی جەماوەری خەلکی کورد، بەتایبەتی خوێندکاران و مامۆستایانی

زانکۆ و ئەندازیاران و پزیشکان بەکورتی هەموو خوێندەوارانی کوردی شارە گەورەکان وەک بەغدا و کەرکوک وسلێمانی و موسڵ، پەیوەندی پێوە دەکەن، ئەم خوێندەوارانە لە هەمانکاتدا کە جەنەراڵ بارزانی بە (فیودالّ) دەزانن، ئەوجاش بە چاوی قارەمانەوە سەیری دەکەن.

زانستگەی سلێمانی لە بەهاری ١٩٧٤ دا بە ٤٢٥ خوێندکارەوە لە کۆی ٦٠٠ خوێندکار لەگەڵ هەموو مامۆستاکانی و کادیرە هونەری و ئیدارییەکانی زانستگەی ئێوبراودا یەکپارچە پەیوەندی بەشۆڕشی کوردەوە دەکەن.ئەمانە هەروەڵێ دەچنە قەڵادزە و پاشان دەچن بۆ دۆڵی چۆمان.

هەموو قوتابیانی خانەی مامۆستایانی دهۆکیش بە مامۆستاکانیانەوە پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد، هەروەها ٥٠٠ قوتابی خانەی مامۆستایانی هەولێریش.

هەروەها ١٦٠٠ مامۆستا وفێرکار و ٢٥٠ دەرسکار و ٢٥٠ ئەندازیار و ١١٠ پزیشک و نزیکەی ١٠٠٠ خوێندکار (هەلی خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی)[١٢] پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کرد.

خوێنکاران، بەتایبەتی خوێنکارانی کورد لە ئەوروپا، تا روخانی یەکجارەکی شۆڕش، دەستبەرداری خوێندن دەبن و دێنەوە بۆ کوردستان و پەیوەندی بە جەنەراڵ بارزانییەوە دەکەن، بە رادەیەک دەزگای ئیداری لە دامەزراندنیان لە ناو شۆڕش دا تووشی دژواری زۆر دەبێ.

ئەم کەسانە، ئەم کورە خوێندکارانە، سەرە بەرەوت و رێبازی سیاسی جیاوازن، جا چ خەباتکاری مارکسی بن، کە ئەمانە لە راستیدا ژمارەیان کەمە، یان موحافەزەکاری بورژوا بن، چ لە بەغدا و لەندەن و میونیخ یان بوخارست بن واز لە خوێندن دەهێنن و دێن تا «بەرگری و بەرەڤانی لە خەڵکی کورد بکەن.»

زۆری پێ ناچێت کە «دەرکراوەکان» شیان دێتە سەر، ئەم دەرکراوانە بریتین لەوخێزانانەی کە مێرد، کور، برایان بوونە بە پێشمەرگەی بارزانی.

لێ ئەگەرچی ژمارەی ئەم «دەرکراوە سیاسیانە» کەم بوو لەچەند هەزار کەسێک تێنەدەپەڕین، بەلام ژمارەی ئەو پەناهەندانەی کە بەتایبەتی دوای هێرشی سوپای عێراق لە مانگەکانی ٧ و ٨ دا لەترسی شەڕ هەلاتبوون یان لە لایەن عێراقەوە لەو ناوچانەی کە «سیاسەتی عەرەباندن» دەیگرتنەوە، وەدەرنرابوون زۆر زوو لە سەدان هەزار تێدەپەڕێت.

دوای ماوەیەک، هاتنی پەنا هەندانی دامـاو بێنەوا بۆ دۆڵی چۆمـان، کـە لە ڕێگەی هامیلتن و حاجی ئۆمەران و سنووری ئێرانەوە دەگەیینە ئەوێندەر، کێشەی یەکجار دژواری بۆ سەرانی کـورد دروسـتکرد، ژێرخـانی بژاڤی کـوردێنی هەر ئەوەندە بووە کـە بتـوانێ پێداویستییە بنەڕەتییەکانی هێزی پێشمەرگە و دامودەزگای ئیداری بەڕێوە ببات.

بەمجۆرە لە کۆتایی نیسانی ١٩٧٤ دا جەنەراڵ بارزانی ناچار بوو داوا لە شا بکات کە جێی ژمارەیەک پەناهەندەی کورد لە خاکی ئێران دا بکاتەوە.

لە ئاخـرونوخـری ئەیلولی ١٩٧٤ دا نزیکەی سـەد و دەهەزار پەناهەندەی کـورد لە ئۆردوگاکانی ئێراند گیرسانەوە و باری دام و دەزگای ئیداری کوردستان تەواو سووک بوو بوو، **بەلام دیار بوو کە ئەم پەناهەندانە بۆ شا شێوەی بارمتەیان وەرگرتبوو.**

لە هەفـتێن ٩ و ١٠ / ١٩٧٤ هەمـوو ڕۆژێک ژمـارەیەک خـێـزانی پەناهەندە دەگـەنە سنوور، واتە دەگەنە حاجی ئۆمـەران ئەمـانە دەبوایە چەندین ڕۆژ و هەندێ جـاران چەندین هەفـتـە لەو دەرودەشـتـەدا کـە نزیکەی ١٧٠٠ مـەتر لەڕووی دەریاوە بەرز بوو، لە نێـو بارونەی خۆدا وەمـێنن تا بگوازرێنەوە بۆ ئەو دیوی سنوور بۆ یەکـێک لە ئۆوردوگـاکـانی شێرو خورشیدی سوور.

زۆربەی ئەمانە، خەڵکی ئەو گوندانە بوون کە گوندەکانیـان بە تۆپ باران یان بۆردومانی فرۆکە وێران بوو بوون، ئەوانی دی خەڵـکی شارۆچکەی وەک ڕەواندز و ئاکرێ و دهۆک و ڕانیە بوون، کەتاک و تەرا خەڵکیان تێدا مابوون.

ئەمانە دوای ئەوەی ماوەیەک لە نێو ئەشکەوت و دارسـتـانانی کۆسـارەکانی دەوروبەردا خۆیان حەشـار دابوو،کـە زانی بوویان لە ئێـراندا ئۆردوگـا کـراوەتەوە ئیدی بەرەو سـنوور وەڕێ کەوتبوون، لە ترسی فـرۆکەی عـێـراقی بە شـەو هاتبوون، بە ختەوەر دەبوون ئەگەر قاترێکیان چنگ کەوتبا و بارونە یان منداڵەکانیـان لێ بار بکردایە، ئەوانەی کە لە گوندە نزیکەکانەوە هاتبوون دە ڕۆژێک بەڕێوە بوو بوون، بەلام ئەوانی دی، بەتایبەتی ئەوانەی لە باکـوری ڕۆژاوای کـوردسـتـانەوە واتە لە بادینـانەوە دەهاتن سێ مـانگان بەڕێوە دەبوون تا بگەنە حاجی ئۆمەران.

٦

## هێرشی پایزە (٩-١٠/١٩٧٤)

وێڕای سەرکەوتنەکانی قەڵادزە (٨/١٩) و ڕەواندز (٨/٢٢) دەرکەوت کە سەدام حسێن کەلەکاتی هێرشە بەهارەکەیاندا، بەڵێنی بەسەرانی سوپای عێراق دابوو، لە ٩/١٥ دا نیوەڕۆژە لە گەڵاڵە ناکات.

لەمپەرێکی یەکجار بە قوەت ڕێگەی گەیشتنە بارەگای بارزانی لە ناوپردان و گەڵاڵە و حاجی ئۆمەران، گرتبوو، ئەم لەمپەرە سروشتییە لە نزیکی ڕەواندز بوو کە بریتی بوو لە چیاکانی زۆزک (٢٢٠٠ م) و هەندرێن (٢٨٧٥م) کەلە گەرووی جادەی هەمیلتۆن دا بوو، ڕەگی ژیانی شۆڕشی کوردی پێک دێنا و بارەگای بارزانی بە سنووری ئێرانەوە دەبەست، پێشتر و لە ساڵی ١٩٦٦ دا، گەورەترین شەڕی مێژوویی شەڕەکانی کوردستان لە چیای هەندرێن دا کرابوو (بڕوانە فەسڵی دەیەم لە هەمان بەش).

سەرکردایەتی سوپای عێراق لە هەوەڵی ئەیلولی ١٩٧٤ دا کەدەیبینی هەمووی چەند مانگێک ماوە بۆ زستان و هەرکە زستان بێت ئیدی ڕێگاوبان دەگیرێ و هێزی زرێپۆش لە قوڕ دەچەقێ و کرداری هێزی فڕۆکەوانیش تا ڕادەیەکی زۆر کەم دەبێتەوە و کاریگەری نامێنێ، دەستی دایە هێرشێک کە بە تەمابوو هێرشی یەکجارەکی و چارەنووس ساز بێت. لەم هێرشەدا ٣٠٠ تانک و ١٢ فەوج و هوویتزر و یەک فەوجی تۆپخانەی ئۆتۆماتیکی پانهارد و ٣٠ هەزار سەربازی پیادە و هێزی هەوایی بەشدار بوون.[١٣]

زنجیرە شەڕێکی دوا بەدوای یەک لەگەرووی عومەر ئاغا و بەرزاییەکانی زنجیرە چیای زۆزکدا ڕووی دا، ئەمە تاقە شەرگەیەک بوو کە کەمی نشێو بوو و ڕێگای بە سوپای عێراق دەدا بتوانی هێزی پیادە، بخاتە شەڕەوە و ئومێدی سەرکەوتنی هەبێ.

لە ١٩٧٤/٩/١٠ دا یەکەمین شەڕ لەم شەرگەیەدا ڕوویدا، عێراقییەکان ١٣٠ تانکیان هێنابووە ئەم شەڕە، دوای ئەمە لە ٩/١٢ و ئەوجا لە٩/١٤ چەند شەڕێکی دی ڕوویدا، پاشان لە شەوانی ٢٧ و١٩٧٤/٩/٢٨ دا شەڕێکی «مێژوویی» ڕویدا، کە مەسعود بارزانی دەربارەی ئەو شەڕە دەڵی: «بە درێژایی شەو سەنگەرەکانی ئێمە لە ژێر تۆپبارانی توند و بۆردومانی قورسی هێزی فڕۆکەوانیدا بوون، لێ هێرشی ڕاستی لە سەعات سێی سپێدەدا دەستی پێکرد، سەرکردایەتی باڵای سوپای عێراق ج درێغییەکی لە بەکارهێنانی چەک دا نەکردبوو، دەستی بە تەقەمەنییەوە نەگرتبوو، یەک لەشکری تەواوی پیادە تیپی

٥ و ٢٩ی «هێزی تایبەتی» بە پشتیوانی دەیان تانک بەشداری شەڕەکە بوون، هێزەکانی ئێمە کە لە چیادا سەنگەریان گرتبوو لەوێندەرەوە تەقەیان دەکرد.

«لەبەرانبەر ئەم هێرشە گەورەیەدا، هێزەکانی ئێمە شڵەژان.لێ ئێمە تۆزێک بەر لەسەعات پێنجی سپێدە، پێش ئەوەی کە هێزێن عێراق فریا بکەون سەنگەرەکانی خۆیان قایم بکەن، دەستمان بە هێرشی پێچەوانە کرد.»

مەسعود بارزانی لەسەر قسەکانی دەڕوات ودەڵێ: «ئێستا هەردوولامان تەقەمەنیمان تەواو بوو بوو، بەناڕنجۆک کەوتینە شەڕ، پاشانیش دەمانویست بە چەکی سپی بکەوینە شەڕی دەستەو یەخە! لەم کاتەدا بوو کەهەڵاتن و بەلای کەمەوە ٥٠٠ کوژراو ٥ تانکیان لەمەیدانی شەڕدا بەجی هێشت، لە هێزی پێشمەرگەش تەنێ ٨ کەس شەهید و ٢٢ کەس بریندار بوون.»

مەسعود لە غیابی ئیدریسی برایدا، (کە پێدەچوو بۆ ئێران یان دوورتر سەفەری کردبێ)، راستەوخۆ سەرکردایەتی شەڕەکانی کەوتبووە ئەستۆ. لە کۆتایی قسەکانیدا دەڵێ :« ئەمە گەورەترین شکستی سوپای عێراقە.»

ئەم شەڕە لە دوو روانگەوە مێژوویییە، چونکە دوای چەند رۆژێک لەوەدوا سوپای عێراق، سەنگەری کوردەکانی تەفروتونا کرد و لە ٣/ ١٠/ ١٩٧٤ دا چیای زۆزکی گرت، هەڵبەتە دۆڵی چۆمان و ناوپردان نەیدەکردە هەموو کوردستان. بەڵام ئەم هەواڵە بۆ کوردەکان زۆر ناخۆش و کوشندە بوو.

## ٧

## دامەزراندنی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی

دەوڵەتی بەغدایە لەدوا هەفتەکانی هێرشی پایزەی سوپای عێراقی دا، دام و دەزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دامەزراند، لە ٢٤/ ٩/ ١٩٧٤ دا هاشم عەقراوی کرا بەسەرۆکی «ئەنجومەنی جێبەجێ کردن» ی ناوچەی ئۆتۆنۆمی - ئەندامەکانی دیکەی ئەنجومەن هێشتا دانەمەزرابوون لە ٥/ ١٠/ ١٩٧٤ دا دەوڵەت لەمەراسیمێکی رەسمی دا یەکەمین کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی سازدا.

دەوڵەت هەموو کەسانێکی بۆ ئەم بۆنەیە وەگەڕ خستبوو، نزیکەی سەد رۆژنامەوانی بێگانەی بۆ ئەم بۆنەیە بانگهێشت کردبوو، عوبەیدوڵڵا بارزانی بە رۆژنامەوانانی گوت کە « جگە لە تاقمە کۆنەپەرست و فیوداڵێک ج کەسی دی لە چیادا نییە» لێ دەگەڵ هەموو

ئەمەشدا رۆژنامەوانە بێگانەکان گوتیان، وێرای دروشمی رازاوە و پڕ ستایش بۆ سەدام حوسێن و سەرەک ئەلبەکر و مەحکوم کردنی ئێران و ئیمپریالیزم و زایۆنیزم بەسەر دەرو دیوارانەوە، جەماوەری خەڵک زۆر سارد و سڕ بوون لە «ئاهەنگی شادومانی»دا بەشداریپان نەبووە.(١٥) کوردەکان نەک هەڵیان نەبوو، چونکە ئەم ئاهەنگ و نمایشەی هەولێر چارەنووسی ئەوانی دیاری نەدەکرد، بەڵکو چارەنووس و قەدەری کورد بەندبوو بەو شەڕانەوە کە لە هەمان کاتدا لە چیاو کۆسارێن کوردستاندا گەرم بوو، هەموو شەوێک و لە هەموو ماڵێک دا خەڵکی هەوڵیان دەدا وێرای خشەخشی توندی رادیۆیی، گوێیان لە بەرنامەکانی «رادیۆی دەنگی کوردستان» بێ.

## ٨

## دوا «رۆژێن خۆشی» شۆڕشی جەنەراڵ بارزانی

پایزی ساڵی ١٩٧٤ دەکاتە لوتکەی دەسەڵاتی جەنەراڵ بارزانی دەسەڵاتی بارزانی بەسەر پانتاییەکی ٣٥٠٠٠ هەزرا کیلۆمەتری چوار گۆشە ویەک ملیۆن دانیشتواندا (جگە لە پەنابەرەکان» دەسەڵاتێکی بێ هەڤرک و چەندو چونە. گوتەی عەلی عەبدڵلا «وەزیری دارایی» دروستە کە بە کۆمەڵە کەسێکی دەوروبەری و لەژێر درەختێکدا خڕ بوونەوە بە تەعلیقەوە لە وەزارتخانەکەی خۆیەتی دەڵێ: «ئەمە ئۆتۆنۆمی نییە، ئەمە سەربەخۆییە!»

وەزارەتخانەکەی بریتی بوو لە چەند کولبەیەکی لە دارو چینکۆ دروست کراو لە کەناری زەلکاوێک دا بوو، لە چەند سەد مەتری گوندی دەربەند دروست کرابوو).

ئەمە قسەیە دروستە، بەڵام ناوبەناو کە دەنگی دوری تۆپ لە قوڵی رەواندزەوە دەگاتە گوێ، وەک بڵێی بیری بخرێتەوە کە سنوور زۆر دوور نییە، بەڵام کوردستان لە حاڵەتی سەربەخۆییدا دەژی.

### کابینەی دەوڵەتی کوردستان

سەرانی کورد بە بێ دەنگی و بێ ئەوەی بیکەن بە هەڵلا حکومەتێکیان لە ٩ وەزارتخانە دروست کردوەو کاروباری خۆیانی پێ بەرێوەدەبەن، لە چاوپێکەوتنێیان دەگەڵ رۆژنامەوانانی بێگانەدا، ئەمانە ناویان وەزارەتخانە نییە، بەڵکو ئیدارەن و لە لایەن (بەڕێوەبەرانەوە) دەبرێن بەڕێوە، بەڵام کوردەکان لە نێوخۆیاندا لە هەموو پەیوەندییەکانیاندا دەگەڵ ئەم دام و دەزگایانەدا) تەنیا وشەی «وەزیر» و «وەزارەت»یان بەکار دەهێنا.

سامی (محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان) جگەلەوەی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەم حکومەتەی کوردە، سەرۆکی حکومەتەکشە.

وەزیرەکانی دی ئەمانەن: دکتۆر مەحمود عوسمان (وەزیری تەندروستی،کە کاروباری دەرێش دەکات) عەلی عەبدوڵلا (دارایی)، دارا تۆفیق (راگەیاندن وپەروەردە) ساڵح یوسفی (داد) نوری شاوەیس (کاروباری گشتی)، موحسین دزەیی (ناوخۆ) وسەدیق ئەمین (کاروباری پەنابەران).

وەزارەتی بەرگری کە پۆستێکی گرنگە لەدەست یەک کەسدا نییە، بەڵکو لەلایەن (مەکتەبێکی عەسکەرییەوە) بەڕێوە دەبرێ کە عەبدولوەهاب ئەتروشی بەپرسی مەکتەبەکەیە، لەگەڵ ئیدریس بارزانی دا.

ئەو بودجەیەی کە بۆ حکومەتی کوردستان.تەرخان کراوە بودجەیەکی بەرچاوییە، هەژدە ملیۆن دیناری (عێراقی) (واتە ٥٥ ملیۆن دۆلار) بۆ ماوەی شەش مانگان (٤-٩/ ١٩٧٤) لە حەقیقەتدا بەرانبەر بەو بودجە ساڵانەیە کەبۆ وەزارەتی کاروباری باکوری عێراق تەرخان کراوە.(١٦)

کارەکانی دەزگای ئیداری کورد، لەم دوا رۆژە خۆشانەی کوردستانی ئازادا. زۆر سەرنجی بینەر رادەکێشێت: «وەزارەتخانەکانی» کوردستان بە درێژایی جادەی هامیلتۆن، لە حاجی ئۆمەرانەوە تا ناوپردان، یەک بەدوای یەکدا هاتوون.

حاجی ئۆمەران کە شارۆچکەیەکە، دوا گوندی عێراقی سەر سنووری عێراق و ئێرانە، بووە بە «پایتەختی» کوردستان، زۆربەی سەرانی رژێم لێرەدا نیشتەجێن، ئەمانە لە خانوی دێهاتیانە و لەپەنای ئەو دوکانۆچکەدارانەدا دەژیان کە پڕ بون لە کاڵای ئێرانی.

جەنەراڵ بارزانی، کە خێزانەکەی، واتە ژن و منداڵە بچوکەکانی بۆ ئێران ناردووە، بە خۆی لە شاخە بەرزەکانی دیار حاجی ئۆمەران دادەژی، بێگومان لەبەر ئەوەی لە سنووری ئێران نزیکە، لە هێرش و پەلاماری رۆژانەی فڕۆکەی عێراقی پارێزراوە، چەند سەد مەترێک لە خوارترەوە بارەگای مەسعودو ئیدریس بور: ئەم بارەگایانە لە خانووی تازە بابەتی جوانی مۆدێ هاوچەرخدان، کە «مەڵبەندی گەشتوگوزاری» عێراق لە ماوەی ئاگربڕی ساڵانی ١٩٧٠ - ١٩٧٤ دا دروستی کردبوون، لەتەنیشت بارەگاکانی ئەوانەوە، بارەگای حەوانەوەی پێشمەرگە بور، کە چەکی فڕۆکە شکێنی باشی بە سەرەوە بور و پەناگای باشی هەبوو.

ئەم تۆیە فرۆکە شکێنانە کە بێگومان تازەترین چەکی کوردستان بوون، ئێوارەی رۆژی ١٩٧٥/٣/٦ جارێکی دی بۆ ئێران دەبرینەوە.

هەر لەو نزیکانەوە لە نێو دۆڵەکەدا خێوەتەکانی وەزارەتی پەروەردە و فێر کردن دەبینرێن، ئەم وەزارەتە باشترین و پرکارترین دەزگای ئیداری حکومەتی کوردستانە. ئەم دەزگایە کە پەناگەی ئەو قوتابی و خوێندکارانەیە کەپەیوەندییان بە شۆرشی جەنەراڵ بارزانییەوە کردووە، هەرچەندە لە وەزع و حاڵێکی وەکو پشێوی هاوینەدایە، بەڵام زۆر بە جیدی کار دەکات، ئیمکانات هەمیشە کەمە، ئەو مامۆستایانەی جارانی زانکۆ یان ئەو کەسانەی لە وەزارەتخانەکاندا بەرپرس و بەرێوەبەربوون، ئێستا لە ژێر خێوەتەکاندا دەژین، هەموو کەلوپەلی نووسینگەکانیان بریتییە لە مێزێکی ئاسن و یەکدوو کورسی و چەند فایلێکی ئەوراق.

بەڵام دارا تۆفیق، وەزیری راگەیاندن رۆژنامەنووسێکی کارامەیە (لە ساڵی ١٩٧٠-١٩٧٤ دا سەرنووسەری رۆژنامەی التاخی بوو).

بۆ یەکەمجار جەنەراڵ بارزانی دەبێ بە خاوەنی دەزگایەکی چاپەمەنی زۆر بەکارو چالاک ئەم دەزگایە بەشێکی تایبەت بە وەرگێرانی هەبوو، کە دەرفەتی ئەوەی بۆ دەرەخساند چاو بەرۆژنامە بیانییەکاندا بخشێنێ، هەروەها بەشێکی تایبەت بە بۆڵتەنی (انصات) هەبوو کەهەواڵی رادیۆکانی جیهانی دەگرت، دەستەیەکی زۆر گرنگی نووسەرانی هەبوو بۆ رێکخستن و بەرێوە بردنی بەرنامەکانی رادیۆی دەنگی کوردستان بە زمانانی عەرەبی و کوردی. هەروەها بۆ نووسین و بەرێوەبردنی بلاڤۆکێن هەمە جۆری وەزارەتخانەکە.

دەزگای پەروەردەش یەکجار چالاکە، سەرانی کورد سوورن لەسەر ئەوەی کارێکی وەها بکەن کە ئەو کیژ و کورە خوێندکارانەی زانکۆ کە پەیوەندییان بە شۆرشەوە کردبوو لە «کوردستانی ئازاد کراودا» درێژە بە خوێندنی خۆ بدەن.

«نووسینگەی سەرەک وەزیر» چەند کیلۆمەترێک لە خوارتربوو. «نووسینگەی سەرەک وەزیر» بریتییە لە چەند خانوویەکی گڵی قەدپاڵەکانی دەوروبەری دەربەند، شوێنی کاری (وەزیرانی) دارایی و دادە.

بەڵام لە کۆتایی داوێنی حاجی ئۆمەرانەوە، تۆزێک هێوەی چوار ریانی گەلاڵە، «مەکتەبی عەسکەری» و «مەکتەبی سیاسی» بەرچاو دەکەون، کە هەمیشە لەبەر هێرش

ویەلاماری ئاسمانیدان.

بێگومان سەرکردایەتی سوپای عێراق، ئاگای لە هەموو وردو درشتێکی هەلکەوتی ئەم شوێنەیە، ژمارەی جاسوسان زۆرە، ئەمە جگە لەوەی بەرپرسانی عێراقی بەر لە تێکچوونی نێوانیان دەگەل کوردا، چەندین جار هاتوونەتە ناو پردان ؛ حاجی ئومەران. هەرچەندە کوردەکان کەمتر هۆکاری خۆپاراستنیان لەبەر.ست دابوو، لێ هێزی هەوایی عێراق هەرگیز ناتوانێ ئەم بنکەی بەرەڤانییەی کوردان ویران بکات، توپولوفی ۲۲ی بۆمباهاوێژ کە لە بە. .کی زۆرەوە ئەللا خوایی، بۆمباکانیان هەلدەرشت لە چیاکاندا دەکەوتنەوە و فرۆکەکانی دیکەش بەدەگمەن نیشانەیان دەپێکا، لەم بەینەدا تەنێ پردەکانی جادەی هامیلتۆن جار جار بەر دەکەوتن.

لەمانگی ئەیلولی ۱۹۷٤ دا دام و دەزگاکانی کورد بەچاکی کاری خۆیان دەکرد، رۆژنامەنووسێک کە لەوسەروبەندەدا سەری ناوچەکەی داوە، شایەتی بۆ ئەو حالەتە دەدات، ئەم رۆژنامەنووسە لەتاران دابەزی بوو، لە تاراندا، شەفیق قەزازی نوێنەری کوردان، پەیوەندی پێوە کرد و بۆ ورمێی برد و لەوێندەر بە مەئموورانی ساواکی سپارد.

پاش ئەوەی کە بە تاکسییەک گەییە سنووری عێراق، دەزگای پاراستنی کوردەکان وەریان گرت و بۆ قەسری سەلامیان برد، ئەم قەسرە هەرچەندە بەناو گەورە بوو، بەلام بریتی بوو لەخانوویەکی پەرپووت و هیچی دی.

دیدارەکان بە زوویی دەستیان پێکرد، قەرارەکان زۆر بە وردی رەچاو کران، لە زەرفی چەند رۆژێک دا «رێگەیەکی زۆرە بردرا، رۆژنامەوانی گۆرین پاش دیدار دەگەل زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی (سامی، دکتۆر مەحمود عوسمان، حەبیب کەریم و ... هتد) و سێ بارزانی (جەنەرال و ئیدریس و مەسعود) و دیدەنییەکی زیندان و نەخۆشخانە و سەردانی شەرگەی رەواندز. بەو باوەڕەوە لە کوردستان گەڕایەوە کە شەری کوردستان وێڕای نەبوونی چەکی قورس و چەکی دژە تانک، سەد سال درێژە دەکێشێت.

## ۹

## «روی دووەمی دراوەکە»

لێ دۆلی چۆمان و رێگەی حاجی ئۆمەران بۆ ناوپردان لە راستیدا «شانزالیزە»ی کوردستان بوو، وەزع و رەوشی ئەم ناوچە بچووکە، لە وەزعی کوردستانی ئازاد کراو جیاترەو ئەوەندە رەنگدانەوەی وەزع و واقیعی کوردستانی ئازاد کراو نەبوو.

## بیافرایەکی دی!

لە پاییزی ساڵی ١٩٧٤ داو بەتایبەتی لە بادیناندا وەزع زۆر باش نەبوو. ئەم ناوچەیە کە لە زاخۆی نزیکی سنووری سووریا وتورکیاوە تا بارزان دەگرێتەوە. لە هەیقی هەشت بەملاوە گەمارۆی ئابووری تەواوی لەسەر بوو. لە باشوورەوە، سوپای عێراق نەیدەهێشت ئازووقە و خواردەمەنی بۆ باکور بڕوات.

لە باکورەوە، سوپای تورکیا سنوری داخستبوو و شەوانیش پلاجکتوری لەو ڕێبازگانەدا دانابوو کە قاچاغچیانی پێدا ڕەت دەبوون.

ئەو تەنیا ڕێگەیەکی کە دۆڵی چۆمانی، لە مێرگەسوورەوە بە بادینانەوە دەبەستەوە، هەمیشە لە ژێر توپبارانی تۆپخانەی عێراقی دابوو، چ سوودێکی لێوەر نەدەگیرا.

لە مانگی ئابی ١٩٧٤ دا سەرانی کورد کە پەیان بە خراپی باروذۆخەکە برد، دەستووری دروستکردنی ڕێگەیەکی دیکەیاندا، ئەم ڕێگەیە کە خۆی لە خۆیدا شاکارێکی هونەرییە و لە زەرفی چەند هەفتەیەک دا بە بلدۆزەر شاخیان بڕی و ڕێبوار دەیتوانی بە ئاسانی بگاتە بادینان، دیارە ئەم ڕێگەیە لە ملەیەکەوە دەڕۆیی کە لە سەنگەرکانی عێراقەوە دیار بوو، لەبەر بۆردومانی فڕۆکە، تەنیا بەشەو هاتووچۆی لێوە دەکرا.

بەڵام بەرپرسانی کورد لە جیاتی ئەوەی ئازوقەی پێویست بە ئوتومبیلان بگەیەننە بادینان، خەڵکیان بۆ ئەم مەبەستە ڕاسپارد، چونکە پێشتر لۆرییەکان لەلایەن سوپاییانەوە گیرابوون.

لە کۆتایی ئەیلولی ١٩٧٤ دا وەزع و حاڵەکە زۆر خراپ بوو، لەشارۆچکەیەکی وەکو سەرسەنگ دا نرخی خۆراک و ئازوقە لە ڕادەبەدەر بەرز بووەوە، شەکر لە سەدا سەد (بەبەراورد لەگەڵ مانگی سێ دا) چای ٢٠٠٪ برنج ٤٠٠٪ ئارد ٥٠٠٪ بەرز بوو بووەوە خۆ ئارد و برنج زۆر زەحمەت دەست دەکەوتن.

نرخی نەوت، کە دێهاتیانی کورد بۆ چێشت لێنان بەکاریان دێنا بوو بە هەشت بەرانبەری جاران، نرخی بەنزین شەش قات زیادی کرد.

مەلەک چەکۆی سەرۆکی «کۆمیتەی باڵای مەسیحیانی کوردستان» دەیگوت: «نرخی بازار بە جۆرێ بەرز دەبێتەوە کە لەوە ناچێت کۆمەکی پێویست بۆ چەند مانگی ئایندە دابین بکرێ» لەسەری دەڕوییی: «ماوەیەکی دی پێ ناچێت نیدی پارەش دادنادات. تاقە چارەسەر ئەوەیە کە تا دەکرێ ئازوقە و خۆراکی زیاتر بۆ ئەم ناوچەیە بهێنرێ.»[١٨]

کـەمی بەنزین هێندەی دی وەزعـەکـەی خـرا دەکـرد. سـەرانی کـورد بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی خەڵکی بادینان و بەو مەبەستەی کەس لە خۆیان نەڕەنجێنن ونەتۆرێنن، ڕێگەیان بە قاچاغچیان دا ئەو کارە بکەن و ئەوانیش بە پێی یاساو حوکمی بازاری ڕەش پاوەیەکی چاکیان لە بەرکی خۆ دەنا.

ئەحـمـەد شـالی «پارێزگـار»ی کـوردی بادینان، کـە نوێنەری دەسـەڵاتی «ناوخـۆی» حکومەتی کوردی بادینان بوو، چ شتێکی دە ئیختیاردا نەبوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو وەزعـە ناڵەبارە، تەنانەت زۆر بە زەحـمـەت ئەوەندەی بەنزین بە دەست دەکـەوت تا لە جێیـەکـەوە بۆ جێیـەکی دی بڕوات. مـانگانە دوو دیناری دەدایە هەر پەناهەندەیەکی ناونوسراو (یانی ٣٠ فرانکی فەرەنسی) ژمارەی ئەم پەناهەندانە نزیکەی ٢٠ هەزار کەس بوون، جگە لەو خێزانانەی کە پیاوەکانیان پێشمەرگە بوون، ئەوانی دی بۆ شۆڕش کاریان دەکرد، ژمارەی ئەم خێزانانە نزیکەی چوار هەزار خێزانێک بوون.

لێ ئەو دانی بەوە دا دەنا کە ژمارەی ڕاستەقینەی پەناهەندەکان نازانێ و بە مەزەندەی ئەو سەد تا سەد و پەنجا هەزار کەسێک دەبوون.

شـارۆچکەیەکی وەکـو سـەرسەنگ کە بنکەیەکی گەشتـەوانی بە نێوبانگە و ژمـارەی دانیشتوانی لە حاڵی ئاساییدا ٢-٣ هەزار کەس بوو، دوو هەزار خێزانێکی پەناهەندەی دهۆکی وزاخۆیی وئاکرەیی داڵدە دابوو.

ژمـارەیەکی دیکەی پەنابەران لە گـوندە دیان نشـین ومـوسـوڵمـان نشـینەکـانی دۆڵی سەرسەنگ و ئامێدی دا بڵاوبوو بوونەوە.

بەڵام جگە لەم پەناهەندە سـەرژمـێـرکـراونە، لە دەڤـەری بادیناندا خـەڵکانی دیکەش هەبوون کە لە نێو دارو درەختان، گوێ گۆلاو، پەنا شاخ و ئەشکەوتاندا دەژیان.

ژمـارەیەکی زۆر لە پەنابەران لە ترسی بۆردومـانی فـڕۆکـەی عـێـراقی بەرەو باکـور ڕۆیشـتـبـوون، تەواو لەسنووری تورکـیـا نزیک بوو بوونەوە بەو هـیـوایەی ئەم نزیکییە لە هێرشی هێزی فڕۆکەوانی عێراقی بیانپارێزێ.

جگە لەم پەنابەرانە، هەندێ خێزانیش هەبوون کە گیرۆدەی وەزع و حاڵێکی ناهەموار بوو بوون، ئەمانە ئەو خێزانانە بوون کە پیاوەکانیان یان یەکێک لە کوڕەکانیان بەر لە دەست پێکردنەوەی شەڕ لە بەغدایە یان لە کەرکوک کاریان دەکرد ومانگانە پارەیان بۆ خێزانەکانیان دەناردەوە. هەندێک لەو خەڵکانە خۆیان گەیاندبووە (کوردستانی ئازاد

کراو) چووبوونە ریزی شۆڕشەوە، بەڵام ژمارەیەکی زۆریان هێشتا هەر لە بەغدایە مابوونەوە و لە ژن و منداڵەکانیان دابڕا بوون و وەزع و حاڵی ژن و منداڵەکانیان زۆر ناهەموار بوو.

خێزانی ئەو کادیرە کۆمونیستانەی کە بە خۆیان بۆ باشور هەڵاتبوون، خێزانەکانیان لە باکور بە جێهێشتبوو، وەزع و حاڵیان باش نەبوو!

ئەحمەد شالی لە مانگی ١٩٧٤/٨ دا ٣٣ هەزار دیناری (دەکاتە سەد هەزار دۆلارێک) وەکو یارمەتی بەسەر پەنابەرانی دەڤەری بادینان دا دابەش کرد، ئەم پارەیە کە لە چاو بودجەی کوردستان دا پارەیەکی زۆر کەمە، ئەوپەڕی خەمساردی و فەرامۆشکاری سەرانی کورد لەم بوارە دا نیشان دەدات.

ئەسعەد خۆشەوی، کە یەکێک بوو لەیاوەرانی جەنەراڵ بارزانی بۆ روسیە و باوەڕ پێکراوی بارزانی بوو، لەساڵی ١٩٦٣ بەملاوە دەسەڵاتداری دەڤەرەکە بوو، بەڵام وەکو دەیگوت هیچ شتێکی دە ئیختیار دا نەبوو، بێ تۆپخانە، بێ تۆپی فڕۆکە شکێن، بێ چەکی تانک شکێن، جگە لە چەند بازوکایەکی ٤ و ٥ چ شتێکی دی نەبوو، چ کارێکی لە دەست نەدەهات تەنێ ئەوە نەبێ چاوەنۆڕ بێ، بەو ئومێدەی کە هێزی پێشمەرگە سەنگەرێت خۆ بپارێزن.

لە سەرەتای پایزی ١٩٧٤ دا وەزع و حاڵێکی (کافکایی) باڵی بەسەر کوردستاندا کێشابوو.

سەرکردەیەکی عەسکەری و پارتیزگارێک لە دیهێکی سەیردا، ئەسعەد خۆشەوی لە ئەشکەوتێکدا و نزیکی بامەڕنی، ئەحمەد شالی لە خێوەتێکدا و لە ژێر درەختێک دا هەردوکیان بەناو گەورەو پڕ دەسەڵات، بەڵام بە کردەوە هیچیان لەبەر دەست دا نەبوو و داماو.

رێگەکان لەبەر نەبوونی بەنزین لە لایەک و لە ترسی بۆردومانی فڕۆکە لەلایەکی دی چۆڵ و هۆڵ بوون وکەس هاتوچۆی نەدەکرد، شەبەنگ و تاپۆی قات وقڕی و برسێتی هەمولایەکی گرتبوو.

وێڕای هەموو ئەمانەش دەسەڵاتی بارزانی لە بادیناندا دەسەڵاتی بێ هەڤڕەک و بێ چەند وچونە، هەر کەسێک زاتی هەیە با بچێت بۆ ئەوێندەر وبەخۆی دروستی یان نادروستی ئەم قسەیە تاقیب بکات.

دوای چەند هەفتـەیەک، لە نیـوەی دووەمی هەیڤی یازدەدا، یەکـەمین بەفـرباری و ڕێگەکەی نێوان بادینان و دۆڵی چۆمان گیرا.

چارە وچارەنووسی ئەم دەیان هەزار مشـەخت و ئاوارانەی کـە زۆربەیان لەم زسـتـانە تووشەی سالی ١٩٧٤-١٩٧٥ ی کوردستان تەنیا ئاسمانیان هەبوو بە خۆیانیدا بدەن چ بوو؟ هیچ سـەرکێش و خـەتەرخوازێک «مغامر» تا ئێستا ئەم چیرۆکـەی نەگێڕاوەتەوە. یەکێک لە بینەرانی ئەم ڕووداوانە دکتۆر ئالکسـاندەری پزیشکی هۆڵەندی بوو، کە هەرگیز نەیتوانی ئەزموونەکانی خۆی بگێڕێتەوە: دوای شکسـتی شۆڕشی کورد کاربەدەسـتانی عێراقی گرتیان و بەو تۆمەتەی کە بەرەچەڵەک جولەکە بوو لە سێدارەیان دا.

دیار نییە بۆچی جەنەراڵ بارزانی ئەم ٥٠٠٠٠٠ و بە ئاوارەکانەوە ٧٠٠/٠٠٠ کەسەی خەڵکی بادینانی دایە دەست قەدەر و چارەنووسی خۆیانەوە، بەتایبەتی کە ئەو بەخۆی بادینانی بوو، هەر لە بادینانەوە بوو کە لە سالی ١٩٦٢ دا خەباتی سەرکەوتوانەی خۆی دەست پێکرد؟

ڕاستە لە مانگی ئەیلولی ١٩٧٤دا کوردەکان لە شەڕگەی ڕەواندز دا کە دوای چەند هەفتەیەک تێک شکا، گیرۆدە و سەرقاڵی شەڕێکی زۆر سەخت بوون. بەڵام بێگومان گرفت و کێشەی ڕاستەقینە لە ناوخودی شۆڕشی کوردا بوو.

**بێ توانایی شۆڕشی کورد:**

ئەگەرچی ئەوسا دەست نیشان کردنی ڕەوتی ڕووداوەکان ئاسان نەبوو، لێ ئاشکرا بوو کە عەیب لە خودی بونیادی شۆڕشی کوردا بوو، هەر هەموو بڕیارەکان لەسەرێ را و لەلایەن جەنەراڵ بارزانییەوە دەدران.

جەنەراڵ بارزانی کە پیرو هەفتا ساڵە بوو، لە ترسی ئەوەی نەوەک هەوڵێکی دیکە بۆ تیرۆر کردنی بدرێ ئەوەندە نەدەهاتە نێو خەڵکی و لەبارەگاکەی خۆی لە حاجی ئۆمەران نەدەهاتە دەرێ، مەگەر سەفەری... تارانی لەبەر بوایە!

ئەو بە خۆی دەیگوت: « من پیرم، ئیدی بۆ جەبهە ناڕۆم، لێرە دەمێنم و لەسەر ئەم کورسییە، کاتی خۆم بە خوێندنەوە و ناردنی بروسکان دەقەتێنم.»[٢٠]

بارزانی کە لەواقیع و ڕووداوان دا بڕا بوو، کەناڵی زانیارییەکانی خەڵکانێکی زۆر کەم بوون کە دەستیان دەگەییە ئەو یان نزیکانی ئەو. ئیدریس و مەسعود، کە کاروباری سوپایی و ئاسایش هەموو وەختی گرتبوون. سامی، زۆربەی کات لە سەفەری هەندەران

بوو، دکتۆر مەحمود عوسمان، کاتی خۆی لە نێوان پزیشکی و کاروباری مەکتەبی سیاسیدا، دابەش کردبوو، حەبیب کەریم کە هەندێ لەوان کەمتر سەرقاڵ بوو، وەختی خۆی بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی سکرتێری حیزب تەرخان دەکرد.

جگە لەوانە ئەندامەکانی دیکەی مەکتەبی سیاسی بە دەگمەن بارزانی یان دەبینی، خۆ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لەوانیش کەمتر.

پارتی ئیدی وەکو حزبێکی سیاسی نەمابوو، دەزگایەکی ئیداری بوو کە وەکو هەر دەزگایەکی ئیداری ئاسایی کاری دەکرد، دەبوا ئەو بڕیارانە جێبەجێ بکات کەلەسەرێ را دەهاتن. ڕێکخراوەکانی قوتابیان و لاوانی کوردیش، تەنیا ڕێکخراوی ڕواڵەتی بوون.

هۆی هەر هەموو ئەم شتانە تەنیا یەک شت بوو، لە کوردستانی ئازاد کراوی بارزانی دا، لەهیچ بوار و ئاستێک دا حیساب و کیتاب و هەڵسەنگاندن و پرسینەوە لە گۆڕێدا نەبوو.

هاوپەیمانەتی دەگەڵ ئێراندا، کەتا هەیڤی ٩/١٩٧٤ نهێنی و ژێراوژێر بوو، پاش مانگی ١٠/١٩٧٤ ئیدی ئاشکرا بوو، هەروەها هاتنی سوپای ئێران بۆ کوردستانی ژێر دەسەڵاتی جەنەراڵ بارزانی، بێگومان هۆی سەرەکی ئەو خۆسەری و بێدادییە بوو کە لەو سەروبەند و قۆناغەدا یەکێک بوو لە تایبەتمەندییەکانی «ڕژێمی» جەنەراڵ بارزانی.

ئەم هاوپەیمانییە نە بەدڵەی جەنەراڵ بارزانی دەگەڵ شای ئێراندا، کە مایەی ڕەخنەو گلەیی خەڵکانێکی زۆر بوو، شێرپەنجەیەک بوو کەلە ناوەوە شۆڕشی کوردی بنکۆڵ دەکرد: ئەم هاوپەیمانییە کە لەسەر بناغەی نهێنییەک ڕۆنرابوو، ئەم نهێنییە هێشتا لە قاو نەدرابوو، بووە مایەی ئەوەی ئەو خەڵکە کەمانەی کەلەو سەروبەندەدا لە نهێنییەکە ئاگادار بوون، بڕیاری خۆیان بێ چ ڕوونکردنەوەیەک بە کار بێنن.

لەمەش خراتر ئەم هاوپەیمانییە دەگەڵ شادا «تابوو»یەک بوو لەو گۆڕە، هەمرو دەیانزانی کە ڕێکەوتنێک لە گۆڕێدایە، بەلام دەگەڵ ئەوەشدا ئەمە بابەتێک بوو کە نەدەکرا بە هیچ جۆرێ باس بکرێ.

بەلام ئەمە تاقە هۆی کارەکە نەبوو، ڕێبەران لە هیچ بوارێکدا ڕێگەیان بەو خوێنەوارو ڕۆشنبیرانەی کە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو، نەدا کە بە شێوەیەکی کاریگەر لە شۆڕشدا بەشداری بکەن: «سوود لە توانا و بەهرەی لاوان وەرنەدەگیرا» ئەمە قسەی باوی سەر زاری کادران و قوتابیان و خوێندکاران بوو، کەم تا کورتێک سوود لەو ١١٠

پزیشکەی کە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو، وەردەگیرا، بەڵام ئەو ۲۵۰ ئەندازیارەی کە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو، گلەییان لەوە بوو کە کاری پلە دوویان پێدەسپێرن.

خوێنکاران لەبری ئەوەی بخرێنە ریزەکانی لەشکری چەکدار و لە بواری بێتەڵ و تۆپخانە و بوارە پسپۆرییەکانی دیکەدا سوودیان لێ وەربگیری، کە بەخۆیان حەزیان لەوە دەکرد، خرابوونە ئۆردوگای هاوینەی قوتابیانەوە یان لە نووسینگەکەکاندا دامەزرێنرا بوون.

سەرانی وەکو دلرا تۆفیق پشتیوانیان لەم بریارە دەکرد و دەیانگوت کە پێگەیاندنی خوێنکارێکی زانکۆیان تەکنوکرات چەندین ساڵی دەوێت، بۆیە راست نییە خوێنکارێکی وەها بۆ شەڕگە بنێردرێ و ژیانی بخرێتە خەتەرەوە.

لێ، ئەمە حاڵی ئەفسەرانی راکردوو لەسوپای عێراقیش بوو، تەنانەت سوود لە یەک ئەفسەر لە «مەکتەبی عەسکەرییەکان» و کارێن فەرماندەیی وەرنەگیرا، یان تاقە پۆستێکی گرنگی سوپایی بەکەسێکیان نەسپێردرا!

لە راستیدا سەرانی تەقلیدی عەشایەر حەزیان نەدەکرد «خوێنەواران» لە یەکەکانیاندا بدیتن. یەکێک لەم خوێنەوارانە دەڵێت: «لێمان دەترسن، ئاخر ئێمە دەمانەوێ وەزع و حاڵەکە بگۆڕین»

ئەو کەسانەی کە لە ۱۹۷٤ دا شەڕی باشترین لەشکرێن عێراقییان دەکرد، ئەو لەشکرانەی کە لەلایەن راوێژکارانی رووسیەوە و هندییەوە، یارمەتی دەدران، هەر هەمان ئەو کەسانە بوون کە ۱۳ ساڵ لەمەوبەر لەلایەن جەنەراڵ بارزانییەوە بۆ رێبەری کرنی شەڕی پارتیزانی هەڵبژێردرابوون. ئەم هەڵبژاردنە پتر پەیوەست بوو بە گوێڕایەڵی و وەفادارییان بۆ خودی بارزانی: ئەسعەد خۆشەوی (سەرانسەری بادینان)، عەلی خەلیل (بەرەی دهۆک) عەبدولڵا پشدەری (باڵەک) و گەڵێکی دیکەش «کە بە حاڵ خوێندن و نووسینیان دەزانی» ئەمە قسەی ئەو خوێندەوارانە بوو کە دوای قەرەباڵغی لەشکر کەوتبوون.

راستە، ئەم کەسانە کە بە هەر حاڵ نەیاندەتوانی نەخشەیەکی جەنگی بخوێننەوە و دایبرێژن، بەڵام تا هەیڤی ئابی ۱۹۷٤ بە کردەوە لە کوردستاندا ئەناسرابوون.

خولاسە: ناکۆکی نێوان جەنگاوەران، گوندییان و جوتیاران لەلایەک و خوێنەواران لەلایەکی دی، کە زۆربەیان خەڵکی شارن، گەییە ئەو پەڕ، ئەم خەڵکە خوێنەوارە کە لە پشت شەڕگەوە، لە چۆمان، لەبنکەکاندا دانرابوون، بە کردەوە بەشداری خەباتی چەکداری

نین، بەمجۆرە ڕێبەرانی کورد ئەو دەرفەتە مێژوویییەیان لە دەستی خۆیاندا کە خەڵکانی هەمە جۆری میللەتی کورد بخەنە بۆتەی شەڕەوە و تێکەڵاویان بکەن.

ڕاستە، لە هەموو بەرخودان و شۆڕشێکی ڕزگاریخوازی نەتەوەییدا بێ متمانەیی و بگرە تەوس و توانجیش دەرهەق بەو کەسانەی هەندێ درەنگتر هاتوون یان دێنە ریزی شۆڕشەوە بەرچاو دەکەوێ و هەیە.

گروپێکی دڵسۆز لە یاوەرانی (مێژوویی) لە دەوری جەنەراڵ بارزانی هەبوون، یاوەرانی ساڵانی ١٩٤٣-١٩٤٥، یاوەرانی دوورە وڵاتی لە یەکێتیی سۆڤیەت، و یاوەرانی سەرەتای شۆڕش، ئەمانە بەچاوی گومانەوە دەیانڕوانییە ئەو کەسانەی کە تا ساڵی ١٩٧٤ نەهاتبوونە ریزی شۆڕشەوە، هەڵبەتە ژمارەیەک هەڵپەرستیش هەبوون.

بەڵام ڕەفتار و مامەڵەی جەنەراڵ بارزانی و دەوروبەرەکەی باری سەرنج و تێبینیانی دی هەڵدەگرت، جەنەراڵ بارزانی پاش ناکۆکی و پاشان جیابوونەوەی لە «هیوا» لە ساڵی ١٩٤٣، مەخابن هەرگیز نەیتوانی دەگەڵ خوێنەواران دا و دەگەڵ حزبێک کەشایستەی ناوی حزب بێ هاوکاری بکات.

## ١٠

## دەوری ئێران

هێزەکانی عێراق لە ٣/ ١٠/ ١٩٧٤ دا زۆزکیان گرت، وەزعی (کوردستانی ئازاد کراو) زۆر زۆر خراپ بوو، سەرانی کورد، جەنەراڵ بارزانی، ئیدریس و مەسعود، عەبدولوەهاب ئەتروشی سەرۆکی مەکتەبی عەسکەری، لێبڕان، داوا لەئێران بکەن بێتە ناوەوە و نەیەڵێ بەرەی ڕەواندز هەرەس بێنێ.

ئێرانییەکان بە زۆری تۆپخانەیان نارد، لە کاتێکدا کە بە تۆپی ١٧٥ ملم دوورهاوێژ لە نێو خاکی ئێرانەوە پشتیوانیان لە هێزی پێشمەرگە دەکرد، ژمارەیەک یەکەی تۆپخانەی قورسیان ناردە نارخاکی کوردستان، ئەم یەکانە لەوێندەر سەنگەریان گرت، تا دوا هەفتەکانی مانگی شوباتی ١٩٧٥ یەک فەوجی تۆپخانەی ئێران (بە ١٢ تۆپی ١٥٥ ملم و چوار سەد نەفەرەوە) لەنزیکی بارەگای ئیدریس بارزانی لە قەسرێ سەنگەری گرتبوو، دوو تۆپخانەش (بەشەش تۆپەوە) وەکو یەدەک لە دەربەند و لە ژێر پەنجەرەکانی «بنکەی چاپ و بڵاوکردنەوە» دا حازر کرا بوو.

ئێرانییەکان ئەم دەست تێوەردانەی خۆیان لەو پزیشک و پەرستار و ڕۆژنامەنووسە

بێگانانە نەدەشاردەوە کە لە کوردستاندا بوون: تەنیا ئەوەندەیان دەکرد کە عەلامەت و نیشانەی سێ رەنگی سەر کڵاوەکانی خۆیان یان قەد لوری و جیپەکانیان قوڕ بدەن تا دیار نەبێ.

هەروەها تۆپخانەی ئێران بەشەو دەهاتە خاکی کوردستانی عێراق: لە بولێڵی ئێواران دا، دەوروبەری سەعات شەشی پاشنیوەڕۆ، وێڕای تەنگی ڕێگاوبان، هاتوچۆیەکی قورس بە جادەی هامیلتۆندا دەبینرا، دوا بەدوای ئوتومبیلی سەرباز هەڵگر، ئیدی ئەو ئوتومبیـ... ـە دەهاتن کە تۆپەکانیان ڕادەکێشا و ئەوجا جیپی فەرماندەیی... ڕۆژنامەنووسێکی فەرەنسەوی لە بانیژەی ئوتێلی دەربەندەوە، کە مەڵبەند و بنکەی چاپ و بڵاوکردنەوە بوو، لەماوەی نیو سەعات دا، دوانزە ئوتومبیل و دوانزە تۆپی دیتبوو.[٢١]

لە سەرەتادا ئەو هێزە ئێرانیانەی کە لە کوردستاندا کاریان دەکرد و ئەوەندە کاریگەر نەبوون، نیشانیان نەدەپێکا، سەربازانی ئێرانی لە فڕۆکەی عێراقی دەترسان، بەتایبەتی کە چەند کەسێکیان (لە هێرشێکی هەواییدا) کوژرابوون.

«بەڵام دواتر ڕاهاتن و شەڕی باشیان کرد.»[٢٢]

ئێرانییەکان، بە موشەکی زەوی بە ئاسمان، یارمەتی هێزی بەرگری هەوایی کوردیان دەدا، لە ئاخر مانگی شوباتی ١٩٧٤ دا چەکی تانک شکێنی لە دوورەوە ئاراستەکراو لە کوردستاندا پەیدا بوو.

سەرانی سوپای عێراق سەرەنجـــام ناچار بوون دان بەوەدا بنەن کە بە پەلە ١٥٠/ ٠٠٠ دەستە جلی زستانەی لە هند دایە ڕادان.[٢٣]

لێ ئێرانییەکان وێڕای ئەوەی کاریگی وەهایان کرد کە کوردەکان بتوانن هێرشی سوپای عێراق تێک بشکێنن، ئەوجاش تا کۆتایی هەر بە «چکە چکە» چەک و تەقەمەنییان وێدەدان.

بەو مەبەستە بوو کە باشتر کۆنترۆڵیان بکەن؟ ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی پارتی پاشان ئەم وەڵامە ساماناکەی ئەو پرسیارەی دایەوە.

«ناه، نە،، چونکە دەیانزانی کە لە مەیل و ڕەزای ئەوان دەرناچین!»

## ١١
## بایەخ و باجی کۆمەکی ئێران.

شتێکی بەڵگە نەویست بوو کە ئەم کۆمەکە زۆرەی ئێران باجی خۆی هەبوو: لە شوباتی ١٩٧٥ دا کوردەکان پاش ناخۆشی و زەحمەتێکی زۆر توانی بوویان وەزعی جەبهە و بەرەکان پڕ بکەنەوە و رای بگرن. بە گوێرەی گوتەی ئیدریس بارزانی. لە شەڕگەی رەواندز دا سەربازانی عێراقی لایەکی کێوی زۆزکیان بەدەستەوە بوو و لایەکی دیکەی بە دەستی هێزی پێشمەرگەوە بوو.

ئیدریس بارزانی پێی وابوو کەئەم وەزعە دڵخۆشکەر نەبوو، « هەندێ خەتی پەیوەندێین ئێمە لەبەردەستی ئەواندایە، ئەمە تەحەمول ناکرێ، دەبێ یەکێکمان بڕۆین، یان ئەولن یان ئێمە!»[٢٤]

لێ لە روانگەی سیاسیەوە، شەڕی کوردان بێ ئەنجام بوو، هەندێ لە کوردەکان، کە ژمارەیەکیان زۆر لە بارزانیەوە نزیک بوون، بەرە بەرە ئیعترافیان بەمە دەکرد.

بارودۆخەکە تەواو ئاڵۆزکابوو، ئەو زەمانە نەمابوو کە رێبوارێک لە بەغداوە دەهات و بە ئاسانی پێی دەنایە ناو «کوردستانی ئازاد کراو» و بای باڵی خۆی دەدا، ئێستا هەر هەمووان لە یەکتر بە گومان بوون.

رۆژنامەوانان نەیاندەتوانی بەبێ «رێنوێن» ئەم جێ و ئەوجێ بکەن، یان بە بێ تەرجومانی تایبەتی دەزگای پاراستن پەیوەندی بە چ کەسێکەوە بکەن.

سەرانی کورد کە ناچار بوو بوون بە یارمەتی ئێران شەڕی بەعسیان بکەن، سەرەنجام بەخۆیان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیاندا شێوازی «دەزگا ئەمنیەکان»ی ئێران بەکار بێنن.

بەلام ئەم حاڵە روون بوو کە سەرانی کورد ئیدی خاوەنی راو بڕیاری خۆیان نەبوون، کوردەکان پاش یازدە مانگ بەرگری و بەرەڤانی شەڕی سوپای عێراق، دەبوایە بڕیارێک بدەن: راگەیاندنی ئوتونومی، یان دەوڵەتی کاتی، یان سەربەخۆیی، دەبوایە سەرکەوتنە سوپاییەکانی خۆیان- لە راستیدا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا بوو- بکردایە بە هەوێنی سیاسەت، بەلام ئەو بڕیارەی کە لە پایزی ١٩٧٤ وە چاوەنۆڕ دەکرا، هەر نەدراو نەدرا.

ئیدریس بارزانی دەیویست بەم قسەیە: « قسە چییە؟ گرینگ دەسەلاتە! دەسەلاتی بەرپرسانی ئیدارەکانی ئێمە زۆر لە دەسەلاتی وەزیران زۆرترە!» پاساو بۆ سیاسەتی

سەرانی کورد بێنێتەوە و بەرگری لێبکات.

بەلام رێبەرەکانی دیکەی کورد راشکاوانەتر بوون، دکتۆر مەحمود عوسمان لە کۆتایی شوباتی ۱۹۷۵ گوتی: «ئەمرۆ شای ئێران دژی ئوتونومی نییە، لە گەلیشی نییە، لەم رووەوە دلی پێ خۆش ناکرێ!»[٢٦]

ئاشکرایە کە سەرانی کورد لە خۆیان دەپرسی کە ئەم شەڕە بێهودەیە چ مانا وچەمکێک دەدات.

دکتۆر مەحمود عوسمان کە لە سالی ۱۹٦٢و دەگەل بالی راستی پارتی دا بوو لەم بارەیەوە دەلێ: «ئێمە خوێنی گەلی کورد لە پێناوی خۆشی شادا نارێژین!» چەند رۆژێک بەر لە رێکەوتننامەی جەزایر بەینی شای ئێران و سەرانی کورد تێک چوو.

کوردێک کەلە رووی پلەو پایەوە لە دکتۆر مەحمود، بچکوتر بوو، ئازادانەتر قسەی دەکرد، زۆر بە کەسەرەوە دەیگوت: «ئێمە بۆ کەسێکی دی شەڕ دەکەین و هیچمان لەمە دەست ناکەوێ! کوردستان وێران بووە، وەزع و حالی پەنابەرەکان زۆر خراپە. بەلام لە دان و ستانی داهاتوودا «مافی» کەمتر لە سالی ۱۹۷۰ بەدەست دێنین.

«درێژە کێشانی شەڕ دەولەتی بەغدای لاواز کرد، ئێمەشی لاواز کرد، لەم بەینەدا براوەی گەورە شایە!»

قسە لەمە روونتر نابێ.

دوای چەند رۆژێک شای ئێران و سەدام حوسێن لە جەزایردا یەکیان بینی و رێکەوتننامەی جەزایریان مۆر کرد و ئەمەش کۆتایی بە شۆرشی بارزانی و هەموو خەونەکانی سەربەخۆیی کوردستان هێنا.

## سەرچاوەو پەراوێزان

١- هەلپەیلینی رۆژنامەوانی ١٩٧٤/٤/٨

٢- بروانە کتێبی (کوردستانی عێراق) عیسمەت شەریف وانلی ل ١٣٠-١٣١

٣- هاشم عەقراوی لە سالی ١٩٢٦ لە دایک بووە، پەیمانگای ماموستایانی بەغدای تەواو کردوە، لەسالی ١٩٥٩دا ئەندامی کومیتەی ناوەندی پارتی بوو.

٤- عەبدوللا ئیسماعیل، کە لە سالی ١٩٢٧ دا لە هەولێر لە دایک بووە، یەکێک بوو لە هەوەلین کەسانێک کە لە سالی ١٩٦١ چەکیان هەلگرت، ئەم ژمارەیە لە ناوچەی شەقلاوە دا لە لایەن سوپای عێراقەوە سەرکوتکران، بروانە کتێبەکەی وانلی ل ١٠٠- ١٠١

٥- لوموند، رۆژی ١٩٧٤/٣/١٦

٦- رویتەر، دەیلی تەستار، رۆژی ١٩٧٤/٤/٢٥

٧- لوموندی رۆژی ١٩٧٤/٣/١١ کەرابوری «دەنگی کوردستان»ی بلاو کردۆتەوە.

٨- «رێپیترانی دووروودرێژی کوردانە تولیلەر پوستیل وێنە، لوموند ١٩٧٤/٧/١٠

٩- ئەم هەواڵە لە «بولتن»ی دەزگای پاراستنەوە وەرگیراوە.

١٠- بە گوتەی مەسعود بارزانی عێراقییەکان ئەم هێزانەیان لە شەرگەی کوردستاندا مۆڵ دابوو، لە شکرێن ١، ٢، ٤، ٦ (بە تەواوەتی) لەشکرێن ٣، ٥، پێنج بەتالیۆنی هێزی تایبەت و هەموو یەکەکانی کۆماندۆ، واتا تێکڕای ٨٠ هەزار نەفەر، واتا نزیکەی ٩٠٪ی سوپای عێراق، بڕوانە گوتاری رۆژی ١٩٧٥/١/٩ی کوتیبدین دوویاری، بە ناوی «پێشمەرگەکان نەخشەکانی بەغدا پوچەڵ دەکەنەوە.»

١١- دەیلی تەستار، ١٩٧٤/٨/٢٧، ئەنتەرناشنال هیرالد تریبیون، ئەسوشیتید پرس، ١٩٧٤/٨/٢٨.

١٢- بڕوانە گوتاری «جەنگی سەد ساڵە لە عێراقدا» نووسینی کریس کۆچیرا، کەلە کوتیبدین دوویاری رۆژی ١٩٧٥/١/١٠ دا بلاو بووەتەوە.

١٣- ژمارەکان لە مەسعود بارزانی وەرگیراون، بڕوانە ژمارەی رۆژی ١٩٧٥/١/٩ی کوتیبدین دوویاری.

١٤- ئەم بابەتە لە حاجی ئۆمەران بۆ نووسەر باس کراوە، ١٩٧٤/٩/٢٨

١٥- «بەغدا سوورە لەسەر ئەوەی بەر لە هاتنی زستان شۆڕشی کورد لە نێوبەرێتە ژ. پ. مرسیە، فیگارۆ، ژمارەی رۆژی ١٩٧٤/١٠/١٤

١٦- عیسمەت شەریف وانلی پانتایی هەموو کوردستان بە ٧٠٠٠٠٠ کم چوار گۆشە دادەنێ. ل ٢٤٨

١٧- ژمارەکان، لە عەلی عەبدوللا وەرگیراون، دوا بودجەی ساڵانەی وەزارەتی کاروباری باکور ١٩ ملیۆن دیناری عێراقی، واتە ١٢٪ی هەموو بودجەی عێراق بوو.

١٨- هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، سەرسەنگ، ١٩٧٤/٩

١٩- هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، ئامێدی ١٩٧٤/٩

٢٠- هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، حاجی ئۆمەران، ١٩٧٤/٩

٢١- نووسەر، کۆتایی شوباتی ١٩٧٥

٢٢- ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

٢٣- واشنگتۆن پۆست، ١٩٧٤/١١/١٧

٢٤- هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، حاجی ئۆمەران، شوباتی ١٩٧٥

٢٥- هەمان سەرچاوە.

٢٦- هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، دەربەند، شوباتی ١٩٧٥.

## فەسڵی پازدەیەم

### رێکەوتننامەی جەزایر (١٩٧٥/٣/٦) و ڕوخانی یەکجارەکی

لە مانگی ١٩٧٣/١٠ دا ڕێبەرانی کورد کە لە چیاوە تاقیبی ڕوودلوەکانی شەڕی عەرەب و ئیسرائیلیان دەکرد، زۆریان سەر لەوەی سوڕما کە دیتیان برجنیف پێشوازییەکی گەرمی لە کیسنجەر کرد لە موسکۆ، بەسەرسامی گوتیان: «ئێمە نامانەوێ ئەمانە یەکدی لە ئامێز بگرن، حەزمان دەکرد یەکدیان بەر شاپان بدا بوایە!»

سەبارەت بە عێراق و ئێرانیش عەینی شت بوو: تا بەینی ئێران و عێراق خراتر دەبوو سەرانی کورد خۆشحاڵتر دەبوون، خۆ ئەگەر باسی نزیک بوونەوەی ئەم دوو وڵاتە بهاتبوایە گۆڕێ، غەمبار دەبوون.

بەڵام ئەو جۆرە، نزیک بوونەوەیەیان بە مەحاڵ دەزانی، کە تورە بوونی شایان دەرهەق بە مۆر کرنی رێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١ وەبیر دێنایەوە دەیانگوت مەحاڵە شا ڕۆژێ لە ڕۆژان دەگەڵ سەرانی بەعس دا رێک بکەوێ «ئەمە جێی باس و گفتوگۆ نییە.»[1]

لێ لە حەقیقەتدا، شای ئێران لە هەیڤی ١٩٧٢/١٠ بەملاوە لە رێگەی وەزیرێکی دەرەوەی وڵاتێکی جیهانی سێیەمەوە کە بێگومان تورکیایە، دەوڵەتی عێراقی تێگەیاند کە ئەگەر دەوڵەتی عێراق قەبوڵ بکات، پەیمانی ساڵی ١٩٣٧ دەربارەی شەتاوی عەرەب، کە ئێران سێ ساڵان لەمەوبەر یەک لایەنە بەتاڵی کردبووەوە، بە ئاشکرا بەتاڵ بکاتەوە، ئەریش (شا) ئامادەیە کارێکی وا بکات ئاشتی باڵ بەسەر دەڤەرەکەدا بکێشێت.[2]

«سیا» لەم کەین و بەینە ئاگادار بوو، بەڵام کوردەکان لەم واریقاتە بێ خەبەر بوون.

بەڵام وێرای ئەمەش هەندێک ئاماژەی مایەی نیگەرانی هەبوون کە دەبوایە کوردەکانی، کە پێشتر بوو بوون بە قوربانی ئاشتی بەعس و سۆڤیەتەکان، (بە شێوەی تایوان) لەوە حاڵی بکردایە کە رێکەوتنی نێوان شا و سەدام کارێکی مەحاڵ نییە.

کە پەیوەندی دیپلۆماسی بەینی ئێران و عێراق تازە کرایەوە، لە دووەم ڕۆژی هێرشی ڕەمەزان (مەبەست هێرشی سوپای میسرە لە ١٩٧٣/١٠) بەم لاوە، وەزیرانی دەرەوەی بەغداو تاران ناو بەناو لە ئەستەموڵ دیداریان دەکرد، لە هەمان کاتدا هەندێ پەیوەندی لە رێکخراوی نێونەتەوەییشدا ئەنجام دەدرا، ڕاستە ئەم دیدارانە شتێکی لێ شین نەدەبوو، بەڵام هەر دیدارەکان بۆخۆیان نیشانەو مایەی نیگەرانی بوون.

له هەیڤی ١٠/١٩٧٤ دا ئەمـیـر عـەباس هوەیدای سـەرەک وەزیری ئێـران له هەڤپەیڤینێکی دووردورێژدا، لەمەڕ مەسەلەی کورد له هەڵوێسته گەرم و گوڕەکانی جارانی بایدابەوە و پتر پێی لەسەر ئەوە دادەگرت «که دابی مرۆڤ دۆستانەی ئێران ڕێگەی نادات دەرگای ماڵەکەی له ڕووی کەسانێک داپخات که لەترساو له برساو له تاو بۆردومان هەڵدێن.»

سەرەک وەزیری ئێران لەم هەڤپەیڤینەدا خۆی له قەڵەمرەوی سیاسەت دوورە پەرێز دەگری، حاشا له کۆمەک کردنی کوردەکان دەکات و دەڵێ: «ئێمە دەست ناخەینە کاروباری نێوخۆی عێراق، ئەمە چەرۆکێکە عێراقییەکان که دەرەقەتی کوردەکان نایەن، دروستیان کردووە و ڕەنگ و ڕتووشیان کردووە. بەرای من ئەم مەسەلەیە پەیوەستە به عێراقەوە، بێ هیچ شک و گومانێک کوردەکان مافی خۆیان هەیە، ناتوانن ئەوە قەبوڵ بکەن که عێراقییەکان وەکو هاووڵاتییەکی پلە دوو ڕەفتاریان دەگەڵ بکەن.»

که لێی دەپرسن کەوایە چ کەسێک کۆمەکی کوردەکان دەکات، سەرەک وەزیری ئێران دەڵێ: « چ کەسێک؟ ڕەنگە «سیا» یان ڕێکخراوی ئەمنی فەرەنسە.»[٣]

له کۆتایی مانگی ١٢/١٩٧٤ دا شای ئێران چاوپێکەوتنێکی دەگەڵ ڕۆژنامەی السیاسەی کوێتی دا کرد که زۆر له دیمانەکەی هوەیدا پتر مایەی نا ئومێدی و نیگەرانی بوو. شای ئێران لەم چاوپێکەوتنەدا عێراقی بەوە تاوانبار کرد که: «ڕاستگۆیانه کاری بەو ڕێکەوتنه نەکردووە» که له ئەستەمۆڵ لەسەری ڕێک کەوتبوون. شا گوتی ئەو کوردەکان «هان نادا» کە داوای سەربەخۆیی بکەن، لەسەری ڕۆیی: «ئەوان تەنیا خوازیاری ئوتونومیەکی سنووردارن له چوارچێوەی عێراق دا، نەک له دەرێی عێراق.[٤]

له هەمان کاتدا، وەختێ فڕۆکەیەکی توپولوف ١٧ و یەکێکی سوخوی به موشەکی ئێرانی و له سنووری ئێراندا خرانه خوارەوە، بەینی عێراق و ئێران به ڕادەیەک تێک چوو که لەوە بوو له نان و ساتدا لێیان ببێ به شەڕ.[٥]

دوای چەند ڕۆژێک شا له ڤیێنا ڕایگەیاند که مەسەلەی دانی «چەکی هجومی» به کوردان له گۆڕێ نییە، چونکه ئەو به خۆی «لەگەڵ سەربەخۆیی کوردستان دا نییە.»[٦]

جگه لەم شتانە نیشانەیەکی تری بیرکردنەوەی زۆر ئاڵۆز و نادیاری کاربەدەستانی ئێرانی له نارادا بوو که دەبوایه سەرانی کوردی نیگەران بکردایە. له هەیڤی شەش دا دەوڵەتی ئێران داوای له «کۆمیتەی نێونەتەوەیی خاچی سوور» و «لیژنەی بالای

ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانی تایبەت بە پەنابەرانە کرد کە نوێنەری خۆیان بۆ سەردانی ئۆردوگای پەناهەندەین کوردی عێراقی بۆ ئێران بنێرن.

ئەم نوێنەرانە لەکۆتایی سەردانەکەیاندا لە کاربەدەستانی ئێرانیان پرسی ئایا پێویستیان بە کۆمەک هەیە؟ ئێران لە وەڵامدا گوتی: نەخێر.

نوێنەرانی ئێوپراو پاشان داوایان لە دەوڵەتی ئێران کرد کە ڕێگەی نوێنەرانی خاچی سوور بدات لە ئێرانەوە بۆ کوردستانی عێراق بڕۆن و کۆمەکەکانی خاچی سوور لەم ڕێگەیەوە بۆ زەوەرمەندانی شەر بنێردرێ. بەڵام دەوڵەتی ئێران خۆی لەم کارە دزییەوە و نەیکرد.

لە هەمان کاتدا سەرەک وەزیری ئێران لەبەڵاڵ دووپاتکردنەوەی ئەوەی کە دەوڵەتی ئێران تا ئێستا ٨٠ ملیۆن دۆلاری لەم ١١٢٠٠٠ کوردە عێراقییە پەناهەندانە خەرج کردووە (١٠/١٩٧٤) ڕایگەیاند کە «پێویستە ئەوە بڵێم لەم خەمساردی و بێ مەبالاتیەی ڕێکخراوێکی وەک «خاچی سووری جیهانی» یان «کۆمیتەی باڵای پەناهەندانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، دەرحەق بەم مەسەلەیە نیگەران و سەرسامین.»

سەرەک وەزیری ئێرانی لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کە دەتاوەنێ چیمان لەم ڕێکخراوە جیهانییە دەوێ، گوتی: «دەوایە بهاتبایە و ئەو پەناهەندانەیان بدیبوایە! چونکە بە پێی پەیڕەوی ناوخۆی خۆیان لە سەریانە بێن و مەسەلەکە تاوتوێ بکەن. ئاخر ئەم خەڵکە هەر دەبێ ڕۆژێک بۆ ماڵی خۆیان بگەڕێنەوە.»[٧]

لە ڕاستیدا مەبەستی ئێرانییەکان لە هاتنی نوێنەرانی ڕێکخراوی نەتەوەیی و سەردانیان بۆ ئۆردوگای پەناهەندەکان ونەنجامدانی جۆرە بانگەشەو پروپاگەندەیەک بوو بۆ خۆیانە ئەوە بوو پاش وەرگرتنی مۆڵەتی ترانزێت لەلایەن خاچی سووری سویدییەوە (٢٤/١٠/١٩٧٤) خاچی سووری جیهانیش لەلای خۆیەوە ئەم مۆڵەتەی وەرگرت.[٨]

زۆر زەحمەتە تەسەووری ئەوە بکرێ کە جەنەراڵ بارزانی و دەوروبەرەکەی بە تەواوەتی لەم کەین و بەینانە بێ خەبەر بوو بێ، بەتایبەتی هەڵوێستی شا دژ بە ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمی یان فیدراڵی لە چوارچێوەی عێراقدا، دەبوا ئەو خانە گومانیەی کە جەنەراڵ بارزانی لە ساڵی ١٩٤٧ وە دەرحەق بە شا هەیبوو، زیاتر و توندتر بکا!

وەنگە جەنەراڵ بارزانی ئومێدی بە بەڵێنەکانی ئەمەریکا بووبێ، نەی دەزانی کە «سیا» بە هەمان بێ شەرمی و بێ هەستی شای ئێرانەوە، وەکو هۆ و ئامراز و ئالەتێک بۆ لاواز

کردنی بونیاد و توانای سەرکێشی ئێونەتەوەیی عێراق» دەبڕوانییە ئەو.[٩]

بە هەر حاڵ لە ١٩٧٥/٢/٢٠ سەفیری میسر لە بەیروت بە نوێنەری بارزانی راگەیاند کە سەرۆک سادات حەز دەکات نوێنەری جەنەراڵ بارزانی ببینێ.

دوای چل و هەشت سەعاتان سامی لە پڕ لە کوردستانەوە بۆ تاران رۆیی و (جەنەراڵ بارزانیش لە ١٩٧٥/٢/٢٦دا بۆ تاران چوو) لەوێندەرەوە بۆ قاهیرە چوو، لەوێ دیداری دەگەڵ سەرەک سادات و هەیکەل دا کرد (هەڵبەتە لە ٢/٢٨)دا.

سەرۆک سادات لەم دیدارەدا بە سامی گوت کەلە جەزایردا رێکەوتنێک لە بەینی ئێران و عێراقدا ئەنجام دەدرێ و ئەم رێکەوتنە پەیوەندی بە کوردیشەوە دەبێت.

لێ سادات لەسەری رۆیی کە وێرای ئەمەش شا «بە رەقانی لەکوردان دەکات.» سامی لە گفتوگۆیەکدا دەگەڵ هەیکەلدا بە زمانێکی بنجبڕ گوتی: « رێکەوتنی بەینی شا و سەدام هەرچییەک بێ، ئێمە لەکاتی پێویست دا درێژە بە شەڕ دەدەین و تەسلیم نابین.»[١٠]

## ١
## دەوری سەرەک سادات و بۆمدیەن

لەبەر ئەوەی هەوڵەکانی یەکەمی زەمینە خۆشکردن بۆ رێکەوتنی جەزایر زۆر نهێنی بوون، بۆیە زەحمەتە ئەوە بزانرێ کە یەکەم هەنگاو بۆ ئەم ئاشتییە سەیرە کێ نای، سەرۆک سادات، سەرۆک بۆمدیەن، یان مەلیک حوسێنی پاشای ئوردن؟

ئەگەرچی دەوری سادات لەم رووداوەدا گرنگ بووە، بەڵام (زەمانەتی) ئەو لە روانگەی شاوە کە خوازیاری زەمانەتی رێبەرێکی عەرەبی «توند» ی وەکو بۆمدیەن بوو.

مەبەستی سادات روون بوو، عەرەب نەیاندەتوانی لە پاڵ رووبەرووبوونەوەی ئیسرائیلدا، جەبهەی دووەم لە خۆیان بکەنەوە، ئیدی ئەو بەرەیە بەرەی کوردستان بووە یان بەرەی زەفار فەرقی نەدەکرد، مەلیک حوسێنیش هەر هەمان مەبەستی هەبوو.

پرۆژەکەی سەرۆک بۆمدیەن لەمە بەرینتر بوو: لەباری جوگرافیاییەوە هەوڵی دەدا دەسەڵاتی هەردوو زلهێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤیەت لە کەنداوی فارس و رۆژهەڵاتی ناڤین کەم بکاتەوە، جا بۆ وەدیهاتنی ئەم ئاواتە دەبوایە کۆتایی بە شەڕی کوردستان کە زۆر بەلەز و بە جۆرێکی ترسناک گەشەی دەسەند، بهێنرێ.

لە مەیدانی ئەوتدا، ئاشت کرد ئەوەی ئێران و عێراق لەلایەن جەزایرەوە، قازانجێکی

زۆری تێدا بوو، شای ئێران وەکو جەزایرییەکان هەڵوێستێکی زۆر توندی لە بواری نەوتدا وەرگرتبوو، بە توندی رەخنەی لە مەلیک فەیسەڵی پاشای سعودیە دەگرت، تەنانەت جارێکیان گوتی: «ئەگەر فەیسەڵ و یەمانی - وەزیری نەوتی ئەوسای عەرەبستانی سعودی- دەیانەوێ دیاری بدەنە ئەمەریکا، دەتوانن چەکیان (صک) بدەنێ! بەڵام ئێمە رێ بە خۆمان نادەین کاری وابکەین.» [۱۱]

بەمجۆرە سەرۆک بۆمەدیەن بە ئومێد بوو بەو ناوبژیوانیەی خۆی عێراق بگەرێنێتەوە بۆ نۆپێک و بەرەی «تصدی» بە سێ کوچکەی جەزایر - بەغدا- تاران بەهێز بکات.

هەروەها لە رواڵگەیەکی دیکەشەوە، بە گوتەی هەندێ کەسان، سەرۆک بۆمەدیەن پێی خراپ نەبوو بەشداری لەوەدەرنانی سۆڤیەتەکان لە کەنداوی فارس بکات و بەمە چاوێک لە ئەمەریکاییەکان دابگرێ.

یەکەم پەیوەندی لەم بوارەدا، لە پەراوێزی کۆنگرەی سەران لە (ربات) ئەنجام دەدرێ، (۲٦/ ۱۰/ ۱۹۷٤): بەگوتەی جەزایرییەکان کە یەکەم هەنگاویان لەم بوارەدا نا، لەسەدام حوسێن یان پرسی: « ئایا ئامادەیە لەگەڵ شای ئێراندا دابنیشێت؟»

بۆمەدیەن کە قایل بوونی یاریدەدەری سەرکۆماری عێراقی زانی، ئیدی درێژەی بە هەوڵەکانی خۆیدا، هەڵبەتە لە ئاستێکی باڵادا.

شای ئێران لە ٦/ ۱/ ۱۹۷٥ دا بە دیدارێکی رەسمی سێ رۆژە چووە عەمان، لە ۲/۸ دا چووە قاهیرە و لەوێندەر زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکرا، بەتایبەتی کەبەر لە هاتنی بۆ میسر بەڵێنی ئیعتبارێکی یەک ملیارد دۆلاری بە وڵاتانی ئێوبراودابوو. [۱۲]

ئەم هەوڵانە تا کۆنگرەی سەرانی نۆپێک بەردەوام بوو، پێشـەچوونی کارەکە هێندە لەبار بوو کە دەرفەتی بۆ سەرۆک سادات رەخساند بەر لەبەستنی کۆنگرەی سەران، کوردەکان لە سازش و رێکەوتنی ئاییندە ئاگادار بکاتەوە.

## ۲

## کۆنگرەی سەرانی نۆپێک و رێکەوتنی (٦/۳/۱۹۷٥)

کۆبوونەوەی سەرانی نۆپێک لە ٤/ ۳/ ۱۹۷٥ لە پایتەختی جەزایر دەرفەتی بۆ سەرۆک بومەدیەن رەخساند کە شاو سەدام پێک بگەیەنێ. هەمـوو شەوێک دوای کۆبوونەوەی نوپێک، شاو «پیاوی بەهێزە ی عێراق پێکەوە دادەنیشتن و تا سپێدە بە جۆرێکی تایبەتی گفتوگۆیان دەگەڵ یەکدی دەکرد.

یەکەمین شەوی ئەم شەونخونییە مێژووییانە، گفتوگۆیەکی دوو قۆلی ورلستەوخۆ بوو «بۆ رێ خۆشکردن»

سەرەک بۆمدیەن لە دووەم شەودا بەشداری کرد: گفتوگۆکان بە زمانی فەرەنسی بوو، یەکێک لە هاوکارە نزیکەکانی سەرۆک بومدیەن بۆ سەدامی دەکرد بە عەرەبی.

سەرۆک بۆمدیەن هەستی کرد کە سەدام حوسێن پیاوێکی «زۆر واقیع بینە» و دەزانێ کە بەهای شەڕی کوردستان ( بە گوتەی عراقییەکان بریتیە لە کوژرانی ۱۰۰۰۰ کەس لە سالێک و نزیکەی چوار ملیارد دۆلار خەرجی)[۱۳] ئەوەندە هەیە کە ئەگەر بیەوێ ئەم برە پارەیە بۆ پەرەسەندن و ئاوەدانکردنەوەی عێراق تەرخان بکات بەخێرایی «زامەکان» سارێژ بکاتەوە.

بەلام سەبارەت بە پەیوەندییەکانی عێراق دەگەڵ موسکۆدا، یاریدەدەری سەرکۆماری عێراق قەناعەتی بە بەرانبەرەکانی خۆی کرد کە ئەمە زادەی گۆشەگیری عێراق بووە.

شای ئێرانیش دەمێک بوو ( لە نیسانی ۱۹۷۲وە، واتە لەکاتی مۆرکردنی پەیمانی دۆستایەتی عێراق و یەکێتی سۆڤیەتەوە) دەیویست یەکێتی سۆڤیەت لە دەڤەرەکە وەدەربنێ.

شای ئێران زۆر چاک دەیزانی کە پشتیوانی لە کوردان بۆ ئەولە راستیدا ئاگربازییە، لە ئێرلن دا ٥ ملیۆن کورد هەبوو کە هیچ جۆرە مافێکیان نەبوو، تەنیا ئەوەندە هەبوو کە بە ئێرانیانی باشیان دەژماردن! ئەم گەلە لە قوتابخانەکاندا بە زمانی زکماکی خۆیان نەیاندەخوێند و لێیان قەدەغە بوو (ئاوە ئاوەش مامۆستایانی کوردیان بۆ ناوچەکانی دیکەی ئێران دەگواستەوە) بلاوکراوە و چاپەمەنی بەزمانی کوردی یاساغ بوو، ئەتەوەپەروەرانی کورد بەشیان هەر ئازار و ئەشکەنجە و راوەدوونان بوو.

شا کە سنووری نێوان کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێرانی خستبووە سەر پشت، بەمە کارێکی کردبوو کە ئەنجام و ئاقیبەتێکی نادیاری هەبوو، مانگانە هەزاران پێشمەرگە مۆڵەتیان وەردەگرت و بۆ سەردانی خێزانەکانیان کە لە ئۆردوگای پەناهەندەکانی ورمێ و کرماشان دا دەژیان، روویان دەکردە ئێران.

ئەو چیرۆکانەی کە ئەم پێشمەرگانە دەیانگێڕایەوە چ کارێکی دەکردە سەر زەین و هزری کوردێن ئێران؟

شا، کە هەمیشە و زۆر بە چاکی ئاگای لەمە بوو، لە سەفەرەکەیدا بۆ فەرەنسا لە

حوزەیرانی ١٩٧٤ دا رایگەیاند: «ئەگەر بەلوعەکە بگرمەوە هەموو شتێک دەبڕێتەوە وە تەواودەبێت!» [١٤]

جا ئێستا وەختی ئەوە هاتبوو کە شا «بەلوعەکە بگرێتەوە!»

پاش شەوێکی دیکەی شەونخونی، کە بە کۆبوونەوە لە دەوری خوانی بەیانی کۆتایی هات، سەرۆک بۆمەدیەن لە کۆتایی کۆبوونەوەی سەرانی ئۆپێک دا رایگەیاند کە «رێکەوتنێکی تێرو تەسەل لەمەڕ ناکۆکی نێوان هەردوو ولاتی برا کراوە» و شا و سەدام لە بەرچاوانی سەرسامی سەرانی ئۆپێک دا یەکتریان لە ئامێز گرت.

ئەوو ئەو زەمانە بەسەرچوو بوو کە سەرۆک ناسر، شای ئێرانی «بە موسولمانی لەبەردلانی ئیسرائیل» ناودەبرد. [١٥]

## ٣

## خاڵە رەسمییەکانی رێکەوتنی ئازاری (١٩٧٥)

رێکەوتننامەی جەزایر بە رەسمی چوار مادە بوو کە ئەم خالانەی گرتبووە خۆ:

- دیاری کردنی سنووری زەمینی لە نێوان ئێران و عێراق بە پێی قەراڵەنامەکانی ساڵی ١٩١٣ی قستەنتەنییە و کارەکانی کۆمیتەی ساڵی ١٩١٤
- دیاری کردنی سنووری ئاوی، بە پێی خەتی ناوەڕاستی شەتاوەکە.
- چاودێری توند و «کاریگەر»ی سنوورەکان بە مەبەستی نەهێشتنی دزە کردنی «خەرابکاران»
- ئەم خالانە، بناغەیەکی گشت گیرن و هەر لادانێک لەو خالانە، روحی ئەم رێکەوتننامەیە دەخاتە خەتەرەوە.

## ٤

## خاڵە نهێنییەکانی رێکەوتننامەکە

رێکەوتنی جەزایر لە راستیدا رێکەوتنێکی سادەی سنووری نەبوو، بەڵکو رێکەوتنێکی بنەڕەتی و ستراتیژی بوو، ئەگەر بە تەواوەتی جێبەجێ بکرایە ئاکام و ئەنجامێکی درێژخایەنی لە ناوچەی کەنداوی فارسدا دەبوو.

رێبەراتی بەعس بە ئیعتراف کردن بە خەتی سنووری کۆمیتەکانی سنووی ساڵانی ١٩١٣ و ١٩١٤ نەک تەنێ مەسەلەی شەتاوی عەرەبیان حەلوفەسل کردبوو، بەڵکو

چاویان له مافی مێژوویی عەرەب له خوزستان (یان ئەوان گوتەنی له عەرەبستان) وکلکەی باکوری کەنداوی فارسیش پۆشی بوو، هەر بۆیەش چاپەمەنی و بلاوکراوەکانی دیمەشق بەلەز و بە زمانی توند لەم رووەوە سەرزەنشتیان کردن.

بەلام رێکەوتننامەکە خالێکی تایبەتی تێدایە کە نابێ ولاتانی کەنداوی فارس بکرێن بە داشە هاری گەمەی زلهێزان، لە بری ئەمەش پشتیوانی لە ململانێ ناوچەیی و ناوخۆکان نەیەتە کرن. بەم پێیە ئێران دەستبەرداری کوردەکان دەبوو.

عێراقیش لەلای خۆیەوە بەلێنی دەدا کە هیچ جۆرە پشتیوانیەک لەرێکخراوە دژە ئێرانەکان کە بەغدا بوو بوو بە مەلبەندیان، بەتایبەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و شۆرشگێرانی زەفار، نەکات.

٥

## هەلویستی کورد بەرانبەر بە رێکەوتنی ١٩٧٥/٣/٦

کوردەکان هەوالی رێکەوتنی جەزایریان لە رادیۆوە ژنەوت، بەلام نەک لە رادیۆی «دەنگی کوردستان»ەوە کەتاقە وشەیەکی لەم بارەیەوە نەگوت، بەلکو لە بی بی سی، لە دەنگی ئەمەریکا، لە رادیۆی قاهیرە، رادیۆ ئیسرائیل و رادیۆی بەغدایە.

تەنێ چەند کەسێک لە خەلکانی نزیکی سەرانی کورد لە شەوی ٣/٥ دا لەم رووداوە ئاگادار بوون، بۆ کوردەکانی دیکە، بەتایبەتی بۆ ئەو پێشمەرگانەی کە لە شەرگەکانی زاخۆ و رەواندز و قەلادزەدا دەجەنگین، هەروەها بۆ پەناهەندەکان و فەرمانبەرانی «وەزارەتخانە»کانی دۆلی چۆمان، ئەم هەوالە وەکو بۆمبا دەنگی دایەوە.

بەلام کاردانەوە دەرهەق بەم هەوالە لە شەرگە و پشت شەرگە جیاوازە، وەک لە شەرگەکاندا هێزی پێشمەرگە، وێرای سەرسامیان دەربارەی ئەم هەوالە، باوەر ناکەن کە هەموو شتێک کۆتایی هاتبێ، بەهیوان لە رێگەی شاوە ئەم رێکەوتنە، رێکەوتنێکی دیکەی لە نێوان جەنەرال بارزانی و بەغدادا بەدوا دابێ.

ئەگەر بەرلەسێش دابخرێ. ئەوان «پێشمەرگە» بەلای کەمەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە «دەتوانن بە بێ کۆمەکی ئێرانیش بەرگە بگرن» درێژە بە شەر دەدەن.!

لە پشت شەرگەوە لە دۆلی چۆمان روخان، روخانی تەواو بوو.

ژمارەیەک خوێنکاری زانکۆ کە چەند مانگێک یان چەند هەفتەیەک بوو پەیوەندییان بە

شۆڕشی کوردەوە کردبوو، لە نائومێدیاندا لێیبڕان خۆ بکوژن، ناچار تفەنگەکانیان لێ سەندن.

ئاشکرایە کە بۆچی وەها وەیان بەرداوە، هەمان شەوی ٣/٦، ئێرانییەکان ئەو تۆپخانە وفڕۆکە شکێنانەیان، کە بۆ بەرگری لە بارەگای جەنەراڵ بارزانی لە حاجی ئۆمەران، هێنرابوون، کۆ کردەوە و بردیانەوە بۆ ئێران. ئەم خەڵکە کە لۆرییە ئێرانیەکانیان دەبینێ بە جادەی هامیلتۆن دا پشت لە شەڕگە و رووەو ئێران دەڕۆنەوە، ئیدی لەوە حاڵی بوون کە ڕێکەوتنی ٣/٦ ناکامی کوشندەی بۆ شۆڕشی کورد دەبێت.

بۆ سبەینێ، واتە ١٩٧٥/٣/٧ هێزی فڕۆکەوانی عێراق کە ترسی تۆپی فڕۆکەشکێنی نەما، سەرانسەری دۆڵی چۆمانی لەگەڵاڵەوە بیگرە تا ناوپردان و دەربەند و نزیکی حدودی دایە ژێر باڵی خۆی و درێغی لە بۆردمان کردنیان نەکرد. پەشێوی هەموو ناوچەکەی گرتۆتەوە، دنیا مەیلەو چۆڵە، چۆڵی بەرادەیەک کە کاتی تەرجومانێکی رێنوێنی رۆژنامەوانێکی بێگانە، لە شەڕگەیەکی دوورەوە بۆ دەربەند دەگەڕێتەوە، تەماشا دەکات مەڵبەندی چاپەمەنی و بلاوکردنەوە و هەموو «وەزارتخانەکان» چۆڵ و هۆڵن. کادرە ئیدارییەکانی پشت بەرە هەموو بۆ ئێران چوو بوون.

لە هەمانکاتدا سوپای عێراق دەستی بە هێرشێکی گشتی کرد، تەنیا لە شەڕگەی رەواندز دا لە شکر و نیوتیک بە پشتیوانی نزیکی ٢٠٠ تانکەوە پەلاماری سەنگەرێن پێشمەرگەیان دا، عێراقییەکان (رەنگە ئێرانیەکانیش) کەمترین گومانیان لەوە نەبوو کە ئەم شەڕگە تێک دەشکێت و دەروخێت وبەکەمێن یەکەی سوپای عێراق لە زەرفی ٤٨ سەعاتدا دەگاتە سنووری ئێران.

**لێ هێزی پێشمەرگە بەو پەڕی قارەمانییەوە خۆیان راگرت وشەڕیان کرد، زەرەرو زیانێکی زۆریان لەسوپای عێراق دا.**[١٧] **ڕێک هەفتەیەک دوای ڕێکەوتنی جەزایر،** دەوڵەتی عێراق رایگەیاند کە کریاری سوپایی لەکوردستاندا رادەگرێ، ئەم ئاگر برە کە لەسەر داوای شای ئێران بوو، بڕیار بوو تا کۆتایی مانگ بەردەوام بێ ودەرفەت بە کوردەکان بدات خۆیان ساغ بکەنەوە، یان پەنا وەبەر ئێران بەرن و ببنە پەنابەر یان بۆ عێراق بگەڕێنەوە و تەسلیم بن.

٦
## جەنەراڵ بارزانی و ڕێکەوتنی ٣/٦

سەرانی کورد تا کۆتایی باوەڕیان بە واقیعەکە نەدەکرد، بەوە دڵی خۆیان خۆش دەکرد کە ئەمەریکاییەکان بە قازانجی ئەوان گوشار لە شا دەکەن.

جەنەراڵ بارزانی کەلە ١٩٧٥/٢/٢٦ دا بۆ تاران چوو بوو تا دوا هەوڵی خۆی لەگەڵ شادا بەکاربێنێ، بێ ئەوەی شا بدینێ بۆ کوردستان گەڕایەوە، بەڵام پێیان گوتبوو کە ڕێکەوتنێک دەبێت و ئەم ڕێکەوتنە بەقازانجی کوردەکان دەبێت.

بەڵام لە ١٩٧٥/٣/٥ دا، واتە شەوی پێش ڕاگەیاندنی ڕێکەوتنی جەزایر، یەکێک لە **ئەفسەرانی سەر بە ساواکی تێهران، هاتە لک وی بە وزمانێکی توند و چاوەڕێ نەکراو پێی گوت کە «سنوور دادەخرێ و ڕێگەی هیچ جۆرە هاتووچۆیەک نادرێ، ناتوانێ چیتر چاوەڕێی کۆمەک (لە تێهران) بکات. دەبێ مەرجەکانی «عێراق» قەبوڵ بکات هێزی پێشمەرگە ڕێگە نادرێن پەنا وەبەر «تێهران» بەرن، مەگەر بەشێوەی گرووپی بچووک و پاش ئەوەی چەکەکانیان تەسلیم بە سوپای ئێران بکەن.»**[١٩]

بارزانی و دەوروبەرەکانی هێشتا هەر بە تەما بوون، کە ڕێکەوتنی جەزایر «هەندێ شتی بۆ کوردانیش» تێدا بێ، بەڵام دوای ئەوەی سوپای عێراق لە ١٩٧٥/٣/٧ دەستی بە هێرش کرد، ناچار ئەم دوا خەیاڵاتەیان لەسەری خۆ دەرکرد و لە ١٩٧٥/٣/١٠ دا نامەیەکی نائومێدانەیان بۆ «سیا» لە تاران دا نارد.

«سەرگەردانی و پەشێوی باڵی بەسەر جەماوەر و هێزەکانی ئێمەدا کێشاوە، خەتەرێکی بێ وێنە هەڕەشە لە گەلی کورد دەکات، بەرەو ناپوودی تەواو دەچین، ئەم شتانە هەمووی نادیار و بێ پاساوە، ئێمە ڕوو دەکەینە دەوڵەتی ئەمەریکا و ئێوە وداواتان لێدەکەین کە بە پێی بەڵێنەکانی خۆتان بکەن و فریا بکەون و مەیەڵن هاوپەیمانەکەتان تیا بچێ، گیانی جەنەراڵ بارزانی و کاروباری خێزانەکانمان بپارێزن، چارەسەرێکی نابروومەندانە بۆ ئەم مەسەلەیە بدۆزنەوە.»[٢٠]

هەر هەمان ڕۆژ جەنەراڵ بارزانی نامەیەکی بۆ کیسنجەر نووسی: « ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرانبەر بە گەلی ئێمە کە بۆ پەرەپێدان و پێشڤەبرنی سیاسەتی وڵاتی ئەنگۆ گیرۆدەی ئەم حاڵەتە بووە، بەرعۆدەیی ئەخلاقی و سیاسی دە ئەستۆدایە، داوای لێکرد لەم بوارەدا هەندێ کاران بکات.

- بەر لە هێرشی سوپای عێراق بگرێ و دەرگای دان و ستان بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێک (کە روالەت بپارێزێ) بکاتەوە.

- لەم ساتە مێژوییە و خەمینەدا، بەمەبەستی کۆمەک کرنی گەلی کورد، گوشار بخاتە سەر ئێران، تا بەلای کەمەوە خەلک ( و لەشکری نیمە ) بتوانن، تا ئەو دەمەی مەسەلەکەمان لە چوارچێوەی رێکەوتنێکی گشتیدا چارەسەر دەکرێ، درێژە بەشەڕی پارتیزانی خۆ بدەن.[21]

**کیسنجەر هەرگیز وەلامی ئەم نامەیەی بارزانی نەدایەوە.**

## ٧

## دوا رۆژەکانی شۆڕشی کورد

پاش راگەیاندنی ئاگر بڕ لە ١٩٧٥/٣/١٣ دا، هەمو سەرانی سوپای کورد و زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی وکۆمیتەی ناوەندی حیزب سوور بوون لەسەر ئەوەی کە وێرای بڕانی کۆمەکی ئێران، درێژە بە شەڕی خۆ بدەن.

**بۆ درێژە پێدانی شۆڕش نەخشەیەک دانرا، بەپێی ئەم نەخشەیە دەبوایە ژمارەی هێزی پێشمەرگە بۆ ١٤-١٥ هەزار کەس کەم بکرێتەوە.**

**گەنجەکان بە پێشمەرگایەتی بێننەوە و ئەوانی دی بچنەوە مالی خۆیان. عەماری ئازوقە دروست بکرێ، سەرکردایەتی شۆڕش و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە پێنج ناوچەی جیاوازدا بن، جەنەرال بارزانی لە «بالەک» جێگیر بێ.**

**لە ١٩٧٥/٣/١٦ دا لەگەلاڵە و لە کۆبوونەوەیەکدا، بە ئامادەبوونی هەموسەرانی سوپایی و فەرماندەیی هێز و بەتالیۆنەکان، جەنەرال بارزانی نەخشەی پەلاماردانی شەرگەی رەواندزی پەسەند کرد.**

بڕیار درا هەموو پێشمەرگەکانی ئەم بەرەیە، بەشداری ئەم هێرشە بکەن. سەرکردایەتی لەشکری کوردستان ئامادەبوو ٢٠٠٠ پێشمەرگە فیدا بکات، بەو هیوایەی کەهێزی پێشمەرگە سەنگەری عێراقییەکان بکوتن و رایانمالن و تا «گەلی عەلی بەگ» پاک بکەنەوە.[22]

## ٨

## داروخانی شۆڕش

بەلام هەر هەمـــوو ئەم پرۆژە و بەرنامـــانە هەر زوو بوون بە بلـــقی ســـەر ئاو: لە ١٩٧٥/٣/١٥ بەپێی بڕیاری ڕێکەوتنی جەزایر، وەزیرانی دەرەوەی ئێـران و عێـراق (عەباس عەلی خەلعەتبەری و سەعدون حەمادی) لە تاران و بە سەرۆکایەتی بوتەفلیقەی وەزیری دەرەوەی جەزایر پێکەوە کۆبوونەوە.

وەزیرانی ناوبراو پاش ٤٨ سەعات گفتوگۆ، گەیشتنە ڕێکەوتنی تەواوەتی دەربارەی چۆنیەتی جێبەجێ کردنی ڕێکەوتننامەکە: لە ١٩٧٥/٣/١٧ دا قەواڵەیەکیان ئیمزا کرد کەبە پێی ئەو قەواڵەیە بڕیاری دامەزراندنی سێ کۆمیتە و مۆڵەتدانی چالاکی «٥٠» ئەفسەری جەزایری لە هەردوو دیوی سنووردا درا.

لە ١٩٧٥/٣/١٨ دا، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی پارتی، لە کۆبوونەوەیەکی ترياندا لێبڕان کە دەست لە شەڕ هەلگرن.

**دەست کێشانەوەی جەنەراڵ بارزانی لەشەڕ هێشتا یەکێکە لە نهێنییە گەورەکانی دوا ساتەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد، گەورەیی تەمەن و ماندوویەتی روونکەرەوە وەلامی هەموو شتێک نییە، « هەروەها دەستبەردار بوونی ئێرانیش روونکردنەوە وەلامی هەموو لایەنێکی ئەو نهێنییە نییە.»**

**بە گوێرەی هەندێک ریوایەتان، پاش کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوە لەتاران، ئەفسەرێکی گەورەی ئێرانی هاتە نک بارزانی وهەرەشەی کرد کە ئەگەر درێژە بە شەڕی سوپای عێراق بدات، سوپای ئێران بێ دەنگ نابێ و دەستەو ئەژنۆ دانانیشێت، حەمید بەرواری کە یەکێک بوو لە فـەرمـاندەکـانی لەشکری کـوردسـتـان، لە روونکردنەوەیەکی دا بۆ ڕۆژنامەوانێک دروستی ئەو واریاتەی سەرێ را دەسەلمێنێ: ناوبراو بەو ڕۆژنامەوانە بێگانەیەی گوت: «ئێستا ئەگەر شەڕ بکەین، ئەوا نەک لەگەڵ یەک دەوڵەتدا، بەڵکو دەبێ لەگەڵ چەندین دەوڵەتدا شەڕ بکەین.»**

بە گـوێرەی گـوتەی هەندێ ژێدەرانی دی، جـەنەراڵ بارزانی دوای ڕێکەوتنی ٣/٦ جارەکی دی بۆ تاران گەڕایەوە و پاش ٢-٣ ڕۆژان، لە نشینگەکەیدا، کەلە راسـتـیـدا دەست بەسەر بوو، شای بینی.

شا بانگی کرد بوو و داوای لێکردبوو کە دەست لەشەڕ هەلگرێ، ئەوجا پێشنیـازی

کردبوو کەبیێ بە پەناهەندەی ئێران و گوتبووی «۱۲ ساڵان لە یەکێتی سۆڤیەتدا مابێتەوە، با ۲-۳ ساڵیش لە ئێراندا بژی»

یەکێک لەو رۆژاواییە دەگمەنانەی کە هەفتەیەک دوای رێکەوتنی جەزایر دیداری دەگەڵ بارزانی دا کردبوو «ئەمە دەمانێ بوو کە جەنەراڵ بارزانی لە کوردستان بوو. و ئازادانە قسەی دەکرد) ئەو رۆژنامەوانە دەڵێ «پیرەمێردێکی موو سپی بوو کە زامێکی قوڵ بە رووحییەوە بوو، دوو سەعاتی تەواو قسەی لەمەڕ ئەو (خیانەت)ە کرد کە دەرهەق بەو کرابوو. ئەم خۆی بە بەزیوو شکست خواردوو نەدەزانی! بارزانی بەخۆی باوەڕی بە بەردەوام بوونی شۆڕش هەبوو، بەڵام ئەمەشی لەبەرچاو بوو کە خەڵکی مەدەنی (بەتایبەتی خەڵکی بادینان) ئیدی ئەو توانانەیان نییە دوای بکەون.

دەیگوت کە ئامادەیە دەم و دەست لەگەڵ بەغدایە بکەوێتە گفتوگۆ و ئەو دان و ستانە دەست پێ بکاتەوە کەیەک ساڵ لەمەوبەر برا بوو.»[۲۳]

«هەیکەل»یش یەکێکبوو لەوانەی دەرفەتی بۆ هەڵکەوت کە چەند هەفتەیەک لەوەدوا، واتە لە هەوەڵی مانگی ۱۹۷۵/۵ دا لە تاران دا بارزانی بدینێ و لێبرا بچێتە بنج و بناوانی ئەو فاکتەر و هۆیانەی بوونە مایەی دەست کێشانەوەی بارزانی لە جەنگ.

جەنەراڵ بارزانی کە نەوو نیمچە بارمتەیەکە لەدەستی شادا و لە ئازادی رەفتار و گوتار مەحرومە، وەڵامی دەداتەوە: « تەنانەت ئەگەر سنوورەکانیشیان داپخستایە من هەر لە گەڵ بەردەوام بوونی شۆڕش دابووم، بەڵام وام بەچاک زانی کە لەوەی پتر نەبمە مایەی رشتنی خوێنی گەلی کورد و عێراق.»

لەسەری دەڕوات: « من تەسلیم نەبوومە» پێم باشتر بوو جارێ بە شێوەیەکی کاتی شۆڕش رابگرم.»[۲٤]

ژمارەیەک لە فەرماندە عەسکەرییەکان نەیاندەویست دەست لە شەڕ هەڵگرن، بەتایبەتی ئەسعەد خۆشەوی کە سەرپێچی لە فەرمانی جەنەراڵ بارزانی کرد و گوتی: « ئەنگۆش دەست هەڵگرن، من بەخۆم ئەوەندەم چەک و تەقەمەنی هەیە کەتا دوو ساڵی دی درێژە بە شۆڕش بدەم.!»

لێ بارزانی بروسکەیەکی دیکەی بۆ نارد و ئەمری پێکرد کە بەخۆی و خێزانەکەیەوە بۆ حاجی ئۆمەران بڕوات.

هەندێ لە فەرماندە عەسکەرییەکان و رێبەرانی حیزب تا (۳/۲٤)ش هەر لە بیری

ئەوە دابوون کە شۆڕشی پارتیزانی لە دەڤەری پێنجوێن دا هەڵگیرسێنن، بەڵام کە قەیرانی ساڵی ١٩٦٤ یان وەبیر هاتەوە کەسیان زاتی نەدەکرد مل بداتە ئەو کارە.

## ٩
## هەڵاتنی بە کۆمەڵ

کۆتایی ڕووداوەکە نزیک دەبووەوە.. ڕێبەران، ڕێگەی حاجی ئۆمەران و سنووری ئێرانیان گرتەبەر، لە بادینان دا، کە دووری ڕێگە کردبوویە کارێک کە جەماوەری خەڵک و پەنابەران بە زوویی نەگەنە دالدەیەکی ئێران، هەندێ کاری خەمین ڕووی دا.

ئەوە بوو کە عیسا سواری ئامر بە تالیۆن کاتێ ویستی هەڤاڵەکانی خۆی بە جێ بهێڵێ، بە دەستی ئەوان هاتە کوشتن.

لە سەرانسەری دۆڵی چۆماندا، هەر هەموان، رابەرانی خۆیان بە خیانەتکار دەزانی: لەم دوا ڕۆژانەی مانگی سێ دا، بەر ' هاتنی ڕۆژی ١/٤/٧٥ ( کەکۆتایی مۆڵەتی ئاگر بڕ بوو) کە ڕۆژێکی چارەنووس ساز بوو وەئەگەر ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی یان مەکتەبی سیاسی حزب، یان یەکێک لە کوڕانی بارزانی زاتیان بکردایە و لە ڕێگەی حاجی ئۆمەران و چۆماندا بەدیار بکەوتنایە، دەم و دەست دەکوژران، ئەمە قسەی کەسێکە کە بەچاوی خۆی دیەنە خەمگینەکانی دوا ساتەکانی ژیانی «حەسار و قەڵای کوردستان»ی دیتووە.

دوا دانیشتوانی گەڵاڵە و چۆمان و دەربەند، بەنزینیان بەماڵ و دوکانەکانیاندا کرد وسوتاندیانن، لە کاتێکدا لە بێ دەسەڵاتی و نائومێدی دا دەگریان، دەنگی دەستڕێژی تفەنگ و رەشاش سەرانسەری دۆڵەکەی پڕ کردبوو، پێشمەرگە ئەم تەقانەیان دەکرد، دەیانویست بەر لەوەی تفەنگەکانیان بشکێنن و بە دیوی ئێران دا بچن، تەقەمەنییەکانیان تەواو بکەن.

لە ١٩٧٥/٣/٢٠ دا رەشید سندی، کە یەکێک بوو لە فەرماندە عەسکەرییکان، فەرمانی راگرتنی شەڕی (لەلایەن بارزانییەوە) قەبوڵ کرد.

لە ١٩٧٥/٣/٣٠ بە شەو، جەنەراڵ بارزانی کە لە ٣/٢٢ وە لە ڕێگەی کەناڵین دیبلۆماسیەوە داوای پەنابەری لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا کردبوو،(25) بۆ دوا جار لە حاجی ئۆمەرانەوە لە سنوور پەڕییەوە.

جەنەراڵ بارزانی نزیکەی سێ ساڵێک دوای قازی محەمەدی سەرۆکی کۆماری تەمەن

کورتی مەهاباد، کە هەر خۆی بۆیە تازی بە خیانەت تاوانبار کردبوو کە بێ هیچ شەڕێک ۱۰۰۰۰ تفەنگی تەحویلی ئێران دابوو ئەمیش دەستی لەو شۆڕشە هەڵگرت کە لە پێناوی وەدەست هێنانی (مافی گەلی کورددا) هەڵی گیرساندبوو. پاش ئەوەی چل ساڵی تەمەنی خۆی لە قەبیلی ئەم خەباتە چەکدارییە کرد، دیسان ڕێی تاراوگەی گرتەبەر، پشتی لە دام و دەزگایەک کرد کە لە سەردەمی «ئەفسانە ئاسا»ی میر بەدرخان بەم لاوە بەهێزترین «حکومەت»ی کورد بوو.

## ۱۰

## کۆتایی

دوای چەند هەفتەیەک، دوا گرووپی ڕێبەرانی کوردی وەفاداری بارزانییەت لە ئۆردوگای نەغەدەی نزیکی مەهاباد دەبینی.

هیچ لێقەوماو وکارەسات دیدەیەک هەرگیز بە ئەندازەی ئەمانە گوناح و مایەی بەزەیی نەبوو.

چەند خێوەتێک لە قەراخ شارۆچکەی نەغەدەدا هەڵدرابوون و لە جیاتی «بارەگای» سەرانی کورد بوو: ئیدریس، مەسعود، سامی، عەلی عەبدوللا.. مەسعود کە حەزی نەدەکرد روخانی خۆی بخاتە روو، خۆی لە دیداران دەپاراست.

سامی لە تفاقی نووسینگە تەنیایەک مێزی بچوکی هەبوو، لە ژێر خێوەتێکدا، لەگەڵ دوو کورسی و فایلێکی نیمچە کراوەی بەتاڵیش بەسەر مێزەکەیەوە بوو. کە سیمای «سەرەک وەزیرە»ی کوردستانت دەبینی مەحاڵ بوو تەسەور بکرێ کە ئەم پیاوە شان و شەپیلک داتەپیوە، ڕەنگ وروو سیسەڵە و چرچەڵەیەی کە لەبەر چاوت بوو، چەند هەفتەیەک لەمەوپێش توانیێتی بەسەنگ و هێزی سی هەزار پێشمەرگەی لەشکری کوردستان، کە یەکێک بوو لە باشترین سوپاکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، لەگەڵ شای ئێران و سەرۆک سادات و کیسنجەردا دانیشتبێ و گفتوگۆی کردبێ.

سامی هیچی پێ نەبوو بیڵێ، هەر ئەوەندەی بۆ دەگوترا کە «شۆڕشی چەکداری کورد تەواو بوو، لە باری سیاسییەوە کاری ئەم گروپەی ڕێبەرانی کورد تەواو.»

ئەم کەسایەتییە کە ئەندازیاری هاوپەیمانی دەگەڵ «سیا» دا بوو بە کەسەرەوە لەسەری ڕۆیی: «کەسێکی زۆر لەئێران گەورەتر بەڵێنی پێ بەردەی دابووینێ، ئەم بەڵێنانەی ئەبردە سەر.»[٣٦]

بەلام ویڕای ترس و نیگەرانی (سیا) کوردەکان تا کۆتایی لەسەر بەڵێنی خۆیان مانەوە و چ شتێکیان لەمەڕ نەخشی ئەمەریکا نەدرکاند.

لە ئۆردوگای نەغەدەدا، کادرانی ڕژێمی بارزانی هەموو خەمبار و بێکار، لەم خێوەتەوە بۆ ئەو خێوەت دەچوون، فەرەنسۆی فەرمانداری جارانی گەلاڵە، عەلی عەبدوڵلای وەزیری جارانی دارایی، شوان شاخەوانی بەرپرسی نووسینگەی ئاوەدانکردنەوەی دیهاتان و زۆری دیکە.

بەلام بێگومان لە هەمووان نا ئومێدتر خوێندکارانی زانکۆ بوون کە بە نیگەرانی و پەشێوی لە خۆیان دەپرسی کیڤە بچن؟

ژمارەیەکیش پێشتر بڕیاری خۆیان دابوو، وەکو سالح یوسفی، کە لەگەڵ ڕاگەیاندنی ڕێکەوتنی جەزایردا، لە ڕەواندز خۆی تەسلیمی کاربەدەستانی عێراق کرد، خەڵکانی دی، کە بە ئوتومبیلی ساواک، لە تاران دا دەسووڕانەوە، دوای ماوەیەکی کەم بە پەساپۆرتی عێراقی بۆ بەیروت ڕۆیشتن.

بەلام بۆ زۆربەی ئەو خوێندکارانەی کە لە عێراق یان لەئەوروپا دا دەستیان لە خوێندنی زانکۆ هەڵگرتبوو و پەیوەندییان بەبارزانیەوە کردبوو، وەزعەکە یەکجار نارەحەت بوو: بەلای ئەمانەوە مەسەلەی سوود وەرگرتن لەو عەفواتەی کە دەوڵەتی عێراق دەری کردبوو، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ۱۹۷۵/٤/۳۰ دا بۆ ماوەی ۲۰ ڕۆژی دی درێژی کردبوەوە، تا ئەوانەی دەیانەوێ سوودی لێوەربگرن، بتوانن بۆ عێراق بڕۆنەوە، لە ئاردا نەبوو.[27]

هەرچەندە سەدام حوسێن وادە و بەڵێنی دەدا، بەلام زۆربەی ئەوانە ترسی ئەوەیان هەبوو کەئەگەر بۆ عێراق بگەڕێنەوە ئازادی خۆیان لە دەست بدەن و زۆریشیان نیگەرانی گیانی خۆیان بوون.

سەدام حوسێن لە سەفەرێکی ڕەسمی خۆیدا بۆ تاران (۲۹/٤-۱/٥/۱۹۷٥) ڕایگەیاند کەتەنیا «چوار کەس هەقی گەڕانەوەیان بۆ عێراق نییە، جەنەراڵ بارزانی، ئیدریس، مەسعود، ومحەمەد خالید (یەکێکە لە دوو کوڕەکەی شێخ ئەحمەد) ئەوانی دی هەر کێیەک هەن و هەر خەتاو تاوانێکیان کردوە، هیچ شتێکمان لە گەڵ دا ناکرێ: کەسیش لەسەر تاوانێک کە لە داهاتوودا دەکرێ پێشوەختە قەساس ناکرێ.»[28]

پاش خیانەتی شا، مانەوەی ئەم هەموو خوێندکارە لە ئێراندا، یانی لە وڵاتێک دا کە

زمانەکەیان نەدەزانی و لە رژێمەکەی بێزار بوون، جێگەی باس نەبوو.

ئەم خوێنکارانە کە زۆریەیان بێ پەساپۆرت بوون، تا ئومێدانە لە هەوڵی ئەوەدا بوون بگەنە پاریس یان لەندەن، بەلام دەرگاوانانی سەفارەتخانەکان دەستووریان پێ درابوو (نەیەڵن، بێنە سنووری سەفارەتخانەکان وەدەرگایان لە رووردا نەکەنەوە.) ئەم خەڵکە تەنانەت نەیاندەتوانی کونسوڵش بدینن، سەرەنجام وڵاتانی بچووکی وەکو سوێد و هۆڵەندا و نەمسا رێزی یاسا و رێسای پەناهەندەییان گرت و هەر یەکەیان چەند سەد کوردێکیان وەرگرت، ... ستاش وەری دەگرن.

بەڵای جەماوەرێکی زۆری پەنابەرەکانەوە، مەسەلەی گەڕانەوە بۆ عێراق یان مانەوە لەئێرانا و پەرتەوازە بوون لەم وڵاتەدا، بە هیچ جۆرێ لە ئارادا نەبوو. لەمانگی ۱۰/۱۹۷۵ دەیان هەزار پەنابەری کورد کە هێشتا ئامادە نەبوون بۆ عێراق بگەڕێنەوە، لەزۆر ئوردوگایاندا شەڕ لە نێوان مامورانی ساواک و پەنابەرەکاندا قەوما!

بەڵام جەنەراڵ بارزانی کە بۆماوەیەک لە مانگی ۹ و ۱۰/ ۱۹۷۵ بە رەزامەندی و پشتیوانی «سیا» لە ئەمریکادا مایەوە، لە نشینگەکەی خۆیدا لە کەرەجی نزیکی تاران دا، لە ژێر چاودێری دابوو.

لە سەرەتای هەیڤی ۱۹۷۵/۵ رۆژنامەیەکی ئێرانی دیمانەیەکی دەگەڵ بارزانی دا ئەنجام دابوو رەسمێکی ئەم پێشەوا کوردەی بە جلی ئەوروپاییەوە بلاو کردەوە، بارزانی لەم دیمانەیەدا رای دەگەیەنێ کە شۆڕش «تەواو بووە و هەرگیز سەر هەڵنادادەوە» و لەسەری دەروات کەوبەردەوام بوونی جەنگ بێهودە» بوو.[۲۹]

**شا، بە بلاوکردنەوەی ئەم قسە شێوێنراوانە یان درۆیانە، لە کاتێکدا کە جەنەراڵ بارزانی لە کەمترین مافی کوردێک، واتە لە مافی لەبەر کردنی جلی نەتەوەیی خۆی مەحروم کردبوو دەیویست بە شێوازی تایبەتی خۆی خاڵی کۆتایی بۆ سەربوری کوردستان دابنێ.**

بەڵام هەر لە هەمانکاتدا جەنەراڵ بارزانی لە دیدارێکی تایبەتی دا دەگەڵ هەیکەل، کە بە بێ ئامادەبوونی شایەت و چاودێری بێگانە ئەنجامدرا، توانی دوا پەیامی خۆی بە جیهان رابگەیەنێ: «دەوری شەخسی من تەواو بووە، بەڵام کۆتایی هێنان بەژیانی نەتەوەی کورد مەحاڵە و رێبەرانی دیکە لە باوەشی نەتەوەی کوردەوە را دەبن.»[۳۰]

## سەرچاوە و پەراوێزان


١- دکتۆر مەحمود عوسمان، شوباتی ١٩٧٥

٢- ڕاپۆری پایک، نووسراوی ٤٦٦

٣- هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، ٣/١٠/١٩٧٤ زاهیدان

٤- ڕویتەر، دەیلی تەستار، ٢٨/١٢/١٩٧٤

٥- بڕوانە نیگارۆ ژمارەی ڕۆژی ١٧/١٢/١٩٧٤ و واشنگتۆن پۆست ١٧/١٢/١٩٧٤

٦- لوموند، ١٦/١/١٩٧٥

٧- هەڵپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، ٣/١٠/١٩٧٤

٨- سەرەنجام خاچی سوری سویدی ١٣٠٠٠ هەزار پەتۆ و ٣٥ تۆن جل و بەرگ و دلو دەرمان و ئامێری نەشتەرگەری بۆ کوردکانی عێراق نارد، کۆمیتەی نێونەتەوەیی خاچی سووریش ١/٥ تۆن دەرمانی نارد، پاشماوەی کۆمەکەکانی ئەم کۆمیتەیە کە لەوانە ١٠ تۆن گۆشت و ٥ ئەمبولانس بوو، دوای مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی جەزایر گەیبە تاران.

٩- ڕاپۆری پایک، نووسراوی ٤٦٦

١٠- دیانەی بارزانی دەگەڵ هەیکەل دا، کە لە ألنوری بەیروتی ١٢/٩/١٩٧٥ و گۆڤاری ئۆزگورلوکی تورکیا بڵاو بووتەوە.

١١- سەرچاوەیەکی دیپلۆماسی تاران.

١٢- سەرگوتاری لوموند، ١٠/١/١٩٧٥ دەربارەی نزیک بوونەوەی لە نوێ ولاتانی عەرەب وتێهران.

١٣- واشنگتۆن پۆست، ٧/٣/١٩٧٥.

١٤- بڕوانە ژمارەی ڕۆژی ١٢/١ کوتیدین دوپاری. گوتاری کریس کۆچیرا.

١٥- اخبار اليوم، لە الاحرارەوە وەریگرتووە، بڕوانە کتێبی حیزبی سوسیالیستی بەعسی عەرەبی، ل٢١ نووسینی کامیل ئەبو جابر

١٦- بۆ زانیاری لەسەر دەقی ئەم بەڵگەنامەیە بڕوانە ڕاپۆری ئاژانسی فەرەنسا لە لوموندی ڕۆژی ٨/٣/١٩٧٥ و دەیلی تەستاری ٧/٣/١٩٧٥

١٧- بە گوتەی ئیدریس بارزانی ٣٠٠ کوژراو، ١٨ زرێپۆش و ٣ فڕۆکە.

١٨- بڕوانە لوموندی ١٥/٣/١٩٧٥ و دەیلی تەستاری ١٤/٣/١٩٧٥.

١٩- ڕاپۆری پایک، نووسراوی ٤٦٣

٢٠- ڕاپۆری پایک، نووسراوی ٤٦٩.

٢١- ڕاپۆری پایک، نووسراوی ٤٧٠.

٢٢- لە ڕوانگەی سەرچاوە ئاگادارەکانی کوردەوە دەبێ ئەم بابەتە بە وریایی و پارێزەوە وەربگیرێ، جەنەراڵ بارزانی هەمیشە لەم بارەیەوە دوورەپەرێزی دەکرد، بەتایبەتی کاتێ کە خەتەر ڕووی لە

خەڵکانی خوردی ئەو دەکرد.

٢٣- سەرچاوەیەکی نهێنی.

٢٤- دیمانەی بارزانی دەگەڵ هەیکەل دا. ئۆزگورلوک.

٢٥- پەیامی تەلەگرافی جیم هوگلاند، پەیامنێری واشنگتۆن پۆست. ئینتەر ناشنال هیرالد تریبیون.
١٩٧٥/٣/٢٤

٢٦- هەڤپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، لە بەغدەد، ١٩٧٥/٤/٢٦

٢٧- ئاژانسی رویتەر، دەیلی ئەستار، ١٩٧٥/٥/١

٢٨- کۆنفەرانسێکی تایبەتی رۆژنامەوانی، ١٩٧٥/٥/١ لە تاران.

٢٩- کەیهان ئینتەر ناشنال، تاران ١٩٧٥/٥/٤.

٣٠- دیمانە دەگەڵ هەیکەل دا، ئۆزگورلوک.

## فەسڵی یەکەم

### بزاڤی کورد لە تورکیا ١٩٥٨-١٩٧٥

خـــەباتی دووروودرێژی بارزانی لە رای وەدەست هێنانی ئۆتۆنۆمی یان ســـەربەخـــۆیی (١٩٦١-١٩٧٥) کارێکی وای کردووە کە کوردستانی عێراق زیاتر لەبەرچاو بێ و لە ریزی پێشەوەدابێ و مرۆڤ زۆری لە بەرگران نەبێ کە واریقات و سەربوری کــوردستانی تورکیـار ئێران فەوامۆش بکات: راستە ئەم دوو بەشە شایەتی قۆناغێکی دووردرێژی هەڵشکان و داکشانی شۆرش بوونە، کە دەکرێ لە چەند لاپەرەیەک دا بەکورتی و پوختی بەرجەستە بکرێ.

پاش ئازاری ١٩٧٥، دوای ریکەوتنی جەزایر و داروخانی شۆرشی جەنەراڵ بارزانی، وەزع و حاڵی کــوردســتانی عـێـراقـیش هەمـان خرابی و پەشێوی بەشەکانی دیکەی کوردستانی گرتە خۆ وبزاڤی نەتەوەیی کورد، کە غەمگینترین ساتەکانی مێژووی خۆی دەگوزەراند، وەکو جاران بە رووی هەر جۆرە ئاسۆیەکدا کرایەوە.

***

پاش سەرکوتکردنی خوێناوی شۆرشی دەرسیم، بە نزیکەی بیست ساڵێک ئەوجا هەندێ هەوڵ و کۆشش بۆ بوژاندنەوەو و کۆکردنەوەی هێز، لە کوردستانی تورکیادا پەیدا بوو، موسا عـەنـتـەر و جـانـب یولدروم، لە خوێنەواران و رۆشنبیرانی دیارەکر بوون لە ساڵی ١٩٥٨دا هەفـتـەنامـەیەک بە نێـوی ئیللەری یورت دەردەکـەن، کـە بایەخ بە مـەسـەلە ناوچەییەکان دەدات.

لە هەمان کاتدا خوێنەوارانی کوردی ئەستەمۆڵ و ئەنکەرا لە رێکخراوە رۆشنبیرییەکاندا کۆ دەبنەوە.

کاریگەری رووداوەکانی عێراق، بەتایبەتی پاش ساڵی ١٩٦٢ و دەستپێکردنی شەڕ لە نێوان بارزانی و قاسم دا، لەسەر ئەم چالاکیانەی کوردێن تورکیا زەق و دیارە و هیچ چەند و چونێک هەڵناگرێ.

**کوردەکانی تورکیا ئێراوێتر یارمەتی بارزانی دەدەن و بارزانی هەر زوو لە لای ئەوان وێنەی قارەمانی نەتەوەیی وەردەگرێ.**

هەڵبەتە ئەم چالاکییە هەر زوو بەر گورزی سەرکوتکاری دەکەوێ: لە نەیلی ١٩٥٩/١١دا چل و نۆ رۆشنبیر و خوێنەواری کورد دەگیرێن و بە تۆمەتی ئەنجامدانی چالاکی جوداخوازانە لە ئەنکەرەدا دادگایی دەکرێن. ئەمانە کە بە «پیلانگێڕی بە مەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی» تاوانبارن هەموو حوکمی درێژخایەن دەدرێن، بەڵام دوای کودەتا عەسکەرییەکەی ٢٧/٥/١٩٦٠ ئازاد دەکرێن.[١]

**«جەنەراڵ گورسەل‌ەی سەرکۆماری تازە، لایەنگری «زەبروزەنگە» و بە رۆژنامەوانێکی سویدی دەڵێت: «ئەگەر ئەم «کێویانە» نەحەوێنەوە ئەوا سوپا لە تۆپبارانی شارو گوندەکانیان ناپرینگێتەوە و حەمامی خوێنێکی وەهایان بۆ دادەخات کە خۆیان و خاکیان تێدا غەرق دەکات.»[٢]**

بەڵام عیسمەت ئینۆنوی سەرەک وەزیر لەگەڵ کاری وەهادا نەبوو، کوردەکان لە زەمانی حوکمڕانی ئەم سەرەک وەزیرەدا کە «بەرواڵەت لایەنگیری دیموکراسی بوو» تۆزە ئازادییەکیان هەبوو: بڵاوکراوەی کوردی رێدران، بەڵام پاشان داخران. خوێنکارانی کورد دەیانتوانی نمایشی فولکلوری لەسەر شانۆ وازی بکەن.

دەوروبەری ساڵی ١٩٦٣ سێ رێکخراوی سیاسی، نەتەوەپەروەران و خوێنەرارانی کورد دەگرنە خۆ.

١

## حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا

حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا لەلایەن مافپەروەرێکەوە بە ناوی فایق بوجاک هاتۆتە دامەزراندن، ئەم پیاوە خەڵکی ئورفەیە و نوێنەری ئەنجومەنی تورکیا بوو، ئەم حیزبە رێکخراوێکی تەواو نەتەوەیی بوو و زۆر لە ژێر کاریگەری ناسیونالستانی کوردی سوریادا بوو. ئەندامانی ئەم رێکخراوە بە زۆری بریتی بوون لە پیشەوەران ورۆشنبیران و خوێنەواران و پیاوماقوڵانی گوندەکانی کوردستان. لە حاڵێکدا جێگرانی رێبەرانی ساڵانی بیستەکان و موڵکدارانی گەورەی رژێم دۆست پەیوەندیان بە حیزبی «تورکیای نوێ»وە کرد و عەزیز ئوغلویان بە نوێنەری دیاریەکەر هەڵبژارد، کە لە ساڵی ١٩٦٣ دا بوو بە وەزیری ساغڵەمی و تەندروستی.

٢

## کوردەکان وحیزبی کرێکارانی تورکیا

لە تورکیاش دا وەکو عێراق، حیزبی کۆمونیست دەسەلاتێکی زۆری لە نێو تێکۆشەرانی نیشتمانپەروەری کوردا هەیە. بۆیە خەڵکێکی زۆری پێشکەوتووی کورد، بەتایبەتی خوێنەواران لە ساڵی ١٩٦٣ بەملاوە لە نێو حیزبی کرێکارانی تورکیا دا دەبینرێن و چالاکانە کار دەکەن.

حیزبی کرێکارانی تورکیا لە سەرەتادا هەڵوێستێکی زۆر خراپی لەمەڕ مەسەلەی کورد هەبوو. لە ساڵی ١٩٦٧دا سەرۆکی ئەم حیزبە، محەممەد عەلی ئایبار، کە بەخۆی تورکە، **لە ستۆکهۆلم و لە کۆنفرانسێکی نێونەتەوەییدا رایگەیاند کە «مەسەلەی کورد لە تورکیادا نییە». لە ساڵی ١٩٦٦ وە کوردەکان گەیینە ئەم قەناعەتەی کەیان لە ناو حیزبی کرێکارانی تورکیا دا رێکخراوێن ئۆتۆنۆمی بۆ خۆ دامەزرێنن یان بە جیا چالاکی خۆیان بکەن.**

لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ساڵی ١٩٦٥دا پانزە پاڵێوراوی حیزبی کرێکارانی تورکیا، کە چواریانن کورد بوون، بۆ ئەندامێتی ئەنجومەن دەرچوون. یەکێک لەو پازدە کەسە دکتۆر تارق ئەکینجی نوێنەری دیاربەکر بوو، کە پاشان لە ساڵانی ١٩٦٨-١٩٦٩ دابوو بە سکرتێری گشتی حیزبی کرێکارانی تورکیا. لە ساڵی ١٩٦٩دا، محەممەد عەلی ئەسلان کە کوردە، بوو بە رێبەری حیزبی کرێکارانی تورکیا، لە ئەنکەرەدا مانگنامەیەکی بە هەردوو زمانی (کوردی وتورکی) بە ناوی «یەنی ئاکوج»وە دەرکرد و لەوێدا بۆ یەکەمین جار لە گۆڤارێکی مۆڵەتدراو دا مەسەلەی مافی نەتەوەیی گەلی کورد خرایە روو.

**ئەم گۆڤارە دوای ژمارە «٤»ی داخرا.**

٣

## قەیرانی ١٩٦٧

ژمارەی گۆڤارێن دوو زمانەی تورکی- کوردی زیاد دەکات، دجلە، فورات، دەنگیش هەر یەکەیان دوای چەند ژمارەیەک دادەخرێن. موسا عەنتەر ولۆەنامەیەکی کوردی - تورکی بلاو دەکاتەوە، هەروەها نووسەرێکی دیکە بە نێوی محەممەد ئەمین بۆز ئەرسەلان (دانەری لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتی- ئابوری لەمەڕ کوردستان)[٣] مەم و زین بە کوردی- تورکی چاپ و بلاو دەکاتەوە.

ئەم دووانە هەر زوو دەگیرێن.

لەمانگی ۱۹٦۷/۱دا حکومەتی سلێمان دەمیریل قەرارێک دەردەکات و «هێنان و بلاو کردنەوەی هەر بابەتێکی (کاسێت و بلاکراوەی) کوردی لە دەرێرا نامادەکراو بە هەموو شێوەیەک قەدەغە دەکات.»[٤]

دوای چەند مانگێک گۆڤاری نوتکنی پان تورانی، کە پێشتر و لە نیسانی ۱۹٦۷ دا گوتارێکی پڕ لە هێرشی دژی کوردان بلاو کردبووەوە، دیسان و لە حوزەیرانی ۱۹٦۷ دا دەست بە کار دەبێتەوە و لە گوتارێک دا بە نێوی «قڕوسکەی کوردانی سوورە! دێتە مەیدان.

نووسەری گوتارەکە هەوسار دەپچڕێ، و بە زمانێکی توندوتیژ و زبری وەک زمانی سەرانی تورکی سالانی بیست (بڕوانە فەسلی چوارەم لە بەشی دووەم) دەنووسێت:

«ئەگەر دەیانەوێ بە زمانە پاشکەوتووە ٤-٥ هەزار وشەییەکەیان قسان بکەن، ئەگەر دەیانەوێ ولاتێک بۆ خۆیان دامەزرێنن و بلاوکراوەیان هەبێ، ئەوا با بڕۆن بۆ جێیەکی دیکە.

«لەوانەیە (لە شارەکانی خۆیاندا) لە سەدا سەدی زۆرینە پێک بهێنن، بەلام خەون دیتن بە دامەزراندنی دەولەتێکەوە لە خاکی تورکیادا، وەکو خەون دیتنی یونانییەکانە بە دامەزراندنی بیزانسەوە، وەکو خەون دیتنی ئەرمەنییەکانە بە دامەزرانی ئەرمەنستانی گەورەوە، بۆ کوێ دەڕۆن با بڕۆن، بۆ ئێران، بۆ پاکستان بۆ هیند، بۆ لای بارزانی! با بڕۆن داوا لە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بکەن کە لە ئەفریقادا! شوێنێکیان بۆ بدۆزێتەوە، ئەنگۆ لە خزمەتی ناسیونالیزمی کوردان، زمانی جیاو و قوتابخانەی ئەلاحەدەو بەرنامەی رادیۆیی و چاپەمەنی و بلاوکراوەی تایبەت بە خۆتان، لە ئێمە دەوێ، بۆ دامەزراندنی حکومەتی خۆتان کۆبوونەوەی نهێنی دەکەن، بارزانی بە ڕێبەری خۆتان دەزانن، لە تورکیاوە چەکی بۆ دەنێرن، لە کۆڕو کۆبوونەوە تایبەتییەکانتاندا شیعری کوردی بۆ مندالەکانتان دەخوێننەوە.»

نووسەری گوتاری ناوبراو لە کۆتاییدا دەلێ : « ئەو ڕۆژەی کە بۆ پارچە پارچە کردنی تورکیا، شۆڕش بەرپا بکەن دەبینن کە ئێمە چین! دەبینن!»[٥]

کوردەکان هەر زوو ناڕەزایی دەردەبڕن، بەیاننامەیەک بە ناوی «باشە وەرنە مەیدان، تا بزانین کە کێ کێ ڕاودەنێ» بلاو دەکەنەوە. ئەنجومەنی قوتابیان و خوێنکارانی ۱۹ شاری

کوردی وەک بینگۆل و بەتلیس و ئەلعەزیز و جەزیرە و دیاربەکر و ئەرزڕۆم و وان و ئورفە و موش و سەقەرک، لە نووسەری نوتوکن دێنە دەنگ و پێی دەڵێن : « تۆ دەتموێ ئێمە بخەیتە شەڕ و براکوژییەوە و وڵات لە گۆمی خوێندا غەرق بکەیت و بیکەیت بە مەیدانی جەنگ. زۆر چاکە، فەرموون ئەوە عەرز وئەوە گەز، ئەوە مەیدان، با بزانین کێ کێ لە وڵات وەدەردەنێ.» (٦)

لە سەر داوای ئەنجومەنی خوێنکارانی کورد لە رۆژی ١٩٦٧/٨/٣ خۆپیشاندانێکی بەربلاو لە سەرانسەری کوردستاندا بەرپا کرا. لە سلیڤان دا پتر لە ١٠/٠٠٠ کەس و لە دیاربەکردا پتر لە ٢٥/٠٠٠ کەس بەشداری ئەم خۆپیشاندانانەیان کرد.

ئەم خۆپیشاندانانە لە مێژووی بزاڤی نەتەوەیی هاوچەرخی کوردی تورکیادا بایەخێکی زۆر ودیاری هەیە. چونکە کوردێن تورکیا پاش تێپەڕبوونی سی ساڵان بۆ یەکەمجار زاتیان کردبوو سەربەرز بکەنەوە و بە دەنگی بەرز داوا لە کاربەدەستانی تورکیا بکەن کە بێنە مەیدان.

ئیدی سەرکوتکاری کوردستان دەگرێتەوە: بە ماوەیەکی کەم دوای ئەم خۆپیشاندانانە، فایق بوجاکی نوێنەری ئورفە و دامەزرێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا، لە کەش و هەوایەکی تەم ومژاویدا بە دەستی مامورانی ئەمنی تورکیا دەکوژرێ. ئیدی مستەفا بوجاکی ئامۆزای کە رۆشنبیر و نوێنەی جارانی ئەنجومەن بوو، بە ناچاری وڵات بە جێ دێڵێ و پەنا وەبەر هەندەران دەبات. (٧)

پۆلیسی تورکیا، لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٨ دا هەموو سەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا، کە سەعید ئالچی یەکێک دەبێ لەوان، دەگرێ و پاشان ئازادیان دەکات.

٤

## دووبەرەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا (١٩٦٩)

حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا لە ساڵی ١٩٦٩ دوو بەرەکی تێدەکەوێ و دەبێتە بەدوو گرووپی هەڤڕکەوە، گرووپێکیان بە سەرۆکایەتی سەعید ئالچی دەبێت کە نوێنەری جارانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی (سووریا) بوو، گرپەکەی دی بە سەرۆکایەتی پزیشکێک بوو بە نێوی دکتۆر شڤان، لەگەڵ دوو رێکخراوی دیدا، کە لە ساڵی ١٩٦٨ دا دامەزرابوون، یەک دەگرێت: دوو رێکخراوەکە بریتی بوون لە «حیزبی دیموکراتی

کوردستانی تورکیه» و (پارتیا دیموکراتا کوردستانا تورکیا) کۆمەلا ئازادی.

دکتۆر شڤان، کە لە ساڵی ۱۹٦۹وە لە کوردستانی عێراقدا خەریکی کاری پزیشکی بوو، بە گوتەی هەندێک ژێدەرێن کوردی لەوێندەر پێگە و بنکەیەکی دە ئیختیار دابوو بۆ راهێنانی لایەنگرەکانی خۆی کە ژمارەیان ٤۰۰ تا ٥۰۰ کەسێک دەبوو.

دژایەتی نێوان ئەم دوو گروپە خەنیمەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا زۆر زوو دەگۆڕێت و سەعید ئالچی لە هەلومەرجێکی ئالۆزدا دەکوژرێ، بە گوتەی هەندێک، لە لایەن پیرۆزی دکتۆر شڤانەوە کوژراوە. دکتۆر شڤانیش لەلایەن پێشمەرگەکانی بارزانییەوە دەگیرێ و لە دادگایەک دا بەسەرۆکایەتی حەبیب کەریمی سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، دادگایی دەکرێ و ئیعدام دەکرێ.

## ٥

## بنکە رۆشنبیرییە شۆڕشگێرییەکانی (رۆژهەلات)

لە ئاخر و ئوخری ساڵی ۱۹٦۸ و لە هەوەڵی ساڵی ۱۹٦۹دا ، کە هێشتا خۆپیشاندانەکانی رۆژهەلاتی تورکیا بەردەوام بوون، ژمارەیەکی زۆر لەو خوێنکارە کوردانەی کە تا ئەو دەمە لە حیزبی کرێکارانی تورکیادا کاریان دەکرد، لەم حیزبە دوورکەوتنەوە، چونکە بە ئانقەست مەسەلەی کوردی پشت گوێ دەخست، لە حیزبی نێوبراو دوورکەوتنەوە و بۆ خۆیان یەکێتیەکیان پێکەوە نا، بەناوی «بنکە رۆشنبیرییە شۆڕشگێڕەکانی رۆژهەلات» دوورینجی دوگوکولتور اجاک لەری: د.د.ک.او.

## ٦

## کریارێن کۆماندۆیی

دەولەتی تورکیا کە لە راپەرینی نەتەوەیی کورد و بەرەسەندنی ئەو راپەرینە، بەتایبەتی دوای رێکەوتننامەی ۱۱/۳/۱۹۷۰ و دانی ئوتونومی بە کوردستانی عێراق، ترسا بوو، لە ژێر گوشاری سوپادا کەوتە کاری کۆماندۆیی دژی کوردەکان.

یەکێک لەم کارە کۆماندۆییانە لە ۱۸/٤/۱۹۷۰ دا لە سلیڤان ئەنجام درا: شەوێ ۲۰۰۰ کۆماندۆی هێزی تایبەتی جەندرمە، بە ۲۰۰ لۆری وشەش هەلیکۆپتەرەوە شاریان گەمارۆدا، کۆماندۆکان بەرەبەیان چوونە نێو شارەوە و بە بیانووی پشکنینەوە، هەموو ماڵەکانیان تالان کرد. هەموو پیاوانی شاریان، کە ژمارەیان ۳۱٤٤ کەس بوو لە دەرێی

شار خر کردنەوە و بەدرەفتاریان دەگەڵ کردن: سەربازەکان دارکاریان دەکردن و جنێویان دەدانێ و هاواریان بەسەردا دەکردن: **«کوردی سەگ، جاسوسانی بارزانی! کوا چەکەکانتان لە کوێ شاردۆتەوە!»**

چەندین کاری کۆماندۆیی دیکەی لەو بابەتە لە سالانی ١٩٧٠ و١٩٧١ لە چەند شارۆچکەیەکی کوردستانی وەک بینگۆل و باتمان و تاتوان و لە چەندین گوندێکدا ئەنجام دران.

لە مانگی ١٠/ ١٩٧٠ دا نزیکەی ٣٠ کەس لەرۆشنبیرانی کوردی وەکو دکتۆر تارق ئاکنجی، جانب یولدرم، موسا عەنتەر و محەمەدەمین بوز ئەرسەلان گیران و پاش چند رۆژێک ئازاد کران. هەر لەو دەمەدا پۆلیس، ژمارەیەک لە خوێنکارانی سەر بە «بنکە رۆشنبیرییە شۆڕشگێرییەکانی رۆژهەلات»یان گرت.

## ٧

## حیزبی کرێکارانی تورکیا و مەسەلەی کورد

حیزبی کرێکارانی تورکیاش وەکو حیزبی کومونیستی عێراق سەرەنجام لە ژێر گوشاری رووداوەکاندا ناچار بوو بە هەلوێستەکانی خۆیدا، لەمەڕ مەسەلەی کورد بچێتەوە.

لە ئاخرو ئوخری سالی ١٩٦٩ دا محەمەد عەلی ئەسلانی کورد، لە جێی محەمەد عەلی ئایباری تورک بۆ رێبەری حیزبی کرێکارانی تورکیا هەلدەبژێردرێ. هەر لە هەمان سالدا سابان ئەریکی تورک لە جێی دکتۆر تارق ئەکینجی دەبێت بە سکرتێری حیزب.

سەرکردایەتی تازەی حیزبی کرێکارانی تورکیا لە کۆنگرەی چوارەمی خۆیدا (٢٩-٣٠/ ١٠/ ١٩٧١) بەیاننامەیەک دەربارەی مەسەلەی کورد دەردەکات و ئەم خالانە پەسند دەکات:

**« میللەتی کورد لە رۆژهەلاتی «ولاتدا» هەیە (ئەمە حەقیقەتێکە، بەلام لەلایەن ئەو کاربەدەستانەوە کە سووربن لەسەر ئەوەی کوردەکان بە «کێوی» و کوردستانی تورکیا بە «رۆژهەلات» ناو ببرێن، حاشای لێ دەکرێ!**

بەیاننامەکەی حیزبی کرێکارانی تورکیا لەسەری دەڕوات:

**«هەر لە سەرەتاوە رژێمی فاشیستی چینی بالا، سیاسەتی سەرکوتکاری و تواندنی دەرهەق بەگەلی کورد گرتەبەر و ئەم سیاسەتە بە قۆناغ و بە شێوەی جیاواز لە کاری پڕ زەبروزەنگ و خوێناویدا خۆی نواند.»**[9]

بەڵام حیزبی کرێکارانی تورکیا هەرچەندە هەنگاوێکی زۆر گرنگی بەرەو ئیعتراف کردن بەبزاڤی نەتەوەیی کوردی نا، بەڵام نەگەییە ئەو ئاستەی کە ئیعتراف بە مافی دیاری کردنی چارەنووسی یان ئوتونومی ئەم گەلە بکات، باسی جیابوونەوە هەر مەکە دیارە حیزبی کرێکارانی تورکیا بەم هەڵوێستگیرییەی سەبارەت بە مەسەلەی کورد هێشتا هەشت ساڵان لەدوای حیزبی کۆمونیستی عێراقەوە بوون، چونکە حیزبی کۆمونیست هەشت ساڵ لەوەوبەر هەمان هەڵوێستگیری دەربارەی مەسەلەی کورد کردبوو.

لەم بەیاننامەیەدا هەرگیز ناوی «کوردستان» و «مافی نەتەوەیی» گەلی کورد نەهێنراوە. ئەوەی باسکراوە خەباتی ئەم گەلەیە «لە پێناوی وەدەست هێنانی ئارمانج و مافی دیموکراتی»خۆیدا. ئەمەش خەباتێکە کە «لەگەڵ خەبات لە پێناوی ئەنجامدانی شۆڕشی سۆسیالیستی دا بە رێبەرایەتی چینی کریکار و حیزبە پێشڕەوەکەی، واتەی حیزبی ئێمە لە شەپۆلێکی یەکگرتووی شۆڕشگێڕیدا یەکدی تەواو دەکەن.»[١٠٠]

**ئەم بەیاننامەیە وێڕای هەموو کەموکورییەکانی، لۆژناغێکی گرنگی مێژووی بزاڤی کوردایەتی لە تورکیادا نیشان دەدات: بۆ یەکەمین جار حزبێکی قانونی دان بە بوونی گەلی کورددا دەنێت و باسی «ئارماجەکانی» دێنێتە ئاراوە و بە تایبەتی کە باسی یەکێتی نێوان رەوتی چەپی کورد و رەوتی چەپی تورک رادەگەیەنێ.**

## ٨

## سەرکەوتکاری پاش کودەتای ١٩٧١

دوای کودەتا عەسکەرییەکەی ١٩٧١/٣/١٢ تورکیا، هەر هەموو رێکخراوە چەپەکان هەڵدەوەشێنێتەوە: حیزبی کرێکارانی تورکیا (لە ١٩٧١/٧) و رێکخراوی لاوانی شۆڕشگێڕی تورکیا و بنکە رۆشنبیرییە شۆڕشگێڕییەکانی رۆژهەڵات.

هەندێ رێکخراوی نهێنی، وەکو «سوپای ئازادی بەخشی خەڵکی تورکیا» و «بەرەی ئوتونومی خواز» و بزاڤی ماویزمی «شەفەق» درێژە بە خەباتی خۆ دەدەن، هەندێ جاریش کاری راستەوخۆ ئەنجامدەدەن (رفاندنی کونسولی ئیسرائیل و کادرێن هونەری ئەمەریکایی).

بەڵام سوپا دەستبەرداری گوشاری خۆی نابێت.

**وەزیری تازەی ناوخۆ بە بیانووی ئەوە کە کوردەکان دەیانەوێ بە پشتیوانی بارزانی «وڵات بکەن بەدووپارچەوە» سەدان کەس لە خەباتکارانی کورد دەگرێت و بە دادگایان**

دەسپێرێت، ئەم خەباتکارانە سەر بە بنکە رۆشنبیرییە شۆڕشگێڕییەکانی رۆژهەڵات و حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا و حیزبی کرێکارانی تورکیان.

که له (١٩٧٣/١٠-١٩٧٤/٩) حکومەتی ئەجەویت دێتە سەر کار رژێم بە ئاشکرا ورومو ئازادی دەچێت: لە ١٩٧٤/٧/٨دا هەر هەموو سەرانی کورد عەفوو دەکرێن و گەلێک لە خەباتکارانی سەر بە رێکخراوانی باهۆز و هەڵرا بۆ تورکیا دەگەڕێنەوە.

بەڵام لەباری پراتیکییەوە وەزع وحاڵەکە دیار نییە، سەرانی کوردی تورکیا لە خۆیان دەپرسن ئایا باشتر وایە لەناو یەکێک لە حیزبەکاندا درێژە بە کاری خۆ بدەن یان حیزبێکی چەپی گەورە بۆ خۆیان دامەزرێنن وبە شێوەیەکی نهێنی کار بکەن.

## سەرچاوە و پەراوێزان


١- شەش کەس لەم گروپە لە مانگی ١٩٦٥/٩ سەر لەنوێ دادگایی دەکرێنەوە. بڕوانە لوموند ژمارەی رۆژی ١٩٦٥/٩/٢٦

٢- داگنس تی هنر، ستۆکهولم، ١٩٦٠/١١/١١ کە لە لێکۆڵینەوەی مەسەلەی نەتەوەیی کوردستان لە تورکیادا هورە ٣٠١٩٧١ نووسینی عیسمەت شەریف وانلی، هەروەها لوموند دیپلۆماتیک ١٩٧١/٨ گوتاری «کوردستان خاکی پارچە پارچەکراو» نووسینی ژ.پ. وینو.

٣- بڕوانە لوموند دیپلوماتیک ١٩٧١/٨ گوتاری «کوردستانی خاکی پارچە پارچەکراو» نووسینی ژ. پ. وینو.

٤- هەمان سەرچاوە.

٥- بڕوانە کتێبی کوردستانی عێراق ل ٢٩٨-٢٩٩ نووسینی عیسمەت شەریف وانلی.

٦- هەمان سەرچاوە ل ٣٠٠-٣٠١

٧- عیسمەت شەریف وانلی، لێکۆڵینەوەی مەسەلەی نەتەوەیی کوردستانی تورکیا.

٨- بەلاغی مانگی ١٩٧٠/٤ی رێکخراوی بنکەی رۆشنبیری شۆڕشگێڕ (د.د.ک.او) کە لە لاپەرەی ٤٧ی لێکۆڵینەوەی مەسەلەی کوردی تورکیا، نووسینی وانلی وەرگیراوە.

٩- لە ژ.پ.وینو وەرگیراوە، لوموند دیپلوماتیک، ١٩٧١/٨

١٠- هەمان سەرچاوە.

١١- عیسمەت شەریف وانلی، لێکۆڵینەوە.. ل ٦٥

## فەسڵی دووەم

### حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ۱۹۵۸ تا ۱۹۷٦

حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران دوای شۆڕشی تەموزی ۱۹۵۸ی عێراق و گەڕانەوەی بارزانی بۆ عێراق، سەردەمانێکی دوورودرێژی کپی و بێدەنگی تێدەپەڕێنێ. هەڵبەتە ئەم کپی وخامۆشیە زادەی گوشار و سەرکوتی «ساواک» و سیاسەتی جەنەراڵ بارزانیە.

لە راستیدا دوای گەڕانەوەی جەنەراڵ بارزانی لە ۱۹۵۸/۱۰دا لە یەکێتی سۆڤیەت، ژمارەیەک لە سەرانی کوردی ئێران خێراو بە مەبەستی «هاو ئاهەنگ» کردنی سیاسەتی خۆیان دەگەڵ ئەودا، چوونە بەغدایە. لە سەرەتادا هەموو شتێک باش و خۆش بوو، بارزانی تەنانەت پێشنیازی کرد کە یەکێک لەوان ببێ بە سکرتێری گشتی یەک حیزب بۆ ئێران وعێراق، بەلام هەر لەهەمان کاتدا ساواکی ئێران ژمارەیەک لە سەرانی حیزبی دیوکراتی گرت، کە یەکێک لەوانە عەزیز یوسفی و پاشان غەنی بلوریان بوون وهەردووکیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوون و هێشتاش (۱۹۷٦)[1] هەر لە زیندان دان. (عەزیز لە ۱۹۷۷دا ئازاد بوو، لە ۱۹۷۸دا مرد. غەنی بلوریان لە ساڵی ۱۹۷۹ د ا ئازاد بوو. شەریعەتی بمرلەوان ئازاد بوو بوو.)

ساڵی دواتر، واتە لە ساڵی ۱۹۵۹دا ساواک تۆڕەکەی خۆی کۆ دەکاتەوە: راوێکی چاکە: رەنگە لە ئاکامی خیانەتێکەوە بووبێ، ۲۵۰ کەس لە ئەندامانی حیزبی دیوکرات دەگرێت کە یەکێک لەوانە شەریعەتی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو.

لەبەر ئەمە لە ئاخرو ئوخری ۱۹۵۹ دا حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران لەباری پراکتیکەوە بێ سەرکردایەتیە، سەرانی حیزب یان لە زینداندان یان لە بەغدایە! بەلام تەنانەت ئەمانەش بە سەلامەتی دەرناچن، دوای تێکچوونی بەینی قاسم و کۆمۆنیستەکان، لە بەغدا دەردەکرێن (بڕوانە فەسڵی «٥»ی بەشی سێیەم) و ناچار پەنا دەبەنە بەر سوریا و لوبنان و ئەورووپا.

١

## بلاوکراوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان بەلای راستدا
## (کۆنگرەی دووەم ١٩٦٤)

حیزبی دیموکراتی کوردستان ئێستا لەو رێبەرە شۆڕشگێڕانەی کە بەرنامە پێشکەوتووخوازەکەی سالی ١٩٥٦یان بۆ داناب‌وو، مەحروم بوو.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش وەکو حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق کە لە لایەکەوە گرفتاری چەپی هەواداری کومونیزم بوو لە لایەکی دییەوە گرفتاری راستی میتا نەتەوەیی بو، لە سالی ١٩٥٩دا و پاش سەردەمانێکی زۆر لە چەپخوازی، لە ژێر کاریگەری بارزانی دا بەلای راستدا بایدایەوە، لە سالی ١٩٦٠دا و بەکاریگەری عەبدوڵلا ئیسحاقی «ئەحمەد تۆفیق» بەراست دا وەرچەرخایەوە.

عەبدوڵلا ئیسحاقی کە یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی کۆمیتەی مەهاباد و لە ئەندامە لاوەکانی بوو، زۆر لە بارزانییەوە، نزیک بوو، لە سالی ١٩٦٢ دا بەرپرسی تۆڕی پشتیوانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە خەباتێک بوو، کە بارزانی لەودیوی سنوور دەستی کردبوو.

عەبدوڵلا ئیسحاقی کە بوو بوو بە سکرتێری گشتی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە سالی ١٩٦٤داو لە گوندی سونێی نزیکی قەلادزێی عێراق داوای بەستنی کۆنگرەی دووەمی حیزبی کرد: کۆنگرەکە لە هەلومەرجێکی تا رادەیەک نادیار و ئالۆزدا ئەنجام درا، ژمارەیەک لە نوێنەران بە زۆر لە بەشداری کۆنگرە مەحروم کران. بەلام سەرانی وەکو سلێمان و عەبدوڵلا موعینی کە لە سالی ١٩٦٧ دا دەبن بە ئەندامی «کۆمیتەی شۆڕشگێڕ» لە کۆنگرەکەدا بەشداریان کرد، کۆنگرە بە هەولی عەبدوڵلا ئیسحاقی، قازی محەممەدی بە تۆمەتی «خیانەت» و پێشکەوتوخوازانی کۆمیتەی ناوەندی سالی ١٩٥٤ ی بە تۆمەتی «کەج رەوی» مەحکوم کرد.

## ٢
## شۆڕشی ١٩٦٧-١٩٦٨

بەلام قەیرانی راستی پاش سالی ١٩٦٤ و کاتێ روویدا کە جەنەرال بارزانی دوای سوود وەرگرتن لە کۆمەکی تایبەتی خەلکی کوردستانی ئێران، پەیوەندی دەگەل حکومەتی ئێران دا بەست و دەولەتی ئێران کۆمەکی زۆر گرنگی خستە بەردەست و بەلێنی ئەویش لەبری ئەو کۆمەکانە ئەوەبوو کە ئارامی تەواو لە کوردستانی ئێراندا بەرقەرار بێ.

ئەنجام دانی ئەم بەلێنە بۆ جەنەرال بارزانی پتر لەم رووەوە ئاسان بوو کە ئەو سەردەمە بە هۆی عەبدوللا ئیسحاقیەوە چاودێری تەواوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی دەکرد. بەلام بارزانی لە سالی ١٩٦٦دا ئەو باوەڕەی جارانی بە عەبدوللا ئیسحاقی نەما و (بەعسییەکان عەبدوللا ئیسحاقیان گرت ودوای ماوەیەک ئازادیان کرد) لە خۆی دوور خستەوە و بۆ دەرەوەی بادینانی نارد.

دوای ماوەیەک و لە سالی ١٩٦٧دا چەند کەسێک لە کادرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کە دژی سیاسەتی «هاوکاری» عەبدوللا ئیسحاقی بوون «کۆمیتەی شۆڕشگێڕ»یان دامەزراند، کە ئەندامە سەرەکییەکانی بریتی بوون لە سلێمان و عەبدوللا موعینی (کوڕانی وەزیری ناوخۆی کۆماری مەهاباد) محەمەدئەمین رەوەند و عەبدولرەحمان قاسملو (کە ئەو دەمە لە ئەوروپا بوو.) جەنەرال بارزانی کە لە مانگی ١٩٦٧/٥دا بەم گروپەی زانی کە سیاسەتێکی سەربەخۆیان گرتبووە بەر، لە رێگەی «سامی»یەوە ئاگاداری کردنەوە کە : « یان لە بەغدایە دەمێننەوە و واز لە هەموو چالاکییەکانتان دێنن، یان بۆ کوردستانی ئێران دەچنەوەو هەموو پەیوەندییەکانتان دەگەل ئێمەدا دەبڕن.»

ئەوسا ئەندامانی کۆمیتەی شۆڕشگێڕ لێبڕان بۆ ئێران بڕۆن.

«شۆڕشگێران» دەگەل لایەنگرانی خۆدا کە هەموو نزیکەی ٢٠٠ چەنگاوەرێک بوون، بە دوو دەستە بۆ ئێران چوون: دەستەی یەکەم لە ئاخرو ئوخری مانگی ١٩٦٧/٣دا و دەستەی دووەم لە ١٩٦٧/٦ دا رۆیشتن.

جموجۆلی ئەم گروپە کە پتر لە سێ گۆشەی مەهاباد-بانە- سەردەشت دا بوو، لە زەرفی چەند مانگێکدا بە مەرگی زۆربەی ئەندامانی گروپەکە کۆتایی هات. لە کۆی یازدە ئەندامی «کۆمیتەی شۆڕشگێڕ» پێنج کەسیان کوژران، لەوانە شەریف زادە

(١٩٦٨/٥/٣) مەلا ئەحمەدی شەڵماشی ناسراو بە ئاوارە (١٩٦٨/٥/١٠) و عەبدوڵڵا موعینی (١٩٦٨/٦) و دوو کەسی دیکەیان دەستگیر کران.

راستە بە دەگمەن شۆڕشێک دەبینرێ کە بەم جۆرە خراپ سازدرابێ: هەر هەموو چەک و تفاقی ئەم گروپە بریتی بوو لە نزیکەی چوار کلاشنکۆف، دوو تفەنگی ئوتوماتیک، هەشتا و پێنج تفەنگی کۆنە.!

ئەم گروپە جگە لەوەی پشتیوانی ناوچەییان نەبوو، هەر زووش روویەرووی کەمی تەقەمەنی بوونەوە و ئەو هەڵە گەورەیەشیان کرد کە مەیدانی کاری خۆیان لە ناوچەیەکی زۆر بچووک دا هێشتەوە و ئەمەش زەمینەی بۆ سوپای ئێران خۆش کرد کە بە ئاسانی بەسەریاندا بدات.

دوای هەمـوو ئەمانەش، جەنەراڵ بارزانی کە پەیوەندی ئەوانی دەگەڵ کوردستانی عێراقدا بڕی بوو، «خۆش خزمەت»ی خۆی گەیاندە رادەیەک کە لە بەهاری ساڵی ١٩٦٨دا سلێمانی موعینی کە لە سەفەرێکی ئەورووپا دەگەڕایەوە، کوشت و جەنازەکەی دایەوە بە کاربەدەستانی ئێرانی تا لە مەهابادا وبەرچاوی خەڵکییەوە بیگێڕن.

«بەهای» کۆمەکی شا (بۆ بارزانی) ئێستا مەعلوم بوو.

## ٣

## کۆنفرانسی دووەمی حیزبی دیموکراتی کوردستان (١٩٦٩)

لە ساڵی ١٩٦٩دا هێمن و چەند کادرێکی دیکەی حیزب، لەکوردستانی عێراقدا کۆنفرانسی دووەمی حیزبیان رێکخست و عەبدوڵڵا ئیسحاقی کە ئەو دەمانە بە تەواوی لەبەرچاوی بارزانی کەوتبوو، لە حیزب دەرکرا. دەرکردنی عەبدوڵڵا ئیسحاقی نیشانەی بادانەوەیەکی تازەی حیزبە بە لای چەپدا.

## ٤

## لە کۆنفرانسی سێیەمەوە (١٩٧١/٦)
## تا کۆنگرەی سێیەم (ئەیلولی ١٩٧٣)

دوای رێکەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١، دیسان بەغدا بوو بە مەڵبەندی کوردان. چ کۆسپێک لە رێگەی گەڕانەوەی سەرانی پێشکەوتوخوازی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە سووریا و لوبنان و ئەورووپاوە نەما، ئەمانە لە ساڵی ١٩٦٠ وە بە ناچاری چوو بوونە ئەو وڵاتانە.

له کۆتایی مانگی ٣/ ١٩٧٠دا «کۆمیتەیەکی ناوەندی کاتی» تازە راسپێردرا کە پەیڕەو و پرۆگرامێکی تازە بۆ حیزب ئامادە بکات: ئەم پەیڕەو و پرۆگرامە تازەیە لە سێیەمین کۆنفرانسی حزب دا (٦/١٩٧١) پەسەند کرا، هەر لەم کۆنفرانسەشدا بوو کە سەرکردایەتی تازەی حیزب هەڵبژێردرا: واتە کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی، عەبدولرەحمان قاسملو بوو بە سکرتێری گشتی. قاسملۆ یەکێک بوو لە دەرکراوەکانی ساڵی ١٩٦٤.

بەڵێ، دوای قۆناغی دووروودرێژی ساڵانی ١٩٦٠-١٩٧٠ ئیدی حیزبی دیموکراتی کوردستان گەڕابووەوە سەر هەڵوێستە پێشکەوتوو خوازەکانی خۆی. ئەم وەرچەرخانە تازەیە بەرەو چەپ، لەلایەن کۆنگرەی سێیەمی حیزبەوە پەسند کرا (١٢-١٩٧٣/٩/٢٦). کۆنگرە رای لەسەر خەباتی چەکدارانە بە هاوکاری رێکخراوە شۆڕشگێڕەکانی دی، دژی شا دا: رەنگە بشێت بەرنامەی ئەم خەباتە لە دروشمی «خەبات لە پێناوی ریفورمی بنەڕەتی، دیموکراسی بۆ ئێران، و مافی نەتەوەیی بۆ کورد» بەرجەستە بکرێ.

## ٥

## حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران
## لە نێوان رکابەری ئێران و عێراقدا

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بە کۆمەکی بەغدایە توانی تا رادەیەکی باش خۆی رێک بخاتەوە و بە هێز بکات! دیارە دەوڵەتی عێراق زۆر بە داخ بوو لە رژێمی «کۆنەپەرستی فراوانخوازی» شا، کە یەکەمین دەستە سەربازی خۆی لە نیسانی ١٩٧٣ دا بۆ زەفار ناردبوو، بۆیە عێراق سوور بوو لەسەر ئەوەی زەربەیەک بە رژێمی شا بگەیەنێ و بۆ ئەم مەبەستەش لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران باشتری وە چنگ نەدەکەوت، بەتایبەتی کە لە ناو خاکی ئێراندا پێگەو جەماوەری خۆی هەبوو.

لەو ماوانەی نێوان تێکچوونی رەسمی و نیمچە رەسمی بەینی بارزانی و بەغدایە، لە روانگەی سەرانی کوردستانی ئێرانەوە هاوپەیمانی حیزبی دیموکرات و حکومەتی بەغدا دژی رژێمی شا، ئاسایی بوو: چما ئەم دەوڵەتە پێشکەوتووخواز و دژە ئیمپریالیستە لەو دواییانەدا - بۆ یەکەمجار لە مێژوودا- ئوتونومی بە کوردەکانی خۆی نەدا! کۆمەکی بەغدا بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هەرگیز بەو کۆمەکەدا ناگات کە شا بە

بارزانی دەکات، ئیدی پیاوەتی بە بوونەوە دەکرێ!

بەڵام حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە بەهاری،١٩٧٣ وە نووسینگەیەکی گرنگ لە بەغدایە دەکاتەوە، هەندێ کۆمەکی مادی و لۆجستی لە حکومەتی عێراق وەردەگرێت، کە هەردوولا هەوڵێکیزۆر دەدەن باسی نەکەن.

بەمجۆرە هاوپەیمانی دوو قۆڵی بەعس و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە بەرانبەر هاوپەیمانی شا و بارزانی دا قووت دەکرێتەوە.

**ئەمە تراژیدیای تەواوەتی کوردە.**

هەردوو بزووتنەوەی کوردی ئێران وعێراق بوون بە هاوپەیمانی دوو حکومەت کەلە وڵاتی خۆیاندا خراپترین دژمنانی هاونەژاداتی ئەوانن «کوردن» لە راستیدا دژمنانی میللەتی کوردن، ئەم دوو حیزبە لەبری ئەوەی بە هەڤڕا خەبات بکەن، کەوتوونەتە دژمنایەتی کرنی یەکدی.

## ٦

## حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران پاش ١٩٧٤/٣/١١

دەست پێکردنەوەی شەری بەعسی و بارزانی پاش ١٩٧٤/٣/١١، رێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەخاتە سەر دوو ریان: بەعس زۆریان لێدەکات کە لە رۆژنامەی «کوردستان»ی ئۆرگانی حیزبدا، بارزانی مەحکوم بکەن، و حیزب قەبوڵ ناکات، بەعسییەکان کۆمەکیان لێ دەبڕن، ژمارەیەک لەو سەرکردانەی کە نیشتەجێی بەغدایەن دیسان دەبێ شوێنێکی دی بۆ خۆ وەدۆزن.

سیاسەتی شا، لە ئێراندا دەنگێکی زۆری داوەتەوە: کوردە دیهاتییەکان هەوەڵین کەس بوون کەوتنە ستایشی رەفتاری شا دەرهەق بە کوردەکانی عێراق. دێهاتییەکی گوندێکی سنووری ئێران لە شوباتی ١٩٧٥ دا گوتی: «پێشتر، ئێمە و بەتایبەتی خەڵکی مەهاباد درێغیمان لەوە نەدەکرد کە کێشە وگرفتان بۆ حکومەتی شا بنەینەوە.[٢] بەڵام لەوساوە کە کۆمەکی بارزانی دەکات، مەسەلەکە فەرقی کردووە.» لەسەری رۆیی: «تەنانەت خانەوادەی قازی محەمەد گوتویەتی: لەبری ئەم کارانەی کە دەرهەق بە پەنابەرانی کوردی دەکات، ئێمە لەوە دەبووریین کە دەرهەق بەماڵباتی ئێمەی کردووە.»

دیار بوو کە بەرە، بەرە بەرە لە ژێر پێی سەرانی کوردی ئێران دەردەهێنرا.

٧

## حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران پاش ڕێکەوتنی ١٩٧٥/٣/٦

ڕێکەوتنی ٦ی ئازار کردییە کارێک کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران نەتوانێ هیچ جۆرە چالاکییەک لە ناوخاکی عێراقەوە دژی ئێران ئەنجام بدات.

بەڵام دەشێت بگوترێ کە ئەم ڕێکەوتنە بەلای کەمەوە یەک ئەنجامی باشی هەبوو: ئەم ئاشتییە سەیرو سەمەرەیەی هەردوو ڕژێمی بەغداو تاران لەسەر جەنازەی گەلی کورد، کۆتایی بە ... هاوپەیمانییە نا ئاسایییە هێنا کە بزووتنەوەی کوردیی تێی کەوتبوو.

سەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە کۆبوونەوەی مانگی ١٩٧٦/٥ لە ئەنجامی تاوتوێ کردنی ڕێکەوتنی ١٩٧٥/٣/٦وە سیاسەتێکی نوێیان بۆ چالاکی و چەلەنگییەکانی حیزب دارشت.

### سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- عەزیز یوسفی لە ساڵی ١٩٧٧ دا لە زیندان بوو، لە ١٩٧٩/٩/٦ دا لەتاران وەفاتی کرد، ڕێ و ڕەسمی بە خاکسپاردنەکەی لە ٦/٩/ ٧٩ لە مەهاباددا بوو بە خۆپێشاندانێکی گەورەی نەوتێ کە هەزاران کەس بەشداریيان تێدا کرد.

٢- هەڤپەیڤین دەگەڵ نووسەردا، لە کوردستانی ئێران، شوباتی ١٩٧٥.

## فەسڵی سێیەم

## وەزعی عێراق لە ساڵی ١٩٧٦دا

عێراقی پاش ڕێکەوتنی جەزایر لەوپەڕی پەشێویدایە. دەوڵەت بەرواڵەت بەردەوامە لە سەرجێبەجێ کردنی پرۆژەی ئوتۆنۆمی «خۆی» و هەوڵیشی کردوە بە پایتەختی ناوچەی ئوتونومی: «حیزبی تازەی دیموکراتی کوردستانی عێراق» لە ١٩٧٦/٥دا ونوێیەم کۆنگرەی خۆیە دەبەستێ. لەم کۆنگرەیەدا ساڵح حەیدەری،[1] ئەندامی مەکتەبی سیاسی دەربارەی «شۆڕشی ئێمە» دەڵێ: «شۆڕشێکی ناسیونالیستیە و لە پێناوی ئازادی و یەکێتی نەتەوەی عەرەبدا دەخەبتێ.»!

مرۆڤ دەکەوێتە گومانەوە کە نەبادا کۆنگرەکەی لێ تێک چوو بێ!

ئەگەر کاربەدەستانی عێراقی بیانتوانیبایە لە سیاسەتی خۆیاندا هەندێ کارامە بن و ڕابردوویان فەرامۆش بکردایە و ڕێگەی ئەو پەنابەرانەیان بدایە، کە بڕیاریان دابوو بۆ وڵات بگەڕێنەوە، جێگەی شایستەی خۆیان لە ناو کۆمەڵدا وەربگرنەوە، لەوە بوو بیانتوانایە ئەو پەڕی سوود لەو خەڵکە وەربگرن کە دام و دەزگای سەرکردایەتی جارانی شۆڕشیان - واتە دام و دەزگای بارزانی- بە تەواوی لە بەرچاو کەوتبوو: زۆربەی ئەو کوردە عێراقیانەی کە دەستیان لە ئوتونومی کوردستان شت بوو، دووچاری نا ئومێدی بوو بوون دەکرا بەناسانی بهێنرێنە مەیدانی هاوکاری کردن دەگەڵ کاربەدەستانی عێراق دا، هەڵبەتە ئەگەر کاربەدەستانی عێراقی باوەشیان بۆ بکردنایەتەوە.

**دەزگای سەرکوت و زەبرو زەنگ:**

لێ سەرانی بەعسی بەغدا جارێکی دیکەش سیاسەتی سەرکوتکاریان گرتەبەر، سەرانی بەعس پاش ئەوەی خەڵکە گەڕاوەکەیان ناچار کرد پرسنامەی دووروودرێژ دەربارەی کاروچالاکی جارانی خۆیان پڕ بکەنەوە کە ئەو پرسنامەیەی وەبیر دێناوە کە ئەندامانی حیزبی کۆمونیستی چیکوسلۆڤاکی دوای «بەهارەی پراگ ناچار بە پڕکردنەوەی کران. هەموو کادرانی جارانی شۆڕشیان بۆ باشور- بۆ کوت، عەمارە، ناسریە- دوور خستەوە: ئەم دوور خراوانە لەوێندەر بوون بە فەرمانبەری شارەوانی و غابات (بۆ وێنە هەمزە عەبدوڵلا، هەرچەندە پەیوەندی بە هێزی بارزانیەوە نەکردبوو.)

زانکۆی سلێمانی لەباری پراتیکیەوە بە داخراو حەساو بوو: هەموو مامۆستاکانی لە

ژێر گوشارو سەرکوتدا بوون.

کۆڕی زانیاری کورد هەر بەناو مابوو، لە خانەی داخراودا بوو.

لەلایەکی ترەوە بەعس کاری «عەرەباندنی» ناوچەکانی کەرکوک و ژەنگار و شێخان و زاخۆی توندتر کردبوو، دەستە دەستە خەڵکی گوندە کوردەکانی بۆ باشور راوەگوێزاو عەرەبی لە شوێندا نیشتەجێ دەکرد.

بە کورتی زەبرو زەنگ بە رادەیەکە کە هەر لە ئێستاوە کوردەکان سەریان بەرز کردۆتەوە و بە ئومێد و هیواوە دەڕوانتە چیا. خەڵکی نەفرەت لە بارزانی ناکەن و دیسان باس باسی شەڕی پارتیزانیە.

بەڵام لە باری سیاسیەوە، وەزعەکە زۆر پەشێوە: سەرانی جاران لە بەرچاوی خوێنەواران و رۆشنبیران کەوتوون. جەلال تاڵەبانی کە پەنای وەبەر دیمەشق بردبوو، هەوڵ دەدات ئەو خەباتکارانەی کە ئامادەی کاری راستەوخۆن، لە دەوری یەکتر کۆ بکاتەوە.

نوێنەرانی سێ بزاڤ: «بزووتنەوەی سوسیالیستی کوردستان» «کۆمەڵەی ماکسی-لینینی کوردستان» و «هێڵی گشتی» لە کۆنگرەیەکدا «لە ٨/٣١/ تا ٩/١٢» لە ناوچەی برادۆست و بە سەرۆکایەتی تاڵەبانی، لێیان لە رێکخراوێک دا بە ناوی «یەکێتی نیشتمانی کوردستان» یەک بگرن، ئەم رێکخراوە کۆمیتەیەکی ناوەندی و مەکتەبێکی سیاسی هەڵبژارد وجەلال تاڵەبانی بە سکرتێری گشتی هەڵبژارد و بەرنامەی شۆڕشی تازەی دارشت.

لە لایەکی دیکەوە پاش قۆناغێکی درێژ لە نائومێدی، سەرانی جارانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق، بە تایبەتی سامی، ئومێدی سەرلەنوێ کۆ کردنەوەی پاشماوەکانی شۆڕش ودامەزراندنی حیزبێکی تازەیان لە دەست نەداوە، لەبەهاری ساڵی ١٩٧٦ بەملاوە سامی هەوڵ دەدات کادرانی پەنابەری ئەوروپا لە چوارچێوەی «پارتی دیموکراتی کوردستان- سەرکردایەتی کاتی» دا کۆ بکاتەوە، دکتۆر مەحمود عوسمانیش بە دامەزراندنی «پارتی دیموکراتی کوردستان- لیژنەی ئامادەکار» بە تەمایە هێزی سێیەم دروست بکات.

شۆڕشی کوردەکانی عێراق زۆر لە گوێن بوو لە ئاکامی ململانێی نێوان یاران و نەیارانی بارزانی، لەسەر وەدەست هێنانی دەسەڵات، هەر لە نێو باڵ و لا باڵە راست وچەپەکانی خۆیدا ببێ بە چەند پارچەیەکەوە.

**دوا وته**

هێشتا زووه بۆ ئەوەی تاوتوێنامەیەکی دروست لەمەڕ کارەکانی بارزانی بە دەستەوە بدرێ، چونکە ئەمڕۆکە لایەنە سەلبیەکانی کاری وی، بە تایبەتی دەست کێشانەوەی یەکجارەکی لە خەبات، پتر مایەی سەرنجن تا لایەنە ئیجابیەکانی ئەو خەباتەی کە چل ساڵ بەرێوەی بردووە.

بەڵام هەر داوەریەکیش لەمەڕ جەنەراڵ بارزانی بکرێ، دەبێ گوتەێن دوو کەسایەتی زۆر جیاواز لە یەکتری، وەک قەدری جانی شاعیری خەڵکی کوردستانی تورکیا و سکرتێری گشتی حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران لەبەرچاو بگرێ.

**شاعیر ممهرسێت:**

سەرداری کوردان، بارزانی
بارزانی... بارزانی،
د جەنگا وڵات دە،
دمەیدانا خەبات دە،
پەهلەوان...
قەهرەمان...
تونی
بونی
هیمی کوردستان...
تو هیمی کوردستان،
چێتر
بێتر
ل جەرانی
بارزانی...بارزانی...

***

بارزانی...بارزانی...
کی
ئی

تاڤی
نزانی؟
هەرکەس دیت،
هەرکەس بهیست،
ل رۆژ هلات...
رۆژ هلاتا ناڤین...
زڤستان وهاڤین
کی دکە دنگ؛ کی دکە خەبات؟
ل همبەر جەند دەولەتان،
نو دژمنێ مللەتان،
چەند دەولەتێن ئیستعمار،
کی بوبە کلم؟ کی بوبە بار
***
عەسکرێن نوری سەعید،
کو دگەل جورجان خلیط،
دخەبتن...
د پریتن...
نکارن ڤی میری،
ڤی شێری،
بێخن داڤێ....
لەشکرێن تورک ونیران
بالاڤرێن رومان
هیج تو هاڤل نەکران..
تشتەک حاسل نەکران..
دیسا ل سەر چییان
دیسا لناڤ مەیدان
دەنگ دکە،
جەنگ دکە.

بارزانی...بارزانی...

***

نوردو، نوردو شکاندن
هزار چنبر قەتاندن..
مینا بروسک وتەوران،
ل هەرجه...ل هەر دران،
دچرسه دده دەنگ
مینا داوەت دچه جەنگ
سینوران دچرینه....
ئاورویان د درینه....
گاڤا ژی رە بو جراخه
ب پردا دلژو ئیراق؛
د ده سەر دلێ تورکان،
دچه باکورێ کروات..
دبه تیر..دبه کڤان...
بچو دریژ دکه ئیران...
ئەو عەجەمێن ئەسرار کێش
ئەفیونکێش...
ب قلیونا خوە دگرن
دکەفن تایا مرن
و دبێژن!
دیسا کرنه خویانی
هات روخستن: بارزانی

***

ئەی برادەرێ عەجەم
ئیخوان عرب الاشم
ئەی دموقراط تورک قارطسن
برادەر ئیخوان یولداسن

ئەم هەڤال وجیرانێن
دژمن ئەمریکانن...
ئینکلیزن...ئینکلیز
ژن ئها ژێ رە مەبن لیر.
سەردارێ مە: بارزانی
گران هەرکەس بزانی
سەردارێ ئازادی یە..
ئافدارێ ئاپادی یە...
رابن هون ژێ ب لڤن
لدورا وی ب چڤن..
بیژن بژی بارزانی!
خلاسکارانێ ئینسانی!

قەدری جان

ڕێبەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە هەیڤی ١٠/١٩٧٣ دا قسەیەکی جوانی دەربارەی کاری سیاسی جەنەراڵ بارزانی کردووە کە دەڵێ: « ئەوەی کە خوێنەران تێی نەگەیشتبوون، ئەوەی سیاسەتوانان تێی نەگەیشتوون، ئەوەی من بەخۆم لە هەندێ کاتدا لێی حاڵی نەبومە ئەمەیە کە بارزانی تاقە کەسێکە کە توانیویەتی ئەم خەڵکە دێهاتییە- ئەم خەڵکە نەخوێنەوار و پاشکەوتووە- بەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی شۆڕشی نەتەوەیی کورد بخات و یەکیان بخات.»[٢]

ئەم دلوەریبە کە لەلایەن رۆشنفکرێک و ڕێبەرێکی چەپی شۆڕشگێری کوردەوە ئەنجام دراوە سەنگ و بایەخێکی فرەی هەیە، هەر چەندو ئەم داوەریبە یەک ساڵ و هەندێ بەر لە ڕێکەوتنی جەزایر ئەنجام دراوە و خاوەنی ئەم قسانە پاشان- لە دوا ڕووداوەکان بەملاوە- بەم داوەرییەی خۆیدا چووەتەوە.

ئێستا کە بارزانی لە مەیدان نەماوە، حیزبە سیاسییەکانی کورد دەتوانن ڕۆڵی خۆیان بگێڕن و ئەو ڕۆڵەی کە لە دامەزراندنی یەکەمین حزبی کوردییەوە بەر لە دووەم جەنگی جیهانی[٣] هەرگیز نەیان توانیوە بیدیەن، دەتوانن دەست بە لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی ڕووداوەکانی ڕابردوو بکەن و پەندی لێوەربگرن.

**ئەو دەرس و پەندانەی کە دەبێ لە شکستی بارزانیەوە وەربگیرێن.**

رژێمی «کوردستانی ئازاد کراوەی جەنەراڵ بارزانی بە هەموو کاڵی و کرچی و کەموکورییەکانیەوە «سەرمەشق و نموونەیەکی» - زۆر زیندووترە لە کۆماری بچوک و تەمەنکورتی مەهاباد کە چ سنوورێکی دیاریکراوی نەبوو و بە بێ تاقە تەقەیەک هەرەسی هێنا. لێکۆڵینەوە لە وەزع وحاڵی ئەم «قەڵا و حەساری کورد»، کە کوردەکان پتر لە دە ساڵان وێرای هێرش و پەلاماری سوپایی قورس، کاروباری خۆیان تێدا بەڕێوە دەبرد، دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەرەخسێنێ کاردانەوەی کوردەکان یان هەندێک لە سەرانی کورد سەبارەت بەو خەونانەیان کە تا رادەیەک هاتبوونە دی، واتا خەونی دامەزراندنی حکومەتی ئوتونومی یان سەربەخۆی کورد بدیێن و شی بکەینەوە.

**لە لایەکی دیکەوە پاڵەوانی و قارەمانی و دلاوەری جەنەراڵ بارزانی تەنها هی کوردی عێراق نیە و بەڵکو هی هەموو کوردانە، جا کوردی تورکیا بێ یان هی هەر شوێنێکی دیکە و رێبەرەکانیان خەون بەو رۆژەوە دەبینن کە بتوانن «بنکەیەکی» شۆڕشگێڕی، تەنانەت دە جاران بچوکتر لە (حەسارو قەڵاکەی) جەنەراڵ بارزانیان هەبێ.**

## **«گرێی جەنگی قەڵایی»**

جار ناجارێ خاڵ و ئەنجامێک بە بیردا دێت: وەکو دیڤید ئادامسن لە ساڵی ۱۹٦۲دا دەری خستووە پێشمەرگەکانی بارزانی بەتایبەتی و کوردان بە گشتی، هەرچەندە زۆر چاک دەزانن لە چیادا چۆن دژی ئەو دژمنەی کەلە دەشتەوە دەست بە هێرش دەکات، بجەنگن، جگە لەم شەڕە «دیفاعیە» شارەزای هیچ شەڕێکی دیکە نین و رێی سوود وەرگرتن لەسەرکەوتن نازانن.

**کوردەکان کە عوقدەیەکیان هەیە و دەشێت ناوی «عوقدەی شەڕی قەڵایی» لێ بنێن، لە خاک و چیاکانی خۆیاندا نەبێ نیدی لە شوێنانی دیدا شەڕ نازانن، لە بواری پراتیکیدا هەرگیز شەڕیان نەبردووەتە ناو جەرگەی عێراقەوە: لە کاتێکا تۆپباران و وێرانکاری و برسێتی خەڵکی کوردی لە پەلوپۆ دەخست، لە بەغدایە خەڵکی چ ئاگایەکیان لەشەڕ نەبوو، هەڵەی گەورەی بەرپرسانی «حەساری کوردان» پەیڕەو کردنی شەڕی «کلاسیکی» بوو، هیچ شۆڕشێکی رزگاریخوازی نەتەوەیی ناتوانێ لەیەک بەرەی نەگۆڕدا رووبەرووی سوپایەکی هاوچەرخی خاوەن تانک و تۆپخانەی قورس و فڕۆکە بوەستێ (مەگەر شۆڕشیش هەمان چەکی هەبێ) سووربوونی ئەم «قەڵا» دێو ئاسایە لە سەربەگری کردن لە**

سنووری خۆی، بە شێوەی وەهم نامێزی جەنگاوەرانی عەسرو زەمانێکی دی، هەڵەیەکی دیکە بوو کە ئەنجامی خراپ و ترسی لێکەوتەوە، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە جەنەراڵ بارزانی دەیتوانی بە هەمان هێز شەڕێکی شۆڕشگێڕانە لە سەرانسەری عێراقدا وەگەڕ بخات و دوور و رواڵێکی ئەوتۆش بۆ تانک نەهێڵێتەوە.

پاساوی جەنەراڵ بارزانی بۆ بەرپانەکردنی شۆڕش لە شوێنەکانی دیکەی وڵاتدا یان پەنا نەبردن بۆ خەباتی تیرۆریستی ئەمە بوو کە: «ئێمە دژی خەباتی تیرۆریستی وەکو هی فەلەستینیەکانین و لەگەڵ کوشتنی خەڵکانی مەدەنیدا نین.»[4] راستە جەنەراڵ بارزانی دەرک و تێگەیشتنێکی «یەکجار زیرەکانە و قارەمانانەی» لەمەڕ جەنگ هەبوو، بەڵام بەم حاڵەشەوە مرۆڤ لە خۆی دەپرسێت کە ئاخۆ لەبەر ئەوە خۆی لە جەنگی «نوێ» دوورە پەرێز گرتوە کە نەوەک لە کۆنترۆڵ ودەسەڵاتی خۆی دەربچێت؟

هەروەها ئەم پرسیارەش دێتە گۆڕێ، بۆچی هێزی پێشمەرگە هێرشیان نەکردە سەر دام و دەزگای نەوتی کەرکوک؟ ئایا لە بەرئەوە بوو وەکو یەکێک لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی دەڵێت: شای ئێران قایل نەبوو، چونکە پاڵاوتەخانەی نەوتی ئەبادان هەمیشە لەبەر سیرەو هەرەشەی تۆپخانەی عێراقدابوو؟

یان بارزانی بەخۆی ترسی ئەوەی هەبوو کە بەم کارە وڵاتانی رۆژئاوایی لە خۆی بتۆرێنێ؟

یان لەبەر ئەوەبوو کەکۆمپانیای نەوتی کەرکوک زۆر بە چاکی پاسەوانی لێدەکرا؟

سنوورەکانی بزاڤی کوردایەتی:

لە کاتێکدا جەنەراڵ بارزانی تەنێ کوردستانی عێراقی کردبوو بە مەیدانی خەباتی خۆی، ئەوانەی پاش ئەویش، واتە ئەورێبەرانەی سەرکردایەتی بزاڤێن کوردستانی عێراق و تورکیا و... گرتبووە دەست، هەمانکاری ئەو دووبارە دەکەنەوە و تەنێ بەشی کوردستانی خۆیان دەکەن بە مەیدانی چالاکی و خەبات: یەکێک لەرێبەرانی کورد لە کتێبەکەیدا بە نێوی «کوردستانی ئێران» دەنووسێت: «دیارە کە هەلومەرجێکی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی چونیەک لە سەرانسەری کوردستاندا هەیە و ئەمەش «لایەن و حاڵەتێکی هاوبەشیان» لە نێواندا دروست دەکات. بەڵام هەر هەمان رێبەر لە سەری دەڕوات: «بەڵام نابێ زێدەڕەوی دەربارەی ئەم لایەنە هاوبەشانە بکرێ» و دوویاتی دەکاتەوە کە تەنێ «هێڵی سنووری» کوردێن تورکیا و ئێران و عێراق، کە دەیان ساڵە لە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی جۆراوجۆری ئەو وڵاتانەدان کە پێوەیان لکێنراون «لەیەکدی» جودا ناکاتەوە.

ئەگەر کوردەکان ئەم پەیوەندییانەی نێوان زۆردار و زۆرلێکراوان وەکو حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگر قەبوڵ بکەن ئەوا لەئێستەوە نیوەی شەڕەکەیان دۆراندووە.

دەبێ لەم بارەیەوە زۆر بە وردی موتالای ئەو لێکۆڵینەوەیە بکرێت کە لوران رینیە rai-Laurant nen دەربارەی ناکامی وفەشەلەکانی بزاڤی نەتەوەیی چیک ئەنجامی داوە، هەروەها دەبێ ئەو شیکردنەوە و لێکدانەوەیەش کەلەمەڕ «داپڕان لە هێزی رزگاریخواز» و «گەڕان بە دوای پشت و پشتیواندا» کە نەتەوە پەروەرانی چیکی بە شکان داوە[4] بە وردی بخوێنرێتەوە.

شتێکی بەڵگە نەویستە کە جەنەراڵ بارزانی لە «ستەمکاران» داپڕا بوو، وەختێ کە لە قسەیەکیدا گوتی هەرگیز دڵ و ستان دەگەڵ بەعسیاندا ناکات،[6] هەندێ لەو وەزیرانەی کە بە تەواوی خۆیان لە بەغدایە دائەبڕی بوو، پەشۆکان «ئەوانە ئەمڕۆ لە کوێن؟» لێ بارزانی هەمیشە عەودالی «پشتیوانە بوو.

زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە دەوری جەنەراڵ بارزانی گرد بوو بوونەوە، وەکو سەرانی کوردی سالآنی بیستی قستەنتەنیە کە دەبێ یەکیان لە ناو دلم و دەزگای عوسمانلییان دا هەبووە بە تەواوەتی لە بەغدایە دائەبڕا بوون، ئەوەتا یەکێک لەوانەی پەیوەندییان بە بارزانییەوە کردبوو، کە لە نێو پەیوەندیکارانی سالآنی ١٩٧٤-١٩٧٥دا یەکێک بوو لە خەڵکە زۆر پاکەکان و لە هەمووان کەمتر هەلپەرست بوو، لەم بوارەدا و بە ئاماژە بۆ کۆتایی شەڕ دەیگوت: «ئەگەر حکومەت هەموو موچەکانم بداتەوە، ئەوا فلان شت بۆ خۆم دەکڕم.»

ئەم پیاوە کە جلی پێشمەرگایەتی لەبەر بوو و کلاشنکۆفێکی داپوو بە شانیدا، تا ماوەیەک لەمەوبەر لە بەغدایە بوو، تۆ بڵێی هێشتاش هەر لەوێندەر دائەبڕابێ.

بەلای سەرانی حیزبە شۆڕشگێڕەکانی کوردەوە، مەسەلەکە شتێکی ترە، لەئاستی ئایدیۆلۆژیدا، کورد حەز دەکەن دەگەڵ باقی بزاڤێن شۆڕشگێڕی «وڵاتی» خۆیاندا هاوبەیان بن- بۆ وێنە لە ئێران دا، دەگەڵ رێکخراوە شۆڕشگێڕەکان و هەندێک بەشی «بەرەی نیشتمانی» درێژەدەرانی رێگەی موسەدیق و..

لە ئاستی ستراتیژیدا سەرانی کورد هەمیشە لەوە ترساون کە ئەگەر بەرنامەیەکی ستراتیژیان هەبێ و داوای ئەویەری مافی خۆ بکەن، ئەو وڵاتانەی دیکەی کە کوردیان تێدایە لەخۆ دەهاروژێن، بۆ وێنە، تورکیا و عێراق دژی کوردی ئێران، کورد بە تەمابوونە و تا ئەمڕۆش هەر بە تەمان کە بە دروشمی ئۆتونۆمی لە چوارچێوەی ئەوا وڵاتانەدا کە

بەسەریاندا، دابەشکراون، بەلای کەمەوە ئەو وڵاتانە لە خۆیان نەھاوێژن و بێ لایەنیان بکەن.

مرۆڤ تێناگات کوردەکان چۆن وا دەزانن کە حکومەتانی داگیرکەر لەم جۆرە مانۆڕانە تێناگەن؟ ئەوەی کە ئەو حکومەتانە نیگەرانی دەکات دروشم نیە، بەڵکو هێزی حەقیقی و راستەقینەی شۆڕشێن نەتەوەییە.

بەڵام ئەوڕۆ شۆڕشی کوردایەتی ئەگەر بیەوێ شانسی سەرکەوتنی هەبێ، ناب خۆی بە خاکی یەک بەشی کوردستانەوە ببەستێتەوە، جا ئیدی ئەو بەشە کوردستانی تورکیا بێ، یان کوردستانی عێراق....

ئاشکرایە لەمە بەدولوە کوردەکان ناتوانن چاوەنۆڕی کۆمەکی دەرەکی بن و ناشبێ بە ئومێدی ئەم بابەتە کۆمەکە بن: هێشتنەوەی خەبات ولە یەک پارێزگاەی کوردستاندا، دەکاتە بە پیرەوە چوونی شکست و ناکامی... کوردەکان کە ئەوی بیر لە «وڵات» دەکەنەوە دەبێ داواکاری «وڵاتێک» بن کە شایستەی ئەم ناوە بێ، هەمەو کۆمەڵانی بەشە جیاوازەکانی کوردستان لە چوارچێوەی خۆیدا یەکبخات.

هەڵبەتە مەبەست لەم قسەیە ئەوە نییە کە لە سبەینێوە شۆڕشێکی گشتی بەرپا بکرێ، چونکە کارێکی لەم بابەتە و بەو پەلەیە دەکاتە بانگەواز بۆ کوشتارێکی گشتی.[٧]

بەڵام تەنێ بە کۆکردنەوە و هاوئاهەنگاندنی هەمەو هێز وتواناکان، لە چوارچێوەی یەک یزاف و شۆڕشدا و بەرلەوەش سەرینەوە ی بیرو بیرکردنەوەی ناوچەگەریانە، دەرفەت و دەلیڤەی ئەوەیان دەبێت کە میللەتی خۆیان بێننە بەر بارو بەرەو ئاسۆیەکی دیاری بەرن.

ئەندریە مالرو قسەیەکی خۆشی لەمەڕ ئوتونومی خوازان هەیە: « بەبۆچوونی من ئوتونومی خوازان، شتانێکن کە بەشێک لە سەردەم و زەمانی ئێمە پێک دەهێنن، بەڵام... دەڵێی دەنگی زەنگوڵەی لیبۆک دێت! بریتۆنەکان Bretons، باسکەکان Basques کۆرسەکان Corses (ناوی کوردەکان نابات) لێرەدایە کە لیبۆکەکانی شەکسپیر لەمەر شانۆ دەردەکەون!»[٨]

چ کەسێک ناتوانێ چارەنووسی میللەتێک لە بری ئەو میللەتە دیاری بکات، کوردەکان دەبێ بە خۆیان ئەوە بسەلمێنن کە نایانەوێ ببن بە «لیبۆک و شێتەکانی شەکسپیر، بیسەلمێنن کە مەحاڵە «بتوانرێ ژیانی پازدە ملیۆن کورد لە ناوچەیەکی بەبایەخی وەکو رۆژهەلاتی ناڤین»دا پشت گوێ بخرێ و بەهەند وەرنەگیرێ و لە خانەی نەبووانداا دابنرێ.

